بەرگی یەکەم

# مەملەکەتی نوور

رۆمانی ژیانی باشترین پیاو

لە نوورەوە بۆ کۆچ

نووسینی
ماکوان کەریم

منتدى إقرأ الثقافي
WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM



# مەملەکەتی نوور

## ڕۆمانی ژیانی باشترین مرۆڤ

(بەرگی یەکەم)

نووسینی: ماکوان کەریم

پێداچوونەوەی: شەوبۆ جەلال


کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی



بەڕێوەبەری گشتی: موحەممەد خضر ئەحمەد ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤

بەڕێوەبەری هونەری: موستەفا موحەممەد کوردی ٠٧٥٠٩٩٩٨١٨٢

فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

ئنیستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

لقی یەکەم: بەرانبەر دەرگەی قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحموود - بەرانبەر مزگەوتی مەحموود عەلاف

ئیمێل: mdmaktaba@gmail.com

نەخشەسازیی ناوەوە: موستەفا موحەممەد کوردی

نەخشەسازیی بەرگ: برەو نەججاڕ

چاپی سێیەم: ٢٠٢٤

پێوانە: ١٧ * ٢٤

تیراژ: ٤٠٠٠

نرخ: ٣٠٠٠٠

لە بەڕێووبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی (١٨٨)ی ساڵی (٢٠٢٠) پێدراوە



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەرکەسێ هات و وتی من عاشقم بڕوا مەکە
تا لەسەر گۆنای نیشانەی زەخمی مارانگاز نەبێ

تاهیر بەگی جاف

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

# پێشەكی

قوورسترین پێشەكی ئەوەیە بۆ پێشەكییەك بنووسرێت، قوورسترین كێشەش بۆ كێشەكان ئەوەیە كە پێویست بە ڕوونكردنەوە نەكات. بۆ ڕوونكردنەوەیەك كە خۆی ڕوونكراوەتەوە بنووسیت، لەڕاستیدا ئەم چامەیەم كە نووسی بۆ ئەوەی تێبگەن كە ئەم كتێبە كۆتایی پێ نەهاتووە و تەواوكردنەكەی لەبەشی دووەم دەبێت.

ڕاستە بەشێوەی نیمچە ڕۆمان نووسراوە، دەشێت ئەم زاراوەیەش لەم كتێبەوە دابێت، ئەویش نیمچە ڕۆمان.

بۆ نیمچە ڕۆمان؟

نیمچەكەی تریشی لە سێ بەرگی تردایە كە پێكەوە دەبنە ڕۆمانی هەموو ڕۆمانەكان، چوونكە ژیانی كەسێك باس دەكات كە ئەو زاتە هەرجۆرێك پێناسەی بكەیت ناتوانیت حەقی تەواوەتی بدەیتێ. نە ماكوان نە هیچ مرۆڤێكی تری سەرزەوی ناتوانن، بەڵكوو خوای باڵا دەست و پەروەردگار شان و شەوكەتی بەرزكردۆتەوە، تەنانەت دوژمنەكانیشی لە جوولەكە، نەسرانی، بێدین و عەلمانییەكانیش كە دێنەوە سەرباسكردنی ئەو كەسایەتییە گەورە و تاجی سەری ئێمە كە پێغەمبەرەكەمانە ﷺ ناتوانن لەسەرو هەموو گەورەكانیانەوە داینەنێن.

لێرەدا دەپرسین بۆ؟

زۆر بەسادەیی لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگارمان شان و شەوكەتی بەرز داناوە، ئیتر ئۆتۆماتیكی كەس ناتوانێت لەو مەكانەت و گەورەییەی كە خوای گەورە بۆی دایناوە بهێنیتە پلەیەكی نزمتر.

ئەمەش ئەو نهێنییەیە كە تەنها لەم كتێبەدا باس كراوە، واتا كتێبی مەملەكەتی نوور..

باسی ئەوە دەكات بۆ محمد؟ بۆ ئەو هەڵبژێردراوە بە پێغەمبەر ﷺ؟

ئەم كتێبە تەنها و تەنها ئەو پرسە ڕووندەكاتەوە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کەواتە خوێنەری بەڕێز.. هەوڵبدە بەو چاوە تەماشای ڕۆمانەکە بکە کە بۆت ڕووندەکاتەوە.

بۆ محمد پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ؟ بۆ لەناو عەرەبەوە هاتووە؟ بۆ بەزمانی عەرەبی قورئانی بۆ هاتووە؟

بۆ محمد صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ لە مەککەوە هاتووە؟ بۆ محمد صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ لە زێد و مەڵبەندی خۆی دەرکراوە ؟ بۆ محمد صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ شەڕی پێفرۆشراوە؟ بۆ محمد صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ هاوڕێیەتی کراوە و پێچەوانەکەی دژایەتیشی کراوە؟ بۆ محمد صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ بووە بە بەو کاریزمایەی کە ئێستا بوونی هەیە لە پەیامەکە و سوونەتەکەیدا؟ بۆ ئەبێت محمد هەڵبژێرێت لەناو هەموو خەڵکیدا ئەو ببێت بە پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ؟ ئەمانە و زۆر پرسی تر لە بەرگی یەکەمی ڕۆمانی نووردا نووسراوەتەوە، ئەتوانم بەڕوونی و بێترس و دوو دڵی بڵێم لە ناو کتێبخانەی کوردیدا تاکە کتێب و ڕۆمانێکە بەو شێوەیە زانیاری ورد بدات. دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زۆرترین سەرچاوەی تێدا بەکار هاتووە، لە بەرگەکانی تری ئەم کتێبەدا بەپشتیوانی خوای باڵادەست ئاماژە بە هەموو سەرچاوەکان دەکرێت.

دیسان جێگای خۆیەتی کە دەست خۆشی لە برای عەزیزم کاک هەوراز ئەحمەد کە دڵسۆزانە و ماندوونەناسانە هاوکارمان بوو، منیش بڕیارمدا کە بەشێکی زۆری پاداشتی ئەم کتێبە پێشکەش بکەم بە دایک و باوکی کۆچ کردووی و خوای گەورە بیانخاتە فیردەوسی بەرز و گەورە، پاشان شازە خاتوونی بەڕێز کە ئەویش هاوکار بووە، لە نزاو پاڕانەوەی خێرو چاکەکانتان ماکوان بێ بەش مەکەن.

٢٠٢٠/٦/١٤

ماکوان کەریم

فرێدریکستاد/نەرویج



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## پێشەکی باشترین مەملەکەت

جاهیلیەتی قورەیش و عەرەب بە گشتی تا جاهیلیەتی جیهانگیری پێویستیی بە کاندیدێکە بۆ گۆڕانکاری، کاندیدی ئەو بوارەش محەممەد و پەیام و مەنهەجەکەیەتی بە تەنها و تاکە کەس توانی ئەم جاهیلییەتە بگۆڕێت. ئەگەرچی محەممەد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە ناوماندا وەکوو کەسایەتی نەماوە، بەڵام مەنهەج و قورئانەکەی و سوونەتەکەی زیندووە و هەرگیز نامرێت ئەم پیاوە پڕ نوورە کەسایەتی هەموو پێغەمبەرانی تێدا کۆ بۆتەوە هەر ئەوەشە وای کردووە کە ببێتە ئیمامی پێغەمبەران هەموو پێغەمبەران کە دەهاتن بانگەوازەکەیان سنووردار بوو یان بۆ شارێک یان بۆ هۆزێک یاخود بۆ ناوچەیەک، یان زۆر جار بۆ خێزانێک بەڵام بانگەوازی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ هەموو جیهانە هەر ئەمەشە وای کردووە کە کۆتا پێغەمبەر بێت و ئەزموونی هەموو پێغەمبەران لەناو ژیانی دا کۆ بێتەوە بە بێ زیاد و کەم خوای پەروەردگار کاندیدی زۆری نارد بۆ سەر زەوی لە جنس و جۆری خودی مرۆڤەکان تا تێیان بگەیەنێت کە ئیتر ئێوە مرۆڤن پێویستە وەکوو ئاژەڵ ژیان نەکەن، ئاژەڵ ژیانی تەنها خۆراک و خەوتن و زیادبوونە لە ڕێگای جووت بوونیان، ئیتر هیچ ئامانجێکیان نییە. لاتان سەیر نەبێت کە ملیۆنەها مرۆڤ ئەمڕۆ لەسەر زەوی بەو شێوەیە دەژی و نازانێ ئەرک و فەرمانی چییە، ماف و داواکاری لە جنسی خۆی داوا دەکات یاخود کەمتر ئەمەش وا دەکات کە مرۆڤ خۆی زۆر پێ بچوکتر بێت لە ئاژەڵ و دار و بەرد و نیگایەک لە خۆی بە گەورەتر بزانێت یان هەر جنسی خۆی بپەرستێت، لاتان غەریب نەبێت ئەم وتەیە. تەماشایی مەسیحییەکان بکەن عیسای کوڕی مەریەم دەپەرستن، یەهوود عوزەیر یەکێکی تر ئاگر، ملیۆنەها ئایینی تر بەردو و بوزا و مشک و مانگا و...هتد دەپەرستن، ئیسلام هات لەناو کۆمەڵێک جاهیل بۆ ئەوەی لەو پەڕی جەهالەتەوە چاکیان بکات کە خراپترین جاهیلەکانی سەر زەوی بوون، بۆ ئەزموونەکە لەوێوە دەستی پێکرد؟ تا هەموو جیهان بزانێت پرۆژەکەی محەممەد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سەرکەوتوو بوو چونکە لە خراپترینەوە بردنی بۆ چاکترین و ئیمپراتۆر و شارستانی هەزار و چوارسەد ساڵەی بۆ دروست کردن و توانی بە هۆکاری دینەکەیان عەزیزیان بکات. ئەمە هەروا کارێکی سەرزارەکی نەبوو عەرەب خەڵکێی زۆر وشک و ڕەق و دەشتەکی بوون، بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نەبوو تەنها خوایەکیان دەپەرست لە ئاسمان و چەندین خوا لەسەر زەوی بۆ ئەوەی بەخششێکی باشیان هەبێت لە ژیان دا و لە بازرگانیدا و لە نەخۆشی و دەردی ژیان و زەرەو زیان بە دوور بن. ئیتر هیچ بڕوایان بە بەهەشت و دۆزەخ نەبوو وایان دەزانی دەبنەوە بە خۆڵ و کۆتاییان ونبوون و عەدەم بوونە، کاری پێغەمبەری ئیسلام محەممەد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر گران بوو بەڵام چونکە



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەموو کەسایەتی پێغەمبەرانی تیا کۆببوەوە توانی لە ماوەیەکی زۆر کورتدا گۆڕانکاری تەواو بکات هەموو کۆمەڵگاکە بگۆڕێت کە ٢٣ ساڵی خایاند پێوەر بە گۆڕانکارییەکەی و کارەکەی لە و جێگایەدا بە هەموو شێوەیەک لە توانای مرۆڤدا نییە، بەڵکوو بە ڕاستی موعجیزەیە و هەرچی مرۆڤ هەیە دەستەوسان و شۆک وەرگرە بەڕوونی بۆ ئەوانەی کە بڕوایان بە خوا و پێغەمبەر ﷺ نییە دەبینرێت کە دەستێکی زۆر بە هێز لە ئاسمانەوە لە پشت ئەم مرۆڤە پڕ نوورەیە، هەر بۆیە کرایە دوایەمین کاندیدی سەر زەوی و تا ڕۆژی قیامەت دەمێنێتەوە بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی چونکە ئەو کەسە و پەیامەکەی نوورن بە نوورا بۆی ڕەوانە کراوە و نووریش بۆی ناردووە.

## خودی کاندیدێتی محەممەد ﷺ

ئەگەر ئادەم عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ خەلیفە بوو لەسەر زەویدا بەڵام پێغەمبەر ﷺ خودی سیستەمی خیلافەتەکەی دا مەزراند و ڕێز و قیمەت و بەهای بۆ مرۆڤایەتی گەڕاندەوە.

ئیدریس پێغەمبەر عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ لە هەوڵی بەکارهێنانی قەڵەم دا بوو پەیامی پڕ نووری پێغەمبەر ﷺ سەرەتاکەی خوێندن و ئامێری نووسینەکەیە کە قەڵەمە، یەکەم جار لە ئەشکەوتی حیرا لە لایەن فریشتەی نوورەوە بۆی هات.

پێغەمبەر نوح عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ بە کەشتییەکەی ڕزگارکەری مرۆڤ و ئاژەڵان بوو لە سەر زەوی لە تۆفان و لافاوی بێبەزەی، بەڵام پێغەمبەر ﷺ مرۆڤایەتی و ئوممەتێکی بە کەشتی ئیسلام ڕزگار کرد لە نغرۆ بوون لە تاوان و خۆشی و حەزە شەهوانییەکان کە دەبێتە هۆی سەرگەردانی و نغرۆ تر بوون لە هەوا و نەفس و بت و تاغوت و بردنی بۆ کەناری ئارامی، ئەگەر کەشتییەکەی نووح عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ تەنها لەسەر کێوی جوودی ئاسەوارێکی ماوە بەڵام کەشتی پێغەمبەری خوا لە هەموو جێگایەکدا ئامادەیە ناهێڵێت مرۆڤ تووشی نغرۆ بوون ببێت ئەگەر خۆیان مەبەستیان نەبێت چیتر نغرۆ نابن لە تۆفان و ئاگری دۆزەخ پاشان گەڕانەوەی گەلان بۆ سەر زەوی لە ناویاندا گەلی عاد، عادیش واتا گەڕانەوە بۆ ژیان لە دوای هۆزی نووح هاتنەوە سەر شانۆی ژیان و ئەوانیش دەستیان کردەوە بە بت پەرستی و بە هۆکاری سەرکێشییان بەرامبەر بە پێغەمەرەکەیان کە ناوی هوود عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ بوو خوای گەورە هەموویانی لەناوبرد، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ نەی هێشت گەلەکەی بە هۆکاری بت پەرستی لە ناو بچێت بەڵکوو هۆز و گەل و مرۆڤایەتی ڕزگار کرد لە بت پەرستی سەر لە نوێ کەرامەت و بووژانەوەی بۆ مرۆڤەکان دەستەبەر کرد بە بەرنامەکەی، پاشان پێغەمبەر ساڵح عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ هۆزەکەی ناسراوە بە سەموود داوای موعجیزەیەکیان کرد لە پێغەمبەرەکەیان کە بە لەبەردێکی

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بێ گیان وشترێکیان بۆ بهێنێته دەر خوای پەروەردگار لەبەر خاتری پێغەمبەرەکەی بۆی ئەنجام دان، بەڵام مەرجی لە سەر دانان لە پارێزگاری ئەو موعجیزەیەی بۆی ناردن ئەوان سەرکەش بوون و وشتر و موعجیزەکەیان سەر بڕی و فەرمانی خوای پەروەردگاریان شکاند بەو هۆکارە لە ناوچوون و بوونە پەند و وانە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بۆ هۆز و گەلەکەی موعجیزەی تەوحیدی هێنا و هەموو لە دەوری کۆبوونەوە ئەگەرچی سەرەتا ئازاری پێغەمبەریان دا بەڵام دوایی پاداشتیان کرد بە یەکتا پەرستی و ڕێزیان گرتوو ئومەتێکیان بەو تەوحیدە عەزیز کرد. حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ خوای گەورە بە موعجیزە لە ئاگر ڕزگاری کرد، پێغەمبەر ﷺ بە موعجیزەی قورئان ئومەتێکی لە ئاگر ڕزگار کرد، ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ هەموو بتەکانی شکاند بۆ ئەوەی خەڵکەکە بخاتە گومانەوە و پێیان بڵێت ئێوە لەتاریکی و خورافیات و جەهالەت دا دەژین پێغەمبەری خوا ﷺ توانی بیری هەموو عەرەب بگۆڕێت و خۆیان بە دەستی خۆیان بتەکانیان شکاند. ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ بوونیادی کەعبەی کردەوە، پێغەمبەر ﷺ کەعبەی نۆژەن و پاکردەوە لە بت پەرستی. ئەگەر ئیسماعیل و دایکی قوربانی بووبێتن، ئیسماعیل لە پێناوی خوادا و هاجەرە خاتوون لە پێناوی هیجرەتی خواییدا، ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکی تر مێژووی هەردووکیانی کردە دروشم و عیبادەت بۆ ئومەتەکەی، زەمزەم و سەفا و مەڕوای کردە درووشم بۆ حەجی موسڵمانان.

یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ براکانی ئازاد کرد و لێیان خۆش بوو لە دوای ئەوەی فرۆشتیان وە پێشتر خستیانە ناو بیرەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لە هەموو خەڵکی مەککە خۆش بوو، لە خەڵکی تائیف خۆش بوو، لە عەشیرەتەکانی تر وەکوو هەوازن و غەتەفان لە کاتێک پێغەمبەریان دەرکرد و بەرد بارانیان کردوو و هاوڕێکانیان شەهید کرد و ماڵ و سامانیان داگیر کرا، بەڵام لە هەمووی خۆش بوو.

ئەگەر لە ناو پێغەمەرانی ئەسباتادا لە نێوان نەوەکانی یوسف و یەهوزا پێغەمبەرایەتی و پاشایەتی دابەشکرا پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمامی پێغەمبەران و خاوەنی دەسەڵات و دەوڵەت بوو، ئەگەر مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ خاوەنی شەق کردنی دەریای سوور بوو ئەوا پێغەمبەر ﷺ مانگی لە ئاسمانا بۆ شەق کرا.

ئەگەر حەزرەتی مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ دەستی نوور و درەوشاوەی نوور بوو بە موعجیزە، پێغەمبەری خوا ﷺ پەیام و خودی جەنابیان نوور بوون.

ئەگەر حەزرەتی عیسی کوڕی مەریەم عَلَيْهِ السَّلَامُ چارەسەری نەخۆشی گەڕی و گولی کەچەڵی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ چارەسەری ئومەتێکی کرد لە نەخۆشی شیرک و کوفر



و تاوان لە کۆتاییدا هەر خۆی نازی عیسای کوڕی مەریەم عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ دەکێشێت و دایکی بەڕێزیان لە بەهەشت دا مارە دەکات و عیسای کوڕی مەریەم عليه السلام لە پێش قیامەت دا لەگەڵ ئومەتی پێغمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەبێت.

ئەمەی باسم کرد و هەزارەها باسی تر لە کەسایەتی پێغەمەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەم کتێبەدا دەخوێنیتەوە، داوام لە هەموو چین و توێژەکان هەیە کەوا بەچاوی سەرنج و تێبینی و پاشان بە دڵ بیخوێنێتەوە نەک لەبەر ئەوەی ماکوان نووسیوێتی نا، بەڵکوو لەبەر ئەوەی ژیانی باشترین پیاوی سەر ڕووی زەوییە تا ڕۆژی قیامەت جا ئەگەر لاوی کەسایەتی خۆتی پێ دابمەزرێنە، ئەگەر سەرکردەی پرۆژەی لێ دەرهێنە، ئەگەر پێشمەرگە و ئاسایش و وڵات پارێزی ئەوا ڕەوشتی وڵات پارێزی و مەلەت پارێزیت دەکات، ئەگەر بازرگانی خۆتی پێ دەوڵەمەند بکە و سەرمایەی پێ کۆ بکەرەوە ئەگەر خوانەناس و بێ دینی فەرموو بە چاوی نەقدەوە تەماشای بکە و بزانە بە چ ئامانجێک لێی دەردەچیت، گرەنتی ئەوەشت ئەدەمێ کە خۆت دەدۆزیتەوە بە لایەنی کەمەوە.

ئەگەر دایکی کەسایەتی دایکایەتیت بۆ دروست دەکات، ئەرگەر باوکی لە هەر پلە و پایە و جێگا و پیشەیەک دای زیاتر و زیاتر زانیاری پێ دەبەخشێت ئەم دڵنیاییەم بۆ ئەم کتێبە تەنها و تەنها لەبەرئەوەی ژیانی پێغەمبەرە.

ماکوان کەریم

زیندانی ئیولەشمۆ/نەرویج

٢٠٢٣/٠٨/١١



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## سەرەتایەک بۆ ڕۆمانی مەملەکەتی نوور

ئەگەر دەمانەوێت ئەم جیهانە جەنجاڵ و پڕ لەئازارە بەجێبهێڵین و دڵمان ئاسوودە و ڕۆحمان شاد بێت و بڕۆین بۆ جیهانی پاکان و بەرز بوونەوە بۆ دوونیای نیگا و ئاکار و جوانی و ڕاستی و بۆ خوا ژیان و خەمی خەڵک و ژانی لەدایکبوونی ئازادی و ڕزگاری و کۆتایی هاتن بە کۆیلە بوون و چەوسانەوە و زیندە بەچاڵ، ئەوا دەبێت ڕابمێنین لەکتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەری خۆشەویست، لەڕاستیداهیچ چێژ و خۆشییەک ناگاتە هاوڕێیەتی و ورد بوونەوە و تێکەڵبوون بەو ساتانەی کە ئازیزمان بەسەری بردووە.

چ ئارامی بەخشێکە کاتێک دڵت ئامادە و بەئەدەبێکەوە لاپەڕەکانی ژیانی ئازیز هەڵدەدەیتەوە و لەسێبەری ئەو زاتە جوانە پڕ لە نورە خۆت بەهرەمەند دەکەیت و ئەزمونت زیاد دەکات و ئاسۆی بیرو بۆچوون و دید وەکوو گەردوون فراوانتر دەبێت.

چ زانکۆیەکە بۆ پەروەردە بوون و وەرگرتنی سوود و وانە بۆ کەسانێک دەیانەوێ ژیان لەگەڵ پاکان و هاوڕێی پاکان بن لەدوونیا و لەدوا ڕۆژیش بەسەری بڵندەوە پاداشتی لەگەڵبوونی ئەو کاروانە مەزنە وەرگرن، بێگومان لەهیچ قوتابخانە و ڕێگایەکی تر ئەو نوور و ئاسوودەیی و ژیان درەخشانی یە وجوودی نییە.

چ پێناسەیەکی جوانە! لە پیاوباشێکیان پرسی: وەسفی جوانی و خۆشی بەهەشتمان بۆ بکە؟ وتی: پێغەمبەری خوای صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ ی تێدایە![1]

هەوڵ ئەدەم پێشەکییەکەم چڕ بکەمەوە و بەشێک لەو سوود و قازانجانەی مسوڵمان دەستی دەکەوێ لە لێکۆڵینەوە لێوردبوونەوە لە خزمەتی ژیاننامەی سەروەرمان صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ باس بکەم.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[1] (فیە رسول اللە)





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یەکەم: ڕەهەندی ڕۆشنبیری و زانیاری بەدەستهێنان:

ژیاننامەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕاستییەک و درووست و تەواوە، ڕاسترین وێنایەکی مێژووییە بۆ یەکێک لە پێغەمبەران کە محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ە، بەڵگە نەوویستە ژیاننامەی هیچ یەکێک لەپێغەمبەران و پیاوباشان بە پارێزراوی نەماوەتەوە و کەسانێک هەن لە شوێنکەووتوانیان هەر لە بنەڕەتەوە بوونیشیان ڕەت دەکەنەوە، بەشێک لە مەسیحییەکانی ئەمەریکا ڕەتی دەکەنەوە کە عیسای مەسیح ڕاستییەک بووبێ و بە ئەفسانەیەکی داتاشراو و وەرگیراو لە لاپەڕەکانی گێڕانەوەی پاشماوەی بتپەرستەکانی ڕۆم و یۆنانییەکانی دادەنێن و تەنانەت

بەچەند مانگ لەیەکێک لە گۆڤارەکانی شیکاگۆ ئەم بابەتە بووە جێگەی دەمە دەمێ و گەنگەشە لەسەر ئەوەی ئایا مەسیح ڕاستییەکی مێژوویی هەیە؟

گۆڤاری (ڕینان) هەر بەناوی سەرنووسەرەکەیەوە ناونراوە بە (ڕینان)، ئەوپەڕی توانای خۆی خستە گەڕ تا بتوانێ ژیاننامەی تەواوی عیسا بخاتە بەردەست، بەڵام هەتا ئێستاش زۆر بەشی ژیانی بە نهێنی ماوەتەوە و پرسیارگەلێک لەزیهنیاندا بوونی هەیە، لەکاتێکدا عیسا -سەلامی خوای لێبێت- یەکێکە لەپێغەمبەران و ژیان و خۆشەوویستی لە ویژدانی ملیۆنەها خوێنەوار و ڕۆشنبیردا لەم دوونیایە بوونی هەیە، ئیتر ئەبێ بۆ ژیانی پیاوباشان و چاکەخوازانی تر وەک نموونەی زەردەشت و بووزا و کۆنفۆشیۆس چ ئاڵۆزی و تێکەڵ و پێکەڵییەک لە مێژوویاندا هەبێت.

لەڕاستیدا ئەمڕۆ گومانگەلێکی زۆر لەسەر کەسایەتی ئەو و کەسایەتیانی تر بوونیان هەیە و ناتوانین سەردەمی زەردەشت دیاری بکرێت کە تیایدا ژیاوە، تا ئەمڕۆش ناتوانرێ وێنەیەکی ڕوون و ڕاستی مێژوویی لەسەر ژیانی بووزا و ژیانی کۆنفۆشیۆس پێشکەش بکرێت، ئەوەی خەڵک لەسەر ژیانی ئەوانە باسی ئەکات و دەیزانێ تەنها وەهمێکە و هیچ ڕاستییەکی تێدانیە، بەڵکوو خەیاڵییەو سەلمێنراو نییە. لەڕووی زانستی و ئەکادیمییەوە ئیعتباری نییە.

بەڵام ژیاننامەو کەسایەتی پێغەمبەری خوا محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر بە وردی و جوانی هەموو لایەنەکانی بەئێمە گەیشتووە و ئەمەش بۆتە جێگای سەر سووڕمانی ڕۆژهەڵاتناسەکانیش، یەکێک لەوانە (ڕینان) زۆر بە ئاشکرا دەڵێ ژیاننامەی هێنەری ئیسلام زۆر

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

زانراوە لامان و تەنانەت ئەوانەش کە چاکسازی و گۆڕانکاری گەورەیان لەمێژووی موسڵمانان کردووە لامان ناسراوو دیارن.

چەند سەربەرزین ئێمە ئەمڕۆ دەزانین و ئاگاداری تەواوی ژیانی پێغەمبەرین ﷺ، شێوەی نانخواردنی و پۆشاک پۆشین و خەوی و لەماڵەوە ژیانی چۆن بووە، مامەڵەی لەگەڵ خەڵکی و لەناو مزگەوت و لە ئاشتی و شەڕو تەنانەت دەتوانین وێنای ڕاستی کەسایەتیشی بکەین و وەسفێکی دەقیقی کراوە لە کتێبەکانی سیرەو فەرموودەکاندا.

کاتێک ورد دەبینەوە لەو وێنەی بۆمان باس دەکرێ ڕوونتر دێتە بەر چاومان تا وێنەیەکی فۆتۆگرافی سەردەمی زانست، پێغەمبەری خوا ﷺ باڵای نە زۆر بەرز بووە و کورتیش نەبوو، مامناوەند بوو، ڕەنگی ڕوون و درەوشاوە بوو سوورێکی ئاڵ تێکەڵ بە سپی بوو کاتێک لەبەر خۆر و با بووایە دەم و چاو و گەردن و گوێ مووبارەکەکانی سوور خۆی دەنواند، قژی دەگەیشتە سەر شانی و هەندێ جار گوێی دادەپۆشی وقژی دەکرد بە دووبەشەوە و لەناوەڕاستەوە لایدەدا و دەهاتە سەر کوڵمی مووبارەکی.

ڕووخسارێکی گەش و جوان وەک مانگی چواردە، چاوەکانی گەورە و ڕەش و سپی‌یەکی نازدارو لەسپێنەی چاوەکانی نیشانەی سووری بچوک هەبوو کە نیشانەی پێغەمبەرایەتی بوو وەک حافیزی عێراقی دەڵێت: یەکێک لەنیشانەکانی پەیامبەرێتی‌یە و لەکاتێکدا لەگەڵ کاروانەکە گەشتی کرد بۆ شام ڕاهیبەکە پرسیاری کرد ئایا سوورییەک لە سپێنەی چاوی هەیە؟ وتیان: بەڵێ؛ وتی: کەواتە ئەوە پێغەمبەری خوایە! چاوەکانی لەکۆتاییەکەی درێژ بووبویەوە و وەک بەردەوام چاوی ڕشتبێت و لەهەمان کات نەیڕشتبوو برۆکانی وەک بەقەڵەم درووستت کردبێت درێژ بووبووەوە بۆ کۆتایی چاویو کەمێک تێکەڵ بەیەک بوبوونەوە و شێوەی کەوانەیی بوو، دەمی مووبارەکی زۆر جوان و ددانەکانی زۆر سپی و شاش بوو لێوەکانی جوانترین و ڕیشی پڕ و بەریئەدایەوە بەئەندازەی دەستی ئەیگرت و جوانترین گەردن و سنگی پان و شانی گەورەو پشتی فراوان بوو، لەنێوان شانی بەلای ڕاستدا مۆری پێغەمبەرایەتی پێوە بوو، دەست و مەچەکی گەورە و جەستەیەکی ڕێک و مامناوەند بوو وەک دەفەرمووێت : من زۆر لەئادەم دەچم، باوکی پێغەمبەران ئیبراهیم لە زۆر ڕووکار و ڕەوشتەوە لەمن دەچوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ کەسایەتییەکی مێژووییە، هیچ دەرفەتێک بۆ گومان بردن نییە لەڕاستیو درووستی بوونی، ئاگاداری ژیانی بووین هەر لەمناڵییەوە تا ئەو کاتەی خوای




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

گەورە هەڵبژارد و کردوویەتی بە پێغەمبەر ﷺ لای ئێمە ناسراو بوو، بەتایبەت ئەو زەمەنی کە پەیامی لەخواوە بۆ هات، ئێمە خوێندنەوەیەکی ڕۆشنبیری مێژوویی زۆر وردمان بۆ کرد، بەڕاستی ژیانی پێغەمبەر زەمەنی پەیامبەرییەکەی مێژوویەکی ڕاست و درووستە و وێنەیەکی ڕاستی ئەو گۆڕانکارییە موحەمەدییە بوو کە یەک ڕیزی و برایەتییەکی مێژوویی بۆ ئەم ئوممەتە درووست کرد و موسڵمانانی لە دەوری ئامانجێک کۆکردەوە کە ڕزگار کردن و دەرهێنانی مرۆڤایەتی بوو لەزەلکاوی ستەم و تاریکی ڕێگاوە بەرەو ڕووناکی و ئازادی و ڕاستی.

## دووەم: ڕەهەندی ڕەوشتی و بەهاکانی مرۆڤایەتی

پێغەمبەرمان ﷺ بە گشتی ژیانی دەرخەری کرۆک و ناوەرۆکی پەیامی خوا بووە و بەدڵ و ئەندامەکانی جەستە خواست و ماناکانی قورئانی بەرجەستە کردووە، قورئان پەیامە و پێغەمبەریش پەیامدارە و وابەستەن بەیەکترەوە و خوایش فەرمانی داوە بەشوێنکەوتنی قورئان و هەروەها شوێنکەوتنی پێغەمبەری داناوە بەنیشانەی خۆشەویستی خۆی و گوێڕایەڵی پێغەمبەری داناوە بە گوێڕایەڵی خۆی، پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جوڵە و گوتە و کردار و ڕەوشت و هەڵسووکەوتی گەیاندنی پەیامی خوا بووە و ناوەڕۆکی ئەحکام و حەڵاڵ و حەرام و بنەماکانی ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤ بووە .

هەر بۆیە ژیانی پێغەمبەر محمد ﷺ ژیانی ئەو پیاوە کامڵەیە کە مرۆڤایەتی کەسایەتییەکی تری ئاوای نییە بۆ ئەوە جێگای بگرێتەوە پێشەنگی چاکی و جوانی کە چاوی لێ بکرێ بۆ گەیشتن و بوونیادنانی دوونیایەکی جوان و کامڵ و نموونەیی و ژیانێکی باشتر.

ئەو کەسایەتییە وەهمییانەی دەیانەوێ بیانناسێنن و ئەو پێشەنگییەی پێ بدەن بۆ بوونیادنانی کۆمەڵگایەکی بەختەوەر و ئازاد و ئازا و داد، جگە لە ونکردنی ڕێگە ڕاستەکەو هەنگاونان بەرەو داڕووخانی ڕەووشتی هیچی تر نییە، بەڵام کۆی بەهای مرۆڤایەتی و پەیامداری و ئاکاری بەرز و داد و ئازادی و ئازایی و ئامانجدار و گەش و باڵا و نوور و ڕێنیشاندەری لە ئازیزماندا هەیە بۆ درووستکردن و پێگەیاندنی تاک و کۆمەڵ بەرەو بەختەوەری، کەواتە مافی خۆمانە لەژیانی پێغەمبەری خواوە ﷺ نموونەی پیادەکردنی ڕەووشتی بەرز بۆ ژیانمان وەربگرین.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿... لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ... ﴿٢١﴾﴾ [الأحزاب].

سووێند بەخوا بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو ڕێك پێك هەیەتا چاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون..

لە ژیانی رسول الله صلى الله عليه وعلى آله وسلم نموونەی بەرز لەهەموو بووارەکانی ژیان بۆ ئێمە هەیە، لە ئاشتی و جەنگ لە ژیانی خێزانی لەگەڵ خانەوادە و هاوڕێ، لە بەڕێوەربردن و پێشەوایەتی بڕیاردان و ڕامیاری، لە ڕەوانبێژی و ڕوونکردنەوە و هەموو ڕەهەندەکانی ژیان و سیستەمە کۆمەڵایەتییەکانیش...هتد

بەڕاستی مرۆڤایەتی کەسی شێوەی ئازیزمان محمدی صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەخۆیەوە نەبینیوە و نایبینێ، بۆ ئێمەی موسڵمانیش نموونەی بەرزی ژیانە، نموونەیەکی زیندووی بەرجەستەیە بۆ ئەوەی وەک ئەو بکەین لەهەموو هەنگاو و جوڵەیەک و ڕێنوێنی لێ وەرگرین.

ژیانی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم ڕاستییەکی مێژوویە و مێژووی ڕاست بەڕاستی دادەنێ و ناتوانێ نکووڵی لێ بکات، ژیانێکە کۆکەرەوەیەکی فراوانە بە هەموو بەش و لایەنەکانی ژیان و زنجیرە وحەلەقاتێکە هیچ لایەنێکی تیایدا بیرنەچووە و فەرامۆش نەکراوە، جوانی ئەم ژیاننامەیە لەوەدایە ئەوەی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم باسی دەکرد لە قورئان و فەرموودە بەژیانی خۆی ئەنجامی داوە، ئەم ئەداکردن و پێشەنگبوونە لەهەموو بوارەکان، هیچ کەسێکی تر لە پێغەمبەرانی خاوەن پەیام و پیاوباشانی ڕێی چاکسازی نەیانتوانیوە بە کردار فێری شوێنکەوتوانی بکات، پێغەمبەر مەسیح - سەلامی خوای لەسەر بێت - نەیتوانیوە وێنەیەکی کامڵ بۆ شوێنکەوتووانی بە کرداری پێشکەش بکا، بۆ نموونە لەبواری خێزان وێنەی نییە چوونکە هاوسەرگیری هەر نەکردووە، لەبواری حوکمڕانی و ئیداری دا ناتوانێ وێنەیەکی کامڵ و زانستی بە شوێنکەوتووانی ببەخشێ، چوونکە خۆی حوکمی بەسەردا کراوە و لەژێر ستەمی ڕۆمان بوو، زۆر ڕێگریان لێ ئەکرد، بەڵکوو هەر خۆی و دایکی سەلامی خوا لە هەردووکیان بێت دەربەدەریان کردن، یان لە ئینجیل دا هاتووە دایک و خوشک و برای هەبووە، بەڵام ژیاننامەیەک وجودی نییە کە باس لە مامەڵەی بکات لەگەڵ خانەوادە و نزیکەکانی تا ببێتە پێشەنگێک بۆ شوێنکەوتووانی!





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەروەها پێغەمبەر مووسا - سەلامی خوای لەسەر بێت - هیچ ژیاننامەیەکمان لەبەر دەست نییە جگە لە وێنەیەک لە شەڕو پێشەوایەتی کردنی جەنگ و ئازایەتی یەکەی نەبێت، ئەویش وەک لە تەورات باسی کراوە، لە بووارەکانی تر هیچ شتێکی ڕوونمان نییە لەباسی ماف و ئیش و کارە دوونیاییەکان و واجبات و ئەرک، یاخوود بەشێک لە ڕەهەندەکانی ژیانی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە، ئیتر چۆن دەبێتە پێشەنگێکی چاک بۆ شوێنکەوتووانی تا لە مامەڵەی ڕۆژانەیان چاوی لێ بکەن؟

هەروەها بووزا کە پانتاییەکی زۆری لەم زەمینەدا داگیر کردووە وێنەیەکی نییە، ئیر چۆن ئەتوانن پێشەنگێکی کرداری لەژیاننامەکەی بەدەست بێنن لەکاتێکدا مێژوو هیچی نەپاراستووە لەسەری مابێتەوە جگە لە کۆمەڵێک چیرۆک و بەشێکی کەمی ژیان.

لەڕاستیدا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەکردەیی و پراکتیک نموونە بوو بۆ پەیام و کۆی بەهاکان کە خەڵکی بۆ بانگ دەکرد و خۆی جێبەجێی دەکرد و شوێنکەوتوانیشی لەسەر پەروەردە دەکرد، هەرکاتێک لەخۆیەوە دەستی پێ نەکردایە موسڵمانان دوودڵ دەبوون لە جێبەجێکردنی وەک ئەوەی لە ڕێکەووتنی حودەیبیە ڕوویدا لە سەربڕینی قوربانی و دیاری و کورت کردنەوەی قژ و تاشینی و لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمانیشی دابوو، بەڵام نەیانکرد. ئوم سەلەمە دایکی ئیمانداران سەیری کرد پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆخۆی ئاژەڵەکەی سەرنەبڕیوە و سەریشی نەتاشیوە و لەخۆیەوە دەستی پێ نەکردووە وەک جارانی پێشوو کە لەخۆیەوە دەستی پێ ئەکرد، بیری خستەوە خۆت دەست پێ بکە ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، کاتێک پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ قوربانییەکەی سەربڕی و سەری تاشی موسڵمانان زۆر بەپەلە دەستیان پێ کرد و بەبێ دوودڵی کارەکەیان ئەنجامدا.

هەر بۆیەش دەبینی لەنێوان مەزهەبەکان، مەزهەبی ئیمام مالک سووننەی کرداری و پراکتیکی پێش دەخات و دایدەنێ لە بنەما بنەڕەتییەکانی مەزهەبەکەی و بە کارو کرداری ئەهلی مەدینە ناوی دەبات، واتە ئەوەی بە کردەوە و یەک لەدوای یەک هێناویانە لەباوانەوە تا گەیشتۆتەوە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پێشی دەخات بەسەر سووننەی گێڕانەوەدا کە لەڕێگەیەکەوە هاتووە ئەمەش یەکێکە لە ئیجتهادەکانی.

زانای گەورەی ئەم ئوممەتە ئەبووو یوسف یەکێک لە بۆچوونەکانی خۆی لەسەر بابەتی وەقف بەهۆی سووننەی کرداری رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕاست دەکاتەوە کە پێشتر ئەبووو



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یوسف لەسەر بۆچوونی مامۆستاکەی خۆی ئەبوو حەنیفە بوو لەسەر ئەوەی وەقف درووست نییە، بەڵام کاتێک ئەبوو یوسف چوو بۆ مەدینە و بەخزمەتی ئیمام مالیک گەیشت بۆی ڕوونکردەوە کە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بە کرداری و پراکتیک دانیناوە بە وەقف و درووست بوونیدا، هەواڵی پێدا کە ژمارەیەک لە میراتبەرانی هاوەڵان وەقفیان کردووە بۆ نەوەکانیان لەسەردەمی پێغەمبەردا و بەئاگاداری ئەو، پاشان پێشەوا مالیک هەندێکی لێ بانگ کردن و ئەوانیش بە ئامادە بوونی ئەبوو یوسف شایەتیاندا کە وەقفیان بە میرات بۆ ماوەتەوە لەباو باپیرانەوە، لەم کاتەدا ئەبوو یوسف لە بۆچوونەکەی خۆی پاشگەز بوویەوە و وتی ئەگەر هاوەڵەکەم واتە ئەبوو حەنیفەی مامۆستای زیندوو بووایە ئەوا لەقسەکەی پەشیمان دەبوویەوە.

## سێیەم: ڕەهەندی ئایینی و خواناسی

ژیان و سیرەتی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سەرچاوەیەکە لەسەرچاوەکانی شەریعەتی ئیسلامی، بەواتەی ژیانی پێغەمبەر ڕاڤەیەکی کردەیی و بەرجەستەییە، ڕەهەندێکی زۆرمان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە لە بنەماکانی شەریعەت و درووشمەکانی، بەرچاو ڕوونیمان پێ دەبەخشێت. کەواتە خوێندنەوە و ورد بوونەوەی ژیاننامەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەگەڵ ئەوەی دەبێتە هۆی گەشەی ئیمانیمان، بەرچاو ڕۆشنیشمان دەداتێ بۆ گەیشتن بە حەقیقەت و جەوهەری ئەم دینە پاک و ڕاستە و قوڵ بوونەوە لە پەیامی خوایی و وەرگرتنی ڕاڤەیەکی درووست، کە قورئان یەکێک لەواتەکانی پەیامێکی پەرستشیە و ئایەتەکانی دەخوێنینەوە لەنوێژەکانمان و فەرمانمان پێ کراوە بە خوێندنەوە و وردبوونەوە لێی.

ژیاننامەی پێغەمبەریش صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕێگەمان بۆ ئاسان دەکات بۆ جوان ورد بوونەوە و وەرگرتنی قورئان، وەکو چۆن ڕاڤەی یاساکانی فەرزەکان و شێوەی جێبەجێکردنەکەیمان بۆ دەکات، ژیاننامەی کرداری پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەدرێژی ڕێنمایی و یاساکانی زەکاتمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و چۆنیەتی نوێژکردن و ڕوونکردنەوەی عیبادەتەکانی حەجمان بۆ ڕووندەکاتەوە، هەر وەک چۆن لە دەستنوێژ گرتندا سێ جار سێ جار ئەندامەکانی لاشەی مووبارەکی ئەشۆرد و ئەیفەرموو ئەوە شێوەی دەستنوێژی من و پێغەمبەرانی پێش منیشە - سەلامی خوا لە هەموویان بێت- هەروەها دەفەرمووێت: نوێژ بکەن وەکو چۆن من ئەبینن




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نوێژ ئەکەم[٢] یان لەبارەی بەندایەتییەکانی حەجەوە دەفەرمووێت: لەمنەوە شێوەی ئەنجام دانی ئەرکان و فەرزەکانی حەج وەرگرن.[٣]

لەڕاستیدا قورئان زۆربەی یاساو ڕێساکان بەکورتی و خاڵە سەرەکییەکانی ڕوون دەکاتەوە و ئەوەی تری جێ هێشتووە بۆ وێناکردنی لەسیرە و ژیاننامەی پێغەمبەردا کە بەدرێژی بۆمان باس بکات و دابڕێژێت، ئینجا یان ڕاستەوخۆ پێغەمبەر ﷺ بە کردەیی کردوویەتی یان بە وتە فەرموویەتی یان کاتێک هاوەڵان کردوویانە لێی بێدەنگ بووە و دانی پیادا ناوە.

لە ژیاننامەی کرداری رسول الله ﷺ هەندێک ڕێساو حوکمی بەندایەتی لەقورئان هەر باسی نەکراوە وەکو درووستی تەیەمومم بۆ لەشگران لەکاتێکدا ئاویش هەیە ئەگەر ترسی نەخۆشکەووتن و بەهیلاک چوونی هەبوو.

هەر وەکو چۆن لەو فەرموودەی عەمری کوڕی عاس هاتووە دەڵێ لە غەزوەی (ذات السلاسل) بەشدار بووم و لەشەوێکی زۆر سارددا تووشی جەنابەت بووم ترسام ئەگەر خۆم بشۆم تووشی نەخۆشی و بەهیلاک چون بم بۆیە تەیەمومم کرد، نوێژی بەیانیشم بە هاوڕێکانم کرد، کاتێک گەڕاینەوە بۆ مەدینە ئەم باسە کرا لە خزمەتی پێغەمبەردا، فەرمووی ئەی عەمر نوێژت بۆ هاوەڵانت کرد و لەشگرانیش بووی؟ وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئایەتەم بیر کەوتەوە:

﴿... وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ [النساء].

خۆتان مەکوژن بەڕاستی خوا میهرەبانە، ئیتر منیش تەیەمومم کرد و نوێژم کرد، ئەفەرمووێت پێغەمبەر پێکەنی و هیچی نەوت ئەمە نیشانەی ڕازی بوون و دان پیانانە.

کەواتە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ ڕوونکردنەوە و ڕاڤەی یاساو ڕێساکانی قورئانە:

---

[٢] (صَلُّوْا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصْلِي)

[٣] (خُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ)



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ ۗ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ [النحل].

ئێمە ئەوانمان ڕەوانە کردووە هاوڕێ لەگەڵ بەڵگەو نیشانەو (مووعجیزە)ی زۆرو کتێبی ئاسمانیداو ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاند، تا بۆ خەڵکی ئەوە ڕوون بکەیتەوە کە بۆیان هێنراوەتە خوارەوە، بۆ ئەوەی بیرێك بکەنەوەو تێفکرن.

بەڕاستی سوود گەلێکی زۆر گەورە هەیە بۆ موسڵمانان کە دەستیان دەکەوێت لە قوتابخانەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ، بێگومان ڕۆشنبیرییەکی مێژوویی باوەڕپێکراوە کە وێنەی بەهاو ڕەوشتە سلوکی و کردارییە وە هۆشیاری دینی زیاد دەکات و چاوڕۆشنییەکی گەورەمان پێ دەبەخشێ بۆ گەیشتن بە حەقیقەت و جەوهەری ئیسلام.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## کەشکۆڵێک پڕ لە مەینەتی

ساڵی ٢٠١١ چووم بۆ حەج لەکاتی ئەنجامدانی عومرەدا لە سەفاو مەروە بووین، بە هاوڕێکانم وت وەرن با نزا و پاڕانەوەیەکی بەکۆمەڵ بکەین کە خوای گەورە بینینی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەخەودا بکاتە نسیبمان.

هەمو دووعامان کردو داوامان لە خوای گەورە کرد کە بەدیداری پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ مان شاد بکات، لەدوای تەواوکردنی درووشمەکانی حەج بەڕێکەووتین بۆ شاری مەدینەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەو ماوەیەی کە لەوێ بووم کاتێک دەچووم بۆ نوێژی بەیانی، لەدوای نوێژ لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ نەدەگەڕامەوە بۆ هوتێلەکە، دەستم دەکرد بە قورئان خوێندن کە خەوم بهاتایە چاکەتەکەم دەکردە بالیفێک و دەمدا بەخۆمدا و سەرم دەخستە سەر تەختەی قورئان خوێندنەکان و ملپێچەکەی ملمم دەکردە سەرینێکی نەرم لەسەر تەختەکە.

مانگی یازدە بوو شاری مەدینە لەشەودا سارد بوو، من بەئاواتی دووعاکەمەوە لەوێ دەمامەوە، بەڵکوو خەو بە پێغەمبەری ئازیزەوە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ببینم. نزیکەی ١١ بەیانی بەم شێوەیە بەردەوام بووم هیچ خەوم نەبینی بە پێغەمبەرەوە زۆر دڵم لە خۆم داما تا کۆتا ڕۆژی مانەوەمان لەوێ کە بڕیار وابوو مەدینە بە جێبهێڵین و بگەڕێینەوە بۆ وڵاتی نەرویج لە بەرواری ٢٠١١/١١/٢٩ بوو. کۆتا بەیانیش ڕۆژی جومعە بوو زۆر پاڕامەوە و بەئاواتی بینینی پێغەمبەری نازادار صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە خەودا، هەروەک بەیانییەکانی دیکە لە مزگەوت مامەوە و خەوتمەوە، سەرم نا بە مەرقەدی پێغەمبەری ئازیزەوە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، خەوم لێکەوت لە خەومدا وتیان: ئەوا پێغەمبەر هات! چاوم دەگێڕا پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ببینم، لە گەڕان بەدوای پێغەمبەردا بووم لەپڕ پۆلیسێک هەڵیساندم وتی: هەڵسە مزگەوت پاک دەکەینەوە بۆ ئەوەی ئامادە بێت بۆ کاتی نوێژی جومعە.

زۆر خەفەتبار بووم کە خەبەری کردمەوە، بەڵام چارم نەما هەر ئەو ڕۆژە مەدینەمان بەجێهیشت و گەڕاینەوە بۆ ئۆسلۆ، خەونەکەم نەبینی و دووعاکەم گیرا نەبوو!



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەمانگی دوانزەی ساڵی ٢٠١٢دا بۆ گەشتوگوزار ڕۆشتم بۆ میسر، لە شاری لوکسور بە خزمەت پیاوێک گەیشتم لە ناو باخێکی مۆز دا کە بۆ بینین و سەیرکردنی تیمساح و ئەو باخە چووبووینە ئەو جێگایە، شوێنەکە بەناوبانگ بوو گەشتیار ڕووی تێدەکرد، منیش لەگەڵ ئەو پیاوە پیرەدا بوومە هاوڕێ، چیرۆکی چوون بۆ حەج و دووعا کردنم و خەونەکەم بە پێغەمبەرەوە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ باسکرد، لەبن دار مۆزێکدا هەردووکمان دانیشتبووین، خێزانم ئانا-ی کچمی بە باوەشەوە بوو لەگەڵ گرووپەکەدا تەماشای تیمساحیان دەکرد، ئەو ناووچەیە تیمساحی زۆرە، هەر ناوی ڕووباری نیل لە زمانی فیرعەونی کۆندا بەمانای تیمساح دێت.

ئەو مامە پیرەیە پیاوێکی ڕەشی زۆر ناشیرین بوو بە سیمای دەموچاو، بەڵام هەتا بڵێیت پیاوێکی لە دڵدا شیرین بوو ناوی شێخ فەرغەلی بوو.

شیخ فەرغەلی: من کتێبێکت ئەدەمێ تەمەنی زیاد لە هەزار ساڵە، هەر کاتێک بتەوێت بە کردنەوەی لاپەڕەکانی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دێت بۆلات!

ماکوان: وەڵڵا یاشێخ هەر ئەم بیدعەیە مابوو ئێوەی میسری فێری خەڵکی بکەن، ئەمەی باسی دەکەیت کتێبێکی جادوو و سیحرە، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ مردوە چۆن دێتەوە بۆلامان؟

شێخ فەرغەلی: جاخۆ زەرەر ناکەیت تاقی بکەرەوە، ئەگەر درۆم کرد لەعنەتی خوام لێبکە، ئەگەر ڕاست بوو باسی باشەو پیاوەتیم بکەو دووعای خێرم بۆ بکە.

ماکوان: جا باشە کە وایە چۆن ئەو کتێبە ئەدەیت بە من؟

شێخ فەرغەلی: بۆ تۆ باشە، من بەدرێژایی ژیانم تا ئەو کتێبەم هەبوو لەخزمەت پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَدا بووم ، تۆش باسی ئەو خۆشەوویستییەت کرد بۆ پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئیتر حەز دەکەم ئەو چاکەو خێرەش لەگەڵ تۆ بکەم، بەڵکوو لەڕێگای تۆوە بۆم ببێتە خێرێکی نەبڕاوە.

ماکوان: جا وەڵڵا ئەگەر ئەو قسەیەی تۆ ڕاست بێت، من پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بەچاوی خۆم ببینم وەعدو پەیمانت ئەدەمێ هەرچیت بووێت کە من خاوەنی بم ئەتدەمێ بۆ خۆت.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

شێخ فەرغەلی: من هیچم ناوێت و کتێبەکەشت بەدیاری ئەدەمێ، بەڵام پەیمانم بدەرێ نەفەوتێت و دوای خۆت بیدەیت بەکەسێک کە ئەویش قەدری خۆشەوویستی پێغەمبەرمان محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بگرێت و بەرز ڕاییگرێت، تەنها ئەو داواکارییەم هەیە.

ماکوان: بەسەرچاو کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ بوو من دابڕام، خێزانم بانگی کردم چوومە لای کە ئاوڕم داوە لەبن دارەکەدا نەمابوو زۆر گوێم پێنەدا و وتم ڕاست ناکات، چوونکە میسرییەکان کە خەڵکی بێگانە دەبینن مووجامەلەی زۆر دەکەن. لەگەڵ خێزانم و گرووپەکەماندا چووینە چێشتخانەیەک کە نزیک بوو لە باخەکە.

نانمان دەخوارد لەپڕ یەکێک دەستی کێشا بەسەر شانمدا وتی: ماکوان ئەوە کتێبەکەیە، بەڵام نایکەیتەوە تاوەکوو ۲۱ ڕۆژی کە، باشە؟

لێم وەرگرت، کتێبەکە پێچرابوو لە پەڕۆیەکی سوورەوە و لەوە دەچوو لە جەنتایەکی قایشدا بێت.

ڕووم تێکردوو خووڵکم کرد بۆ نان خواردن، بەڵام وتی کە کاری زۆرە دەڕوات، دووبارە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە نابێت تا ۲۱ ڕۆژی کە بیکەمەوە، چوونکە ئەگەر وانەکەم ئەوەی کە ئەوباسی کردووە ڕوونادات.

گەڕامەوە بۆ نەرویج ماوەی ئەو ۲۱ ڕۆژە کتێبەکەم نەکردەوە، دوای ئەوەش شەیتان لە بیری بردمەوە خستبوومە ناو تاکێک کۆمود، دوای چەند مانگێک بەدوای هەندێک وەرەقەی تایبەتی خۆمدا دەگەڕام تاکی ئەو کۆمودەم کردەوە جەنتاکەشم بینی کە بە پەڕۆیەکی سوورەوە پێچراوە، پەلەم بوو دەبوو بچوومایە ئەو وەرەقانەم ببردایە بۆ فەرمانگایەک، بەڵام دەستم دایە کتێبەکەی شێخ فەرغەلی و لەگەڵ خۆم بردمە ناو سەیارەکە بۆ ئەوەی لەبیرم نەچێتەوە. دوای ئەوەی لەو فەرمانگەیە تەواو بووم تەلەفونم بۆ کرا لەلایەن خێزانمەوە وتی بگەڕێوە ماڵەوە ئانا نەخۆشە پلەی گەرمی زۆر بەرزە بابیبەینە نەخۆشخانە.

بەپەلە گەڕامەوە ماڵەوە ئانا-مان برد بۆ نەخۆشخانە ماوەیەکی کورتمان پێچوو، لە تاو ئانا-ی کچم کە نەخۆش بوو دیسان تەماشای کتێبەکەم نەکرد لەناو سەیارەکەدا لە بیرم چووەوە خستبوومە ناو داشبۆردی سەیارەکەم.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

مانگی ڕەمەزان بەسەردا هات، بەهۆکاری مانگی ڕەمەزان و دەرس و دەورەوە دیسان کتێبەکەم لە بیرچووەوە.

کۆتا ڕۆژی ڕەمەزان بوو لە کار دەگەڕامەوە، پۆلیسی ترافیک داوای پێناسی شۆفێری و ناسنامەی سەیارەکەمی کرد لە ناو داشبۆردەکەدا دامنابوو، دەستم دایە داشبۆردەکە و کردمەوە پێناسەی سەیارەکەم دەرهێنا، دیسانەوە کتێبەکەی مام فەرغەلی-م بینی لەگەڵ سەنەوییەکەدا دەرمهێنا و کتێبەکەم خستە سەر کووشنی پێشەوە. ئەوەی پۆلیس داوای کردبوو لێم تەسلیمم کردن، دوای سەیرکردنی بەرێزەوە مۆڵەتیان دام کە بڕۆم. هەر خەریک بووم تەماشام دەکرد وانزیکەی هەشت مانگی بەسەردا چووە من هەر نەمکردۆتەوە!

کتێبەکەم داگرت ویستم بیبەمەماڵەوە لەناو سەیارەکەدا دەریبهێنم خێزانم وتی تا دانەنیشتوویت بڕۆ هەندێک شتمان پێویستە لەبازاڕ بیهێنە، بەیانی جەژنە.

دیسان گەڕامەوە بە کتێبەکەوە، کتێبەکەم لەسەر کووشنەکەی پێشەوە دانا بۆ ئەوەی لە بیرم نەچێت، چووم بۆ کڕینی شتوومەک، ئەوەندەم عەلاگە پێبو کە گەڕامەوە دیسان شەیتان لەبیری بردمەوە.

هەموو شتوومەکەکانم بردەوە بۆ خێزانم، لەدوای ئەوەی ماندوو بوونم دەرچوو خەیاڵم لای کتێبەکە بوو ویستم بچم بیهێنم لەپڕ تەلەفونم بۆ هات لە لایەن برای خێزانمەوە، وتی کاک ماکوان فریاکەوە باوکمان بە پەلە بردووە بۆ نەخۆشخانە، وتم خۆ شکور ماوە و سەلامەتە؟

بەگریانەوە وتی نەوەڵڵا، باوکم تەواو بووە خوا لێی خۆش بێت، بەڵام جارێ بە باران مەڵێ تا دێنە ئێرە.

منیش ڕەنگم سوور هەڵگەڕا و نەمدەزانی چی بکەم و ناچار تەلەفونم کرد بۆ خزم و کەسووکار لە نەرویج و خێرا کۆبوونەوە، کە چووین دیسانەوە کتێبەکەم خستەوە ناو داشبۆردی سەیارەکە، کاک حوسێن فارس پیاو مەعقولی ناوچەی پێنجوێن لە پێشەوە دانیشتبوو، خۆشم نەمتوانی سەیارە لێخوڕم دامە دەست کوڕەکەی ئەو.

لەبیرم چووەوە کە کتێبێک لەناو سەیارەکەمدایە دوای ئەوەی کە تەعزێ تەواو بوو ماوەیەکی دوور درێژی پێچوو بیرم لەوە کردەوە سەیارەکەم بفرۆشم سەیارەیەکی نوێ بکڕم.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بێئەوەی هیچ لە سەیارەکەم دەرکەم سەیارەکەم نارد بۆ پێشانگایەک هەر لە هەمان پێشانگا سەیارەیەکی ترم کڕی. دیسانەوە کە داشبۆردەکەم کردەوە کتێبەکەم هاتەوە یاد و دەرم هێنا خستمە ناو داشبۆردی سەیارە نوێیەکەم.

لەدڵی خۆمدا وتم دیارە ئەم کتێبە شتێکی سادە و ئاسان نییە با خێرا بیکەمەوە بزانم چی ڕوو ئەدات، چووم بۆ کەناری دەریایەک و دانیشتم و تەلەفونم کووژاندەوە و پێشتر بە خاوەن کارەکەمم وتبو کەنایەم بۆ کار، ئەمڕۆ خەریکی سەیارە کڕینم.

پەڕۆ سوورەکەم کردەوە بینیم کتێبێکی کۆن لەناو جەنتایەکی بچوکی قایشدایە و کتێبەکەم کردەوە و سەرەتاکەی نوسرابوو...



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## هاتنی مانگ بە ئەستێرەکانییەوە

لەکەناری دەریایەک دانیشـتم کتێبەکەم دەرهێنا و کردمەوە، سـەرەتای کتێبەکە نوسرابوو ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، ئەمە مەنهەجی ژیانی تۆ و هەر کەسێکە کە دەیخوێنێتەوە.

لاپەڕەی یەکەم بەم شێوەیە دەستی پێکرد، چاوم لەسەر کتێبەکە بەرزکردەوە تەماشایەکی دەوروبەری خۆم کرد ئەو جێگایە نەبوو کە منی تێدابووم هەموو گۆڕابوو! لە بیابانێکی وشک و گەرمدا بووم لە دوورەوە دەوارێکم بەدی دەکرد کۆمەڵێک بزن و مەشکەیەک و جێگایەکی ئاگردانی بە بەرد هەڵچنراوم بەدی کرد و لەسەر بەردێک دانیشتبووم، بە پەلە هەڵسامەوە سەر پێ، وامزانی فێڵی چاومە دوو جار چاوم هەڵگلۆفی و کردمەوە دامخستەوە تەماشای چواردەوورم کرد و لەبەر خۆمەوە وتم ئەمە خەو نییە، بەڵکوو ڕاستییە!

ئاخۆ ئەم جێگایە کوێ بێت؟ جلەکانی بەرم یەک پارچە عارەق بوو ئەوەندە گەرمام بوو خۆر بەسەرمەوە بوو گەرمایەکەی بێ وێنە بوو، بەپەلە ڕوومکردە ئەو دەوارنشینە و چووم داوای ئاوم لێکرد هاوارمکرد خەڵکینە کێ لەم دەوارە دا دەژی دەتوانم بێمە لاتان؟

لەپڕ ژنێک هاتە دەرەوە لە دەوارەکە و وتی: فەرموو چیت دەوێت؟

ماکوان: تینومە ئاوت لایە بیخۆمەوە؟

جلو بەرگەکەی زۆر سەیر بوو تا ئێستا شتی وام نەدیبوو!

ژنەکە: هەندێک پیاو وەک تۆ غەریب دیارن نایانناسم ئەوانیش لە پشتی ئەم دەوارەی ئێمەوە دانیشتوون داوای شیر و ئاو دەکەن، بەڵام بچۆ لای ئەوان بە تا مێردەکەم دێتەوە، بەڵکوو ئاو بهێنێت لەگەڵ خۆی و ماڵاتەکەمان بهێنێتەوە شیرو ئاوتان پێ بفرۆشێت.

کەچووم لە پشتەوە سێ پیاو دانیشتبوون پیاوێکیان کە بینیم زۆر جوان بوو پیاوێکی باڵا بەرز ڕووی لە من وەرگێڕرا، دووانەکی تریش یەکێکیان هات بە دەممەوە وتی چیت دەوێت؟ بەڵام ئەوانیش جلوبەرگیان زۆر سەرنج ڕاکێش بوو!



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: هیچ تەنها برسیم بوو لەگەڵ تینویەتی زۆری بۆ هێنام هاتمە لای ئەم دەوارە وتم بەڵکوو خواردن یان تۆزێک ئاوم دەست بکەوێت؟

پیاوە جوانە ڕووخۆشە بە ویقارەکە بە پێکەنینەوە فەرمووی: ئەبوو بەکر وازی لێبهێنە با بێتە لامان.

کەچوومە تەنیشتی بەدەنگێکی خۆش و پڕسۆزەوە ژنی دەوارەکەی بانگ کرد ئەی بەندەی خوا هیچ بزنێک لەو بزنانە شیریان نییە؟

ژنەکەش وتی ئەوانە هەموو بۆیە لەگەڵ ڕانەکەدا نەڕۆشتون لەڕو نەخۆشن و هیچ شیریان نییە.

پیاوە بەڕێزەکە ئاماژەی کرد، بۆ ئەو پیاوەی ناوی ئەبوو بەکر بوو لەگەڵ ژنەکەدا فەرمووی کامەیان لەڕوو لاوازە بیهێنە با خۆم بیدۆشم؟

کە بزنەکەیان هێنا دەستی برد بۆ گوانی بزنەکە پڕبوو لەشیرو جامێکیان هێنا پڕیکرد لە شیرو دایە دەست ئەبوو بەکر تێری خواردەوە، دوای ئەوە دایە هاوڕێکەی تریان فەرمووی تۆش بخۆرەوە عەبدوڵڵا ئەویش تێری خواردەوە، دوای ئەو دایە دەست ژنەکە تێری خواردەوە، پاشان دایە دەست من شیرەکەم خواردەوە، لەدوای هەموومان خۆشی تێر شیری خواردەوە، جاری شەشەم کە دۆشییەوە دایەوە دەست ژنەکە، وتی ئەوەش هەڵبگرە بۆ هاوسەرەکەت با ئەویش تێر بخواتەوە.

هەڵسان ڕۆشتن بە پێکەنینەوە، منیش لە تاو جوانی و سەرسووڕمانم بۆ ئەو پیاوە بەدیارییەوە حەپەسابووم نەمدەزانی کێیەو چییە؟ لەدوای ڕۆشتنی ئەوان کەمێک لەبن سێبەری دەوارەکەی پشتەوە دانیشتم نەمدەزانی چی بکەم، لەپڕ پیاوێک بە دەنگی بەرز هاواری کرد دایکی مەعبەد! دایکی مەعبد! لە کوێیت وەرە ئەو ئاوەم لێوەربگرە بیکە مەرکانەکە با مەڕەکان کۆکەمەوە بیانکەمە ناو پەرژینەکە.

ژنەکە بەدەمیەوە چوو من هەر لە پشت دەوارەکەوە بووم گوێم لێیان بوو، ژنەکەش بە پیاوەکەی وت بەخێر بێیتەوە باوکی مەعبەد.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەپڕ باوکی مەعبەد وتی: ئەو شیرەی لە ناو ئەو جامەدایە لەکوێت بوو؟

دایکی مەعبەد وەڵامی دایەوە: پیاوەکە دەمەوێت شتێکت بۆ بگێڕمەوە!

ئەمڕۆ شتێکی سەیر ڕوویدا، چەند پیاوێک هاتنە ئێرە یەکێک لەو پیاوانە هەتا بڵێیت ڕووخساری ڕووناک و پڕ نوور و بە ویقار بوو، خاوەن ڕەووشتێکی بەرزو لەسەر خۆ بوو، تا ئێستا مرۆڤی وا جوانم نەدیووە! هەر بەبینینی دەبوو ڕێزی لێبگریت. دەموچاوی ئەوەندە جوان بوو حەزم نەدەکرد چاوم لە ئاست دەموچاویدا دابخەم، بەڵام لەتاو ویقار و ڕێز و گەورەیی چاوم داخست و سەر زەلیل بووم لە ئاستیدا.

ئەو ژنە ڕاستی کرد منیش ئەو پیاوەم کە بینی نەمتوانی خۆم بگرم لە ئاستی ویقار و گەورەییدا، چاوەکانم داخست و لە خزمەتیدا وەستابووم.

گوێم لە دایکی مەعبەد بوو قسەی دەکرد بۆ هاوسەرەکەی دەیووت: باڵای بەرز بوو، ورگی زل نەبوو بەڵکوو لاشەیەکی ڕێک و پێکی هەبوو، سەری نە بچوک بوو نە کەلە زلیش بوو، بەڵکوو سەرو سیمای زۆر شیاو بوو ڕێکو گونجاو بوو لەگەڵ لاشەیدا تا بڵێت جوان و وەسیم بوو.

باوکی مەعبەد، تا ئێستا پیاوی وا جوانم نەدیبوو، چاوی ڕەش وەک ئەوەی کل کرابێت برژانگی ڕێک، درێژ و سپیاییەکی زۆر سپی بەچوار دەوری تیلەی چاوەکانیدا، بەدەنگێکی زۆر پیاوانەو پڕ سۆزی پیاوەتی قسەی دەکرد، کە قسە دەکات حەزت دەکرد گوێی بۆ بگریت، برۆکانی وەک کەوان لەسەر چاوی نەخشا بوون، پیاوێکی گەردن بەرزو کەڵەگەت، گەردنی لە سوراحی زیو دەچوو ڕیشی پڕو نەخشاو لەسەر دەمو چاوی.

ئینجا وەسفێکی گشتی کرد بۆ هاوسەرەکەی وتی: کە بێدەنگ دەبوو ویقارێکی سەیری هەبوو حەزت بەئارامی دەکرد لەلایدا، چاوەڕێت دەکرد قسە بکاتەوە! کە قسەی ئەکرد، ئەدووت هەموو ئاسمان گوێی لێدەگرێت، زۆر بە کەسایەتی بەرزەوە قسەکانی لەدەمی دەهاتە دەرەوە، ئەوەی لەبەردەمیدا بووایە بچوک دەبووەوە.

قسەکانی زۆر جوان بوون جۆرێک قسەی دەکرد کە خۆشی و جوانی پێوە دیار بوو نە درێژ دادڕ بوو نە واش بوو لێی تێنەگەیت، وشەکان لەدەمی کە دەهاتە دەرەوە وەک ئەوە وابوو




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

گەوهەر و جۆرێک لە مەرجان و بەردی گرانبەها لەدەمی دەهاتە دەرەوە. لە دوورەوە بتدیبایە جوانترین پیاو بوو، لە نزیکیشەوە جوانی بێ وێنە بوو، کەسێکی کەڵەگەت بوو نە بچوک نە درێژ، لەو خەڵکانەی لەگەڵیدابوون لە هەموویان جوانتر بوو هاورێکانی زۆر وابەستەی بوون ئاگایان لێی بوو وەک پاسەوان وابوون لەگەڵیدا. هەر قسەی بکردایە یەکسەر بێدەنگ دەبوون، ئەمری بکردایە جێبەجێیان دەکرد، زۆر زیاد لە پێویست ئیحترامیان دەگرت. واهەستت دەکرد پاسەوانێکی زۆر بە دەورییەوەیەتی، ڕووخۆش دیاربوو ماندووبوونی پێوە دیار نەبوو هەرگیز هەست ناکەیت لە ژیانیدا تورە بووبێت.

لەدڵی خۆمدا وتم ئێستا مێردەکەی ئەیداتە بەرشەق، چۆن لەبەردەم هاوسەرەکەیدا ئەو هەموو وەسفەی پیاوێکی نەناسیاوی کرد!

باوکی مەعبەد: دەنگی بەرزکردەوە، وتی: ئەی دایکی مەعبەد ئەوە ئەو پیاوەیە کە قووڕەیش بە شوێنیدا دەگەڕێن!؟

لەدڵی خۆمدا وتم ئەوە باسی چی دەکەن، ئەم شتانەی باسی دەکەن قووڕەیش ئەو پیاوە جوانخاس و بەڕێزە، یەکسەر قسەکەی فەرغەلیم بیرکەوتەوە ئەوە کتێبەکەیە منی هێناوە بۆلای سەردەم و کاتی پیغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، واتە ئەو پیاوەی بینیوومە پێغەمبەر بوو صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، ڕاستی کرد فەرغەلی خەریک بوو ڕاکەم بەشوێنیدا بەڵام لەدواوە یەکێک پشت ملی گرتم شمشێرێکی لەسەر ملم داناو هاواریکرد دایکی مەعبەد دزێکم گرت!

ماکوان: کورە بیکە بۆخاتری خوا، دزی چی من ماکوانم، بە خێزانت بڵێ ڕێبوارم دەمێکە لێرە دانیشتووم.

باوکی مەعبەد: تۆ کێیت، سەر بەکام عەشیرەتەی؟

ماکوان: قوربان من سەر بە عەشیرەت و شتی وا نیم، من لە وڵاتی نەرویجەوە و کتێبێکم دەخوێندەوە چاوم لەسەر کتێبەکە بەرز کردەوە هاتمە ئەم ناوچەیەی ئێوە، خۆشم نازانم بۆ کەوتوومەتە ئەم ناوەوە وازم لێبهێنە با بڕۆم بە شوێن ئەو پیاوەی کە پێشتر لێرەبوو، من ڕێبوارم و دزییش ناکەم ئەگەر پارەت ئەوێت بتدەمێ؟

باوکی مەعبەد: باشە پارەم دەوێت چەندت پێیە؟




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەستم کرد بە گیرفانمدا ۲۰۰ کرۆنی نەرویجیم پێبوو دامە دەستی، وایزانی گاڵتەی پێدەکەم!

وتی من درهەمم دەوێت ئەم وەرەقەیە چییە؟ ئەوە کەی پارەیە هەڵم ئەخلەتێنی؟

ماکوان: کاکە بیکە بەڕای خوا هەڵخلەتاندنی چی، وەڵڵا ئەوە پارەیە نزیکەی ٤٠ دۆلارە!

باوکی مەعبەد: دۆلار چییە؟ من دۆلارم بۆ چییە، درهەمم دەوێت پێتە یان نا؟

ماکوان: نەبەخوا پێم نییە، ئیتر پشتی ملی گرتم بردمیە خێمەکەی خۆیان، تەماشام کرد بتێکی تێدایە ڕووی کردمە بتەکە خەریک بوو بمکوژێت.

دایکی مەعبەد: بۆ وای لێدەکەیت چی کردووە؟ کوشتنی ئەو کوڕە هیچ بە تۆ دەگەیەنێت؟

کە وای وت باش بوو دەستی هەڵگرت، دوایی بۆم دەرکەوت ئەو ڕەشماڵە یاخوود ئەو دەوارەی لەوێدا هەڵدراوە لە نێوانی مەککەو مەدینەیە خەڵکی بۆ ئیستراحەت لەوێدا لایان ئەداو پارەیان ئەدا.

ئێوارە درەنگانێک ئازادی کردم، پێموتن تکایە پێم بڵێن ئەو پیاوە چۆن ڕۆشتوە با منیش شوێنی بکەوم بەڵکوو بیدۆزمەوە؟

وەڵامیان نەدامەوە، نزیک دەوارەکە بوومەوە بانگێکم لە ژن و پیاوەکە کرد هاتنە دەرەوە، ئاگام لێبوو پیاوەکە وتی: عاتیکە وازی لێبێنە با بڕوات جلووبەرگی سەیرەو لە شێت دەچێت، هەندێک وەرەقەی ڕەنگاوڕەنگی دەرهێناوە دەیوویست من بخلەتێنێت ئەی وت ئەوە پارەیە!

عاتیکە: باوکی مەعبەد گوناحە، ناونیشانی بەرێ با بڕوات.

باوکی مەعبەد: تەماشای ئاسمان بکە، ئەو حەوت ئەستێرەیە دەبینی بەرەو ڕووی بڕۆ و بەڕۆژدا ئیسراحەت بکەو بەشەودا بڕۆ ئەگەیتە شاری یەثریب، باشە؟

مەرکانەیەکی بچوکی دامێ پڕبوو لە ئاو، وتی: بیبە با لە تینواندا نەخنکێیت.

لە خۆشەوویستی پێغەمبەری خوا ﷺ شوێن حەوت ئەستێرەکەی ئاسمان کەوتم، بیرم کەوتەوە لە کوردستان پێیان دەوت حەوتەوانان، بەپەلە کەوتمە ڕێ بەشوێن





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پێغەمبەری خوادا ﷺ، زۆر بە خێرایی دەڕۆشتم جاری وا هەبوو ڕامدەکرد دەم وت بەڵکوو پێیان بگەمەوە.

زیاد لە تاقێک ڕێگام کرد بەرەبەیان دەرکەووت زۆر ماندوو بووم چوومە تەنیشت بەردێک ماندوویەتیم بحەسێتەوە و پشوویەک بدەم خەوم لێکەووت.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## دڕندەیی مرۆڤ و بازرگانە مرۆڤ فرۆشەکە

لە تەنیشت تاشە بەردێکەوە خەوم لێکەوتبوو، نوکێکی تیژ لەسەر گەردنم دانرا، خەریک بوو دەیچەقاند بە ملم دا، کە چاوم بەرزکردەوە سێ کەسی ناشیرین بەدەورمەوە بوون بەتایبەت ئەوەی کە شمشێرەکەی خستبووە سەر گەردنم کابرایەکی سەرو قژ درێژ بوو لە هەموویان ناشرینتر بوو وتی: هەڵسە چی دەکەیت لێرە خەڵکی کام وڵاتی؟ ماکوان: کوردم لە وڵاتی نەرویجەوە هاتووم.

تەماشایەکی جلوبەرگەکەیان کردم دەستیان کرد بە پێکەنین.

گوێم لێبوو یەکێکیان وتی: با بیبەین لە بازاڕ بیفرۆشین!

پانتۆڵیکی کابۆ و کراسێک و بلوسێکم لەبەردا بوو، ئەوانیش بە جلەکانم پێدەکەنین.

پرسییان: چۆنە دەتوانی بە عەرەبی قسە بکەیت؟

ماکوان: لە خۆشەوویستی ئیسلام خۆم فێری عەرەبی کردووە.

هەرکە وام وت دایانمە بەرشەق و نێزەی شمشێرەکانیان و لە دە لاوە جلەکانمیان دڕاند و خوێن بە پشت و دەست و گیانمدا دەهاتە خوارەوە. بەو گەرمایە بە پێ بردیانم، بە حەبلێک بەستوومیانەوە تا نیوەڕۆیەکی گەرم کە ڕۆژ بەسەرمەوە بوو، چیتر توانام نەماو لە هۆش خۆم چووم.

بە ئاگا هاتم لە ناو کۆمەڵێک خەڵکی ڕەشپێست و ئافرەتاندا بووم لەسەر سەکۆیەک دانرابووم. فرۆشتبوومیان بە کابرایەک لە بازاڕێکدا، پێیان وتبوو ئەم کەسە خەڵکی بیلادی ڕۆمە، کەسێکی ڕەش پێست ئاوێکی گەرمی پێبوو وتی: بیخۆرەوە با تۆزیک هێز و توانات تێبێتەوە، لێوەکانت قڵیشاون.

زۆر خەفەتم خوارد کە بۆ وام لێهاتووە؟ بیری ماڵ و منداڵم دەکرد، لە دڵی خۆمدا وتم کورە بۆ خاتری خوا ئەمە خەوە من دەیبینم. کەی ئەمە سەردەم و کاتی منە؟ هاوارم کرد لە خەڵکەکە،



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

خەڵکینە من ناوم ماکوان-ە خەڵکی شاری پێنجوێنم، جنسیەی وڵاتی نەرویجم هەیە! ئەو خەڵکە تەماشایان دەکردم وەک ئەوەی تەماشای شێت بکەن، ئەوکەسەی کە منیان پێفرۆشتبوو هات لەگەڵ دوو کەسی زلی تردا یەک دوانێکیان کێشا بەسەرمداو وتیان: قسە بکەیت سەرت دەبڕین!

هیچ چارم نەما تۆزێک خۆم بادا، لەدڵی خۆمدا وتم بابە خەوە با تووڕەیان بکەم تا ئازارم پێبگات و لەم خەوە ناخۆشە خەبەرم بێتەوە.

هاوارم کرد دیسانەوە ئەوکەسەی کە ئەیفرۆشتین هات دوانی لەگەڵدا بوو بەقامچی ئەوەندەی پێدا کێشام دیسانەوە لە هۆش خۆم چووم، کەمێکی پێچوو هۆشم هاتەوە هەستم کرد نوێژی نیوەڕۆ و عەسرم نەکردووە، بە یەک دوانێکم وت: ئەرێ دەمەوێت بڕۆم دەست نوێژ بگرم بچم بۆ تەوالێت، چی بکەم؟

هەر لێم تێنەگەیشت، هەڵسام چووم بۆلای ئەو کەسەی کە دەیفرۆشتین لە بازاڕەکەدا وتم: ئەمەوێت دەموچاوم بشۆم دەستنوێژ بگرم.

ئەویش وتی باشە، دەموچاوت بشۆ بەندەیەکی ئاقڵ بە، کەسێک ئەیەویت بتکڕێت، ئەتفرۆشم بەو، دەوڵەمەندێکی باشە.

لەدڵی خۆمدا وتم ئەوە خۆ ڕاستە من لەم سەردەمەدام خەو نییە، چار نییە دەبێت چاوەڕێ بم تا بزانم دەگەمە کوێ، بەڵام تەحەمولی ئەو قسەم نەکرد کە بڵێت ئەتفرۆشم بۆیە دەستم دایە خەنجەرەکەی دەرمهێنا خستمە سەر ملی.

ماکوان: یەک سەگباب بێتە پێشەوە ئەم مرۆڤ فرۆشە دەکوژم، ئەوەش دەکوژم دەست بهێنێتە پێشەوە.

لە مەڵاسدا بووم خۆم ڕزگار بکەم، بەڵام لە پێشەوە سەرقاڵیان کردم بەهۆسەو دەنگە دەنگ تا لەدواوە کێشایانەوە بەسەرمدا ویستیان بمکوژن بە شمشێر، کابرای مرۆڤ فرۆشم خستە بەر شمشێرەکەو کردمە قەڵغان بۆ خۆم هیچ فایدەی نەبوو، ئەوەندەم زانی خوای گەورە کردی فەرغەلیم بینی بەرەو ڕووم هات، خەنجەرەکەم لەسەر ملی مرۆڤ فرۆشەکە دانابوو.

فەرغەلی ڕووی کردە کابرا: ئەو بەندە هار و هاجە عەجولە بەچەند دەفرۆشی؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

مرۆڤ فرۆشەکە: بەچەند ئەتەوێت بۆ تۆ بەس لە دەستی ڕزگارم کە؟

فەرغەلی: سەد درهەم باشە؟

مرۆڤ فرۆشەکە: تۆزێک بەر لەئێستا بە هەزار درهەم کڕیومە.

کەوای وت خەنجەرەکەم لە ملی قایم کردو بردمە سەر خوێن.

هاواری کرد نامەوێت بۆ تۆ بیبە بە سەد درهەم.

فەرغەلی: ئەوە کڕیم، ماڵی منە ئەو کەسە!

ماکوان: شێخ فەرغەلی من چی بکەم، نەجاتم بە؟

فەرغەلی: لەگەڵ مندا دێیت، وەرە لای من واز لەو کابرایە بێنە.

ماکوان: باشە؛ لە ترساندا خۆم خستە پشتی فەرغەلی-ەوە

مرۆڤ فرۆشەکە: لێتدەکڕمەوە بە سێ کیسە درهەم، تەنها دەیکوژم لەبەرانبەر ئەوەی جوورئەتی کرد، لەم بازاڕەدا وای بە من.

فەرغەلی: کەمە زیادی بکە ئەتدەمێ بیکوژە، چوونکە ئەوە کوڕی یەکێکە لە پادشاکانی ڕۆم.

مرۆڤ فرۆشەکە: کردمە پێنج کیسە درهەم.

فەرغەلی: نایدەم، ئەگەر ویستت پێت دەفرۆشمەوە بە سەد کیسە درهەم!

کابرا ویستی پەلاماری هەردووکمان بدات بە خۆی و بەندەکانی تر کە لەگەڵیدا بوون، سەیر دەکەم فەرغەلی شمشێری دەرهێنا و یەک دوانێکی تریش شمشێریان دەرهێنا لەگەڵ فەرغەلی بوون.

فەرغەلی: خۆ هیچ نەکەین دەتوانین دە بەندەت بکوژین، دوایی خۆت زەرەر دەکەیت بەندەکان و پارەکانیشت دەڕوات.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کە وای پێوت کابرا ترسا وهەردوولا جیابووینەوە ڕۆشتین.

فەرغەلی سێ وشتری پێبوو لە ناو کۆپانی یەکێک لە وشترەکاندا دزداشەیەکی بۆ دەرهێنام وتی بیکە بەرت با لە بەشەر بچیت، بەم پانتۆڵەتەوە ئێستا جێگای پێکەنین و سەرسامی ئەو خەڵکەی.

ماکوان: کاکە بۆ واتکرد بە من؟ تۆ وتت پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەبینیت، بەڵام من بووم بە کۆیلە. خوای گەورە ڕزگاری کردم، ئەمە چ سەردەمێکە؟

فەرغەلی: من درۆم لەگەڵ نەکردی تۆ لە ڕێگای کتێبەکەوە بەخزمەت پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ گەیشتی وایە؟

ماکوان: لە ڕاستیدا وایە، بەڵام چی بکەم بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ سەردەمی خۆم؟

فەرغەلی: کتێبەکە بدۆزرەوە دایبخە با هەردووکمان بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی خۆمان!

ماکوان: جا نازانم لە لای تاشەبەردێک دا دامنابوو کە منیان هەڵساند نازانم چی لێهاتووە، حەتمەن بردویانە.

فەرغەلی: کەمادام وایە دەبێت بگەڕێین بەشوێن ئەو کتێبەدا، نازانی ئەو جێگایە ناوی چی بوو؟

ماکوان: لای دەوارەکانی باوکی مەعبەد بووم، ڕۆژێک ڕێم کرد بەرەو ڕووی حەوت ئەستێرەکان تا بەرەبەیان خەوم لێکەووت لەو جێگایە، ئاوا دەزانم ناونیشانت بدەمێ.

فەرغەلی: باشە نازانی باوک و دایکی مەعبەد ناویان چییە؟

ماکوان: نازانم

فەرغەلی: ئەیدۆزینەوە

کەمێک ڕۆشت هاتەوە بۆلام، من بەدوای ئاودا دەگەڕام دەستنوێژ بگرم نوێژ بکەم.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بە هاوڕێکانیم وت ئاوتان پێیە؟

مەرکانەیەک وەک مەشکە وابوو پڕبوو لەئاو ئاوەکە شیرین و کەمێک ساردبوو تێرووپڕم خواردەوە و دەستنوێژم گرت و دەستم کرد بە نوێژ، لەپڕ وشترەکانی هێنایە لامەوە وتی با کەس پێت نەزانێت نوێژ دەکەیت ئەگینا ئەتکوژن! شاردمیەوە لەبەینی وشترەکاندا.

ماکوان: بۆ دەمکوژن؟

فەرغەلی: ئەی نازانیت لەسەر ئەم دینە پێغەمبەریان ﷺ دەربەدەر کردووە، تۆش ئەتەوێت نوێژ بکەیت! ئێستا بزانن پارچە پارچەت دەکەن.

بە پەلە نوێژەکانم کرد و پرسیم: ئێستا ئێمە لە کوێین؟

فەرغەلی: لە بازاڕی شارێکی بچوکی دەرەوەی شاری مەککە، خۆ ئەگەر لە بازاڕی گەورەی مەککەدا ئاوا پەلاماری سەیدو گەورەکەت بدایە ئەوا یەکسەر ئەیانکووشتی، ئەوێ ناوی بازاڕی (ذولمجاز)ە ناوی باوک و دایکی مەعبەدیشم دۆزییەوە، ناویان حەبەش و عاتیکە-یە بابڕۆین لەم ناوە ون بین.

ماکوان: باشە بابڕۆین، دنیایەک قسە لەدڵمایە، دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆلای ماڵ و منداڵەکەم. بۆ سەردەم و شوێنی خۆم و ئیشوکارەکەم.

فەرغەلی: ئەی ناتەوێت جارێکی تر پێغەمبەر محمد ﷺ ببینیەوە؟ شوێن کەوتووی ئەو بیت؟

نەمدەزانی چی بکەم، هەردووکیانم خۆش دەویستن، نەمدەزانی لەو کاتەدا بڕیاری چی بدەم؟ بۆیە دەنگم بەرزکردەوە وتم من هەرشوێن کەوتووی رسول الله- م ﷺ، بەڵام نە سەردەم وە نە شوێنی من ئێرەیە!

فەرغەلی: خۆت داوات کردووە هەڵتبژاردوە، با بڕۆین جارێ کتێبەکە بدۆزینەوە، ئەوکات خوای گەورە کارمان بۆ ئاسان بکات.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەڕێگادا فەرغەلی باسی ئەوەی بۆ دەکردم کە پێشەکی کتێبەکەم خوێندۆتەوە، پاشان لاپەڕەی زۆرم هەڵداوەتەوە، ئەگەر وەک خۆی بمخوێندایەتەوە نەدەهاتمە ئەم سەردەمە.

ماکوان: واتە ئەگەر لەسەرەتاوە دەستم بەو کتێبە بکردایە، بەم شێوەیەم بەسەردا نەدەهات؟

فەرغەلی: بەڵێ؛ بەدڵنیاییەوە وات بەسەر نەدەهات و منیشت نەدەخستە نارەحەتییەوە.

ماکوان: ئەرێ بەڕاست فەرغەلی تۆ کێیت، تۆچیت، بۆ وا لەمن دەکەیت؟

فەرغەلی: بە پێکەنینەوە؛ باش بوو بیرت کەوتەوە، بەڵام جاری کاتی ئەوە نییە.

کە گەڕاینەوە بۆ هەمان جێگا بۆلای دەوارەکەی دایک و باوکی مەعبەد، چوومەوە سەر ئەو ڕێگایەو بەپەلە ڕامکردە لای تاشە بەردەکە و بەدەوریدا گەڕام، باش بوو سووپاس بۆ خوا کتێبەکەم دۆزییەوە و هەڵمگرتەوە.

فەرغەلی: بە پێکەنینەوە؛ لای پێغەمبەر ﷺ دەمێنیتەوە یان دەچیتەوە بۆ لای ماڵ و منداڵ؟

ماکوان: دەچم بۆ لای ماڵ و منداڵ دەگەڕێمەوە، پاشان خۆم ئامادە دەکەم تا دووبارە بگەڕێمەوە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ.

فەرغەلی قسەی نەکرد دەستی کرد بە پێکەنین، بەڵام پێکەنینێکی زۆر جوان وتی: کتێبەکە بکەرەوە لاپەڕە ٤٢ بخوێنەرەوە؟

ماکوان: باشە؛ لاپەڕە ٤٢م کردەوە نووسرابوو ڕێگا بە پێغەمبەر ﷺ گیراوە لە شاری یەسریب، ٧٠ چەتەو دز ڕێگەیان پێگرتووە لەلایەن هۆزی ئەسلەمەوە.

سەرم بەرز کردەوە کە بڵێم پەشیمانم دەچم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، چەتەکان ڕێگەیان پێگرتووە لەخزمەت پێغەمبەر ﷺ دا دەبم، کە تەماشام کرد لەتەنیشت دەریاکەم لە وڵاتی نەرویج-ەو نزیک ماڵی خۆمانم. تاڕادەیەک دڵم خۆش بوو هەڵسام بەپەلە چوومەوە بۆ ماڵەوە، بەخێزانم وت چەند دەبێت لەدەرەوەم؟

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

باران: هەمووی هەر چوار بۆ پێنج کاتژمێرە لەدەرەوەیت! خێر هیچ بووە؟

ماکوان: ڕادەبووێری؟ من زیاد لە هەفتەیەکە لەماڵەوە نیم.

باران: تۆ ڕادەبووێری، سەیارەکەت کڕی؟

ماکوان: وەرە تەماشایەکی پشتم بکە بزانە جێگای شمشێری پێوەیە یان نووکی خەنجەر؟

باران: بۆ شەڕت کردووە؟

ماکوان: تۆ تەماشایەکی بکە.

باران: نەوەڵڵا هیچی پێوە نییە، عەیبی نییە!

ماکوان: کەواتە ئەوەی من بینیم چی بوو؟

باران: چیت بینیووە، باشی شکور؟ بۆ وا شڵەژاوای؟

ماکوان: نازانم چیت بۆ باس کەم!

باران: چیت بینیووە باسی بکە؟ شەڕتکردووە لەگەڵ خاوەن پێشانگاکە؟
ماکوان: دوایی بۆت باس دەکەم.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## خۆ ئامادەکردن بۆ گەیشتن بە پێغەمبەری خوا ﷺ

لەدوای ئەوەی کە گەڕامەوە سەردەمی خۆم، لەگەڵ خێزانم گفتوگۆی ئەوەم دەکرد کە چەندە لەماڵ دوورم، داوام کرد بزانێت جێگای برین بە پشتمەوە نییە، دانیشتم ئیستراحەت بکەم بەڵام هەستم بە ئارامی نەدەکرد، لە دڵی خۆمدا دەمووت ئەگەر ئیمانت باشەو خواناسی چۆن پێغەمبەر ﷺ بەجێدەهێڵی؟ ئەگەر حەز بە سەرکەووتنی دینی خوا و شەریعەتی ئیسلام دەکەیت و حەز بە تەوحید دەکەیت چۆن ناچیتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ ئەو هەلە بۆ کێ هەڵدەکەوێت، کە بۆ تۆ هەڵکەوتووە؟

لەم قسانەدا بووم لەگەڵ خۆمدا سێ و دووی دڵی خۆم دەکرد بۆ گەڕانەوە، وام دەزانی بلیتی فڕۆکەم بڕیووە و جانتا و کەشکۆڵم پڕدەکەم و دەڕۆم، بۆ سەردەمێکی تر دیسانەوە خۆم ئامادە کردەوە کتێبەکە بخوێنمەوە بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ ئەو سەردەمەی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە ماڵی خۆماندا بە تەنها لە ژوورێکدا دانیشتم و کتێبەکەی مام فەرغەلی-م کردەوە بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە مەبەستمە.

لەدوای ئەوەی کە ماوەی نیو کاتژمێر بەردەوام بووم لە خوێندنەوە، بەڵام هیچ ڕووی نەدا! سەرم بەرز دەکردەوە لە ژوورەکەی ماڵی خۆماندا بووم.

بەدەم خۆمەوە بە بۆڵە بۆڵ لەژوورەکەدا وتم حەزقیل، حەنانە، سەسیل، ئەگەر ئێوە بوون ئاساییە پێم خۆش بووە بە مەرجێک بمبەنەوە بۆ ئەو سەردەمە، هیچ دەنگ نەبوو لەپڕ خێزانم خۆی کرد بە ژووردا.

باران: سەرمات نییە، هیتەرێکت بۆ داگیرسێنم؟ بۆ نایەیتە ژووری دانیشتن، منداڵەکان خەوتوون ئارام و بێدەنگە؟

ماکوان: باشە وا هاتم.

هەڵسام چوومە ژووری دانیشتن، خێزانم لێی پرسیم ئەم کتێبە چییە بەدەستتەوە؟ زۆر گرنگی پێئەدەیت باسی چی دەکات؟

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: وەکوو باس باسەکانی زۆر گرنگن، بەڵام وەک تێگەیشتن کاتی دەوێت و پێوویستی بە خوێندنە لای مامۆستایەک.

باران: خۆت بیخوێنیتەوە هیچی لێ تێناگەیت؟

ماکوان: بڕواناکەم قوورسە.

لەم قسانەدا بووین جارێکی تر سەرم بەسەر کتێبەکەدا شۆڕ کردەوە ئەم خوێندەوە، زوو زوو سەرم بەرز دەکردەوە سەیرێکی ئەملاولای خۆمم دەکرد.

باران: ئەوە سەرت دێشێت؟ ئەگەر ئەزانیت ماندووی بیخەرە کاتێکی تر.

ماکوان: ئەرەوەڵلا ماندووم، کتێبەکەم داناو خۆم درێژ کرد بۆ ئەوەی تۆزیک ماندوویەتیم بحەسێتەوە

چاوم چووە خەو لە خەومدا شێخ فەرغەلی بە پێکەنینەوە هاتە لام.

فەرغەلی: هەموو کارێک نییەتی دەوێت هەرکات نییەتی خۆتت ساف و پاک کردەوە ئەوەی ئەتەوێت بۆت ئەنجام ئەدرێت.

ماکوان: شێخ فەرغەلی گیان، هەمیشە نییەتم بەرانبەر بە ئیسلام ساف و بێگەردە.

فەرغەلی: ڕاستە، بەڵام زۆر جار نییەتەکانمان پێویستی بە پاککردنەوە هەیە، زۆر جار ئاڵتون تۆز و خۆڵ دەیگرێت یان هەر شتێکی جوان پێویستی بە پاکردنەوەیە نموونەی ئاوێنە تا پاک بێت جوانتر نیشانت ئەدات، هەموو نییەتێکیش پێوویستی بە سێ پایە هەیە.

هەستم کرد ئەو ماوەیەی کە کتێبەکەم دەخوێندەوە باسی نییەت و کردار و زانستی دەکرد، کەچی شێخ فەرغەلی هەمان قسەی دووبارە کردەوە.

سێ پایەی گرنگ هەیە بۆ گەیشتن بە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

یەکەم: نییەت بە ئیخلاص و پاکی.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دووەم: کردار و بانگەواز بۆ ئیسلام.

سێیەم: هەوڵدان بۆ زانست و فێربون لە ئایینی ئیسلام.

لە پڕ ڕاپەڕیم، چووم دەستنوێژم گرت دوو ڕکعات نوێژم کرد، داوام کرد لە خوای گەورە لە تاوان و گوناحەکانم خۆش بێت و نییەتم بۆ خۆی ساف و پاک بکاتەوە.

بە زەلیلی لەم موناجاتەدا بووم لە نێوانی خۆم و خوای پەروەردگاردا، تەلەفونەکەم لێیدا کە وەڵامم دایەوە، کەسێک وتی من مولحیدم چەند پرسیارێکم هەیە، ئەگەر ڕێگام پێبدەیت؟

ماکوان: بەڵێ ئاساییە، بە مەرجێک تانە و تەشەر نەدەیت و هەوڵبدەیت تێبگەیت. خۆ ئەگەر بۆ تانە و تەشەر و قسەی دەمبازییە نە من والێبکە بچوک ببمەوە و بێمە ئاستێکی نزم، نە واش بکە شکۆی خۆت بشکێنیت و زەلیل بیت.

مولحید: نا، کاک ماکوان بەڕێزت باش دەناسم ناهێڵم تووڕە بیت، بەڵام هەندیک پرسیارم هەیە ئەگەر وەڵامم بدەیتەوە مەمنون دەبم، ئەگەر زیادەڕۆیم کرد بموەستێنە. بێحورمەتی ناکەم، چوونکە هەمیشە ڕێزی تۆم لایە، دەزانم ماندوویت ڕێزی ماندووبوونت دەگرم.

ماکوان: باشە فەرموو، مادام وایە منیش لە خزمەتتدام. دەکرێت بزانم ناوت چییە تا بەو ناوە بانگت بکەم، نامەوێت بتناسم کێیت و چیت، دەمەوێت ئاستی خوێندەواریشت بزانم بۆ ئەوەی لە ئاستی جەنابتاندا وەڵامەکان بدەمەوە ئەگەر زانیم.

مولحید: ناوم سەربەستە خەڵکی شاری سلێمانیم یاریدەدەری پزیشکم (معاون طب)، هەمیشە ئاگام لە پەیج و لایڤ و قسەکانتە، بەتایبەت جەنابت و مامۆستا کرێکار و مامۆستا کوڕی پاک.

ماکوان: فەرموو!

سەربەست: چەند چیرۆک لە قورئاندا هەیە زۆر زیادەیە و هیچ پەند و ئامۆژگارییەکی تێدانییە، مادام وایە بۆچی خوای گەورە نووسیویەتی. من گوێم لە تۆ بووە دەڵێیت هیچ شتیک لە قورئان دا نییە کە حیکمەت و هۆکاری نەبێت، ئادەی هۆکاری ئەم چیرۆکانە چین؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: چەند دانەیەکم پێ بڵێ بۆ نموونە.

سەربەست: چیرۆکی فیل و ئەبرەهە، یاخوود چیرۆکی ئەو کۆمەڵەیە بەناوی ئوخدود، یان ئەبوو لەهەب و ژنەکەی یان سوورەتی کەوسەر.

ماکوان: قسەکانت ڕوون نییە، ئەو چیرۆکانە زۆربەی زۆری نەوەک بێسوود نین، بەڵکوو مووعجیزەشن. تۆ خۆت چۆن لێی تێگەیشتوویت ڕوونکردنەوەی خۆت بدە تا منیش لە گۆشە نیگای خۆمەوە دیدو تێڕوانینەکانمان بگۆڕینەوە.

سەربەست: تۆ ناڵێیت قورئان لەسەر چوار تەوەر کار دەکات؟

ماکوان: بەڵێ وایە.

سەربەست: ئەم سوورەتانە نە بیروباوەڕە سوودی لێوەربگرین، نە مێژوویەکی زۆر کۆنە بە ئێمە بناسێنرێت، نە ڕەوشتە تا فێری ئاکارمان بکات.

ماکوان: پێموانییە بەو گشتاندنە بێت کە بەڕێزت باسی دەکەیت، چوونکە بیروباوەڕی تێدا بەدی دەکرێت ئەوانەی کە باست کرد ئاکار و ڕەوشتی تێدا بەدی دەکرێت یاساو ڕێساشی تێدایەو مێژووی سەردەمی خۆی دەست نیشان کردووە، بۆ نموونە کەوسەر حەوزێکە لە بەهەشتە، ئەوە بیروباوەڕە کە ئێمەی مسوڵمان بڕوامان پێیەتی. ئەبرەهە و لاوەکەی ئەسحاب ئوخدود ئەوەش مێژوویەکی گرنگە دەست نیشان کراوە، بەڵکوو سەردەمی پێ جیاکراوەتەوە.

یاسای کەون و ژیان و ژیاری تێدا ڕوون بۆتەوە، یاسایەک مرێنراوە و یاسایەکی تر زیندووبۆتەوە، ئەویش پێمان دەڵێت یاسای مووعجیزە نەماوە کە تەیرونەبابیلە و دەبێت یاسای هێزو توانای خۆتان کۆبکەنەوە بەسەر دوژمناندا.

سەربەست: ڕوون نییە ئەگەر زیاتر ڕوونی بکەیتەوە باشترە.

ماکوان: کاک سەربەست ئەوانەی جەنابت ئەیان وروژێنیت باسی تەلەفون نییە من شیکاریت بۆ بکەم ئەوە چەندەها وانە و کاتژمێری دەوێت تا بۆت ڕوون بکەمەوە. من دڵنیام جەنابت باش تێگەیشیتی، بەڵام بۆ دڵنیابوونی جەنابت و خۆشم هەوڵ ئەدەم لایڤێک لەسەر ئەم باسە بکەمەوە دوایی جەنابت دەتوانیت ڕاوبۆچونی خۆت بڵێیت.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سەربەست: خۆشحاڵ دەبم، کە مادام وایە با کاتت نەگرم ماڵاوا.

ماکوان: سەرچاو ماڵی تۆش ئاوا.

کە سەربەست تەلەفونەکەی داخستەوە، منیش بەدوای هەندێک سەرچاوەی مێژوویيدا دەگەڕام لە کتێبخانەکەی خۆمدا، بیرم کەوتەوە لەو کتێبەی کە شێخ فەرغەلی دابوویمێ بەشێکی تێدابوو باسی عەرەب و هاتنیان بۆ مەککە و مەدینە و تائیف-ی دەکرد. چوومە سەر ئەو باسە، بەڵکوو شتێکی نوێی لێوە فێر ببم.

لە بەشی پەیدابوونی عەرەب ویستم بگەڕێم بەشوێن ئەوەدا کە بزانم عەرەب کێن و چین، بۆ سەردەمی خۆشیان ناوناوە جاهیلی، بەڕاستی ئەگەر جاهیلن چۆن لەناو جاهیلەوە خوای پەروەردگار پێغەمبەرێک دەنێرێت؟

کتێبەکەم کردەوە و چاوم خستە سەر ئەو بەشەی کە دەمویست لێکۆڵینەوەی تێدا بکەم، چاوم بەرزکردەوە لەسەری بینیم لە تەنیشت وشترەکەی مام فەرغەلی-ەوە پاڵکەتووم هەمان جلوبەرگم لەبەردایە کە ئەو پێیداوم کتێبەکەش لەژێر سەرمەوە دانراوە دوو هاوڕێشی لەگەڵدا بوو بەناوەکانی عابید و ڕازی.

فەرغەلی: دەمێکە نوستوویت بڕۆین؟

ماکوان: ئەرێ وەڵڵا سپاس بۆ خوا کە گەڕامەوە، با بڕۆین بۆ شاری مەدینە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

فەرغەلی: گەڕاویتەوە بۆ سەردەمێک کە هێشتا پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە دایک نەبووە.

ماکوان: شێتم مەکە مام فەرغەلی، لە حەزقیل و سەسیل نەجاتم بوو ئینجا نۆرەی تۆیە. بیکە لە ڕای خوا من لە کوێم و چیم؟ لەکام سەردەمەدام؟ پێم بڵێ بۆ ئەوەی یەکتر بدۆزینەوە بزانین بۆ چ ئامانجێک هەوڵەدەین؟

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرغەلی: خۆت دەست نیشانی کات و سەردەم و شوێن دەکەیت، لەدەسەڵاتی کەسماندا نییە. خۆت هاتوویتەوە بۆ ئەم شوێن و سەردەمە ئێمەش ڕاسپێراوین لەگەڵتا بین و هاوکاریت بکەین، حەزقیل و سەسیلیش ناناساین.

ماکوان: واز لە حەزقیل و سەسیل بهێنە، بەڵام ئێستا من بۆ لێرەم من هاتووم بۆ خزمەتی پیغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ؟

فەرغەلی: نا ئەوەندەی من بزانم تۆ بەدوای ئەوەدا دەگەڕێیت بزانیت عەرەب کێیە و چییە؟ بۆچی بەدوای شتی وا کەوتوویت؟

ماکوان: بڵێم چی من شوێن پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کەوتووم.

فەرغەلی: با بڕۆین، ئەگەر ئارام بگریت لەگەڵمدا بیت بەردەوام خاوەن نییەتی پاک و کردارو زانست بیت، پێم وابێت دەگەینە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

ماکوان: ئامادەم، با بڕۆین لە خزمەتتدام.

فەرغەلی: تەنها بەو مەرجەی باسی ڕابردووت مەکە و لەبیری بکە و بەدوای داهاتوەوە بە ڕابردووت چەندە گرنگ بێت بۆ ئەم سەردەمە هیچ ئەرزشی نییە. هەوڵ بدە تەماشا بکەو زانیارییەکان بگوازەرەوە، ئەوە کاری سەرەکی تۆیە، پێدەچێت خەڵکێکی زۆر سوود لەم ژیانە ببینێت، کەم کەس هەیە ئاوا بگەڕێتەوە سەردەمی ڕابردوو، مەگەر شەیتان و جنۆکەکان بێدین و خوانەناسەکان بەرنەوە وەک جادوو و سیحر، بەڵام تۆ نە جادووە نە هیچ تەنها گەیاندنی زانیاری و درێژ بوونەوەی تەمەنی خۆتە، دەبێت وردبیت لەم گەشتەدا.

ماکوان: ئامادەم.

فەرغەلی: لەگەڵ ڕازی و عابید-دا خۆت فێری شەڕە شمشێر و تیر هاویشتن بکە، تەنها بۆ پاراستنی خۆتە.

ماکوان: ئەوەشیان هەر ئامادەم!


WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## دەستپێکی گەشت بەرەو نوور

خەریکی ئەوە بووم خۆم فێری هونەری شمشێربازی دەکرد، هەستم دەکرد کارێکی ئاسان نییە و ترسناکە، یاریکردنە بە ڕۆح و کایەی مەرگە، بەڵام چار نییە دەبێت فێر بم ژیانێکی نوێیە و دەبێت خۆمی بۆ ئامادە بکەم.

فەرغەلی: هاتە لام نزیک بووەوە لێم، وەرە با بچین پیاسەیەک بکەین!

ماکوان: فەرموو لەخزمەتتدام.

فەرغەلی: خۆت لە هەموو کەس بە دوور بگرە، ئەم سەردەمەی کە تێیدا دەژین زۆر ترسناکە، هەوڵبدە لێم دوور مەکەوە. دۆزینەوەت قوورس دەبێت، بەڵام گریمان لە هەر جێگایەکدا ون بوویت لە شاری مەککەدا هەوڵ ئەدەین یەکتر بدۆزینەوە، ئەو کیسە پارانەت با پێبێت و خۆت لاواز نیشان مەدە، چوونکە خەڵکی ئێرە بزانن لاوازیت دەست بەجێ دەست بەسەردا دەگرن پارەو سەروەت و سامانت ئەبەن و ئەتکەنە کۆیلەی خۆیان. لەبەر ئەوە زۆر وریابە لە دارستان دا دەژین هیچ یاساو ڕێسایەک نییە، ژیانێکی ئاژەڵی دارستانە و بەهێز لاواز لە ناو دەبات.

ماکوان: بۆچی وا دەمترسێنیت و وام لێدەکەیت هەوڵبدەم بگەڕێمەوە بۆ کات و شوێن و سەردەمی خۆم؟

فەرغەلی: کەس بە زۆر نەیهێناویت! ئەوەی بۆت باس دەکەم ڕاستییە، نەک ترساندن. ئەوەشی تووشی ئەم بارو گوزەرانەی تۆ ببێت ترسنۆک نییە نابێت بترسێیت، چوونکە ئەم بووارە لە خەڵکی ترسنۆک ڕوونادات، هەوڵبدە زیاتر خۆت ئازا بکە و لەگەڵ ڕەوشەکدا بگونجێ.

ماکوان: باشە؛ هەوڵی تەواوەتی ئەدەم بە قسەت بکەم لە وتەکانت دەرنەچم.

فەرغەلی: هەوڵبدە پرسیار بکە بۆ ئەوەی بزانیت لە کام سەردەم و شوێن و کات دایت، تۆ بۆیە لێرەی بۆ ئەوەی شارەزا و ئاگادار بیت لەم ڕەوش و واقیعەی کە ئێمەت بۆ هێناوە؟





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: لەڕاستیدا پرسیارم زۆرە، نازانم چۆن دەست پێبکەم.

پرسیم من کێم و چیم، بۆچی منتان هێناوە بۆ ئێرە و ئایا ئەمە ڕاستە کە دەیبینم؟

فەرغەلی: ئەم وەڵامە لای من نییە منیش وەک تۆ بەدوایدا وێڵم، ئەو وەڵامە لای کەسێکە کە تۆی بۆ ئەم جێگایە ناردووە.

ماکوان: کێ منی ناردووە بۆ ئەم جێگایە؟

فەرغەلی: وەک وتم وەڵامی ئەو پرسیارە لای من نییە.

ماکوان: ئێ تۆ بەمن دەڵێیت چیت لە مێشکدایە پرسیار بکە، کەچی دەڵێی وەڵامەکە لای من نییە؟

فەرغەلی: من باسی ئەم ڕەوش و واقیعە دەکەم کە من و تۆ تێیدا دەژین.

ماکوان: باشە، ئێرە کوێیە؟ بەرەو کوێ دەچین و ئیشمان چییە؟

فەرغەلی: بیرتە کاتی خۆی لە شاری مەککە لە کاتی حەج دا نزات کرد کە بە خەو پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ببینیت؟

ماکوان: بەڵێ بیرمە، بەڵام ویستم بە خەو ببینم ئەمە خەون نییە.

فەرغەلی: ڕاستە خەو نییە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئاواتەکەت دێتە دی لە ڕێگای کتێبێکەوە کە خەڵکی بە ملیۆنەها پارە دەیکڕن کەچی تۆ بەبێ بەرامبەر دەستت کەوتووە! ئەوەی کە من پێت دەڵێم بریتییە لەوەی کە لە ڕووی مەیدانییەوە پرسیار بکەیت لەم جێگا و شوێن و سەردەمەی کە بۆی هاتووین.

ماکوان: باشە ئێمە لە ئێستا کوێین و لەکام سەردەمەین؟ چۆن دەتوانم بگەڕێمەوە بۆ سەردەمی خۆم؟

فەرغەلی: لە جێگایەکین ناوی بەنداوی (مەئرەب)ە لە چەندین ساڵ پێش لەدایکبوونی پێغەمبەر محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ داین. بۆ گەڕانەوەت کەی ویستت دەتوانیت بگەڕێیتەوە،




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەڵام مەرجی گەڕانەوەت ئەوەیە کە دەست بەسەر نەبیت، لەکاتی جەنگدا نەبیت و لەترساندا ناتوانیت بگەڕێیتەوە. دەبێت کاتی گەڕانەوەت هیچ کێشەیەکت نەبێت، ئەو گەشتەی ویستووتە تەواو ببێت لەکاتێکی ئاساییدا بگەڕێیتەوە.

ماکوان: ئەو بەنداوی مەئرەبە لە کوێیە؟

فەرغەلی: یەمەن.

ماکوان: بۆ لێرەین؟

فەرغەلی: بۆ ئەوەی بزانیت عەرەب کێن؟ چۆن هاتوونەتە مەککە و مەدینە و ئەم ناوچانە، چوونکە ئێمە مامەڵە و هەڵسووکەوتمان لەگەڵیاندا دەبێت.

ماکوان: بۆ چەند ساڵ هاتووینەتەوە بۆ پێش لەدایکبوونی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ؟

فەرغەلی: بۆ ئەوەی بزانیت بۆچی محمد لەم کات و سەردەمەدا و لەم جێگایە کراوە بە پێغەمبەر و بۆچی لە جێگای تردا نەبووە. هۆکار چییە لەم جێگاو کات و سەردەمەدا هاتووە، بۆ لەسەردەمی تۆ و جیل(نەوە) و ڕەوەندی ئێوەدا نەهاتووە؟

ماکوان: واتە شوێن پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەکەووین، ڕەووشی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری عەرەب و ناوچەکە بەگشتی؟

فەرغەلی: بەڵێ بەدڵنیاییەوە.

ماکوان: لە گەڕانەوەی خۆم باش تێنەگەیشتم، ئەتوانیت زیاتر بۆم ڕوونبکەیتەوە شێخ فەرغەلی برام؟

فەرغەلی: ئەم سەردەمەی کە تۆی تێدایە هەندێک شت بە دەست تۆ نییە بۆ هاتن و گەڕانەوەت، بۆ هاتن سێ مەرج هەبوو: نییەت پاکی و کردەوەی جوان و گەڕان بە دوای زانست دا، بۆ گەڕاندنەوەت پێویستە لە کێشەدا نەبیت واتە لەناو کێشەیەکدا نەبیت لە ترساندا بڵێیت دەگەڕێمەوە بۆت چارەسەر ناکرێت، دەبێت چارەسەری کێشەکانت لەم سەردەمەی کە ئێستا



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

من و تۆی تێدا دەژین چارەسەر بکەیت ئینجا دەتوانی بگەڕێیتەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵت یان بۆ سەردەمی خۆت و مردنیش لەڕێگەدایە، ئەگەر بمریت لەم سەردەمە ئەوە مردوویت و لەوێش لەسەردەمی خۆتدا دەمریت و کۆتایی بە ژیانت دێت. تێگەیشتی؟ ڕوونە؟

ماکوان: ڕوونە، خوای گەورە پشتووپەنامان بێت، مادام بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەم، ئامادەم بۆ هەموو ڕووبەڕ و بوونەوەیەک.

فەرغەلی "بە پێکەنینەوە": گرنگ ئەوەیە سوور بیت لەسەر وتەی خۆت و پەشیمان نەبیتەوە؟

ماکوان: بەدڵنیاییەوە پەشیمان نابمەوە، خۆم هەرچیم هەیە دەیکەمە قوربانی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ.

فەرغەلی: قسەکەی خۆتت بیر نەچێتەوە، پاشان ئەزانی بۆ لە بەنداوی مەئرەبین؟

ماکوان: فەرمووت بۆ ئەوەی بزانین چۆن عەرەب دروووست بوون، هاتوونەتە مەکە؟

فەرغەلی: ڕاستە، ئێستا بەرەو مەککە دەڕۆین لەڕێگا پێدەچێت دوو سووپا ببینین کە جێگای تێرامانن سووپای فارس و سووپای ئەبرەهە!

ماکوان: بەڕاستتە؟

فەرغەلی: بەڵێ بەدڵنیاییەوە ڕووداوی زۆرتر دەبینین، بەڵام دەبێت زۆر ئاگاداری خۆمان بین. ئێستا ئەوەت بۆ باس دەکەم کە مەککە چۆن دروووست بووە، هەڵبەت دەزانی کە بە فەرمانی خوای پەروەردگار حەزرەتی ئیبراهیم نێردراوە لەگەڵ هاجەرە خاتوونی خێزانی و حەزرەتی ئیسماعیل بۆ ئەم ناوچەیە، بیری زەمزەم دروووست بووە لە ڕێگای پەرجۆو مووعجیزەیەکەوە، وایە؟

ماکوان: بەدڵنیاییەوە وایە هەموو ئەوە دەزانین؟

فەرغەلی: ئەوەش دەزانیت کە بۆچی ناونراوە مەککە؟




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: دەزانم مەککە بەمانای گریان دێت.

فەرغەلی: ڕاستە مەککە بە بەککە لە قورئان دا هاتووە.

﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ [آل عمران].

بەڕاستی یەکەم خانە و ماڵ و مەنزڵگایەک کە لەسەر زەوی (بۆ خوا پەرستی) بۆ خەڵکی دانرا ئەوەیە کە لە مەککەدایە کە هیدایەت و ڕێنموویی بەخشە بۆ هەموو خەڵکی جیهان.

چوونکە دەستپێکی ئەم ناوچەیە بە گریان بووە، لە بەجێهێشتنی حەزرەتی ئیبراهیم بۆ خێزانەکەی و ئیسماعیلی کوڕی و پاشان جێگای گریانی زۆرێکی تر بووە لە خەڵکی. قورئانیش وەک مێژوویەک کە عەرەب سەرسام دەکات و دەیانگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی درووستبوونی مەککە، پێیان دەڵێت کە شارەکەتان ناوی بنەڕەتی بەککە بووە نەک مەککە، ئەمەش مووعجیزەی قورئانە!

ماکوان: ڕاستە، بەڵام ئەم بەنداوە کەناوی مەئرەبە چ پەیوەندی هەیە بەسەر باس و ژیانی ئێستای ئێمەوە؟

فەرغەلی: ئەم بەنداوی مەئرەبە لەسەردەمی سەبەئیەکانەوە درووست بووە، لەسەردەمی هەڵقوڵانی ئاوی زەمزەم بە مووعجیزە، ئەم بەنداوە بە هۆکاری لافاو دەڕوخێت و هەموو عەرەبەکان ماڵ وحاڵیان لێ تێک دەچێت، ناوچەکەیان دەبێتە ئاو و دەریاچە و هەموو کۆچ دەکەن بەرەو باکووری یەمەن، لەوێ دەزانن لە ناوچەی مەککە ژنێکی لێیە و لەگەڵ منداڵێک دا لەو دۆڵەدا دەمێننەوە بۆیە داوای لێدەکەن دەوار و خێوەتی خۆیان هەڵبدەن و لەئاوی زەمزەمیش بخۆنەوە حەقی ئەوە پارەیەک یان خواردنێک بدەنە دایکی ئیسماعیل.

ماکوان: ئەی سەیر نییە کە پارە ئەدەنە ژنێک و منداڵێک و ئاوەکە داگیر ناکەن لەکاتێکدا ئەوان هۆزی زۆرن؟ تۆش دەڵێیت ئەمانە هیچ یاساو ڕێسایەکیان نییەو خەریکی کوشتنن؟

فەرغەلی: سەرەتا ویستیان ئەو کارە بکەن، بەڵام کە باسی ژیانی خۆی کرد و خۆی ناساند کە خێزانی پێغەمبەرە ترسان، خوای گەورەش ترسی خستە دڵیان و وتیان ئەمە تەنها ژن و منداڵێکن. لەناو عەرەبدا ڕووبەڕووبونەوەی ئافرەت و منداڵ زۆر نەنگی بووە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: کەواتە ڕەوشت لەناویاندا هەر هەبووە مانای وانییە کە عەرەب هیچ بەهایەکیان نەبووە.

فەرغەلی: نا، بەو واتەیە نییە کە ئیتر هەر هەمووشتێکیان لەدەست دابێت، چوونکە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت: (إِنَّمَا بَعَثْتُ لِأُتَمِّمَ مَكَارِمَ ٱلْأَخْلَاقِ).

خوای پەروەردگار ناردوومی کە ڕەوشتە جوانەکان تەواو بکەم، ئەمەش واتای ئەوەیە کە لەناو عەرەبدا ڕەووشتی جوان هەبووە، بۆ نموونە درۆیان نەکردووە، وەفایان هەبووە، ئازا بوون هەندێک لە ڕەوشت و ئاکاری خۆیان ماوە کە پێوەی پابەند بوون، بەڵام لە ڕووی ڕەوشتە گشتییەکانەوە زۆر وێران بوون.

ماکوان: چۆن؟

فەرغەلی: ڕەوشت لەجزیرەی عەرەبیدا وێران بووە.

با تۆزێکت بۆ شی بکەمەوە...

خواردنەوەی عارەق و مەشروب زۆر بڵاوبووە، هەتا شاعیرەکان شیعریان نووسیوە بەسەریاندا هەتا ئێستا خەڵکێک شیعر لەسەر مەی و مەشرووب دەڵێن، شانازی پێوە دەکەن وەکووو عەرەبی جاهیلی کۆن، هەروەها قومار لەنێوانیاندا زۆر بەربڵاوبووە وەکوو خوای گەورە دەگێڕێتەوە بۆمان لەسەر ژنەکانیان قوماریان کردووە و ڕق و ناحەزی کەوتۆتە نێوانیان و شەڕیان کردووە، خوای گەورە دەفەرموویت:

﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ۝﴾ [المائدة]

بەڕاستی شەیتان دەیەوێت لەڕێگەی عارەق و قومارەوە دوژمنایەتی و بووغز و کینە بخاتە نێوانتانەوە لە یادکردنی خواو ناوە پیرۆزەکانی وێڵتان بکات، هەروەها سست و تەمەڵتان بکات لە ئەنجامدانی نوێژەکان، ئایا ئیتر بەس نییە؟ ئایا ئیتر کۆڵ نادەن؟! (جا هەر کە ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە، جاڕدرا بە ناو شاری مەدینەدا: ئیتر عارەق حەرام کراو، ئیمانداران قەڕابە و گۆزە و دیزە و هەرچی عارەقی تیابوو ڕشتیانە کۆڵان).



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پاشان سوو خواردن "ڕیبا" لەنێوانیاندا دەبوایە بکرایە

﴿... إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْ ...﴾ [البقرة].

چوونکە ئەوانە دەڵێن: کڕین و فرۆشتن وەک سوو وایە.

زینا پێشهاتنی ئیسلام زۆر ئاسایی بووە، وەکوو دایکمان عائیشە دەگێڕێتەوە، ٤ جۆر نیکاح هەبووە، نیکاحێکیان ئێستا خۆمان بەکاری دێنین، ئەوانەی تر وەکووو ئافرەتێک کە لە حەیز تەواو دەبوو ژنی پیاوێکیش بووبێ پیاوەکە ژنەکەی دەنارد بۆلای پیاوێک کە گەورەی قووڕەیش بووایە یان پیاوێکی ناوداری عەرەب بووایە دەینارد خۆی نەئەچوو، بەلایا هەتاکو منداڵێکی لێ دەبوو، ئەمەش پێی دەوترا (نكاح أستبضاع)، نیکاحێکی تر (رهط) یاخوود کە دە پیاو (زینا) لەگەڵ ئافرەتێک بکەن، ئەگەر منالێکی بووایە، ئافرەتەکە ئەیووت ئەو منالە هی تۆیە و هیچ یارمەتییەکیش نەبوو مەنعی بکات لەوە دەبووە ژنی ئەوەی منداڵەکەی ئەدا بەسەریدا.

نیکاحێکی تر وەکوو زینابوو لە مێژوودا بە (رايات الحمر) دەناسرا بەئاڵا سوورەکان ئەناسرێ، هەرکەس ئەڕۆیشت، ئافرەتان لاشەی خۆیان ئەفرۆشت، ئەگەر ئافرەتەکە سکی پڕبوایە لە پیاوێک هەموو پیاوەکانیان کۆدەکردەوە یەکێکیان دەهێنا پێ ی دەوترا (ئەهلی قافە) ئەوکەسانە بوون کە منالیان دەناسییەوە، پاشان لەهەر کام لە پیاوەکان بچوایە منالەکە بەوەوە دەنووسا پێیان دەوت (فالتاط به) یان (التصق به) نووساوە پێوەی دەبووە منالی ئەو، نەیئەتوانی لێی جیاببێتەوە!

عەرەب خوویەکی گەندەڵیان هەبوو ئەویش زیندەبەچاڵکردنی ئافرەت، ئەمەش بەهۆی ترسان لەوەی کە هەژاربن وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ خَشۡيَةَ إِمۡلَٰقٖۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُهُمۡ وَإِيَّاكُمۡۚ إِنَّ قَتۡلَهُمۡ كَانَ خِطۡـٔٗا كَبِيرٗا﴾ [الإسراء].

نەکەن منالەکانتان لەترسی گرانی و برسێتی بکوژن (چوونکە پەروەردگارتان ڕۆزی بەخش و میهرەبانە)، ئێمە ڕزق و ڕۆزی دەبەخشین بەوانیش و بە ئێوەش، چوونکە بەڕاستی کوشتنی ئەوان گوناح و تاوانێکی زۆر گەورەیە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یاخوود لەوەی کوڕیان نەبووە نەیان ویستووە بەخێویان بکەن، شتێکی گرنگتر ئەیان.وت فریشتەکان کچن، لەبەرئەوە ئێمە ئەم کچانە دەکوژین بۆ ئەوەی خوای گەورە ڕازی بێت لێمان بگەڕێنەوە بۆلای ئەو! خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ ۝٨﴾

کاتێک کە کچی زیندە بەچاڵ پرسیاری لێ کرا.

﴿بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ ۝٩﴾ [التكوير].

بە چ گوناحێک، بە چ تۆمەتێک کوژرا؟!

﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ ۝٥٨﴾

خۆ ئەگەر مژدەی بوونی کچ بدرێت بە یەکێک (لەو نەفامانە) ڕووی گرژ و تاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت و سینەی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە.

﴿يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ۝٥٩﴾ [النحل]

لەداخ و خەفەتی ئەو مژدە ناخۆشە، خۆی دەدزێتەوە لە خەڵکی و بەتەنها (بیردەکاتەوە): ئایا بیهێڵێتەوە بە زەلیلی و سووکی و بێ نرخی، یاخوود (زیندە بەچاڵی بکا) و بیخاتە توێی خاکەوە، ئای کە چەندە بڕیارێکی ناڕێک و ستەمکارانەیە!

لەڕووی هۆزگەرای و شەڕی نەژاد پەرستی و گەل و هۆزپەرستی ئەوان بەگشتی هەمیشە خەریکی شەڕکردن بوون، لەناو عەرەب دا قسەیەکی بڵاو هەیە دەڵێت:

(وَأَحْيَانًا عَلَى بَكْرْ أَخِينَا . . . إِذَا مَا لَمْ نَجِدْ إِلَّا أَخَانَا)

واتە: ڕۆژێک ئەگەر کەسمان نەدۆزییەوە شەڕی لەگەڵ بکەین، لەگەڵ بەکری براماندا شەڕ دەکەین!




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

شەڕیان کردووە لەسەرئەوەی تەنها یەکێک کێشاویەتی بەسەر وشترێکا، شەڕێکی زۆر گەورە لەنێوان (بەنی بەکرو بەنی تەغلیب) ئەم دوو هۆزە شەڕیان کرد لەسەر ئەوەی کەسێکیان لەبەنی بەکر شمشێرێکی کێشابوو بە ملی حوشترێکا خوێن و شیرەکەی تێکەڵ ببوو لەسەر ئەوە بەدرێژایی مێژوو شەڕیان دەکرد تا سەردەمی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ. ئەمانەن خەڵکی ئەم سەردەمە کەتێیدا دەژین، ماکوان گیان.

لەم قسانەدا بووین ئەوەندەم زانی لە تەنیشتمەوە گیزەی تیر هات، تیرێک لەنێوانی هەردوو قاچمدا وەستایەوە و گوێم لە زرەی شمشێر بوو لە دوامانەوە هات و خێرا منیش دەستمدایە شمشێرەکەم و شێخ فەرغەلی-ش پشتی نا بە پشتمەوە و ڕازی و عابیدیش پشتیان نا بە پشتی یەکەوە بەدەوری خۆماندا دەسوڕاینەوە بزانین کێن و چیان دەوێت؟ چواردەورمان گیرا!



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## ڕزگا بوون لەچەتەکان، ڕۆشتن بۆ گەیشتن بەنوور

کۆمەڵێک چەتە دەووریان گرتین داوای پارەیان دەکرد، شێخ فەرغلی-ش بەهیچ شێوەیەک ڕازی نەبوو پارەیان بداتێ هاواری دەکرد چەتەکانت مەدە بە کوشت لەبەردەم خەڵکی هەژاردا، برۆ ڕێ بە کاروانی دەوڵەمەندان بگرە تەنها بەشی توێشووی خۆمان نامان پێیە، پێشتر ڕووتکراوینەتەوە لە لایەن چەتەکانی حەبەشەوە، ئێوە عەرەبن لەبری هاوکاریمان بکەن کەچی ئێوەش چەتەیی بەسەر براکانی خۆتانەوە دەکەن؟

کە وای وت ڕۆشتن دەووریان چۆڵ کردین، خێرا داوای کرد کە ئەم ناوچە بە جێ بهێڵین بەرەو مەککە و تائیف بکەوینە ڕێ.

لەڕێگادا لە شێخ فەرغەلی-م پرسی ئایا عەرەب چۆن بەم ناوچانەدا بڵاوبونەتەوە ؟

فەرغەلی: لەدوای ئەوەی کە بەنداوی مەئرەب ڕووخا و عەرەب بە گشتی لە ناوچەکانی یەمەن بەربڵاو بوون، زۆرێکیان ڕۆشتن بەرەو شام کە هۆزی غەساسینەکان بوون، کۆمەڵێکی تریان چوونە نزیک بەحرەین و کوێت-ی ئێستا و خوارووی بەسرە-ی عێراق بەناوی هۆزی مەنازیرە، لە تائیفش هۆزی سەقیف و لە مەککە-ش هۆزی جورهەم کە زۆر ڕێزیان لە خاتوو هاجەر گرت کە وتی هاوسەرەکەم پێغەمبەرە و کوڕەکەشم هەر پێغەمبەرە، چوونکە ئەو سەردەمە پێغەمبەرایەتی وەرەسە بووە. بۆیە کە ئیبراهیم گەڕایەوە بەئاسانی ئایینی تیدا بڵاوکردەوە، هەروەها ئیسماعیل-ی کوڕیشی هەر بانگەوازی دەکرد لەناو ئەو گەل و هۆزەدا.

ماکوان: وشەی عەرەب واتەی چییە؟ لە چییەوە هاتووە؟

فەرغەلی: قسەی زۆر هەیە لەسەر مانای وشەی عەرەب، بەڵام ئەوەی کە بەربڵاوە دەڵێن بەمانای وشک و برینگی و دوور لەئاو و سەوزایی دێت. عەرەبەکان خۆیان دەڵێن بەواتەی پاک و ڕوون و ئاشکرا دێت کە هیچی تێکەڵاو نەکرابێت، نموونە دەهێننەوە کە دەڵێن هەر کەرەستە و شتوومەکێکی بە قیمەت لەگەل هیچ تێکڵاو نەکرابێت دەڵێن ئەوە عەرەبە، هەندێکیش لە مێژوو نووسەکان دەڵێن عەرەب لە یەعرەبی کوڕی قەحتان دێت کە یەکێک بووە لە پاشاکانی یەمەن، هەندێک دەڵێن عەرەب و عیبری هەر یەک هۆزن لەبەر ئەوەی ناوی عەرەبیان لێنراوە.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لە زمانی ئاشووری کۆن لە زمانی عیبری دا واهاتووە کە لەبەر ئەوەی دەشتەکی بوون شوێنی نیشتە جێبوونیان نەبووە کۆچەری بوون.

ماکوان: ئەی قووڕەیش لە چییەوە هاتووە؟

فەرغەلی: هەندیک دەڵێن ناوی یەکێک لە باوانی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە یان ناوی سێ باوانی پێغەمبەر بووە کە بە قووڕەیشی گەورە و ناوەند و بچوک ناسراون، وەک (نەزری کوڕی کینانە بە قووڕەیشی گەورە ناسراوە فەهری کوڕی مالکی کوڕی نەزری کوڕی کینانە بە قووڕەیشی ناوەند ناسراوە قووڕەیشی بچوکیش دەڵێن: قوسەی کوڕی کیلابی کوڕی مەڕەی کوڕی کەعبی کوڕی لوئەی کوڕی غالبی کوڕی فەهری کوڕی مالکی کوڕی نەزری کوڕی کینانە)یە. یاخوود دەڵێن تەنها بە قوەی وتراوە قووڕەیش یاخوود بە فەهر وتراوە قووڕەیش ئیتر ناوەکە لەوە هاتووە.

ماکوان: ئەی ئەمانە سەر بە کێ بوون لەگەڵ کام دەوڵەتدا بوون؟ چۆن ئەم دەسەڵاتەیان بۆ درووست بووە ئاوا لە ناو خەڵکیدا عەزیز بوون ؟

فەرغەلی: لە ڕاستیدا لەدوای ئەوەی کە هۆزی جورهەم چوونە دۆڵی مەککە و لە ڕێگای هاجەرە خاتوونەوە لەوێدا نیشتەجێ بوون، حەزرەتی ئیبراهیم باوکی پێغەمبەران -سەلامی خوای لێبێت- کەعبەی بوونیاد نایەوە، خوای گەورە کەعبەی لە دڵی عەرەب دا بە گشتی خۆشەوویست کرد وەک مووعجیزەیەک، ئەوەی لەوناوچەدا بووایە ڕێزیان لێدەگرت و زۆرێکی تر لە گەل و هۆزەکانی عەرەب چوونە ناوچەی مەککە، لەوانە گەل و هۆزی بچوکی عەرەب لەو ناوچانە لە دەووروبەری مەککە مانەوە، بەڵام هۆزی جورهەم بەهۆکاری ئەوەی کە کچیان دابووە ئیسماعیل و لەگەڵ بنەماڵەی پێغەمبەر ئیبراهیم -سەلامی خوا لە هەردووکیان بێت- تێکەڵ بوون، ئەوان خزمەتی حاجی و میوانانی ماڵی خوایان دەکرد، هۆزی جورهەم بە درێژایی مێژوو خزمەتی مەککەیان کردووە تا ئەوکاتەی کەسێک بەناوی عەمری کوڕی لوحەی لە هۆزی خوزاعە بۆ دەسەڵاتی خۆی هەوڵئەدات شاری مەککە داگیر بکات و خۆی ببێتە خاوەنی ئەو ماڵە، شەڕێکی گەورە بەرپا دەکات لەگەڵ هۆزی جورهەم-دا.

لەکاتی جەنگدا هۆزی جورهەم کە بنەماڵەی پێغەمبەری خوان ﷺ و باپیرە گەورەی پێغەمبەر ﷺ بەناوی فەهر کە نازناوی بە قووڕەیش دەردەچێت لەشەڕی

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەنی خوزاعە دا ئەدۆڕێن و ئەوانیش لەداخی ئەوەی کە هیچ سوودێک نەگات بە هۆزی خوزاعە و عەمری کوڕی لوحەی، هەرچی بیرەکانی زەمزەم هەیە کە ئاوی تێدا کۆکراوەتەوە بۆ حاجییەکان هەمووی پڕدەکەنەوە و لەناوی دەبەن یاخوود دەیشارنەوە، خاکی مەککە بە بێ ئاوی زەمزەم دەمێنتەوە، لەدوای ئەوە خوزاعە سەکەووتن بەسەر هۆزی جورهەم-دا هەندێکیان مانەوە هەندێکیش لە هۆزەکە ڕایانکرد و عەمری کوڕی لوحەی بووە سەرۆکی شاری مەککە و خۆی بۆ حاجییەکان ئاوی پەیدا دەکرد و بیری تری هەڵکەند لە دەووروبەری مەککە دا لە سەقیفەوە ئاوی دەکڕی بۆ مەککە.

ماکوان: کەواتە عەمری کوڕی لوحەی بووە گەورەی مەککە؟ ئەی پێشتر کێ بوو و چی بوو واهاتە شاری مەککە ئەم سووپا بەهێزەی چۆن دەست کەوت؟

فەرغەلی: عەمری کوڕی لوحەی یەکێک بوو لە گەورە پیاوانی عەرەب جێگای دیار نەبووە، چوونکە سرووشتی ئەو هۆزە وابووە دەگەڕان، ئەویش کەسێکی دەوڵەمەندی خاوەن پارە بووە بازرگان بووە لەنێوانی شام و یەمەن دا، بۆیە خەڵکێکی زۆری لەگەڵدا بووە لەهۆز و نەوەکانی خۆی و کۆیلەشی زۆر هەبووە. دەشڵێن کەسێکی جادووباز بووە توانیوویەتی لەگەڵ جنۆکەدا هەڵسووکەوت بکات و کاهین بووە. لەدوای ئەوەی کە دەبێتە گەورەی شاری مەککە وەک هەموو دەسەڵاتدارێک خەڵکی گوێی بۆ گرتووە یاساکانی خۆی بەسەر حاجیەکاندا کە هاتوونەتە کەعبە سەپاندووە ، نان و ئاوی حاجیانی دابین کردووە و خەڵکی گوێی بۆ گرتووە.

ماکوان: ئەمە ئەو کەسە نەبووە کە بتپەرستی لە مەککەو ناوچەکانی عەرەبدا بەگشتی بڵاو کردۆتەوە ؟

فەرغەلی: بەڵێ؛ عەمری کوڕی لوحەی-ە، بۆ بازرگانی دەچێت بۆ شام لە ڕێگادا ڕێی دەکەوێتە ناو هۆزێکی ئەو ناوچەیە بەناوی عەمالقە تەماشایان دەکات بت دەپەرستن، نوێژو قوربانی بۆ بتەکانیان دەکەن، لەوانەوە وەری دەگرێت و بڵاوی دەکاتەوە بەناوچەکانی تردا.

ماکوان: واتە عەرەب تا ئەوکاتە بەگشتی یەکتاپەرست بوون؟

فەرغەلی: بەڵێ عەرەب تا ئەو سەردەمە نەیانزانیوە بتپەرستی چییە، یەکەم بت کە دێتە ناو مەککە بەناوی (هوبەل) لە شامەوە عەمری کوڕی لوحەی دەیهێنێت لە ناو گەل و هۆزی





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

عەمالقەوە. ئەمری پێکردن کە هوبەل بپەرستن بۆ ئەوەی لە خوایان نزیک بکاتەوە، واتە خوای پەروەردگاریان دەپەرست، ئەمەشیان کردە خوایەکی تر بۆ واستە و نزیکبوونەوە لە خوای ئاسمان! کە خەڵکی دەهاتن بۆ مەککە فێربوون بەرد و قوماشی شاری مەککەیان دەبرد و لە جێگاو شوێنی خۆیاندا بە دەووریدا وەک کەعبە دەسووڕانەوە، ئیتر خەڵکی بەندایەتیان بۆ بەرد و دار و قوماش دەکرد. ڕەوشەکە وای لێهات ئەو ناوچەیە بووە بت پەرست و هاوبەشدانەر بۆ خوا.

ماکوان: واتە لەوکاتەوە بت پەرستی و خوانەناسی دەستی پێکرد؟

فەرغەلی: قووڕەیش هەر خواناس بوون، خەڵکی مولحید و بێدین نەبوون، بەڵکوو هەموو خوایان دەپەرست بەڵام هاوبەشیان بۆ دادەنا.

ماکوان: ڕەوشەکە بەتەواوەتی تێکچوو ، شێخ فەرغەلی گیان کەمێکی تر بۆم شی بکەرەوە؟

فەرغەلی: لەو وڵاتە لەگەڵ ئەوەی بڕوایان بەخوای گەورە هەبوو ئەو پەیکەرانەشی کە هەیان بووە پەرستشیان کردوون هەروەکوو خۆیان دەیان وت:

﴿... مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ ...﴿٣﴾﴾ [الزمر].

ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە، لەکاتێکدا ئەوان لەخواوە نزیکترن...

بە تێبەڕ بوونی کات وای لێهاتبو ئەچوون داوایان لە پەیکەرەکان دەکرد لەخوای گەورە نزیکیان بکەنەوە. لەناو مەککەدا دوو پەیکەری تێدابووە وەکوو (هوبەل) گەورەی بتەکانی مەککە و (لات) گەورەی بتەکانی تائیف، لەناو پیرۆزترین شوێنی ئەم جیهانە ٣٦٠ بتی جیاوازی تیابووە، پاشان دوو پەیکەری تر بەناوی (ئیساف) و (ناهیلە)یان پێدەوترا. ئەو دوو بتە پیاوێک و ژنێک بوون لەیەمەنەوە هاتوون لە بیت الحرام دا زینایان کردووە، خوای گەورە ئەو دووانەی ڕەق کردووە و کردوونی بە بەرد، کە ئەمە کەس نازانێت سەرچاوەکەی ڕاستە یان درۆ کەچی دەیانپەرستن! ئەمانە لەنێوان سەفا و مەروەدا دانراون.

ماکوان: جا ئەگەر ئەو دووانە زینایان کردووە و خراپە کار بوون چۆن پەرستوویانن؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرغەلی: ئەی بۆچی پێیان دەووترێت سەردەمی جاهیلی! هەموو جاهیل بوون خاوەنی هیچ شارستانییەتێک نەبوون.

ماکوان: باشە چۆن ئەو خەڵکە بڕوایان بەم کابرا بازرگانە کاهینە، شەڕەنگێزە کرد؟ خێرا ئەم بتانەی بۆ هێنان بیانپەرستن.

فەرغەلی: زۆر شتی تری داهێنا لەوانە خۆی شەعائیرەکانی بۆ خەڵکی دادەنا، حەرامی حەڵاڵ دەکرد شتی پیرۆز دەکرد، بۆ نموونە وشتری پیرۆز کردبوو، بەرد و داری مەککەی پیرۆز کردبوو و دەینارد بۆ هۆزەکانی عەرەب، ئەوانیش بتیان لێدرووست دەکرد و دەیان پەرست. بە ئەقڵی خۆی شەریعەتی دادەنا بە ئارەزووی خۆی یاسا و دەستووری دادەنا، لەبەرئەوەی زۆر حەزی لە مەی بوو پیرۆزی کرد بوو، حەزی لە داوێنپیسی بوو ئەویشی حەڵاڵ کرد بۆ ئەوەی ئافرەتان ببینێت. ئەوەی قوماشی مەککەی لەبەر نەکردایە دەبوا خۆی ڕووت بکردایەتەوە، وای کردبوو کە زۆرێک لە حاجییەکان دەهاتنە ناو شاری مەککە پارەیان پێنەبوو جل بکڕن ناچار خۆیان ڕووت دەکردەوە.

ماکوان: بەخوا ئەم کابرایە پیس و ساختە چی بووە.

فەرغەلی: یاسای تری زۆر داهێنا، لەوانە هەر ئافرەتێکی لاجوان بووایە دەچوو لەگەڵیدا دەخەوت ئەیوت با کوڕێکی مووبارەک و گەورە و خاوەن نەسەبی هەبێت. دەچوو بۆ شام هەرچی ناوی بتەکانی ئەوێ بوو هێنایەوە دانەیەکی تری لێدرووست دەکرد وەک لاساییکردنەوە لەوانە بتەکانی نەسر، ود، سواع، یەغوث و یەعوق لە شام و فەڵەستین. ناوی ئەو بتانەی هێنا بۆ هەر هۆزێک لە دەوورووبەری مەککە بتێکی دانێ بۆ نموونە بتی قووڕەیش هوبەل بوو، بتی ود بۆ نەوەی کیلاب بوو، بتی سواع بۆ نەوەکانی هوزەیل لەشاری مەککە، بتی یەعووق بۆ خەڵکی هەمزان، بتی نەسر بۆ خەڵکی یەمەن، باسی ئیساف و ناهیلەشم بۆ کردی.

ماکوان: ئەمەش هەر وەکووو پەرلەمان و حکوومەتەکانی ئێستا وایە بەئارەزووی خۆیان یاساو ڕێسا دادەنێن و ئەوەی زینا دەکات یاسایان بۆ داناوە مادام هەردوولا ڕازییە ئاساییە! ئەوەی ڕیبا دەخوات مادام لە ڕێگای بانقەکانەوەیە ئاساییە و ئەوەی دزی دەکات دەستی نابڕدرێت و یان پاداش دەکرێت یان وەک بەرزەکی بانان بۆی دەردەچێت!، یاخوود ساڵێک زیندانی دەکەن و دواي دێتە دەرەوە. ئەوەی ماڵ و سەروەت و سامانی خەڵکی دەخوات بە





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سیاسی و حەکیم و دانای دەزانن و دەبێتە وەزیر و کاربەدەست لە وڵاتی موسڵمانان دا، ئێستاش وایە هیچ فەرقی نەکردووە.

شێخ فەرغەلی هەست دەکەم هەر سەردەمی جاهیلییە.

فەرغەلی: ڕاستە، لەبیرت نەچێت بەشێک لە هۆزەکانی عەرەب بەتایبەت لە گەل و هۆزی یەمەنییەکان و بەشێکیش لە جورهەم جێگایەکی تریان درووست کرد لەسەروو شاری مەککەوە بەناوی شاری یەسریب (یثریب)، ئەوکاتەی کە ڕۆمەکان هاتن شامیان داگیر کرد زۆرێک لە جوولەکەکانیان کوشت، بەشێک لە جوولەکەکانی شام هاتنە ناوچەکانی یەسریب و لەگەڵ عەرەبەکاندا تێکەڵ بوون بنەو بارگەی خۆیان لەناو عەرەب دا خست و زۆرێک لە خەڵکی ئەو ناوچەیە بوونە جوولەکە، بەڵام بەزۆری عەرەبەکانی مەککە و زۆرێک لە خەڵکی ئەو ناوچەیە بوونە بتپەرست، بەڵام زۆربەی عەرەب ئایینی یەهوودییان بۆ خۆیان هەڵگرت و تێکەڵ بوون لەگەڵ جوولەکەکاندا، ئەوکات جوولەکەکان لەناوچە عەرەبییەکاندا بە ژمارەی دانیشتوان و جوگرافیا و دیمۆگرافیان لە شاری یەسریب زۆر بوون، پاشان ناوچەیەکیان بۆ خۆیان درووست کرد بەناوی فەدەک و خەیبەر کە چەندین قەڵای بەهێز و چاکیان هەبوو، بێجگە لە بازاڕی زۆر گەورە و کاریگەر لەو ناوچەیەدا.

ماکوان: کەواتە جوولەکەکانیش ڕاوەدوو نراون هاتوونەتە ئەو جێگایەوە، لەڕاستیدا مەنزڵگایان نەبووە؟

فەرغەلی: بەڵێ وابووە، چوونکە ئەوانیش جێگای نیشتەجێیان نەبووە کۆچەر و دەشتەکی بوون.

ماکوان: ئەی هەموو چواردەوریان وابوون؟ مەبەستم فارس و ڕۆم و وڵاتەکانی ترە، زۆر باسی شارستانێتی ئەوانیان دەکرد لە مێژوودا ئەی ئەوان چی؟

فەرغەلی: پرسیارت زۆر کرد، بڕۆ خێزانت بانگت دەکات، بڕۆ بۆلای کەی کاتت هەبوو بێرەوە بۆ لامان.

ماکوان: باسی چی دەکەیت؟

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کە وام وت پاڵێکی پێوەنام وەک بکەومە ناو چاڵێکەوە. خێزانم کێشای بە پشتمدا وتی: ماکوان.. ماکوان ئەو دەنگە دەنگەت لە چییە؟ نانم حازر کردووە وەرە نانەکەت بخۆ با سارد نەبێتەوە.

کە سەرم هەڵبڕی کتێبەکە لەباوەشمدا بوو، بە توڕەییەوە وتم چییە؟

باران: نان حازرە وەرە نانەکەت بخۆ!

نەمدەزانی چی بکەم، دیسان حەپەسابووم چاوم بەدیار خۆمەوە زەق ببوو.

باران: ئەگەر دیسان باسی جنۆکە و ئەو شتانەیە وازی لێبێنە مەیخوێنەرەوە، چوونکە دیارە تەواو ماندووی کردوویت.

ماکوان: نا خەوتبووم لەخەومدا ژنم هێنابوو ئیتر خەبەرت کردمەوە و نەتهێشت بزانم چی دەبێت؟

باران: بەپێکەنینەوە، دەی کەوایە بڕۆ بخەوە تەڵاقی بدە، ئینجا وەرە نانەکەت بخۆ!





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## گەڕانەوە لە خۆشییەوە بۆ کارەسات

دوای ئەوەی کە فەرغەلی گەڕاندمیەوە بۆ ماڵی خۆمان، خێزانم پرسیاری لێکردم لە جۆری کتێبەکە منیش وتم خەوم لێکەوتووە هەندێک گاڵتە و گەپم کرد لەگەڵ خێزانم، دەموویست بگەڕێمەوە بۆلای شێخ فەرغەلی زۆر تامەزرۆی ئەو باس و خواستانە بووم، ئەوەی بۆ باس کردم بۆ من نوێ بوو لەو شوێن و کات و سەردەمەدا، ژیانێکی زۆر سەیر بووە!

دەستنوێژم گرت چوومە ژوورێک دوو ڕکعات نوێژم کرد، سووپاس و ستایشی پەروەردگارم کرد بۆ ئەو نیعمەتانەی بە منی بەخشیووە. لە خوای گەورە پاڕامەوە کە ئیخلاس و نییەت پاکیم پێبدات.

چوومە سەرکتێبەکە و لەوێوە کە لای من کۆتایی هاتبوو دەستم پێکردەوە.

کەچووەمە ناو باسەکە باسی ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی وڵاتانی چواردەووری مەککە بوو پێشهاتنی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

لە خوێندنەوەی فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوادا بووم صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کە دەفەرمووێت:

إِنَّ اللَّهَ نَظَرَ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ، فَمَقَتَهُمْ عَرَبَهُمْ وَعَجَمَهُمْ إِلا بَقَايَا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ.[٤]

خوای گەورە کەسەیری زەوی کرد بینی لەعەرەب وعەجەمەکان زۆر خراپەکاری دەکەن وچاکە لە کەم بوونەوەدایە.

ئەگەر ورد ببینەوە لە فەرموودەکە شتێکی زۆر سەرسووڕمانی تێدایە کەباس لە "مقت" دەکات لەوپەڕی ناڕەحەتی و ناهەمواری چۆنیەتی بێزاربوون لەسەر زەویدا نیشان دەدات.

---

[٤] صحيح الجامع، رقم ٢٦٣٧





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بێزاریی و ڕقێکی زۆر لەو سەردەمە بەربڵاو بووە، پاشان دەفەرمووێت؛ (بقايا) لەزمانی عەرەبیدا بۆ شتی کەم دێ؛ واتە خەڵکێکی کەم مابوونەوە کە باوەڕیان بە خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان هەبوو، زۆر کەم بوون ئەو مرۆڤانەی کەچاکەکار و پیاو چاک بێت.

کە تەماشای فەرموودەکەم کرد باس لەسەردەمانێک دەکات کە هێشتا پێغەمبەرایەتی دەستی پێ نەکردووە، ئەم سەردەمە کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی دەکات خوای گەورە سەیری زەوی کردووە خەڵکی سەر ئەم زەوییە هەموو خراپە کاربوون، هیچ کەسێکی باشی تێدا نەماوە تەنها خەڵکێکی کەم نەبێ، بۆنموونە لەو سەردەمەدا شارێک نەبووە خەڵکێکی باشی هەبێ، بەڵکوو لەجێگایەکدا پیاوێکی باش هەبووە لەخوراسان، پیاوێکی باش هەبووە لە میسر بەهەمان شێوە تورکیا بەم شێوەیە بەهەزارەها میل پیاو باشێک هەبووبێ. ئەمە بەگشتی پێش پێغەمبەری خوایە ﷺ باسی دەکات لە زاری مووبارەکی خۆیەوەیەتی کە دەفەرمووێت: خەڵکی زۆر لەناڕەحەتی و ناهەمواری ژیاون.

هەر چاوم بەرز دەکردەوە لە ژوورەکەی خۆماندا بووم، ئارەزووم دەکرد بگەڕێمەوە بۆلای فەرغەلی و هاوڕێکانم.

لە لاپەڕەیەکی تردا چوومە سەر باسێک، باسی شارستانێتی ڕۆمی لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕەهەندەکانی تری ژیانەوە دەکرد.

چەند ساڵێک بەر لە هاتنی پێغەمبەر ﷺ بوو ساڵی (٦٠٠-٦٠٣) زایینی بوو، ئاوا باسی کردبوو.

سەرەتا باسی دابەش بوونی هێزەکان بوو، هەروەک چۆن ئێستا دنیا دابەش بووە بە سەر چەند هێزێکی گەورەی وەک ئەمریکا، ڕووسیا، فەڕەنسا و ئینگلتەرا...هتد، ئەو سەردەمەش چەند دەسەڵاتێک هەبووە کە بەهێز بوون. ئەو دەسەڵاتە جیاوازانەی کە هەبوون لە جیهاندا یەکێکیان دەسەڵاتی ڕۆم بووە.

لەوانەیە خەڵکێک بڵێ باشە بۆ باسی ڕۆم بکەین چ ئیشێکمان بە ڕۆم هەیە، خوای گەورە سوورەتێکی بەناوی (روم) ناوناوە، خوای گەورە باسی لێوە کردووە و گرنگی پێداوە، سوورەتی ڕۆم باسی دەوڵەتی ڕۆما دەکات، ئەبێ ئێمە بزانین هۆکارەکەی چی بووە کە پێغەمبەری ئازیز





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ﷺ کاتێک لەوپەڕی ناڕەحەتی و دژواری دا بووە خوای گەورە سوورەتێک دادەبەزێنێت باسی ڕۆم دەکات؟ خەڵکێک پێشبینی دەکرد مادام ئەو سەردەمە مەککی بووە، ئەبوایە باسی تەکوینی بیروباوەڕ و ئیمانی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺی بکردایە، ئەبێ هۆیەکی خۆی هەبێ کەئەم دینە هیچ شتێکی بێ ئامانجی نییە و هەمووشتێک بەتەواوەتی و ڕێکخستنە.

ئەو سەردەمە دەوڵەتی ڕۆم سێ بەشی قاڕەی ئەوروپا و زۆربەی وڵاتانی ئاسیای گرتبووەوە، لەدوای ئەوەی کە ناکۆکیان تێکەوت شەڕیان بوو، دەوڵەتەکە بوو بە دوو بەشەوە.

بەشێکیان کە پایتەختەکەیان ڕۆمای ئێستایە ڕووخا، کۆمەڵێکی تر کە ڕۆمەکان گرتیانە دەست پایتەختەکەیان کرد بە پایتەختی قوستەنتینییە، ئەو سەردەمە پاشاکانیان بە قەیسەر ناودەبران، ئەو سەردەمەی کە پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ هات پاشای ڕۆمەکان لە قوستەنتینییە (هرقل) بوو.

## بواری دینی و کۆمەڵایەتی لای ڕۆمەکان:

خەڵکانێک بوون هەمیشە لەناوخۆیاندا شەڕیان بووە یەکتریان دەکوشت، شێوازی کوشتنەکانیشیان زۆر سەیر بووە بەشێوەیەک کە بە دوو پێیەکانی هەڵیاندەواسی بەمشار لەناوەڕاستدا دەیانکرد بە دووکەرتەوە! نەسارەکان ببوونە دوو هۆز، بەهۆکاری جیاوازی بیروباوەڕەوە کە هەریەکەیان هەوڵی لەناو بردنی ئەویکەیانی دەدا. ئەوەندە ڕقیان لەیەکتر بوو کاتێک یەکتریان دەکوشت گۆشت و خوێن و جگەری یەکترییان دەخوارد! ئەم دوو بەشەش کۆمەڵێکیان مەزهەبی (ئۆرتۆدۆکسی) یان هەبوو کە پێیان دەوترا (کەنیسەی ڕۆژهەڵات)، کۆمەڵەکەی تر مەزهەبی (کاتۆلیکی)یان هەبوو پێیان دەوترا (کەنیسەی ڕۆژاوا).

ئەم دووانە بەدرێژایی مێژوو تا ئێستاش شەڕیان کردووە بە ملیۆنەها خەڵکیان لە یەکتر کوشتووە، لەناو ڕۆمای ئۆرتۆدۆکسی دا ڕاجیاوازەکان زۆر گەورە بوو بۆیە دەسەڵاتی قوستەنتینیە کە هۆزی (منوفیسیەکان)یان پێدەوترێت، توانیان دەسەڵات بگرنە دەست، هەرچەندە زۆربەی زۆریشیان بەناو میسر و حەبەشەدا بڵاوببونەوە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەمە تەنها وێنەیەک بوو لەو کتێبەی لەبەردەستم بوو، لە بواری دینی و کۆمەڵایەتی ڕۆمەکان لەو سەردەمەدا هێنامەوە پێش چاوتان.

خۆ ئەگەر ئەگەر سەیری لایەنی ڕەووشتی ڕۆما بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە چۆن لەڕووی ئەخلاقییەوە لەناوچووبوون، ڕێک وەک ئەو سەردەمەی ئێستای لێهاتووە.

چۆن؟

بواری ڕەوشتی:

مێژوونووسان بەگشتی دەگێڕنەوە لەسەردەمی (هرقل) دا پێش هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەری ئازیز ﷺ خەڵکی ئەو سەردەمە لەناویاندا (عزوبەت) ڕەبەنی و سەلتی زۆر بوو، واتە هاوسەرگیری ڕووی لە کۆتابوون کردبوو، چوونکە ئەوەندە ژن و ژنخوازی گران بوو کەس نەیدەتوانی لەو سەردەمەدا ژن بهێنێ، زیناکردن و داوێنپیسی و شەڕواڵ پیسی لەناو خەڵکەکەدا بڵاوببووەوە، ببوو بە شتێکی ئاسایی هەروەکوو ئێستای وڵاتانی ئەوروپا دەبینین خەڵکێک چەندین ساڵ لەگەڵ ئافرەتێکدا دەژین، کەلێی دەپرسی بۆچی نایهێنی و نایکەیتە ژنی خۆت؟ لەوەڵامدا دەڵێ؛ ژن هێنان قوورسە ئاخر ئەگەر ژن بهێنم ئەبم بە هاووبەشی ژیانی، بەڵکوو هەر لەگەڵیا ڕابووێرم باشترە لەژێر ناوی هاوڕێیەتی و دڵسۆزی و گێڵ فرێند و ...هتد

ئەو سەردەمە زیاتر خەڵک گرنگیان دەدا بەو بووارە ناڕەووشتییە و هاوسەرگیرییان لەبیرکردبوو، خەڵک زیاتر ڕووی لەخراپە و فەساد کردبوو.

بەرتیل (ڕەشوە) ببوە شتێکی ئاسایی، موچەخۆرەکانی دامودەزگای دەوڵەت ئیشیان نەدەکرد بەبێ وەرنەگرتنی بەرتیل، خەڵکی ڕۆم هەمیشە حەزیان لە کوشتنی یەکتر بوو، بۆ نموونە لەوسەردەمەدا گیانلەبەرێکیان دەهێنا، گیانلەبەرە دڕندەکە لەگەڵ مرۆڤەکان شەڕیان پێدەکردن!

شێر و پڵنگیان بەرئەدایە بەندەکانیان و شەڕیان پێ دەکردن. سەرکردەکانی ڕۆما و خەڵکەکە کۆدەبوونەوە و پێدەکەنین بەو دیمەنانە ئاسوودە دەبوون، یاخوود شتێکی کە هەبوو پێیان دەوت (گلادیاتۆر)، لەوانەیە بپرسن ئێستا ئەو دیاردانە نەماوە ئەو سەردەمە پێوویستی کرد




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پێغەمبەری خوا ﷺ بێت، بەڵام ئێستا کوا خەڵکانێک بەدوای ئەوانەدا دەگەڕێن وەکوو گیانلەبەران لەگەڵ مرۆڤدا شەڕی پێ بکەن، ئێستا مافی مرۆڤ هەیە.

بەداخەوە ئەم دیاردەیە بەردەوام تا ئێستا دەبینرێت لەناو خەڵکیدا، ئەوەتا دەبینین لە ئیسپانیا گا بەرەڵلا دەکەن لەناو خەڵکیدا و پێدەکەنن و چێژی لێ دەبینن و ناونراوە بە شارستانییەت کە ئێستا ئێمە دەیبینین، شێوەی گلادیتۆر نەماوە، ئیستا لە هۆڵەکاندا زیاد لە بیست پیاو کۆدەکەنەوە هەریەکە دەمانچەیەکیان ئەدەنێ لەسەر سەری یەکتر دادەنێن، لە ناو هەر دەمانچەیەکدا یەک فیشەکی تێدایە بە یەکترییەوە دەنێن تا لە ناو ئەو بیست کەسە دووکەس دەمێنێتەوە، هەریەک لەوان چەند جار دەمانچەکە دەچرکێنن تا ئەو کاتەی یەکێکیان لەناودەچن، ئەمە ئێستا لە ئەمریکا دا زۆر باوە لە وڵاتانی ئەوروپای شەرقی تا ڕادەیەک لەسەر پارە دەکرێت، واتە قوماری گیانی خەڵکییە. بۆ ئەم قومارە پیاوی شێت یان پیر بە کار دەهێنن یان دەرمانخۆرەکان بێ ئەوەی بزانن چییە، تەنها خەڵکانی تر پارە بە ڕۆحی ئەوان پەیدا دەکەن!

بواری سەربازی:

لەکاتی شەڕیاندا شەڕێکی زۆر دڕندانەو گەورەیان دەکرد، هەروەک لەسەردەمی قەیسەرەکان کە پێی دەوترێ سەردەمی (فسفسیان) پاشایەکی ڕۆمی بوو زۆر ڕقی لە یەهوودییەکان بوو هات شاری قودسی ئێستای بۆماوەی پێنج مانگ ئابلۆوقەی ئابووری خستە سەر وەکوو مێژوونووسان دەڵێن؛ لە سێپتەمبەری ساڵی (٧٠) زایینی بەتەواوی ئەو شارە کەوتە دەست ڕۆمەکانەوە، ئەگەر سەیری ئەم دەوڵەتە بکەین دەبینین چییان بە یەهوودییەکان کرد چەندە دڕندانە لەگەڵیاندا ڕەفتاریان کرد، ئەو مێژووە ناونراوە بە دۆڕاندنێکی ترسناک لەبەرانبەر ڕۆمادا، تا ئێستا مەگەر یەهوودییەکان لەسەردەمی (نەبو خزنەسر)دا ئەوەندەیان لێ کوژرا بێت، ئەم پیاوە لە ڕۆما هەستا بەوەی کە فەرمانی دەرکرد و وتی چی یەهوودی هەیە بەدەستی خۆیان ژن و مناڵیان بکوژن! خۆ ئەگەر ئەو کارە نەکەن ئەوا هەموو پیاوەکان دەکوژن.

لەبەر ئەوەی کە یەهوودییەکان حەزیان بە ژیانە، هەستان بەوەی هەرچی ژن و منالیان هەبوو بەدەستی خۆیان کوشتنیان تەنها بۆ مانەوەی ژیانی خۆیان.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پاشان پادشای ڕۆم داوای لێکردن کە هەردوو پیاوی یەهوودی بەرەنگاری یەک ببنەوە، کە ئەبوایە یەکێکیان براکەی خۆی بکوشتایە! وەک مێژوو دەگێڕێتەوە لە قودس زۆر بەکەمی خەڵک مایەوە، ئەوانەی توانیان ڕایان کرد، ئەوانەشی کە مانەوە هەموو لەناوچوون.

ئەو یەهوودییانەی کە ڕایان کردبوو هەموو هاتنە ناوچەکانی یەسریب و یەمەن.

بواری کۆمەڵایەتی:

دەوڵەتی ڕۆما باجێکی زۆری خستبووە سەر خەڵکی، وای لێهاتبوو خەڵکەکە بەگشتی هەژار بوون. ئەو سەردەمە فەیلەسوفی گەورە (ئەفلاتون) کتێبێکی هەیە بەناوی (جمهورية افلاطون) یاخوود بەعەرەبی پێی دەوترێ (صاحب الفكر المدينة الفاضلة) کە پێی دەوترێ (یتوبیا).

ئەفلاتون دەبینێ لەو شارەی خۆیدا کە باسی لێوەکردووە کە هیچ بەندەیەک مافی هاوڵاتی بوونی نەبووە با خەڵکی ئەو شوێنەش بووبێ، ئەمە وای لێهاتبوو خەڵکەکە زۆربەی ببووە بەندەی دەسەڵاتدارەکان بەگشتی خەڵک هەژار بوون، لە ڕێگای ئەم یاسایەوە دەوڵەتی ڕۆما هەرکەس خەڵکی ڕۆما نەبووایە بە بەندە و کەنیزەک هەژماردەکرا لە، ئەمە باسی گوزەرانی وڵاتی ڕۆمابوو بە گشتی.

لاپەڕەم هەڵدایەوە باسی شارستانێتی فارس بوو، چاوم لەسەری بوو سەرقاڵی خوێندنەوەی بووم جاروباریش تەماشام دەکرد دەم وت خوایە بگەڕێمەوە بۆلای فەرغەلی و هاوڕێکانی.

هیچ ڕووی نەدا ناچار بەردەوام بووم لەسەر خوێندنەوەی چوومە سەر شارستانی وڵاتی فارس.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## شارستانیتی پارس (فارس):

فارس دەسەڵاتێکی زۆریان هەبوو، هەر وەکوو دەوڵەتی ڕۆم چۆن ئەوان پادشایان هەبوو فارسیش پادشای خۆیان هەبوو بەناوی (کسرا)، باروڕەوشی ژیار و شارستانێتییان بەهەموو پێوەرێکی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی لە خراپترین بارو گوزەراندا بوون، لەڕووی دینیشەوە داڕوخاوو وێران بوون. مێژوونووسان خۆیان باسی لێوەدەکەن جگە لە گوزەرانی ئایینی، باری ڕەووشتی دەوڵەتی ساسانی یاخوود دەوڵەتی فارسی کە کوردستانیشیان داگیرکردبوو.

کە ئێستا خەڵکیک هەمیشە باس لەوە دەکەن دەڵێن ئیسلام هاتووە وڵاتی ئێمەی داگیر کردووە! وەرن سەیر بکەین کە چۆن ئەو دەوڵەتەی پێی دەوترا دەوڵەتی ساسانی یاخوود دەوڵەتی پارس چۆن ژیانیان کردووە شارستانییەتیان پێکهێناوە؟

ساسانییەکان بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە بۆ خێزانی ساسان کە خۆی ئاگرەوان یاخوود ئۆترۆبانێکی زەردەشتی بووە خەڵکی نێوانی شیراز و ئەسفەهان بووە ئەم خانەوادەی ساسانییانە لەوێوە سەرچاوەیان گرتووە.

### بواری ڕەوشتی:

لەناو ئەم دەوڵەتەدا هاوسەرگیری نەبوو!

لەسەردەمی کیسرای یەزگورد کە (یەزگوردی دووەم)ی پێدەوترێ، ئەم پیاوە کچەکەی خۆی مارەکرد! لەناو ئایینی زەردەشتیەت دا مەحرەم نامێنێ! دایک لەکوڕی مارە دەکرێ، کچ لە باوکی خۆی، خوشک لە برا بەم شێوەیە لە ناو ئایینی زەردەشتییەتدا بڵاوبووەوە، لەسەردەمی کیسرا یەزگوردی دووەمدا (بورهامی جوبین)ی ئەم کابرایە خوشکی خۆی هێنا، ئابەو شێوەیە لە ڕووی ئەخلاقییەوە رووخا بوون هەتا لەسەردەمی (قوباد) (ئێمە دوو قوبادمان هەیە : قوبادێک لەسەردەمی ئیمامی عومەر (ڕەزامەندیی خوای لێ بێت) لەدوای شۆڕشی جەلەولا و خانەقین و شارەزوور کرا دژی فارسەکان، کەسێک بەناوی (قوباد) کە پیاوێکی کوردی موسڵمان بووە زۆرجار بە شوێنکەوتووی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەژمار کراوە چوونکە قوتابی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس بووە)

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەسەردەمی قوبادی فارس دا فەیلەسووفێک هەبووە بەناوی (مەزدەک)، ئەم پیاوە فەلسەفەیەکی داهێنا ڕووداوێکی درووستکرد لە دەوڵەتی فارس دا یەکسانی دامەزراند لەنێوان خەڵکدا، وەکوو ئەم بیرۆکەیەی شوعییەتی ئێستا هەیەتی، واتە "ئیشتراکییەت" وتی: هەموو خەڵک یەکسانن!

لەڕاستیدا بەڕووکار شتێکی جوان و ئاساییە، بەڵام لەناوەخندا خەڵک وایلێهات نەیاندەزانی ئەرک و مافی خۆی چییە، ڕێزی خەڵک نەئەگیرا. وای لێهات خەڵکی لەسەروەت و ساماندا یەکسان بوون، بەهەمانشێوە بەرامبەر ئافرەتیش یەکسان بن، واتە هیچ کەسێک خاوەندارێتی هیچ شتیک نییە، ئەو شوعییەتەی کە ئێستا خەڵک ئیشی بۆ دەکات ئەمەش "مەزدەک" دایناوە، هەتاکو مارکس لە دواییدا گەشەی پێداوە و بەناوی مادییەتی فیورباخی یان ڕاڤەکردنی مێژوو و مەسەلەی دیالەکتیکی هاتووە و کاری لەسەر کردووە تا بووەتە ئایدۆلۆژیایەک و خەڵکێک شانازی پێوە دەکات، ئەمەش خەڵکی بەهێز دەچووە ماڵی خەڵکی لاواز و توانا و دەسەڵاتی نەبوو پارە و ژنی داگیر دەکرد، شوعییەت ببووە دینی سەردەمی (کیسرا) بەناوی قوبادەوە بوو، با بێین جیاوازییەک بکەین لەگەڵ ئەو یەکسانییەی کە کەسێک دێت ئەویش پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت:

(وَٱلَّذِي نَفْسِ مُحَمَّدْ بِيَدِهِ ، لَوْ أَنَّ فَاطِمَة بِنْتْ مُحَمَّدْ سُرِقَتْ لَقَطَعَتْ يَدُهَا)

واتە: (ئەگەر هاتوو کچەکەی خۆم فاتمە دزی بکات دەستی دەبڕم)

کامیان یەکسانی یە؟

### بواری کۆمەڵایەتی

لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە پیرۆزییەکی زۆرگەورەیان دابوو بە (کیسرا)کانیان، واتە (کیسرا)یان بە پیرۆز ڕادەگرت، ئەوان وایان هەست دەکرد خەڵکی ئەو سەردەمە کە خوێنی خوا تێکەڵ بووە لەگەڵ خوێنی (کیسرا)کانیان واتە ئەمان لەسەروو یاساوە و بە بەرزی ڕایاندەگرتن، هەتا دەهاتنە بەردەمی (کیسرا)کان سووجدەیان دەبرد، هەتاکو فەرمانی نەکردایە بەوەی سەریان

---

[٥] سسن النسائي، رقم ٤٨٩٨





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەسووجدە بەرزبکردایەتەوە سەریان بەرز نەئەکردەوە، ئەوەندە بووغرا و خراپەکاربوون لەناو (کیسرا)کانیاندا بە چینایەتی دەوەستان لەبەرامبەریاندا، ئەوانەی نزیک بوون لە (کیسرا)کانیانەوە چینی (کاهینەکانیان) بوو پێیان دەوترێ (ئاگرەوان) یان (ئۆترۆبان)، دەبوایە پێنج مەتر لە (کیسرا)کانەوە دووربن.

پاشان کاربەدەست و وەزیر دێتە پێشەوە، ئەوانیش ئەبوایە لەپشتی ئەوانەوە بووەستانایە، پاشان خەڵکێک وەکوو سەفیر و ئەوانەی سەردانیان دەکرد ١٠مەتر دووربوون لێیەوە خەتیان دەکێشا لەو خەتەدا بمێننەوە، ئەگەر خەڵکێکی تر بهاتایە و قسەی لەگەڵ بکردنایە ئەبوایە پارچە قوماش ببێچن بە لوتیانەوە بۆئەوەی ئەو ژینگەیەی (کیسرا) پیس نەکات کە مەجلیسی تایبەتی دیوانی (کیسرا)یە بۆئەوەی ژینگەکە تووشی پیسی نەبێ! ژینگەی پاک بۆ (کیسرا) درووست بکرێت.

جیاوازییەک بکەن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ

(كان رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ إذا استقبله رجل فصافحه لا ينزع يده من يده حتى يكون الرجل ينزع، ولا يصرف وجهه عن وجهه حتى يكون الرجل هو الذي يصرفه، ولم يُرَ مقدمًا ركبتيه بين يدي جليس له (أي يتواضع لجليسه فلا يمد رجله أمامه).[٦]

واتە: کاتێک پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کەسێکی ببینییایە و تەوقەی لەگەڵ بکردایە یان بگەشتایە بە یەکێک، هەتاکو ئەوکەسە دەستی لەدەستی مووبارەکی دەرنەئەهێنا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەستی دەرنەئەهێنا، هەتا لەو فەرموودەیەدا هاتووە: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەم و چاوی هەرگیز لەدەم و چاوی ئەو کەسە وەرنەئەگێڕا کەقسەی لەبەرانبەر دا دەکرد، سەرووەرمان دائەنیشت لە سەر ئەژنۆ دەستی دەخستە نێوان ئەژنۆکانیەوە وەکوو تەوازوعێک بۆ ئەوکەسەی کە لەبەرامبەریدایە، ئەگەر سەیر بکەین پادشاکان هەمیشە خۆیان لە گومڕایدا دەژیان، گەر بەراوردێک بکەین دەبینین کە چۆن ئەم پادشایانە ڕەفتاریان کردووە،

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦] روى ذلک الترمذي وابن ماجه عن أنس رضي الله عنه.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هیچ کەسێک ئەوتوانایەی پێغەمبەری خوا ﷺ ی نەبووە، نەیتوانیوە وەکوو ئەم ئازیزە ڕەفتار بکات.

لەناو چینایەتی دەوڵەتی فارس دا کە بەیەکسانی باسی ژیانی کۆمەڵگەیان دەکرد، مرۆڤەکان دابەش کرابوون بەسەر چەند چینێک دا:

چینی یەکەم: چینی (کیسرا)کان بوون ئەمانە ڕاقیترین و بەرزترین خەڵک بوون.

چینی دووەم: (ئەشراف) بریتی بوون لە حەوت خێزانی شەریف، کە لەم خێزانە بەناوبانگانە لە دەوڵەتی فارس دا تەنها ئەو حەوت خانەوادەیە هەبوون کەس لەوان شەریفتر نەبوو.

چینی سێیەم: (رجال دین) یاخوود پیاوانی ئایینی.

چینی چوارەم: هێز و سووپا و پیاوانی پلەداری جەنگی.

چینی پێنجەم: نووخبەی (ڕۆشنبیرەکان) وەکوو پزیشک، شاعیر، نووسەر، ئەدیب و ساحیرەکان، لەوسەردەمەدا زۆر گرنگیان بە خورافییات داوە.

چینی شەشەم: چینی (دەهاقین)، ئەم چینە هەمیشە گەڕاون بەلادێ و شاردا بۆ کۆکردنەوەی سەرانە و باج و خەراج.

چینی حەوتەم و کۆتایی: چینی (هاوولاتییان)ە بەگشتی لە ٩٠٪ی ئەم خەڵکە هەژار بوون بریتی بوون لە کرێکار، جووتیار، بازرگان، سەرباز، کۆیلە و...هتد.

ئەمانە هەموو مافیان وەک یەک بووە هەتا لەشەڕ دا لە پێشەوە وەک سەنگەر ئەم خەڵکەیان بە کار دەهێنا، هەروەک خالیدی کوڕی وەلید -ڕەزامەندی خوای لێبێت- لەشەڕی (ئوبەلە)دا کە پێی دەوترێت (ذات السلاسل) ٦٠هەزار کەسیان بەستبووەوە بۆئەوەی ڕانەکەن، لەبەرانبەر موسڵمانەکاندا ئەوەندە گرنگییان بەخەڵکەکە نەئەدا، بە زنجیر ئەیانبەستنەوە بۆئەوەی ڕانەکەن!

بۆیە (کیسرا) وای دەزانی کە موسڵمانەکان هەڵدێن لە ڕووی سووپای فارس دا، بەڵام خالیدی کوڕی وەلید دەڵێت: لەشەڕی (ئوبەلە) دا نامەی نارد بۆ ڕۆستەم بۆی نووسی: (جئتكم برجال




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یحبون الموت، كما تحبون أنتم الحياة") واتە: من بەخەڵکێکەوە هاتووم کە ئەوان چەندە مردنیان خۆش دەوێ، ئەزانم ئێوەش ئەوەندە ژیانتان خۆش دەوێ.

بۆیە ئەم ئیسلامە ئاوا سەرکەوتووە.

بواری سیاسی:

لەڕووی سیاسییەوە ئەوان ئەهلی ساسانیان پێدەوترا، تەنانەت منداڵێکی بچوکیشیان (ئەردەشیری کوڕی شیروان) حەوت ساڵ بوو بە ئارەزوی خۆی حوکمی ئەدا بەسەریاندا و بۆیان نەبوو قسە بکەن، یاخوود کچێک بەناوی (بۆرانی کچی کیسرا) بەو ناوە هاتووە، تەمەنی چەند ساڵێک بووە توانیوویەتی بڕیار بدات هەموو کەس ڕێز و حوورمەتی لێگرتووە.

بواری ئایینی:

دەوڵەتی فارس ئاگریان پەرستووە، ئایینیان زەردەشتی بووە هەروەکوو مێژوونووسان باسیان کردووە ئاگریان بە پیرۆزڕاگرتووە، تەنانەت زۆر جار خەڵکی نەیانتوانیوە ئاگر بەکاربهێنێت لەبواری ئاسنگەری و پیشەسازی و...هتد، بەم هۆکارە زیاتر دەوڵەتی فارس ناسرابوو بە دەوڵەتێکی کشتوکاڵی و بازرگانی، ئەگەر شتێکیان پێوویست بووایە لە دەوڵەتی دەرەوەی خۆیان هێناویانە.

لەبیروباوەڕی ئەواندا ئاگریان بە پاک و بێگەرد داناوە، هەرکاتێک ئاتەشگەیەکیان بکردایەتەوە ئەبوایە ئافرەتێک یاخوود کوڕێکی نابالغیان بکردایەتە قوربانی!

چوومە سەر لاپەڕەیەکی نوێ تەماشام کرد باسی شارستانێتی ترە و منیش هەر لە ژوورەکەدام نەچوومەتەوە بۆلای فەرغەلی.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەردەوام چاوم لەسەر کتێبەکە هەڵنەگرت دەموویست بمگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی فەرغەلی، بەڵام لە ژوورەکەمدا بووم لاپەڕە بەدوای لاپەڕەدا هەڵم ئەدایەوە.

دوای شارستانێتی فارس و ڕۆم هاتە سەر شارستانێتی ئەوروپا و سکەندەناڤیا.

## شارستانێتی ئەوروپا و سکەندەناڤیا:

وڵاتانی ئەوروپا بەشی ئەڵمانیا کە ناسراو بووە بە جێرمەن، وە بەشەکانی تر بە سکەندەناڤیا...هتد. ئەو ناوچانەی ڕۆم دەستی بەسەریاندا نەگرتبوو، مێژوو نووسێکی فڕەنسی بەناوی (ڕینۆ)دەڵێت: پێش هاتنی ئیسلام خەڵکی ئەوسەردەمە خەریکی تاوان بوون، تەنانەت ڕایان دەکرد لە پاک وخاوێنی و شارستانییەت لەنێوانیاندا نەمابوو، لە جاهیلییەتدا دەژیان. خەڵکێک بوون گەڕاون بەدوای پیسیدا و بەساڵ خۆیان نەشتووە، بەلای ئەوانەوە وابوو ئەو پیسییە کە لەسەر لاشەیان کۆدەبێتەوە خێر و خێراتیان دەست دەکەوێت بە نەمری و سەربەرزی دەمێنێنەوە. هیچ زانست و زانیارییەک نەبووە، زۆر سەرەتایی ژیاون، ئەگەر بەراووردێک بکەین لەگەڵ یەکەم ئایەت بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هاتە خوارەوە خوای گەورە دەفەرمووێت: (اقرأ) واتە: بخوێنە، لە شوێنێکدا کە نیوە دوورگەی عەرەبە. (ڕینۆ) باس لە ئەوروپا دەکات بە دەهەیەک پێش هاتنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم (Theater of wars and atrocities) دەڵێت: شانۆیەک بووە بۆ شەڕو کردەوەی دڕندانەو بەربەری.

بەم شێوازە باس( Arab civilization) مێژوونووس (گۆستاف لۆبون) لەکتێبی شارستانی عەروب دەکات: لەم کتێبەدا باس لە یانزە ساڵ پێش هاتنی پێغەمبەرایەتی محمد صلی الله علیه وسلم دەکات، باسی ئەوروپا دەکات دەڵێت: هەموویان لە بەربەریەتێک و وەحشیگەریدا ژیاون کە توانای ئەوەیان نەبووە بەدوای مەعریفەدا بگەڕێن، کەسێکیان خوێندەواریان نەبووە وای لێهاتبوو شانازی بە جەهالەتەوە بکەن، پادشاکانیشیان شانازییان بە نەخوێندەوارییانەوە دەکرد. لە سەدەی ١١و ١٢ی زاینیدا ئەوروپا هەوڵی زانست و



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پێشکەووتنیان دا، ئەگەر بەراوردی بکەین بە سەدەی ٤ی کۆچی دەبینین سەدەی ٤ و ٥ ی کۆچی موسڵمانان لەچ هێز و توانا و دەسەڵاتێکدا بوون.

مێژوونوسێکی ئەندەلووسی بەناوی(صاعد) لە سەدەی ٥ی کۆچی ساڵی ٤٦٢کۆچیدا لە(توڵەیتڵە) ئەم کتێبەی نوسیووە هەرلەوێش مردووە، توڵەیتڵە پایتەختی ئیسپانیا بووە لەو کاتەدا پایتەختی دەوڵەتی قوتییەکان بووە، کاتێک توڵەیتڵە گیرا موسڵمانان پایتەختی خۆیان گواستەوە بۆ (قورتوبە). ئەو لە توڵەیتڵە دەژیا کتێبێکی نووسی بەناوی (طبقات الأمم)، لەو کتێبەدا باس لە حاڵەتی دەوڵەتانی ئەوروپا دەکات بەتایبەت سکەندەناڤیا (دانیمارک، سوید، نەرویج، فینلاند) پۆلێنیان دەکات و دەڵێ: (هم أشبە بالبهائم منهم بالناس) وەکوو ئاژەڵ ناویان دەبات دەڵێت: هیچ توانایەکیان نەبووە تەنها خواردنیان خواردوە و، ئاژەڵیان سەربڕیوە گۆشتەکەیان بەکاڵی خواردوە.

کەسێکی تر باس لە ئەوروپا دەکات بەناوی (أبراهیم طرطوشی)، ئەمیش خەڵکی ئەندەلووسە خەڵکی شاری (جلیقیە)یە، ئێستا بەناوی (کلیە) ناو دەبرێ لە باکووری ئیسپانیایە لەنزیک فەڕەنسا، باس لەوە دەکات خەڵکی ئەوێ بەگشتی خۆیان نەدەشۆرد، تەنانەت دەڵێت: هەموویان خەڵکێکی ناپاک بوون، ئەهلی غەدر بوون لەساڵێکدا یەکجار یان دوو جار خۆیان دەشۆرد، ئەویش بەئاوی سارد و جلیان هەر نەدەشت، ئەوان واهەستیان دەکرد ئەم پیسییە وەکوو دەستکەووتنی خێرو نزیک بوونەوەی خوایە لێیانەوە.

ئەگەر بەراورد بکەین لەگەڵ هاتنی دینێک کە دێت فەرمان دەکات لە شەوو ڕۆژیکدا ٥ جار دەست و دەم و چاو و قاچ بشوات، لەهەمو جەنابەتێکدا(غوسڵ)، لە ڕۆژی هەینی غوسڵ دەربکەین، لەڕۆژی جەژندا غوسڵ دەربکەیت، هەتا گەورەترین بەندایەتی ڕۆژی هەینییە، بەڕێزترین بەندایەتییە، لەکاتێکدا ئەگەر پیاز یاخوود سیرت خواردبێ دەبێ لەو بەندایەتییە خۆت دووربخەیتەوە! ئەمەش بەرزی مرۆڤ دەردەخات لەلای ئیسلام، چوونکە دوورخستنەوەی خۆتە بۆ پاراستنی موسڵمانانی تر.

لە ڕووی پاراستنی مافی خەڵکییەوە ئیسلام تەنانەت مافی کافر و بێباوەڕەکانیش دەپارێزێت بە ئەرکی سەرشانی دەزانێت.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴾ [التوبة].

واتە: خۆ ئەگەر کەسێک لە هاوەڵگەران داوای پەنای لێ کردیت ئەی پێغەمبەرﷺ، ئەی ئیماندار، ئەوە تۆیش پەنای بدە هەتا گوێی لە فەرموودەکەی خوا (قورئان) دەبێت، پاشان بیگەیەنە بەو شوێنەی دەیەوێت و (ماڵو گیان و ژیانی) تیایدا پارێزراوە، ئەم میهرەبانییە لەبەر ئەوەیە ئەوانە کەسانێکن نازانن (خواناسی چییە).

کەسانی تر وەکوو (ابن فضلان) ئەویش لە ئەندەلوس ژیاوە باس لەوە دەکات کە هەمیشە خەریکی خراپەکاری بوون بۆنموونە لە کتێبەکەیدا باسی ئەوە دەکات کاتێک ڕێزی سەیدیان گرتبێ (سید) بەمانای خاوەنی بەندە بووبێت.

ئەگەر بمردایە ئەوانەی لەگەڵی بوون بەندەکان یاخوود ئافرەت و جارییەی هەبووایە ئەهاتن سەرخۆشیان دەکرد و هەندێک تقوساتی دینییان پێدەکردن، پاشان ملیان لە دوو لاوە دەبەستەوە بەگوریس لە دواییدا دوو کەس ڕایان دەکێشا تاکو ئەمرد! خەنجەرێکیان دەکرد بە دڵیا تا خوێنەکەی بەسەریدا دەهاتە خوارەوە خوێنەکەی دەکەوتە سەر گەورەکەی، هەروەها باسی ئەوەش دەکات وەکوو ڕێزێکە بۆ گەورە و پیاوەکەی ئەو کارەیان ئەنجامداوە!

ئینجا وەرن پێوەر بکەن بە ئایینێک، دێت دەڵێت:

لە فەرموودەیەکدا کە موسلیم ڕیوایەتی کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (مَنْ لَطَمَ مَمْلُوكَهُ أَوْ ضَرَبَهُ فَكَفَّارَتُهُ أَنْ يَعْتِقَهُ).

واتە: هەرکەسێک مست یان زلەیەک لە بەندەکەی بدات، یاخوود لێی بدات ئازارێکی بدات، کەفارەتەکەی تەنها ئەوەیە دەبێ ئازادی بکات.

ئەوان ڕێزی گەورەی بەندەکانیان بەوشێوەیە گرتووە کە خاوەنی بەندەکە بووە.

ئەوەی باسمان کرد بەگشتی حاڵەتی ئەوروپا بوو.

سەروەرمان پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي وَأَمَتِي، كُلُّكُمْ عَبِيدُ اللَّهِ، وَكُلُّ نِسَائِكُمْ إِمَاءُ اللَّهِ، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: غُلامِي وَجَارِيَتِي، وَفَتَايَ وَفَتَاتِي".[٧]

واتە: بە بەندە و کەنزەکەکانتان بڵێن کوڕەکەم یان کچەکەم، یان وەک منداڵی خۆتان هاوسەرگیرییان بۆ بکەن لە کوڕ و کچ، لە جلوبەرگی خۆتانیان لەبەر بکەن، هەروەها لەو خواردنەی دەیخۆن بیاندەنێ.

پاشان چوومە سەر شارستانێتی میسر:

لە کتێبەکەدا بەم شێوەیە نووسرا بوو:

بابزانین پێش هاتنی پێغەمبەری خوا لە میسر چی ڕوویداوە ، لەسەرەتاوە زانیمان دوو دەوڵەتی ڕۆمان هەبووە، دەوڵەتێکیان بەتەواوی کۆتایی پێهات، سەردەمی (کلێوپاترا) و (هۆکتافیۆس) لەساڵی ٣١ پێش زایینیدا میسری گرت، پاشان لەسەردەمی (ئۆگستین) قەیسەرێکی تربوو توانی دەوڵەت بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

واتە لەساڵی ٤٦٧ی زایینی واتە نزیکە ١٥٠ساڵ پێشهاتنی پێغەمبەری خوا دەوڵەتی ڕۆمانیا میسری خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە.

لەدوای گرتنی چییان لەم وڵاتە کرد؟

ڕۆژاوای میسری خستە ژێر دەستی خۆیەوە، دووبارە دەوڵەتی ڕۆمی ڕۆژهەڵات توانی دەسەڵات بگرێ بەسەر میسردا، لەشەڕێکدا دژی کەنیسەی ڕۆژاوایی هات و میسری کرد بە جێگەی مەخزەنی خۆراکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، ئابووری نزم بووەوە، خەڵکەکەی دوورخستەوە لە هەموو بوارێکی زانست و زانیاری و پێشکەووتن و کۆمەڵگەکەی بەرەو دواکەوتوویی برد، تەنانەت ڕۆما سووڵتەی لەدەسەڵاتی میسری سەند بۆخۆی، ئەوەشی مابوو بۆئەوەی شۆڕش بەرپا نەبێ کۆمەڵێکی درووست کرد وەکوو ئەم خەڵکەی ئێستا کە دەبینین وەک ئەمریکا هەرکەس لایەن و نفوزی خۆی بێ ئەوا دەیهێنێ و دەیخاتە سەر وڵاتەکە بۆئەوەی

---

[٧] صحيح مسلم، رقم ٢٢٤٩



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

شۆڕش کپ بکاتەوە، زۆری خەڵکەکە لەدژیان هەڵنەستێ، پاشان باجی لەسەر خەڵکی میسر دانا. باجی لەسەر زەوی و زاری خەڵکی و مەڕ و ماڵات لەسەر فرۆشتن و کەل و پەلی ناوماڵ کە مێژوونووسان باسی لێوە دەکەن، باجی گواستنەوەی دانابوو تەنانەت باجی لەسەر ژنهێنان و شووکردن دانابوو.

ئەمەی کە باسمان کرد هەمووی ئێستاش لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆدا هەیە، هەروەک لە وڵاتێکی وەک نەرویج کاتێک لە شارێکەوە دەچیتە شارێکی تر باجی ڕێگا دەبێ بدەیت، لەو سەردەمەشدا باجی قەبر و دفنی مردووەکانیان سەندووە، لێرەش بەهەمان شێوە هەروایە کەسێک بمرێ باجی لێدەسەندرێ، هەر ئەو ڕووداوانە دووبارە دەبێتەوە لە ئێستاو ڕابردووشدا کە ڕوویداوە، باجی تەلەفزیۆن کەئێستا هەیە هەمان باجە کەلەسەر کەلو پەل و پێداویستی ماڵ لەو کاتەدا هەبووە ئێستاش بەردەوامە لەم وڵاتانەدا، هەربۆیە هەمیشە دەڵێین؛ مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە، لەسەروو هەمووشیانەوە ئەشکەنجەیەکی زۆری ئەدان تەنها لەبەرئەوەی ئەوان کاتۆلیکی بوون و ئەمان لەژێر چەتری نەسرانیە ئۆرتۆدۆکسیەکاندا بوون!

وڵاتێکی وەک چین کە ئیمپراتۆرییەت بوون، خاوەنی سێ ئایین بوون، بە ۱۰ساڵ پێشهاتنی پێغەمبەری خوا .

یەکەم: دینی(لاوتستۆ) ئەم دینە دینێکی کرداری نەبووە، شتێکی بێهودە بووە خەڵک زۆربەکاری نەهێناوە، بەڵام دینی لاوتستۆ باوبووە نەک پیادەکراو.

دووەم: بەناوی (کۆنفۆشیۆس) ئەمانیش بەگەورەی فەلسەفە و دەسەڵاتدارانی چین ناودەبرێ، لە دواییدا دەبێتە دین و یاسای بۆ دائەنرێ و دەیپەرستن.

ئەم ئایینە باس لە ژیان دەکات کە ژیان شتێکی بێهوودە و هیچە، گرنگییەکی نییە بەئارەزووی خۆتە چی دەپەرستیت وەک دار، ئاو، مشک و ...هتد.

سێیەم: دینی (بوزا یاخوود بوودا) ئەمیش فەیلەسووفێک بووە توانیوویەتی شەریعەتێک دانێ لەسەردەمی خۆیدا هەندێ بنەمای ئایینی و ئەخلاقیشی هەبووە، خەڵکی دائەبڕی




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەکۆمەڵگا ئەبێتە ڕاهیب، وەکوو سۆفیگەرییەکی ئەو سەردەمە دەگێڕنەوە، وشەی تەسەوف لەو سەردەمەی بووزاوە سەرچاوەی گرتووە، هەتا هاتۆتە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە، هەرچەندە زۆرێکیش پێش بووزا هەر تەسەوف هەبووە و لەسەردەمی مەسیحی و یەهوودی و دوای ئەویش هەر هەبووە.

## شارستانێتی هیند:

ئیمپراتۆریەتێکی تر هەبوو بەناوی (هیند)، هیندستان یەکێک بوو لەو وڵاتانەی دەوڵەتێکی بەتوانا بووە، ١٠ ساڵ پێش هاتنی پێغەمبەر محمد ﷺ لەو وڵاتەدا هەمووشتێک ڕێگەپێدراو بووە بۆ پەرستن لە ئێستاشدا هەروایە، شێوازی جۆراو جۆر هەبووە بۆ پەرستن، لەوانە: (هەیکەل، خەڵک شاخ و ڕووبار وەک ڕووباری (كنج) کەزۆر مووقەدەسە لەلایان، کانزاکان، مانگ، قەڵەم، ئاڵتوون، زیو، شمشێری دەستی خۆیان و ئەستێرەو مشک و گیانلەبەرانیان) پەرستووە. تا ئێستاش مانگا و مشک و سەگ دەپەرستن، لەو وڵاتەدا مانگا پەرستن باوبووە کەزۆربەی زۆری زانایان خەبیرن لە کۆمپیوتەرو تەنانەت شارەزایانی بوواری چەکی ئەتۆمی ئەو وڵاتە و زۆرێک لە سیاسییەکانیان مانگا دەپەرستن، لەڕاستیدا ئەمە شتێکی سەیرە!

لەسەردەمی کۆندا لەهیندستان لەجێگایەکدا کە مشکیان دەپەرست برسێتییەک ڕووی کردە ئەوان، خواردنی مشک قەدەغەکرابوو تەنها مشکیان سەرنەئەبڕی ئەو ماڵانەی کە گەنمیان کۆکردبوەوە، مشکەکان هەموو دانەوێڵە و گەنمەکانیان خواردن!

## بواری ڕەوشتی:

لەڕووی جنسییەوە هاوسەرگیری شتێکی ئاسایی نەبوو، کەس هاوسەرگیری نەئەکرد، ئافرەتێکیان بەدڵ بووایە ئەیان توانی بیبەن بۆخۆیان بەتایبەت کاهینەکانیان بە بەندایەتییان دەزانی، کاری خراپەکاری و فەواحش لە مەعبەدەکانا ئەیانکرد، ئەیانشوبهاند بەوەی بووارێکی ئاینییە، لەگەڵ مناڵ و پیر و گیانلەبەران دا هەرشتێک ئەوان ئارەزوو حەزیان لێبوایە دەیانکرد، دەیان وت مادام خۆشی مرۆڤەکان لە خواردن و سێکس و خەوتندایە، کەواتە بەبەندایەتییان دادەنا.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بواری کۆمەڵایەتی:

لەناو ئەوانیشدا چینایەتی هەبوو دابەش کرابوون بەسەر چوار چین دا:

چینی بەڕاهیمە: دەسەڵاتدار و کاهینەکانیان بوون، هەمیشە پادشا ئەبوایە کاهین بووایە، واتە پیاوی ئایینی بووایە.

چینی (شترای): ئەمەش پیاوانی جەنگ و ئازاکانیان بوون.

چینی (ویش): ئەمیش بازرگان و جووتیار بوون خاوەنی زەوی و زار و سەروەت و سامان بوون.

چینی (شۆدەر): ئەم چینە هیچ شتێکیان بۆ نەبوو بیکەن، لەگەڵ گیانلەبەران هەژمار دەکران، بەکوردی خۆمان پەراوێز خراوەکانیان پێدەووترێت.

لە یاسای هیندستاندا لەو سەردەمەدا ئەتوانرا لەبەرامبەر بەراهیمەکاندا ئیشیان بۆبکەن بەبێ ئەوەی پارەشیان بدەنێ.

ئەم چینی"شۆدەر"دەبوو خزمەتی کاهین و دەسەڵاتداری هیندستانیان بکردایە، ئەگەرپێوەری بکەین بە ئایینی ئیسلام ابن ماجە ڕیوایەتی کردووە لە ئیمامی عومەرەوە -ڕەزامەندی خوای لێ بێت- ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە دەفەرمووێت: (أَعْطُوا الأَجِيرَ أَجْرَهُ قَبْلَ أَنْ يَجِفَّ عَرَقُهُ).

واتە: پارەی خاوەن کرێ بدەن بەو کەسەی کە بەکرێ گرتووتانە، پێش ئەوەی عارەقەکەی وشک بێتەوە.

ئەگەر شۆدەرێک بەهێزبوایە و تورەیان بکردایە لە بەراهیمێکی بدایە، لە کەسێکی دەسەڵاتداری بدایە، وەکوو ئیبن ئەسیر باسی دەکات دەڵێت؛ دەستیان دەبڕی و ئەگەر دابنیشتایە لە حزوری بەراهیمێک ئەوا پشتیان بەئاسن داغ دەکرد (کەوی)یان پێدەوت، یاخوود لە هیندستان شۆدەرەکان قسەیەکیان بە بەراهیمە بووتایە یەکسەر زمانیان دەبڕی، خۆ ئەگەر بهاتایە لەوانەی کە ئەپەرسترا بۆنموونە: سەگ، بۆق، کونەپەپوو و پشیلە یەکێک لەم گیانلەبەرانە بکوژرایە وەکوو ئیبن کثیر دەڵێ: (وكفّارة قتل الكلب والقطة والضفدعة والبومة مثل كفارة قتل





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

الشودر سواء بسواء). هەر کاتێک هەرکەسێ ئام گیانلەبەرانەی بکوشتایە، کەفارەتەکەی وەکوو کەفارەتی کوشتنی پیاوێک لە شۆدەر بوو، کاتێک خوای گەورە ئیسلامی بۆ ناردین دەفەرمووێت: (ولقد کرمنا بنی أدم).

هەمووشتێک لەپێناو مرۆڤەکانن، ڕێز لە مرۆڤ گیراوە. لەوسەردەمی هیندستان دا ئافرەتان لەکۆمەڵگەکەیاندا هیچ گرنگییەکی نەبووە، ئەتوانرا ژن بێ و ئیشی پێبکرێ و زۆرجار هیندییەکان ماڵ و سەروەت و سامانیان لەقومار دەدۆڕاند، ژنەکانیان دائەنا لەبەرامبەریدا، پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت: (اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا)، واتە: وەسێتی کردووە لەگەڵ ئافرەتان باشبین.

یاخوود دەفەرمووێت: (النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ)، ئافرەتان هاوڕێ و هاوسۆزی پیاوانن.

یاخوود (خَيْرُكمْ خَيْرُكمْ لِأَهْلِهِ)، باشترینتان ئەوانن کە بۆ هاوسەرەکانتان باشن.

خەڵکێک لەوانەیە بپرسێ شوێنی یەهوود لە کوێ بووە؟ بابێین سەیری کیانی یەهوود بکەین.

یەهوود لەوسەردەمە لەناوچەی شام بەگشتی لەوێدا چەقیان بەستبوو مابوونەوە، هەموو دەزانن یەهوود پیسترین کەسایەتین، لەکاتی لاوازی و بێهێزی خۆیاندا هەمیشە خەریکی خنوعن، بۆ خۆبردنەپێشەوە خەریکی گەردنکەچی و ماستاوچێتی و خەریکی ڕق و کینە و درۆزنین.

لەساڵی ٦١٣زایینی واتە ٣ ساڵ دوای هاتنی پێغەمبەر ڕووداوێک ڕووئەدات لەژیانی ئەم یەهوودییانە، لەناو شام دا کەژیاریان هەبووە لە ساڵی ٦١٣ زایینی هەموو دەزانن فارس سەرکەووت بەسەر ڕۆم دا، وەک خوای گەورە دەفەرمووێت:

واتە: ڕۆمەکان تێکشکێنران (بەدەستی فارسەکان)



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بۆمان دەگێڕێتەوە لە سوورەتی ڕوم دا، پاش سەرکەووتنی فارس بەسەر ڕۆم لەشام دا، یەهوودییەکان هاتن کودەتایەکیان کرد بەسەر هەموو نەسارەکاندا، هاتن هەرچی نەسارا بوو بە قەشە و پاپاکانیانەوە هەموویانیان گرت و کوشت، هەموو کەنیسەکانیان تێک دا، هەرچی ڕاهیب بوو کوشتیان، لەدوای ئەوەی دەسەڵاتی تەواویان گرتە دەست.

لەپاشان ماوەیەک دیسانەوە ڕۆم خۆیان گرتەوە، سەرکەووتنەوە بەسەر فارس دا، وەکوو خوای گەورە دەفەرموویت:

واتە: لە نزیکترین و نزمترین وڵاتیاندا، بەڵام لە ئایین دەدا (نۆرەیان دێتەوە) ڕۆمەکان دوای شکستیان سەردەکەونەوە.

لەدوای ئەوەی سەرکەوتن بەسەریاندا، ئەم یەهوودییانە چون بۆلای "هەرقل" چون زەلیلی خۆیان نیشاندا، چون داوای ئەوەیان کرد دوای حکومەتەکە بکەون، لەدواییدا وتیان ئێمە لە حکومەتەکەی تۆدا دەبین و یارمەتیت دەدەین، پاشان ئەویش پەیمانێکی لەگەڵ یەهوود بەست ئاسایش و هێمنی دانێ.

بەڵام لەدواییدا نەسارەکانی شام هاتن بۆلای هەرقل و پێیان وت: تۆ چیت کردووە لەگەڵ ئەمانەدا، هەرچی خەڵکی ئێمە بووە لەناو شام دا هەموویان کوشتووە، کەبەمەی زانی پادشای ڕۆم زۆر تووڕە بوو، بەڵام پەیمانەکە ڕێگر بوو ئەویش ئەو پەیمانەی نێوانیان بوو، پاشان نەسارەکان هاتن بۆلای و قسەیەکیان کرد وتیان: تۆ کێشەت نەبێت ئێمە کەفارەتی پەیماننامەکەت بۆ ئەدەین بەس بیانکوژە (اقتلهم وسنصوم عنک جمعة کل سنةٍ أبد الدّهر)، وەرە تۆ بیانکوژە ئێمەش هەموو هەینییەک بۆ تۆ بەڕۆژوو ئەبین تا ڕۆژی قیامەت بۆئەوەی کەفارەتەکەت بۆ بدەین، ئەویش هەستا بەکوشتنی یەهوودی و عەزابی ئەدان و لێی ئەدان، زۆریان ڕایان کردو هەندێکیشیان مانەوە لەشام.

ئەگەر سەرنج بدەین بەدرێژایی مێژووی نەسارا و یەهوود ڕقیان لەیەکتربووە دژایەتی یەکیان کردووە، نەسارەکان بڕوایان وایە کە یەهوودییەکان کە عیسا -سەلامی خوای لێبێت- لەخاچیان



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دا یان کوشتویانە، کەئەمەش ڕاست نییە، هەروەکوو خوای گەورە لە سوورەتی النساء دا دەفەرمووێت:

﴿... وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ...﴾ [النساء].

واتە: نە کوژراوە نە لە خاچ دراوە.

لەساڵی ١٦ی کۆچییدا سەیدنا عومەر فەتحی قودسی کرد مەرجێکیان لەسەر ئیمامی عومەر دانا، مەسیحییەکان وتیان بەمەرجێ ئێمە دەوڵەتی قودس تەسلیم دەکەین کە نابێ یەک یەهوودی لەوڵاتی قودس دا بمێنێت.

عومەری کوڕی خەتتاب -ڕەزامەندی خوای لێبێت- ئەو پیاوە بەڕێزە قبوڵی مەرجەکەی کرد هەرچی یەهوودی لەقودس بوو هێنایانە دەرەوە لەشوێنی تردا نیشتەجێی کردن، لەبەرئەوەی بەبێ شەڕ قودسی گرت.

ئەگەر سەیری ڕێکەوتنی یەهوودی بکەین ئێستا لەگەڵ ئەمریکا، فەرەنسا، ئینگلیز هەموو ئەو وڵاتانە پێکەوە دەبێ بزانین بۆچی ئەم ڕێکەوتنەیان مۆرکردووە لەنێوانیاندا!

لەبەر ئەوەی شەڕی هەموویان بەرامبەر بە موسڵمانانە، دژی موسڵمانان شەڕدەکەن، یەهوود لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لەشاری مەدینەی منەوەرە نیشتەجێ بوون وەکوو خوو و نەریتێک هەروەکوو ئێستا کەهەن، ئەو خووەی ئێستا هەیانە نەگۆڕاوە وەک لەسیرەدا هاتووە دڵێکی ڕەق هەمیشە ئەخلاقی لادەری و خراپیان هەبووە، حەزیان بە فیتنە بووە و هەمیشە ویستوویانە دەسەڵات و سامانیان درووستکردوە بۆ هێنانەدی ئاواتیان و چەکیان فرۆشتووە لەنێوان هۆزەکاندا، هۆزی ( ئەوس و خەزرەج) یان دابوو بە شەڕ، چەکەکانی خۆیان پێ دەفرۆشتن، هەمیشە کاری ئەوەیان دەکرد بەدڕەووشتی لەناو خەڵکدا بڵاودەکردەوە، بۆئەوەی دەستبگرن بەسەر خەڵکدا، ئەمە کاری ئەوان بووە بەدرێژایی مێژوو، ئێستا بە هەمانشێوە هەر بەردەوامن لەو جۆرەکارانە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## شارستانی حەبەشە:

سەردەمی دەسەڵاتی دەوڵەتی حەبەشە (ئەتیوبیا)ی ئێستا، پێش هاتنی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ حەبەشە وڵاتێکی نەسرانی مونحەریف بوون واتە شوێنکەتووی "کورسی بابەویان" پێدەوترا یاخوود کورسی ئەسکەندەری کە دینێکە پێی دەوترا دینی (مەنفوسیا)، باوەڕیان وایە کە مەسیح خوایە یاخوود کوڕی خوایە، ژیانێکی زۆر سەرەتاییان هەبوو لەگەڵ ئەوەشدا چەک و جبەخانەی بەهێزیان هەبوو لەسەردەمی پێشهاتنی پێغەمبەردا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

کەسێک هەبوو بەناوی (نەجاشی ئەسحەمی) -ڕەحمەتی خوای لێبێت- کەس نەیدەتوانی زوڵم بکات، لەوکاتەدا نازناوی نەجاشی درا بە پادشاکانی حەبەشە.

## شارستانێتی هەردوو ئەمریکا:

هیندەسوورەکان تیایدا دەژیان، بەڵام لە ئێستا نەماون. لەسەردەمی ئەوروپییەکان کەچوونە ئەمریکا هەموویانیان کوشت. وەکوو مێژوونووسان دەڵێن سەد ملیۆن کەس بوون لەو کیشوەرەدا ژیاون، هەموویان لەناوبردوون.

ئەمانەی کەباسکران وێنەی پێش هاتنی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوون.

ئیتر بێزار بووم لە شارستانێتی پڕ کارەساتی ئەو سەردەمەی جیهان ئەوەندە ماندوو بووم لەتاواندا بەسەر کتێبەکەوە خەوم لێکەوت، بەڵام دەبێت بگەڕێمەوە یاخوود تەواو ئیتر توانای گەڕاندنەوەم نەماوە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## چاوپێکەوتنێک لەگەڵ سەلمانی فارسی دا

بەردەوام بووم لە خوێندنەوەی کتێبەکەی مام فەرغەلی، بەڵام تەنها زانیاریم لەسەر شارستانییەتەکانی پێشوو دەخوێندەوە کە باس کرابوو، ئەو ڕەوشەی کە ڕووی تێکردبووم لە پێشووتردا چووبوومە ناو ئەو ژیانەوە وەک ژیانی خۆمی لێهاتبوو ئاواتم بۆ گەڕاندنەوە بووە خولیاو هەر ئەو کتێبە بەدەستمەوە بوو ناچار دەقەکانیم لەبەر دەکرد.

ئێوارەیەکی پێنج شەممە بوو بەڕۆژوو بووم، زۆرم برسی بوو بەرماڵم داخست دانیشتم چاوەڕوانبووم بۆ نوێژی مەغریب هەندێک نزا و پاڕانەوەم کرد، خێزانم خەریکی سفرە ڕاخستن بوو سەری مەنجەڵی هەڵدایەوە بۆنو بەرامی نان و چێشتەکەی لەسەر بەرماڵەکە هەڵیساندم و بەرماڵەکەم جێهێشت.

باران: نوێژەکەت بکردایە ئەنجا بهاتیتایە بە ئیسراحەت نانەکەت بخواردایە.

ماکوان: نا، سوونەتی پێغەمبەری خوام ﷺ پیادەکردووە کە دەفەرموویێت: کە نان دانرا نوێژ کردن وازلێبێنن تا نانەکەتان دەخۆن، بۆ ئەوەی دڵتان لای نانەکە نەبێت خەیاڵتان بڕوات.

إِذَا قُدِّمَ العَشَاءُ، فَابْدَؤُوا به قَبْلَ أَنْ تُصَلُّوا صَلَاةَ المَغْرِبِ، ولَا تَعْجَلُوا عن عَشَائِكُمْ[٨]

نان خورا دیسان کەڵکەڵەی کتێبەکەم کەوتەوە سەر، چوومە ژوورێک بەتەنها کردمەوە، لە دڵی خۆمدا زۆر پاڕامەوە کە بچمەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو لاپەڕەیەم دەست نیشان کردبوو کە لەسەری هەڵسابووم. دەستم کردەوە بە خوێندنەوەی چوومە سەر ژیانی کەسێک کە زەردەشتییە کوڕی پیاوێکی خانەدانی زەردەشتییەکانە.

چاوم بەرز کردەوە لەبناری شاخێکی سەوز و جواندام هەوایەکی فێنک دێت، چەمێکی سازگاری بەخوڕ لەپشتمەوە تەی دەکات، جریوە و چەهچەهەی باڵدار و چۆلەکە و کەناری

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٨] صحیح البخاري، رقم ٦٧٢



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەو سرووشتەیان مەست کردبوو. لەخۆشیدا هاوارم کرد سووپاس بۆ خوا گەڕامەوە، سووپاس بۆ خوا گەڕامەوە.

بەڵام دوای تۆزێک بیرم کردەوە کە ئێرە سەحرای عەرەبستان نییە، بەڵکوو ئەمە زۆزان و کوێستانە! من لەکوێم؟ هاوارم کرد شێخ فەرغەلی! شێخ فەرغەلی! هیچ دەنگێک نەبوو...

تۆزێک هەڵسوڕام بەدەوری خۆمدا تولە ڕێیەکم دۆزییەوە جێگای پێی مرۆڤ و ئاژەڵ بوو شوێن ئەو تولە ڕێ کەوتم. دوای ماوەیەک لە ڕێکردن هەستم بە برسێتی کرد هیچ ئاوەدانیشم نەدەبینی، بەردەوام بووم لە ڕۆشتن.

لەدوورەوە پیاوێکم بینی ڕای دەکرد ڕەنگی جلەکانی بەری سوور و سپی بوو، لە شێوەی جلو بەرگی بووزییەکان دەچوو. منیش لەخۆشیدا ڕامکرد بۆلای پرسیم، بێزەحمەت براکەم ڕاوەستە، من غەریبم پرسیارێکم هەیە؟

ئەو کەسە ڕاکردنەکەی خێراتر کرد، بەڵام دیار بوو ماندوو بوو منیش ڕووەو ئەو ڕامکرد، ناچار بووم بیگەمێ دەمزانی جێگایەک هەر شارەزایە ئەگەر چی بشترسێت.

منیش ڕامکرد بەدوایدا تا گەیشتمە لای وتم: مەترسە! من غەریبم ڕێگام لێ هەڵە بووە.

دیار بوو لێم تێنەگەیشت، ئەویش بەزمانێک قسەی دەکرد کە ئاشنا نەبووم بەو زمانە، منیش ناچار بۆ ئەوەی تێبگات، وتم: زمانی ئینگلیزی، عەرەبی، فارسی، کوردی، هیچ دەزانی؟

وتی: پارسی، پارسی! بە جۆرێک دەستی کرد بە قسە کردن لە نێوانی فارسی و لوڕیدا بوو زانیم زمانەکەی فەهلەوییە، یاخوود پەهلەوی و نزیکە لە زمانی ئاڤێستایی ئارییەکانەوە، پێشتر خۆم بەووردی لێکۆڵینەوەم لەسەر کردبوو. تێگەیشتم کە ئەم زمانەی قسەی پێدەکات زمانی سەردەمی ئەشکانی و ساسانییەکان و بە زمانی ناوەندی ئێرانی مەشهورە (پارسینگ).

کە قسەی کرد زانیم لە دەوڵەتی فارسی ساسانی دام!

ماکوان: ناوت چییە؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کابرای فارس: ناوم (روزبەماهو)وە کوڕی (خەشفوزان)م، لەدەست کەسووکارەکەم ڕامکردووە، دەمەوێت بڕۆم بۆ شام و ببم بە نەسرانی و وازم لە دینەکەی خۆم هێناوە، من کوڕی پیاوێکی ئاگر پەرستم.

لەم قسانە دابووم لەگەڵ ئەو پیاوەدا لەپڕ گوێم لەدەنگی ڕازی و عابید بوو هاواریان کرد، ماکوان! ماکوان! کە تەماشام کرد شێخ فەرغەلی لە دوایانەوە پێدەکەنێت بە دەستێ جلی سوودانییەوە تەماشام دەکات لە خۆشیدا ڕام کرد بۆلایان کابرای فارسم بە جێهیشت.

باوەشم پیاکرد ئەملاولای شێخ فەرغەلی-م ماچ کرد زۆر خۆشحاڵ بووم.

فەرغەلی: ئەو کەسە کێ بوو قسەت لەگەڵ دەکرد؟

ماکوان: بەخوا نازانم کێ بوو، دیار بوو کەتنێکی کردووە پێدەچوو ڕایکردبێت.

فەرغەلی: گەیشتی بەهەر کەس ناو و جێگای لێبپرسە، چوونکە ئێمە لەم وڵاتانەدا شارەزانین بە ناو و جێگاکانیانەوە لەوانەیە بیانناسین، ئەوە بکە بەبنەمایەک بۆ خۆت، چوونکە تۆ لە سەردەم و کاتێکی ترەوە هاتوویت، وایە ماکوان گیان؟

ماکوان: بەڵێ وایە، لێم پرسی ناوی روزبە ماهو-وە کوڕی خەشفوزان-ە و لە شاری ئەسفەهانەوە هاتبوو لە دێیەک بەناوی (جین) پێدەچوو زەردەشتی بێت و ئەیووت دەبم بە نەسرانی!

شێخ فەرغەلی: کوا بانگی بکە، ئەوە سەلمان-ی فارسییە، هاوەڵەکەی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

کە ئاوڕم دایەوە لەوێدا نەمابوو، هەرچی هاوارم دەکرد کاک سەلمان گیان! کاکە سەلمان-ی فارسی گیان! هیچ دەنگێک نەبوو لێمان ون بوو. هەر چوارمان هەرچی بە شوێنیدا گەڕاین، بەداخەوە نەمان دۆزییەوە.

ماکوان: شێخ فەرغەلی سەلمان چی دەکات لەم ناوە؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرغەلی: ئاگادارم چەند ڕۆژێکە بەدوای ئەوەدا دەگەڕێیت کە چۆن بێیتەوە بۆ لامان. هەموو شارستانییەتەکانت ئەم دیواو دیوکرد کە چۆن ژیانێکی خراپیان بەسەر بردووە بەدەست دەسەڵاتدار و پاشاکانیان پیش هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، وایە؟

ماکوان: بەڵێ وایە.

فەرغەلی: دەی سەلمان-ی فارسیش بەدوای دیندا دەگەڕا، دەیزانی کە دینەکەی زەردەشت خراپە بۆیە بەدوای ئایینی ڕاستیدا دەگەڕا و خەڵکی باش کەمە لەو سەردەمەی کە هێشتا پێغەمبەری خوا ﷺ نەبووە بە پێغەمبەر و خەڵکی بەدوای گۆڕانکاریدا دەگەڕێت. خەڵکیش بە گشتی تا تاریکی نەبینێت خۆشەوویستی بۆ ڕووناکی ناجووڵێت، ئەو زەمەنە هەمووی تاریکیی بووە.

ماکوان: ئێستا ئەو هاوەڵە بەڕێزە بۆ کوێ دەچێت؟ با فریای بکەوین تا نەبێتە نەسارا و بیکەینە موسڵمان.

فەرغەلی: ئێمە ناتوانین کات بگۆڕین، بەڵکوو لە ناو کاتی ئەواندا ڕێگا دەبڕین، ئەگەر توانیمان قسەیەک دەکەین، بڕوا ناکەم بتوانی قەدەری سەلمان بگۆڕین لەدەستمان دەرچوو.

ماکوان: ئێستا ئەو چی دەکات، چی بەسەر دێت؟

فەرغەلی: سەلمان کوڕی پیاوێکی ناودارە، لە دینی زەردەشتیدا یەکێک بووە لە ئەترۆبانەکان، بەڵام زۆر سەرنجی دەڕوات بۆ دینی مەسیحییەکان وەک بینیت ڕادەکات دەچێتە وڵاتی شام لەوێ لە کەنیسەیەک دادەنیشێ لەشام، زۆر گەڕاوە بەدوای خەڵکدا بۆ چاکە و دین تا ئەو کۆمەڵگایە لە تاریکی دەربهێنێت.

بۆماوەیەک لەو کڵێسایە ئەژی، دوایی تەماشا دەکات پاپای کڵێسا کەسێکی زۆر درۆزنە، کە دەبینێ پارە و سەروەت و سامانێکی زۆر لەخەڵکی کۆدەکاتەوە ئەم تەنها سەرنج ئەدات تاکو پاپا دەمرێ، پاش ئەوە خەڵکی بانگ دەکات دەڵێ ئەمە خیانەتی لەئێوە کردووە لەدوایدا ئەو پارەیەی کە کۆی دەکاتەوە زیاد لە سێ سندوق یاخوود بەسێ شاخ پارە و ئاڵتون و زێڕ و زیوی هەڵداوەتەوە، خەڵکەکە دەڵێن سەلمان ڕاستی کردووە و زۆریان خۆش دەوێت.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پاش ئەوە واز لە دینی مەسیحی دێنێت و ڕوو دەکاتە لای پیاوێک پێی دەڵێت:

مامە فێرم بکە بچم بۆ کوێ، پیاوێکی باش هەبێت تا بچمە لای دینداری بکەم؟

ئەویش پێی دەڵێ بڕۆ بۆ موسڵ ئەوەی لەسەرچاکە مابێتەوە هەر ئەو کەسەیە، ئەویش دەڕوات ماوەیەک لەوێ دەمێنێتەوە خەریکی چاکەکاری دەبێت تا ئەو پیاوچاکە دەمرێت.

پێش ئەوەی بمرێت پێی دەڵێت: بچم بۆ کوێ کەسێکی لێ بێت چاکەخواز بێت؟

پیاوچاکەکە دەڵێت: بڕۆ بۆ "نوسەیبین"[٩] شوێنێکە لە موسڵ-ەوە دوورە، پیاوێک هەیە لەوێ باشەو کەسێکی دادپەروەر و دیندارە.

دەچێتە لای ئەو پیاوە لە کۆتایی ژیانیایەتی، سەلمان پێی دەڵێت: مامە پێم بڵێ بچمە لای کەسێک کە لەسەر ئەم زەوییە باش بێت؟

ئەویش دەڵێت: کەسێک نابینم لەم شارەی خۆماندا، بەڵام کەسێک هەیە لە (عاموریا) تورکیای ئێستا لە نێوان تورکیا و سوریا، لەوێ پیاوێکی لێیە لەسەر حەق ماوەتەوە.

سەلمان دەڵێت: کەچوومە ئەوێ زۆر دەوڵەمەند بووم، سەروەت و سامانێکی باشم پێکەوەناو بوومە خاوەنی چەند سەر مانگا و مەڕوماڵات و ئەسپ و پارە...هتد، لەدواییدا ئەو پیاوە وەفاتی کرد باسی ئەوە دەکات کە بەو پیاوەی وتوە من چی بکەم لەدوای تۆ بچم بۆ کوێ؟ ئەویش دەڵێ کەسێک شک نابەم لەسەر زەوی چاکە خواز بێت، بەڵام بڕۆ کەسێک هەیە کەبەشوێنی دەگەڕێن، پیاوێکە لەوڵاتی عەرەبەوە دێت کە پێغەمبەری ئاخر زەمانە.

ماکوان: ڕاستە منیش لە جێگایەکدا خوێندبوومەوە کە ئەو سەردەمە مووژدەی هاتنی پێغەمبەریانداوە.

لەوانە کەسێک هەیە لە دینی زەردەشتی دا بەناوبانگە بەناوی (پیر شالیار)، ئەم پیر شالیار-ە کەسێکی زۆر شارەزا بووە لەئایینی زەردەشتی، زانایەک بووە بۆیە (گاوان یاخوود جابانی کوردی) دێتە لای پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوایە و کوردە،

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٩] نصیبین



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئێمە تەنها ناوی ئەم هاوەڵە بەڕێزە کوردەمان بیستووە کە (الشيخ الكوردي)ش هەیە لە (مغنی محتاج) هاتووە، کەدێتە لای پیغەمبەری خواصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەپرسن: پیرشالیار بەئێمەشی وتووە پێغەمبەرێک دێ لەوڵاتی عەرەبەوە، بۆیە ئێمە هاتووین بۆلای تۆ.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەیان گەڕێنێتەوە بۆ کوردستان، بۆیە هێزێکی موسڵمانان دێتە ناو کوردستان ڕاپەرینێکی گەورە ڕوودەدات لەشارەزوور و شارباژێڕ دژی دەوڵەتی فارسی ساسانی، کورد بەئارەزووی خۆی کە دەزانێ ئەمە هێزێکی حەقە، زۆر جار یارمەتی هێزەکەشیان داوە.

فەرغەلی: من ئەو مێژووە شارەزا نیم، بابێمەوە سەر باسەکەی خۆمان جارێ، سەلمان-ی فارسی کاتێک دەگێڕێتەوە دەڵێت؛ لە عاموریە کۆمەڵێک دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی عەرەب، پاشان لە عاموریە کە دەرئەچێت ئەو خەڵکە دەبینێ کاروانچییەکان سەلمان-ی فارسی بێ ئەوەی گەشتبێ بەخزمەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بیناسێت، بزانن چۆن دوای حەق کەوتووە! بۆیە هەمیشە دەڵێم:

هەتاکو چێژی تاریکی نەبینن تامو چێژ لەڕووناکی نابینن!

چوونکە سەلمانی فارسی -ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لێ بێت- زانیبووی تاریکی چییە، بۆیە بەدوای ڕووناکیدا دەگەڕا، بۆیە بە کاروانچییەکانی وت هەرچی سەروەت و سامانم هەیە پێتان دەبەخشم لەبەرانبەریدا داوای کرد تەنها بیبەن بۆ ئەوێ، ئەو سەروەت و سامانەی هەیبوو بەخشی بەوان و لەگەڵیان ڕۆیشت.

سەلمان-ی فارسی خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێت؛ کە گەیشتمە (رقە) یاخوود (وادي القرى)ی پێدەوترێ، لەوێ زۆر زوڵمیان لێکردم منیان فرۆشت وەک بەندەیەک. فرۆشتیان بەپیاوێک پاشان لە ئەهلی رقە فرۆشتیان بە پیاوێکی جوولەکە لەمەدینە، هەروەها بۆمان دەگێڕێتەوە ڕۆژێکیان سەیدەکەم لەگەڵ برازایەکی خۆیدا قسەی دەکرد وتی ئای چ گیرێکمان خواردوە بەدەست ئەم پیاوەوە کەهاتووە، ئێمە نەئیشمان بۆ دەکرێ نە ئەم دوو هۆزەش دەدەن بەیەکدا، مەبەستی هەردوو هۆزی (ئەوس و خەزرەج) بوو بانگەوازی پێغەمبەری دەکاو ناوی محمدە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سەلمان-ی فارسی دەڵێت: من لەسەر دارخورمایەک بووم لەکاتێکدا گوێم لەو قسەیە بوو ڕاپسکام خەریک بوو لەسەر دارخورماکە بکەومە خوارەوە. سەلمان دەڵێت: هاتمە خوارەوەو وتم: ئەوە وتت چی؟ ئەوە وتت چی؟ ئەوە وتت چی؟

ئەویش دەڵێ بەسەر سوڕمانێکەوە سەیری کردم وتی: ئەوە بۆ وادەکەی بڕۆ سەرداراەکە، لێی تووڕە دەبێت، ئەویش دەڵێ ویستم دڵنیا ببمەوە لەو قسەیە، کابراش قسەکەی بۆ دووبارە دەکاتەوە دەڵێت کەسێک هاتووە ناوی محمدە کە بانگەوازی پیغەمبەرایەتی دەکات، پاش ئەوە سەلمانی فارسی گەڕا بەدوای حەقداو دەگاتە پلەیەک کە دەبێتە گەورەترین پیاوی سەر زەویی و پیاوی ناو ئەم ئیسلامە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (سَلْمَانُ مِنَّا آلَ الْبَيْتِ).[10]

واتە: سلمان لەئێمەیە ئال و بەیتی ئێمەیە.

ماکوان: ئەی لە شاری مەککەدا کەس نەبوو بزانێت کە پێغەمبەر محمد ﷺ ڕاستە و دێت خەڵکێک نەمابوون لەسەر دینی حەق و ئیبراهیمی؟

فەرغەلی: خەڵکی زۆر کەم مابووەوە لە مەککە لەو سەردەمەدا کە لەسەر دینێکی ڕاستی مابێتەوە وەکوو (زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نەفیل، وەلیدی کوڕی سەعدی کوری زەید) ئەم دوو پیاوە بەڕێزە حەنەفی بوون لەسەر دینی ئیبراهیم بوون -سەلامی خوای لێ بێت-، وەرەقەی کوڕی نەوفەل کەسێکی مەسیحی بوو ناوەکان لەمێژوودا هەن کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، بۆیە ئەمەشم هێنایە پێش چاوی تۆ، باسم لێوەکرد نرخی نوور و ڕووناکی نازانین هەتاکوو تاریکی نەبینین.

سەیری خوو و نەریتی ئەو سەردەمانە بکەین چۆن خەڵکی تیا ژیاوە کە ئێستا من و تۆی بۆ گەڕاوینەتەوە، هەر بۆیە لەوکاتەدا خوای گەورە پیغەمبەرە ئازیزەکەی ﷺ دەنێرێت.

---

[10] قال الهيثمي في المجمع (١٣٠/٦) : رواه الطبراني وفيه كثير بن عبد الله المزني وقد ضعفه الجمهور وحسن الترمذي حديثه، وبقية رجاله ثقات



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

درێژەی ئەو باسەی کەکردم وەڵامی ئەو پرسیارانەیە کەبۆچی لەوکاتەدا پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ هاتووە.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ ۚ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَـٰبٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾﴾

ئەی خاوەنانی کتێب، دڵنیا بن کە پێغەمبەری ئێمە بۆسەر ئێوەش ڕەوانە کراوە تا زۆربەی ئەو شتانەی کەلای ئێوە ڕوون و ئاشکرا نین و دەیشارنەوە لە کتێبی (تەورات و ئینجیل دا) بۆتان ڕوون و ئاشکرا بکات، هەروەها لە زۆر شت چاوپۆشی دەکات (ئەگەر پەشیمان ببنەوە و ڕوو بکەنە پەروەردگاری تاک و تەنها) چوونکە بەڕاستی لەلایەن خواوە ڕووناکییەکی ئاشکراتان بۆ ڕەوانە کراوە (کە محمد پێغەمبەرە) هاوڕێ لەگەڵ کتێبێکی ئاشکرادا کە ( قورئانە).

﴿يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَـٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٦﴾﴾ [المائدة]

(بێگومان) خوا بەو قورئانە پیرۆزە هیدایەت و ڕێنمونی ئەو کەسانە دەکات کە بە شوێن بە دەستهێنانی ڕەزامەندیی ئەودا وێڵن و بەرەو ڕێبازەکانی ئاشتی و ئاسوودەیی دەیانبات، بەفەرمانی خۆی لە تاریکستانەکان دەریان دێنێت و ڕزگاریان دەکات و دەیانخاتە ناو ڕووناکییەوە، ڕێنموونییان دەکات بۆ سەر ڕێگە و ڕێبازی ڕاست و درووستی (دینداری و خواناسی و چاکە).

ئەمە بەگشتی ئەو نوورە بوو لەوسەردەمە، خوای گەورە لەوکاتەدا ناردی هۆکارەکەی ئەوە بوو کە بزانین بۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ هاتووە.

واتە چاکە و باشە زۆر لاواز ببوو بۆیە خوای گەورە قورئان دەنێریت بە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ دا بۆ ئەوەی چاکسازی بکات، پێش هاتنی قورئان تەماشای خەڵکی بکە و دوای ئەوەشی کە محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ قورئان بڵاو دەکاتەوە چی درووست دەبێت چۆن شارستانی درووست دەکات.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: ئێستا چی بکەین یاشێخ؟

فەرغەلی: ئەو دەستە جلە لەبەر بکەو دەگەڕێینەوە بۆ مەککە، ئیتر پێوویستە ژن بهێنیت و ماڵ درووست بکەیت و منداڵت هەبێت و تێکەڵ بیت لەگەڵ ئەو کۆمەڵگەیەدا!



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## لێکچونی زەمەنی ئێستا و ڕابوردومان

کەوتینە ڕێ بەرەو مەککە، لە ڕێگادا لە شێخ فەرغەلیم پرسی: کاکە برسیمە هیچت پێ نییە بیخۆین؟

فەرغەلی: شتێکی وامان پێ نییە، ئێستا دەچینە جێگایەک بزانین هەندێک نان و پەنیر ناکڕین.

ماکوان: بۆ پەنیر لەم سەردەمەدا هەیە؟

فەرغەلی: لەم ناوچەیەدا پەنیرێکی زۆر خۆش و نانی زۆر جوان درووست دەکەن، هەولئەدەین خۆشمان ڕاو بکەین، دەمە و ئێوارە خۆمان مەڵاس ئەدەین بۆ ڕاو.

ماکوان: باشە، خۆزگە سیلاحمان پێدەبوو؟

فەرغەلی: ئەی ئەوە نییە پێمانە.

ماکوان: نا مەبەستم کلاشینکۆفێک یان قەناسێک؟

فەرغەلی: بە پێکەنینەوە؛ ئیتر باسی ئەو شتانە نەکەیت، کەس لێت تێناگات، پێت پێدەکەنن!

ماکوان: ئەزانم؛ بەڵام بڕوا بکە شێخ فەرغەلی برام هیچ فەرقێکی وا نابینم لە خەڵکی ئێستاو ئەو سەردەمەی کە خۆمانی تێدا دەژین.

فەرغەلی: چۆن؟ تێناگەم ئەم سەردەمە و سەردەمی خۆمان زۆر جیاوازن لە ڕووی پێشکەووتنەوە.

ماکوان: ڕاستە لە ڕووی پێشکەووتنەوە گومانی تێدا نییە، بەڵام لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ڕەوشت و خەڵکەوە هەریەک جۆرن ئەمە سەردەمی جاهیلییەتە، بەڵام جیاوازی نابینم لەنێوانی خەڵکەکان دا، ئەگەر بڵێم سەردەمی ئێمە هەروەک ئێستا پێوویستی بە پێغەمبەرێکە بۆمان بێت! بەڵام بەداخەوە پێغەمبەر دوای حەزرەتی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نایەت.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرغەلی: لێت تێناگەم ئەتەوێت چی بڵێیت ماکوان؟

ماکوان: ئەو سەردەمەی کە لە کتێبەکەدا باس کراوە لە دەوڵەتی فارس، ڕۆم، چین، هیند و میسر تا دەگاتە هەموو جیهان، ئایا زەمەنی ئێستا پێویستی بە ئیسلام نییە؟ پێویستی بە هاتنی پێغەمبەری خوا نییە سەرلەنوێ بگەڕێتەوە ناومان؟

خۆت وەڵام بدەرەوە شێخ فەرغەلی؟

فەرغەلی: بە دڵنیاییەوە قسەکەت ڕاستە لە ڕووی کۆمەڵایەتی، ڕەوشت، ئابووری تەنانەت ئاکارەوە وێرانە.

ماکوان: لای هەموو خەڵک ئاشکرایە کە کۆتا پێغەمبەر محمد ﷺ وە چیتر زیندوو نابێتەوە، بەڵام ئەوەی کە لەناوماندا ماوە شەریعەتە ڕەبانییەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ ئایا پێتوانییە ئەم دنیایە بە هەموو ئەوروپا وڵاتانی ئیسلامی هەر هەموو بەگشتی پێویستیمان بەوەیە جارێکی تر ئیسلام بگەڕێتەوە؟

ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ زیندوو بێتەوە لەناوماندا بە سوونەتەکانی؟

فەرغەلی: بە پێکەنینەوە؛ ئەی من و تۆ بۆ لێرەین ماکوان؟

ماکوان: حەز دەکەم بەدەم ڕێگاوە باسی سەردەمی خۆمانت بۆ بکەم وەرە سەیری کۆمەڵگەکان بکەین چۆن تووشی دڕندەیی و تاوان " ئینحراف" و ڕەفتاری ناشرین بوون، سەیری وڵاتان بکەین بەرەو کوێ دەڕوات بزانن تووشی چ کارێکی ئەخلاقی و "شذوذی جنسی" بوون!

دەزانیت پێویستمان بەوە هەیە کە ئەم سەر زەوییە خەڵکێک بیگرێتە دەست کە شوێنکەوتووی محمدە ﷺ. باشە چۆن بتوانین ئەو سەردەمەی کەخوێندمەوە لە شارستانێتییەکان گرێی بدەین بە ئێستاوە؟ ئەو کۆمەڵگەیە هەمان ئەو کۆمەڵگەیە کە ئێستا ئێمەی تێدا دەژین.

تەماشای شارستانیی نوێی ئەمریکا بکەین بەیەکەوە...

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

وەزارەتی دادی ئەمریکی باسی کردووە و دەڵێت: ڕێژەی ئەو خەڵکانەی لە ژێر تەمەنی ١٨ ساڵیدان ٢٥٪ خەریکی زینان. لەشارەکان ٨٠٪، لە لادێکان ٣٣٪، هەموو مانگێک جارێک ٣٥٠ هەزار ئافرەت دووگیان دەبن بەو هۆکارەوە منداڵەکەیان فڕێ ئەدەن. بەهەمان شێوە ٢٣٪ وڵاتی ئەمریکا نازانێ باوک و دایکی کێیە! وەزارەتی دادی ئەمریکی لە یۆلیۆی ساڵی ١٩٩٤ ڕاپۆرتێکی ترسناکی بڵاوکردەوە دەڵێت: ڕێژەی دەست درێژی (أغتصاب) لەشارێکی وەکوو نیویۆرک ٣٨٠٠ حاڵەتبوو، بۆ ئەو کەسانەی تەمەنیان لە ژێر ١٢ساڵە، لە ساڵی ٢٠٠٩ هەر لەشاری نیویۆرک دا ڕێژەکە گیشتە ٧٢٠٠ حاڵەت.

ئایا ئەو خەڵکە پێویستی بە ئیسلام نییە؟ لە ساڵی ٢٠١٧ ڕێژەکە گەیشتۆتە ٩٢٠٠ حاڵەت.

٢٠٪ ی ئەو کچانەی دەستدرێژیان کراوەتە سەر لە ڕێگەی باوکیانەوە بووە، ٢٦٪ لەلایەن خزمەکانیانەوە، ٥١٪ بەهۆی هاوڕێ و تێکەڵاوبوونیان بە خەڵکی خراپ، ٤٪ لەڕێگەی خەڵکی نادیارەوەیە.

سەیری عوورفی ئەمریکا بکەین ٨٥٪ منالی ئەمریکا کە لە دایک دەبێ نازانێ دایک و باوکی کێیە، ٤٪ خەڵکەکەی خەریکی خۆکوژییە، لەساڵی ٢٠٠٨دا زیاد ٣٢٠٠٠ کەس خۆیان کوشتووە. چ شەڕێک ئەوەندە ڕێژەی کوشتاری تێدابوە؟

لە ئەوروپادا دوانزە هەزار حاڵەتی خۆکوشتن هەبووە لەساڵی ٢٠١٦.

سەیری شەڕی ئەمریکا بکە بەرامبەر بە وڵاتانی جیهان:

قومبەلەیەکی کێشا بە هیرۆشیما و ناکازاکی دا لە بەرواری ١٩٤٥/٩/٦ ( ٢٥٠) هەزار کەسی کوشت لەیەک کاتدا، (١٠٠) هەزار کەس تووشی ئیفلیجی بووە، لەمانگی مارسی ١٩٤٥دا قومبەلەو ناپاڵمێکی کێشا بەتۆکیۆ دا (٨٠) هەزار کەسی یابانی مەدەنی کوشت. باشە ئەو خەڵکە پێوویستییان بەم ئیسلامە نییە؟

شەڕی کۆریا لەساڵی ١٩٥٠ وەکوو شەڕی ڕۆم کە خوای گەورە باسی دەکات، شەڕی کۆریای باشوور کە لەژێر چەتری وڵاتە یەکگرتووەکان کرا، زیاد لە ٥ ملیۆن کەس لە کۆریای باشوور




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کوژرا، زیاد لە نیو ملیۆن سەرباز و ملیۆنێک لە مەدەنی و کۆمەڵێکی تریان بە برسێتی مردن، ئێستاش لە کۆریای باشور ٣٠-٤٠٪ خەڵکەکەی لەسەر گژوگیا دەژین.

شەڕی ڤێتنام ساڵی ١٩٦٣-١٩٧٥ ئەمریکا چی نەکرد بەڤێتنام؟ باشە پێوویستییان بەم ئیسلامە نییە بیگەڕێننەوە، ٣-٤ ملیۆن خەڵک بەدەستی ئەمریکا لە ڤێتنام کوژرا، بەگەورەترین شەڕ ئەژمێردرێت لە جیهاندا.

شارستانی نوێی ئەوروپا تەماشا بکەین کە خۆم لەو کیشوەرەدا دەژیم..

هیتلەر چی نەکرد؟ ستالین بەهەمان شێوە، سەیری ئەوروپا بکەین ڕێژەی منداڵی غەیرە شەرعی لە سوید ٥٠٪ دایە، لەبەریتانیا ٣٣٪، فەڕەنسا ٣٣٪، لەساڵی ١٩٩٧ سەرۆکی فەڕەنسی "جاک شیراک" بەبۆنەی منداڵێکی غەیر شەرعی کچەکەی کەنازانێ باوکەکەی کێیە و کچەکەی لەگەڵ کێ خەوتووە گەورەترین ئاهەنگی گێڕا!

سەیری ئینگلیز بکەین ٦٥٪ ئەو گەنجانەی تەمەنیان ١٦-١٩ ساڵ دەبێ، "ممارەسەی سێکس" دەکەن بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ سنوورێک کە لەنێوانیان دا هەبێت، ٥٥٪ گەنجەکان ١٦-١٩ ساڵ مودمینن بە مەی و مەشروب و مادده هۆشبەرەکان (مخدرات)ەوە.

لە بەریتانیا هەر لە ١٧٠ ئافرەت کە لە خوار ١٧ ساڵیدان هەموو هەفتەیەک لاشەیان دەفرۆشرێت وەک "سۆزانی" بەپێی یاسایەکی فەرمی بۆیان ڕێکخراوە.

لەڕووسیا ئینکاری بوونی خوا دەکرێت بەتەواوەتی، شوعیەتێکی فاسدیان هێنایە پێشەوە تا ئەو خەڵکەیان لەناوبرد. وەزعی ئەفریقیا ١٣ ملیۆن خەڵک دەمردن بەهۆی کەمخۆراکی لە باکووری ئەفریقا ملیۆنێک خەڵک لە ئەتیوپیا، ملیۆنەهای تر لە سۆماڵ لە بەر برسێتی دەمرن. ٦٠٠ ملیۆن ئەفریقی هەموو ڕۆژێک داهاتیان نیو دۆلارە واتە ڕێژەی هەموو پێکهاتەی ئەفریقیا (٧٩٪)ی قاڕەکە دەکات. ٥ ملیۆن ئەفریقی پەناهندەن، جگە لەو قەرزەی ٣٧٠ ملیارد دۆلارەی لەسەر ئەو وڵاتەیە، واتە ڕێژەی ٦٥٪ لە داهات دەبێ بیداتەوە لەقەرزدا.

کە سوژن دەکەین بە خەڵکدا با جار جار دەرزییەکیش بکەین بە خۆماندا.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

با سەیری جیهانی ئیسلامی بکەین شێخ فەرغەلی و خۆمانی لێ بێبەری نەکەین! وڵاتی ئێمە بۆچی پارچە پارچە بووە؟ ئوومەتی ئەم ئیسلامە هەرگیزا و هەرگیز نامرێ، ئەمەش قسەی خوای گەورەیە هەر کاتێک ئوومەتی ئیسلامی لەناوچوو واتە قیامەتە، ئێمە باوەڕمان وایە خەڵکی سەر ئەم زەوییە هەموو مسوڵمان نابێ ئەوەش ناکرێ، بەڵام پێوویستمان بە سەرۆکێکی جەماوەرییە، ئەبێ ئێمە وابکەین سەرکردەیەکی جەماوەری خۆمان بەهێز بکەین و نوخبەی لەدەور کۆبکەینەوە بۆ ئەوەی مەنهەجی بگەیەنینە هەموو موسڵمانان، هیوادارم لەم قسەم تێبگەن ئەمە زۆر گرنگە بەدەرس وەری بگرین و هەموومان کاری بۆ بکەین، ئەوانەی لەدەووری ئێمە کۆدەبنەوە موسڵمانن، گرنگ لەوەدایە تۆ بتوانی خەڵکێک لەدەوور و پشتت کۆببێتەوە (واتە بە ئایدۆلۆژی کردنی ئیسلام و درووستکردنی نوخبەی ئیسلامی، بۆ ئەوەی پێگەی جەماوەری بەهێز بکرێت، تاکوو بتوانیت لە ڕێگای ئایدۆلۆژیاکەوە خەڵکە موسڵمانەکە پێبگەیەنیت و ڕۆحی شۆڕشگێری تێدا درووست بکەیت).

کاتێک کە شۆڕش لەناو کورد دا کرا شۆڕشی یەکێتی بوو، کاتێک یەکێتی هات لەئەنجامی ئەوە درووست بوو کە پارتی شکستی هێنا لەشۆڕشی ١٩٧٤- ١٩٧٥ دا، هۆکارەکەی ئەوە بوو سەرۆکێکی جەماوەری بەهێزی بۆخۆی هێنایە پێشەوە ئەم سەرۆکە جەماوەرییە توانی ئەو ڕەوشە بقۆزێتەوە بۆخۆی. خۆ ڕێکخستنی نەبوو بەڵام ئەچووە هەر دێیەک لە دێیەکەدا خەڵک لە دەوروپشتی بوو، کێشەکەیان کێشەیەکی ڕەوا بوو.

لەسەردەمی سەلاح دین ئەیوبی دا لەناو هێزی سەلاح دینی ئەیوبی دا -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- لەناو هێزو سووپاکەی سەلاحەدین-ی ئەیوبی دا هێزی مەسیحیشی تێدا بووە کە لەگەڵ سەلیبیەکاندا شەڕیان کردووە! ئەزانن بۆچی ئەو خەڵکەی لەگەڵدا بووە؟ لەبەرئەوەی سەلاحەدینی ئەیوبی-یان ناسیوە و زانیویانە ئیسلامەکەیان دادپەروەر بووە و دژی دینەکەی خۆیان شەڕیانکردووە لەگەڵ ئەمەشدا دیندار بوون زانیویانە لەژێر سایە و چەتری ئەواندایە، دەبێ ئێمەش بزانین ئەو خەڵکە تێ بگەیەنین کاتێک تۆ موسڵمان نیت، لەگەڵ موسڵماناندا نیت، بەڵام دەبێ بزانی لەژێر سایەی ئیسلام دا ئارام دەگری، نابێ ئێمە تەنها هەوڵ بدەین خەڵکی خۆمان لەدەوروپشتمان کۆببێتەوە ئەبی قسە بکەین و ئەو خەڵکەش تێ بگەیەنین بۆ ئەوەی لەگەڵمان بن بۆ ئەم ئیسلامە، چوونکە ئیسلام بۆ هەمووانە و تا بزانن ئێمە خێرو خۆشنوودیمان بۆ بێباوەڕیشە.

ماکوان: هیچ تێگەیشتی لێم شێخ فەرغەلی؟




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرغەلی: قسەکانت هەمووی باش و چاک و جوانن، دووبارەی دەکەمەوە بۆیە من و تۆ لێرەین، چوونکە تۆ دەزانیت کە ئەم سەردەمەی بۆی هاتووین و سەردەمی تۆ لەیەک دەچن، چۆن ئەم سەردەمە هەموو بە دوای پێغەمبەرێکدا دەگەڕێن بۆ ڕزگاری ئەو خەڵکە، سەردەمی تۆش کە گەڕایتەوە دەبێت بیگەینین بە خەڵکی کە هەموو کەس پێویستی بە ئیسلام و شەریعەتەکەیەتی.

ماکوان: زۆر ڕاستە، لەسەرئەنجامی ئەم قسانەم بۆ جەنابت پێویستمان بەوە هەیە ئەم دینە بەتەواوی بگەیەنین، خەڵک ئێستا لەم زەمەنەدا شەیتان دەپەرستن، وەک لەو فەرموودەیە کە ئەبوو هورەیرە -ڕەزامەندی خوای لێبێت- دەڵێت:

(إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ أَيِسَ أَنْ يُعْبَدَ بِأَرْضِكُمْ هَذِهِ، وَلَكِنَّهُ قَدْ رَضِيَ مِنْكُمْ بِمَا تَحْقِرُونَ).[١١]

واتە: شەیتان لەدەست مرۆڤەکان بێئومێد بووە، تەواو چۆتەوە ماڵەوە گۆڕەپانەکەی بۆ مرۆڤ خۆی بە جێهێشتووە، مەبەستم لەوەیە ئێستاش ژیان پێوویستی بە گەڕانەوەی ئیسلام هەیە بۆ دەوڵەتی ئیسلامی بەتایبەتی و بەگشتی بۆ هەموو وڵاتانی تر.

ئەگەر سەیر بکەین وڵاتانی بیانی و ڕۆژاوا بە گشتی دەسەڵاتی سیاسی و سەربازی بەسەر موسڵماناندا هەیە و سەیری وجودی سەربازی بکەن لەوڵاتانی ئیسلامیدا هەروەک (فەڵەستین، عێراق، چیچان، کشمیر، کوردستان، کۆسۆڤۆ، بۆسنە، ئەفغانستان، تورکمەنستانی شەرقی، داغستان) هیچیان نییە.

ئابڵوقەی ئابووریان خستوەتە سەر سوودان و غەززە و ئێران و سۆماڵ و تورکیا...هتد. سەیری ئەو موسڵمانانە کەچۆن سەردەبڕێن و دەکوژرێن و لەناودەچن، چۆن بەدەستی هیندۆسەکان سەردەبڕێن، بەدەستی بووزییە بۆرماییەکان، سەیر بکەین کشمیر، ئەندەنوسیا، هیند، سۆماڵ، کینیا، فلیپین، کوردستان و فەڵەستین و وڵاتانی تر.

ئاگاداری ئەمانە نین تازە بەتازە ڕاجیاوازیمان لەسەر ئەوە هەیە: دەست لەسەر سنگ بگرین یان نا!؟ مەولود بیدعەیە یان جائیزە؟! لەکاتی تەحیات پەنجە بجوڵێنی یان نەیجوڵێنی؟! شتی

[١١] إسناده صحيح أو حسن أو ما قاربهما، وله أصل في الصحيح

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

زۆر گەورەتر لەپێشتر هەیە، بۆیە پێویستە بزانین ئەم ئیسلامە چۆن بگەیەنینە ئەنجام، پاشان بزانین چۆن بە ململانێی خۆمانەوە ئێمەیان سەرقاڵ کردووە.

کوردستان داگیرکراوە بەدەستی وڵاتانی ئیسلامی تر.

ململانێی نێوان عێراق و عەرەبی، سوونە و شیعە.

ململانێی نێوان میسر و سودان لەسەر حەلایب.

لیبیا لەسەر شریتی ئۆزۆ وێرانبوونی دوای موعەمەر قەزافی تەراتێنی مووخابەراتی دنیا تێیدا.

مەغریب و جەزائیر لەسەر بیابانی ڕۆژاوا.

سینگال و مۆریتانیا لەسەر ڕووباری سینگال.

سعودیە و یەمەن لەسەر هەرێمی حەسیب و شیعەی حوسی.

ئیمارات و ئێران لەسەر جزیرەی ئەبوو مووسا.

سوریا و تورکیا لەسەر لێواری ئەسکندەریە و وێرانبوونی سوریا لە لایەکی ترەوە بەهۆی دەسەڵاتدارانی ناوخۆ و بەشار ئەسەدی خوێنڕێژ.

ئەرمینیا و ئازربایجان لەسەر هەرێمی کارباخ.

تورکیا و کوردستانی تورکیا، ئێران و کوردستانی ئێران، سوریا و کوردستانی سوریا...هتد.

ئەگەر دوو سەدە بگەڕێینەوە بۆ دواوە کەی لە وڵاتانی ئیسلامیدا ئەو گرفتانە هەبووە؟ ئەمریکا، ئاسیا، ئەفریقا و گشت وڵاتان پێویستیان بە ئیسلام هەیە.

فەرغەلی: باشە ماکوان بەڕای تۆ بۆ گەڕاندنەوەی ئیسلام چی بکەین باشە؟





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: گەڕانەوەی ئیسلام سەرەتا بە تێگەیشتنە لە ئیسلام و دامەزراندی بیرووباوەڕە لە مێشک و هزری خۆماندا و ببێتە جیهانبینی بۆمان، پێم وایە بتوانم لە دە خاڵ دا بۆت کۆبکەمەوە.

شێخ فەرغەلی: فەرموو ماکوان گیان!

ماکوان: پێم وایە دەبێت ئاوا دەست پێبکەین..

١- ئەبێت بزانین ئەم پەیامە پاک و بێگەردەی خوای گەورە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر تێکەڵی بکەین لەگەڵ هەر بەرنامە و ئایدیۆلۆژیایەکی تر یان هەر فەلسەفە و فیکرێکی تردا ئەوا سەرکەوتوو نابێت، ئەبێت ئەم پەیامە وەکو خۆی بمێنێتەوە و نابێت بڵێین: ئەمە ئیسلامی (دیموکراسی، لیبراڵی، پۆستمۆدێرن)ە، چوونکە تەنها موسڵمانی شوێنکەوتووی ئیسلامە کە لەهەموویان دەوڵەمەندترو جوانتر و بەرزترە.

٢- بۆ ئەوەی فێربین دەبێت بزانین سەرکەووتن تەنها لەلای خودایە، نابێت وا هەستبکەین بەپشتیوانیی خەڵکانی تر سەردەکەوین. دەبێت موسڵمانان لەناو خۆیاندا یەکگرتووبن پاشان دەتوانن سەرکەووتن بەدەستبهێنن.

٣- موسڵمانان دەتوانن سوود لەیاسا دانراوەکانی دەستی مرۆڤ وەربگرن، بەمەرجێک زیان نەگەیەنێت بەعەقیدە و دینیان.

٤- پێویستە ئەم جیلەی کە دەمانەوێت بوونیادی بنێین (نەوە)جیلێک بێت فێری زمانی عەرەبی بن. ئەمە خاڵێکی گرنگە چوونکە دەبێت زمانی قورئان بەپاکی ڕابگرین و فێری ببین تا لەدینەکە تێبگەین.

٥- لەنزیکەوە دەست پێبکەین. واتە من کە کوردم لەکوردستانەوە لە کەسوکارمەوە و خەڵکی تریش بەو جۆرە، هەرکەسەو لە وڵات و کەسوکاری خۆیەوە تا بتوانین سوودیان پێبگەیەنین، بۆ ئەمەش خوای گەورە دەفەرموێت:




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ [الشعراء].

ئیسلام لەناو خەڵکانی نزیکی خۆتدا بڵاوبکەرەوە باشترە.

٦- ئەم ئوممەتە هەڵناسێتەوە هەتا خەڵکانێکی ڕاستگۆ نەیەن بەڕێوە کە ئیسلامەکەیان لەخۆیان خۆشتر بووێت.

٧- دەبێت خەڵکێکی بەخشندە بین و ئەوەی باش و جوانە بیبەخشین بۆ ئەوەی ڕابێین لەسەر بەخشین، ئەمەش لەجیهاد دا خاڵێکی سەرەکییە.

٨- پێویستە واز لەکەسی ترسنۆک بهێنین، چوونکە دەبێت لەکەسی ئازا و دەستپاک و ڕاستگۆ و نزیک بینەوە.

٩- سوور بوون لەسەر عیزەتی نەفس، دەبێت خەڵکێک بین بەزەلیلی نەمرین، چوونکە هیچ کەس بەترسان تەمەنی درێژ نابێتەوە کەسیش بەئازایەتی تەمەنی کورت نابێت، بەڵام ئازایەتی هەڵبژێرین باشترینە بۆ ئەوەی ژیانمان بەشانازییەوە بگوزەرێنین.

١٠- پێوویستە پشت بەخۆمان ببەستین و لەسەرپێی خۆمان بووەستین لەکاتی تەنگانە و جیهاد و برسێتی و قسە وتنیشماندا ئارام گربین.

فەرغەلی: بارک الله ماکوان بۆ خۆت و شیکاریت، زۆر جوانە.

ماکوان: ئەی تۆش پێم بڵێ بۆ ئەم ئیسلامە لە مەککەوە دێت بە زمانی عەرەبی دێت؟

فەرغەلی: باشە بۆت باس دەکەم، بەڵام با بچینە ئەو دێیە کەمێک شت بکڕین، دەچم لەو ماڵە نان دەکڕم برۆ بەیەکەوە بچین. کە چووم کچێک هاتە دەرەوە هەر زۆر جوان بوو، لەجوانییەکەی سەرسام بووم لەتاواندا هەموو قسەیەکم لەبیر چووەوە.

کیسە پارەکەم بەدەستەوە بوو بەدەستمەوە گرتم بۆ ئەو، ئەویش هەر دەیووت ئەوە چییە؟ ئەوە چییە؟

لەتاو جوانییەکەی وتم هیچ هەمووی بۆ خۆت!





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرغەلی: نانی دەوێت بای ئەو پارە نانمان بدەرێ.

کچکە: نانمان نییە، تەنها ئاردمان هەیە.

ئاردەکەی لێکڕی داوای لێکرد شتێکی بداتێ تێیدا بیشێلین، منیش وەک سەحنی سەتەلایت نیگا و ڕووم لە دەرگا و پەرژینی ئەو ماڵە بوو حەوشەکەیان تەویلەی حەیوان بوو پڕ بوو لە مەڕ و چەند دارێک لە حەوشەکەیاندا بوو، خانووەکەیان لە قوڕ درووستکرابوو، کچەکەش تەماشای منی دەکرد و پاڵی دابوو بە دارەکەوە.

ماکوان: شێخ فەرغەلی ئەوە سەرسامە بە من وا سەیرم دەکات؟

فەرغەلی: نەوەڵڵا تۆی بەلاوە سەیرە وادەزانێت لە ئاسمانەوە دابەزیویت لە مرۆڤی ئەم سەردەمە ناچیت.

ماکوان: بۆ؟

فەرغەلی: تەماشایەکی خۆت بکە! ئەوە جل و بەرگی ئەم سەردەمەیە؟ جلەکانی کە پێم دایت بۆ لەبەرت نەکردووە؟

ماکوان: ڕاست دەکەیت کە تەماشای خۆمم کرد دیسان پانتۆڵێکی کابۆ و بلووسێکم لەبەردابوو، ئینجا بیرم کەوتەوە بۆیە ئەو کەسەشی کە وتیان سەلمانە منی بینی ڕایکردوە لێم وای زانیوە جۆرێکم لە مرۆڤی ئاسمانەکان.

فەرغەلی: ماکوان حەز دەکەیت ئەو کچەت بۆ داوا بکەم؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## بۆ دەبێت مەککە جێگای پێغەمبەر ﷺ بێت ؟

دوای ئەوەی ئەو نازدارەمان بینی ئاردو خوێ و هەندێک شتوومەکی ترمان کڕی، شێخ فەرغەلی وتی: ماکوان ئەڵێی چی ئەو کچەت بۆ مارە بکەم؟

ماکوان: ئاخر من ژنم هەیە زۆرم خۆش دەوێت، پێویستم بە ژن هێنان نییە.

فەرغەلی "بە پێکەنینەوە": کوا خێزانەکەت؟

ماکوان: ڕاستە لێرە نییە بەس خۆ دەگەڕێمەوە بۆ لایان.

فەرغەلی: لێرەدا تۆ پێویستت بە خێزانە و پێویستە لەم ژیانەدا خاوەنی خێزان و ماڵ و منداڵیش بیت.

ماکوان: یاشێخ ئەشێت سەیری ئافرەتێکی جوان بکەم، بەڵام بیرم بۆ ئەوە ناجووڵێت لە ئێستادا ژن بهێنم و بیر لەوە ناکەمەوە، برسیمە با نان درووست بکەین.

فەرغەلی: باشە ئەو تەپاڵانە بهێنە لەوێدا با لە دەووری ئەو بەردە ئاگرێک بکەینەوە و تەپاڵەکان بسوتێنین.

ماکوان: بەوە نان درووست بکەین؟

فەرغەلی: ئەی چۆن خۆشترین تام و بۆنی هەیە، خەڵکی هەر بەوە ئاگر دەکاتەوە.

عابیدو ڕازی چون بۆ ڕاو، بەڵکوو شتێک بگرن بیخۆین، تا ئەوان دێنەوە با من و تۆ هەویرەکە بشێلین ئەو بەردە پانە بهێنە ئێرەوە با نانەکەی لەسەر ببرژێنین.

ماکوان: کاکە ئەوە بۆ نان نابێت، ئەوە بۆ زۆپایەک یان شتێکی تر باشە؟

فەرغەلی: لەوە زیاتر نییەو داری ئێرە هەمووی تەڕە، ئەی خۆیت ئەوەیە نایخۆت هەر ئەوەیە.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: باشە!

لەم قسانەدا بووین ڕازی و عابید گەڕانەوە بە بزنەکێویەکەوە سەری بڕابوو، بەڵام لێی نەکرابووەوە و هەر بەلاشەیەوە بوو، ڕازی دەست و قاچی بە هەردوو دەستی گرتبوو ورگیشی نابووە پشت ملییەوە. خێرا گوریان و نانمان درووست کردو گۆشتمان برژاند ئەوەی کە مایەوە ئاردی پێدا کرد و لە پارچە قوماشێکەوە پێچا و هەڵیگرت، دیاربو وا گۆشتیان هەڵدەگرت! نزیکەی ٦٠ نانمان کرد و بەرەو شاری مەککە کەوتینە ڕێ، پرسیم ئێستا ئێمە لەکوێین؟

فەرغەلی: ئێمە لە وڵاتی پارسین لە نێوانی تەبرێز و حەلوانین.

ماکوان: ئەی باشە پێم بڵێ، ئەو پرسیارەی لێم کردی، بۆچی ئیسلام لە شاری مەککەوە دێت بۆ لە فارسەوە نەهات؟ بۆ لە ڕۆمەوە نەهات؟ یان لە چین یاخوود هەر وڵاتێکی تر؟

فەرغەلی: سەرەتا بەوە دەستپێدەکەمەوە بۆچی ئیسلام لەمەککەوە دابەزێنرا؟

یەکەم هۆکار ئەوەبوو کە ئەو شوێنە خاوەنی هیچ مێژوویەک نەبوو، ساڵانی خۆیان ناونابوو بەساڵانی جاهیلی. خۆشت دەزانی عەرەب چەندە جاهیلن، خاوەنی هیچ لە ڕۆشنبیری، فەلسەفە، فیکر، تەشریعات و یاسایەکی بەربڵاو ورد نەبوون، ژیانێکی سادە و زۆر سەرەتاییان هەبوو. لە کتێبەکەدا باسی دەوڵەتی ڕۆمی غەربی و شەرقیت خوێندەوە، کۆمەڵێک تەشریعات و کۆمەڵێک یاسای جیاوازی تێدابوو، ڕاستە زوڵم و چەوساندنەوە و خراپەکارییان هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا حوکمێکی ڕاستەوخۆی تەواویان هەبوو، یاسای ژیانی خۆیان پێ ڕێکخستبوو، وایە؟

ماکوان: وایە!

فەرغەلی: بۆنموونە یۆنان لەسەردەمی ڕۆمای ئەو کاتەی پێشهاتنی پێغەمبەرایەتی کۆمەڵێک فەیلەسووفیان تێداهەڵکەوتووە وەکو (سوقرات، ئەفلاتون، ئەرستۆ) ئەمانە زۆر بەتوانا بوون و خاوەنی دەسەڵات و زانست بوون، ئەگەر لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ بهاتایە، لەوانەبوو خەڵکی ئاماژەیان بەوە بکردایە کە یەکێکە لەفەیلەسوفەکان، وایە؟

ماکوان: ڕاستە لەوانەیە بیانووتایە (محمد)یش فەیلەسوفە!

فەرغەلی: ئەی بارک الله، کەواتە:

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەگەر لە دەوڵەتی فارسی ساسانییەوە بهاتایە کە پێشتر خوێندوتەوە، کە ئەوانیش خاوەنی فەیلەسوف و ڕۆشنبیری خۆیان بوون، نموونەی وەک (مەزدەک) بوو خاوەنی هزری شیوعی بوو کە ئێستا خەڵکی بەکاریدەهێنن و مارکس نوێیکردووەتەوە، هەروەکو زانییت خاوەنی (زەردەشت)یش بوون و ئاگرپەرستبوون. هیندییەکان کۆمەڵێک دەسەڵاتداری بەتواناو خاوەن هزریان لەناو کیان و دەسەڵاتی خۆیاندا هەبوو، خاوەنی ڕێساو یاسای تایبەت بوون بە خۆیان دەزگای دەوڵەت و دینیان هەبووە. وایە؟

ماکوان: وایە؛ کەواتە ئەگەر لەوێش بهاتایە خەڵکی دەیانووت محمد ﷺ شتێکی گرنگی نەهێناوە ئەوەتا دنیایەک فەیلەسوفی فارس و هیندی وجودیان هەبوو لەناوچەکەدا هەموو خەڵکی بەتوانا بوون.

فەرغەلی: زۆر ڕاستە کەواتە لێم تێگەیشتی، با نموونەیەکی تر بهێنینەوە.

وڵاتی چین خاوەنی (کۆنفۆشیۆس و بووزا) بوون، ئەمانیش داهێنەری یاساو ئایین و خاوەنی دەستووری خۆیان بوون، هۆکاری نەهاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو شوێنانەوە ئەوەبوو تا تێکەڵبوون ڕوونەدات لەنێوان ئەو هزر و فەلسەفانەدا.

ماکوان: زۆر ڕاستە!

فەرغەلی: نموونەیەکی تر بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونی...

میسر مێژوویەکی دوورودرێژیان هەیە لەیاسا داناندا و کۆمەڵێک یاساو ڕێسای خۆیان هەبوو، لەگەڵ بوونی ئەم هەموو هێزە گەورانەی سەرزەوی کە باسمان لێوەکردن بەگشتی، ئەم پەیامە کە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هات، لە جێگەیەکەوە هات تەنانەت هیچ ڕۆشنبیری و شارستانێتییەکی تێدانەبوو، تەنها هۆنراوەیان هەبوو، ئەمەش نابێتە هۆکاری درووستبوونی کۆمەڵگە و یاساو ڕێسا...هتد.

کەواتە: هیچکەس بەهۆنراوە ناتوانێت بنیادی ئەم ئوممەتی ئیسلامە بکات، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی زۆر زمان پاراو بووە لەدەربڕین و قسەکردندا، خوای گەورە دەفەرمووێت:




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴾ [يس].

(دیارە خوا نەناسان ئایاتەکانی قورئانیان بە شیعر داوەتە قەڵەم و پێغەمبەریش ﷺ بە شاعیر، بۆیە دەفەرموویت): وەنەبێت شیعرمان فێر کردبێت، شیعر وتنیش لەو قەدەغەیە، ئەوەی کە فێرمان کردووە تەنها یادخەرەوەو قورئانێکی ئاشکراو ڕوونە.

دیارە خوانەناسان ئایاتەکانی قورئانیان بەشیعر داوەتە قەڵەم و پێغەمبەریش ﷺ بەشاعیر، بۆیە دەفەرموویت: وە نەبێت شیعرمان فێرکردبێت، شیعر وتنیش لەو قەدەغەیە و بۆی نەبوو شیعر بڵێت، ئەوەی کە فێرمانکردووە تەنها یادخەرەوە و قورئانێکی ئاشکراو ڕوونە.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە شیعر حەڕام بووبێت، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ شیعری نەزانیوە و نەخوێنەوار بووە، لەبەرئەوەی دینەکە تێکەڵ نەبێت، کە لەدواییدا خەڵکانێک بڵێن: قورئان جۆرێکە لەشیعری نوێ و پێغەمبەر ﷺ خۆی هێناویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ لەهەموو تەمەنیدا تاکە شیعرێکی نەوتووە.

(مەبەستمان ئەوەیە کە خۆی داینابێت و خۆی خاوەنی شیعر بێت) لەبەرئەوە ئەم پەیامە بەبێ ئەوەی تێکەڵ ببێت لەگەڵ بیروبۆچوونی هیچ فەیلەسوف و بیرمەندێکدا، ئایینێکی پاکە وەکو شیری سپی و بێگەرد بێئەوەی هیچی تێکەڵ ببێت، ئەم پەیامەش لەلای خواوە نێردراوە، پەیامێکی وتوێژکردنە لەگەڵ ناخی مرۆڤ و کۆمەڵگەو دەسەڵاتدا، هەربۆیە لەناو عەرەبیشدا خاوەنی هیچ ئەحکام و یاسایەک نەبوون، تەنها کۆمەڵێک شتی وەکو (تەبەنی)یان هەبووە، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ چارەسەری دەکات، خۆی هەڵدەسێت بەو کارە چاکە بۆ ئەوەی کۆتایی پێبهێنێت، زەینەبی کچی جەحشی مارەکرد کەپێشتر خێزانی زەیدی کوڕی حاریسە بوو، ئەم هاوەڵە بەڕێزە تەبەنیی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ زەینەب پێکەوە نەدەگونجان و لێک جیابوونەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ خۆی مارەیکرد بۆئەوەی کۆتایی بهێنێت بەو یاسا جاهیلییە.

ماکوان: زۆر زۆر ڕاستە ئەگەر لەوڵاتێکی وەکو فارس یان ڕۆم دا بهاتایە و بیوویستایە ئەم یاسایانە بگۆڕێت، دەبوو کۆمەڵێک بیرو فەلسەفەو دیدو تێڕوانین و یاسای جیاواز بگۆڕێت، هەرچەندە خودی پەیامەکە بەتواناو گەورەیە لەهەر شوێنێک بەگوێرەی جێگەو زەمان

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەتوانێت خەڵکەکە بگۆڕێت، بەڵام لەو کەش و هەلومەرجەی نیوە دوورگەی عەرەبیدا کە ئێمە ئێستا باسی لێوەدەکەین و ئیسلامی تێدا هاتووە باشتر بۆی گونجاوە.

فەرغەلی: زۆر باشە ماکوان ئەو مێشک کرانەوە زۆر گرنگە کە تێبگەیت، خەڵکانێک دەپرسن بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ لەفەلەستینەوە نەهاتووە؟ بۆئەوەیە کەتێبگەین لە مووعجیزەی ئەم پەیامە کە بریتییە لە: بۆئەوەی یەکتاپەرستییەکی ڕەسەن بێت لەهیچ فیکرەو مەنهەجێکیتر نەچێت، چوونکە نەسرانییەکان خۆیان دەستکارییان کردووە، هەروەها بۆئەوەی کەسانێک نەڵێن: "ئەم پەیامە بۆیە لەفەڵەستینەوە هاتووە، چوونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لەیەهوودی و نەسرانییەکانی وەرگرتووە".

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پەیامەی بۆ هاتەخوارەوە لەمەککە و لە فەڵەستین بۆی دانەبەزی بۆئەوەی نموونەیەک نەبێت لەتەورات و ئینجیل.

هەرچەندە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی مەککە ئەیانوت: "محمد ئەم پەیامەی هێناویەتی لەغوڵامێکی نەسرانییەوە وەریگرتوە". چ جای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەڵەستیندا ببوایە، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کەحیکمەتێکی زۆر گەورەی تێدایە لەو جێگەیەوە هاتووە، چوونکە بەبێ بوونی هیچ مێژوو ڕۆشنبیری و شارستانییەتێک لەوێوە هاتووە، هەروەها دەبێت بەتەواوی لەوە تێبگەین کە ئەم ئیسلامە تێکەڵی هیچ فیکرە و ئایدیۆلۆژیایەک و بیرووبۆچوونی هیچ فەیلەسوف و بیرمەندێک نەبووە، تەشریعات و یاساکانی هەموو خۆی خاوەنییەتی، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ... ۝﴾ [الزمر].

واتە: ئاگاداربن، دینی پاک و خاوێن تەنها بۆ خوایە.

پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب -ڕەزامەندی خوای لێ بێت- کاتێک لاپەڕەیەک لەتەورات دەخوێنێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فڕێ دەدات، بۆئەوەی بەهیچ شێوەیەک تێکەڵیی لەگەڵ دینی ئیسلام دا ڕوونەدات، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە ئایینی ئیسلام ئایینێکی پاک و بێگەردەو تەنها لەلای خوای گەورەوە هاتووە، بە پووختی و بێدەستکاری و تێکەڵبوونی دینەکانیتر و بیری فەیلەسوفەکان.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: هەموو قسەکانت ڕاست و درووستن، ئەگەر بڕوانین دەبینین کاتێک موسڵمانان بەفەلسەفەی یۆنانی مەفتون بوون، دوای ئەوەی کە ئیسلام زیاتر پەرەیسەند و گەیشتە وڵاتانی عێراق و لەوێوە وڵاتی فارسی گرت و دەوڵەتی درووستکرد، هاتن کۆمەڵێک فەلسەفەی یۆنانییان وەرگێڕا بۆ سەر زمانی عەرەبی، دەزانن چەندین بیرو بۆچوونی جیاواز لەناو ئاییندا دروستبوو!

لەبەرئەوە خوای گەورە ئەم زەوییەی بۆ ئیسلام هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی هیچ شتێکی تێکەڵ نەبێت و بەپاکی وەکو خۆی سەرچاوە بگرێ. لەو فیرقانەی درووستبون وەک: (موعتەزیلە، معطلة ... هتد) کۆمەڵێکیتر کە مەفتون ببوون بەکۆمەڵێک دیدوڕێی ترەوە، تووشی جۆرەها فیتنە بوون کۆمەڵێک دەرگایان دەکردەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی لێوەنەکردووە.

بۆنموونە: بانگەوازی ئەوەیان دەکرد ئایا قورئان مەخلوقە، یان خۆی خالقە؟ ئەی بەهەشت لەکوێیە؟! ئەمانە بوونە هۆکاری ئەوەی موسڵمانان مەفتون بن بەئەفکاری فەلسەفە و ئەو بیردۆزانەی کە لەوڵاتانی یۆنان و فارسەوە هاتبوون، ئێستا تێگەیشتم کە بۆچی ئەم ئیسلامە لەوڵاتێکی عەرەبییەوە هاتووە کە بێ شارستانییەت و بێ ژیار بوون، (سبحان الله) شێخ فەرغەلی ئەم ئیسلامە هەموو بنەماکانی و سەرەتاکانی و هەموو شتێکی بە مەعریفەت و حیساب و کیتابە هەروا عەشوائی نییە.

فەرغەلی: لە هەمووی گرنگتر ئەو ناوچەیە خاوەنی هێزێکی سەربازی نەبوون.

ماکوان: جا ئەمە پەیوەندی چییە بەسەر ئایینی ئیسلامەوە؟

فەرغەلی: چۆن پەیوەندی نییە، بۆ نموونە:

حیکمەتێکی زۆر سەیرترمان بۆ ڕووندەبێتەوە، ئەویش بریتییە لەوەی ئەو ناوچەیە کە وتمان بێ مێژوو بووە، ڕاستییەکەی مێژوویەکی سەربازیی وای نەبووە تاکو بڵێین: عەرەب بۆ خزمەتی ئەم ئیسلامە سووپایەکی زۆر بەتواناو هێزی هەبووە تا ئەم ئیسلامەی بەجەنگ و بەتوانا و هێز گەیاندبێت، بەڵکوو خەڵکێکی زۆر سادە بوون و کۆمەڵێک هۆزی پارچە پارچە و لەیەک دابڕاو بوون، جەنگیان نەزانیوە ئەگەر جەنگیشیان کردبێت وەکوو جەنگی پارتیزانی چونەتە سەر یەکتری و هێزێکی سەربازیی نیزامییان نەبووە و هیچ هەیبەتێکیان نەبووە، لەڕووی



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سەربازییەوە چەکەکانیان سەرەتایی و کۆن بوون، نەخشەو پلانیان زۆر سەرەتایی بووە، ئەمەش بارودۆخی سەربازیی عەرەب بووە.

بۆئەوەی تێبگەیت ئەم دینە لەجێگەیەکەوە هاتووە ئەو جێگەیە هیچ هێزێکی سەربازیی تێدانە هاتووە، بەڵام کاتێک ئیسلام دێت دەبینین لەگەڵ ئەوەی زۆر بێ تواناو لاوازبون لەڕووی سەربازییانەوە، بەڵام دەبینین سەرۆکێکی سەربازیی تێداهەڵدەکەوێت بۆئەوەی دوایی نەوترێت: خۆیان پێشتر پێشەنگیان هەبووە و توانایان هەر هەبووە، وڵات لەدوای وڵات فەتح دەکەن، پاشان ڕێکەووتن دەکەن و وڵات ئاوەدان دەکەنەوە، بانگەوازی خەڵکی دەکەن بۆ ئەوەی وازبهێنن لەبەندایەتیی خەڵکی بۆ بەندایەتیی خوای بێهاوتا "جئنا لنخرج العباد من عبادة العباد إلى عبادة رب العباد".

بەو مانایەی مێژوویەکی گەورە دەهێنن لەفتوحاتی ئیسلامیدا کە ئەمە مرۆڤ سەرسام دەکات، مووعجیزەیەکە بەهەموو پێوەرێک، کە ئەم ئیسلامە توانای دەگات بەوەی دەوڵەتی فارس دەڕوخێنێت بە سیانزە هەزار کەسەوە، لەکاتێکدا دەوڵەتی فارس خاوەنی دوو ملیۆن سەرباز بووە، ئەمە بەهەموو پێوەرێک مووعجیزەیە.

بۆیە ئەم ئیسلامە خودی خۆی مووعجیزەیە، دەوڵەتی فارس بریتیی بووە لە (ئێران، کوردستانی تورکیا، ئەفغانستان، ئۆزبەکستان، تاجیکستان، کازاخستان، قیرقیزستان، تورکەمەنستان) لەدوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ بە سیانزە هەزار کەسەوە فەتح دەکرێت، دەوڵەتی ڕۆما خەڵکێک فەتحی دەکەن کە بەمووعجیزە دادەنرێ، زۆربەی زۆری ئاسیاو ئەفریقاو وڵاتی ئەندەلوس دەگرێتەوە دەستی خۆی، بەمەش خوای گەورە تێماندەگەیەنێت کە ئەو پەیامە بۆیە لەو جێگەیەوە هاتۆتە خوارەوە کە مەککەی پیرۆزە.

لێرەدا قسەیەکی کیسرا دەهێنمەوە بۆ سەرنجدان لەعەرەب، کە پێشهاتنی ئیسلام کیسرای فارس چۆن سەیری عەرەبی کردووە، عەرەب وڵاتێکی دواکەوتوویان هەبووە، لەو کەسانەی کە زۆر شانازییان دەکرد بەوەی چونەتە دیوانی دەوڵەتی فارسەوە پانزە مەتر لەکیسراوە دوور بوون، مووغیرەی کوڕی شوعبە - ڕەزامەندی خوای لێ بێت- پێش موسڵمان بوونی، لەجاهیلییەت دا فەخری دەکرد کەچووەتە دیوانی کیسراوە، ئەمە زۆر گرنگ بووە بۆ عەرەب کە شانازی بەووەوە دەکرد خەڵکانێک هەبوون بەس چونەتە ناو خاکی کیسراوە شانازییان



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پێوەکردوە، بەڵام باسەیری عەرەب بکەین کەچۆن ئەم ئیسلامەی بەئێمە گەیاندووە، ئایا هۆکارەکەی چییە لەو دەوڵەت و جێگەیەوە دێت؟

سەرنج بدە کاتێک موسڵمانان دەچن بۆ فەتحی وڵاتی فارس، پادشای فارس زۆری بەلایەوە سەیر دەبێت و دەڵێت: بۆچی ئەم عەرەبانە هاتوون بۆ فەتحی وڵاتی ئێمە؟! پادشای فارس دەڵێت: مادام ئەمانە هاتوون با جەنگ و کووشتار نەکەین، جل و بەرگیان بدەینێ بۆئەوەی بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان، هەر سەربازێکیان درهەمێکی بدەنێ، سەرۆکەکانیشیان ئیغرا بکەن و هەریەکەیان دوو پۆشاکی بدەنێ لەگەڵ سەد درهەم بۆئەوەی بگەڕێنەوە، بەڵام ئەمان کە دەچن بۆئەوەی پەیامی ئیسلام بڵاوبکەنەوە، ئەوانیش بەم شێوەیە سەیری عەرەبیان کردووە.

ماکوان: واتە وەک چەتە و دز؟

فەرغەلی: بڕوا بکە کەمتر، زۆر سادە بوون عەرەب هیچی نەبوو، نموونەیەکت بۆ باس بکەم

موسعەبی کوڕی عومەیر لەجەنگی ئوحود دا شەهید کرا، پۆشاکی بەری بەشی نەدەکرد بەگەڵا دایانپۆشی، حوزەیفەی یەمانی -ڕەزامەندی خوای لێبێت- کاتێک کە ڕۆیشت هەواڵ بدات بە پێغەمبەری خوا ﷺ کەجەنگی ئەحزاب بوو، جلی لەبەردانەبوو چوو جلی خێزانەکەی خۆی کردە بەری، هەرئەم دەوڵەتەیە کە گەورە دەبێت و فەتحی دەوڵەتانی فارس و ڕۆم دەکات، بۆیە خوای گەورە مووعجیزە نیشانی ئەو خەڵکانە دەدات، کە ئیسلام لەو جێگەیەوە هاتووە.

لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەجەنگی ئەحزابدا بوو، کافرەکان لەو جەنگەدا هێزیکی زۆریان کۆکردەوە دژی هێزی ئیسلام کە دە هەزار کەس بوون، پاشان هەر بەو خەڵکەوە دوایی کە موسڵمان دەبن چوون فەتحی وڵاتێکیان کرد دە هەزار بەرامبەر دوو ملیۆن کەس، بەبێئەوەی چەک و تەقەمەنیی باشیان ئامادە کردبێت، لەناو خاکی فارس دا توانییان سەرکەوون بەسەر فارس دا.

ئەگەر سەیری سەرکردە بەڕێزەکانی ئیسلام بکەین وەکو (ئەبوو عوبەیدەی جەڕاح، خالیدی کوڕی وەلید، عەمری کوڕی عاس، قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی...هتد) ئەو پاڵەوانانەی ئیسلام، پێش موسڵمانبوونیان چیبوون؟ بەڵام لەگەڵ هاتنی ئیسلام ئەمانە چ گۆڕانکارییەکیان



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەسەردا هات؟ وڵاتی فارس و ڕۆم کەوتە ژێردەستیان، لەپێشینەدا باس دەکرێت خالیدی کوڕی وەلید -ڕەزامەندی خوای لێ بێت- لەجەنگی ئوحوود دا بە سێ هەزار کەسەوە نەیتوانی بەرامبەر حەفتا کەس بووەستێتەوە، کە ئەگەر موخالەفەی پێغەمبەری خوا ﷺ - یان نەکردایە و شاخی (ڕومات)یان بەجێنەهێشتایە، هەرگیز نەیاننەتوانی سەربکەوون، بەبێگومان موسڵمانان یەکەمجار سەرکەوتبوون. موسڵمانان دەچن وڵاتی فارس ڕزگاردەکەن بە سیانزە هەزار کەسەوە بەرامبەر شەست هەزار یاخوود سەد هەزار کەسی فارس.

ئەمەش ئەوە دەردەخات ئەو شوێنەی ئیسلامی تێداهاتووە هۆکارەکەی ئەوەیە ئەو خەڵکە تێبگات، بەپێوەرێکی مرۆڤایەتی ئەگەر بیری لێبکاتەوە سیانزە هەزار کەس ناتوانن بەرامبەر بە شەست هەزار یاخوود سەد هەزار کەس بووەستنەوە، پێوەرێکمان هەیە بۆ پێوانی ئەم ئیسلامە ئەویش خوای گەورە فێرمان دەکات:

﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ۝﴾ [الأنفال].

خوای گەورە پشتوپەنای ئەو خەڵکەیە، خوای گەورە توانیویەتی ئەو خەڵکە سەربخات بەو شێوەیە، باشە ئەگەر ئەم پەیامە لەوڵاتێکدا بهاتایەتە خوارەوە خۆتان بڵێن، دەوڵەتێک بوایە وەکوو ڕۆم و فارس ئەیانووت: بۆیە ئەم ئیسلامە هاتۆتە خوارەوە مێژوویەکی هەبووە لەبواری سەربازیدا، بۆیە توانیوویەتی بەهێزی سەربازی و توانای خۆی ئەم ئیسلامە بڵاوبکاتەوە.

بەڵام بابێین سەیری فتووحاتی ئیسلامی بکەین، بزانین چۆن بووە؟

جەنگکردنیان لەگەڵ ڕۆم و فارس دا هەمووی بەئیعجاز بووە، ئەگەر کەمێک شیکاریی لەگەڵ بیری خۆماندا بکەین، لەگەڵ ئەم مێژووەدا کە ئەمە شتێکە لەدەرەوەی توانای مرۆڤ بووە، ئەبێت باش تێبگەین ئەم ئیسلامە بۆچی لەو جێگەیەوە هاتۆتە خوارەوە؟

هەمیشە هەروابووە، ئەم ئیسلامە یەکێک لەسووننەتەکانی ئەوەیە خەڵکێکی کەم توانیوویانە بەسەر خەڵکێکی زۆردا سەربکەوون، بۆئەوەی خوای گەورە بیسەلمێنێت بۆ ئەو خەڵکە کە ئەم ئیسلامە بەزۆر و بۆر نییە، بەڵکوو خەڵکانێک ئەگەر بەڕاستی ئەم ئیسلامە وەربگرن با کەمیش بن، بەڵام خوای گەورە هەر سەریاندەخات وەک دەفەرمووێت:




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿... كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ [البقرة].

ئەمە سوونەتێکمان بۆ دەردەخات، کە ئیسلام لەمەککەدا نە بەفەلسەفە و نە بەهێزی سەربازی هاتووە.

ماکوان: وەڵاهی زۆر ڕاستە، بەڕاستی مووعجیزەیە ئەم ئیسلامە خەڵکی ئاقڵی دەوێت لێی وردبێتەوە.

فەرغەلی: ماکوانی برام باسی سیستەم و شارستانیی و توانای سەربازیی ئەو وڵاتانەمان کرد، بەڵام لەنیوە دوورگەی عەرەبیدا هیچ حوکمڕانییەکی باش و سیستەمێکی تەواوی تیانەبوو، عەرەب مەجلیسی حوکمیان هەبووە، لەزەویی مەککەدا هۆزەکان حوکمیان دەکرد، هەروەکوو ئەمڕۆ چۆن عەشایەرەکان حوکم دەکەن، وەکو دیموکراسی وابوون. هەرکەسە دەهات حوکمی هۆزەکەی خۆی دەکرد و نوێنەرایەتیی هۆزەکەی خۆی دەکرد، ئەگەر بهاتایە ئەم ئیسلامە لەدەوڵەتی فارس، یۆنان، ڕۆمان، چین دا بهاتایە، خاوەنی حوکمێکی ڕێکوپێک و نەبڕاوەی ئەو سەردەمە بووایە، ئایا چەندەها قسەیان بۆ درووست نەدەکرد؟! ئەیانگوت: لەو سەردەمەدا حوکمی ئیسلام بۆیە هاتۆتە خوارەوە، خەڵک توانای هەبووە و پێشتر توانای شارستانێتیان هەبووە، بەڵام بەپێچەوانەوە لەشوێنێکەوە ئەم ئیسلامە دێت کەهیچ دەسەڵاتێکیان نییە، ئا لێرەدا وانەیەک لەپێغەمبەری خوا ﷺ فێردەبین کە چۆن سوودی بینیووە لەکۆمەڵێک یاسای ئەوان، سوودی لەو یاسا جاهیلییانە وەرگرتووە، بەمەرجێک کاریگەریی لەسەر ئیسلامەکە نەکردبێت، یەکێک لەو یاسایانە یاسای (پەنادان) بووە، کە لەژێر سایەی کەسێکدا خۆی حەشارداوە بۆ ئەوەی ئازار نەدرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەچێتە ژێر سایەی (مطعم بن عدی)، یاخوود ئەبوو بەکری سدیق ئەچێتە ژێر سایەی (دخنة) کە پیاوێکی مووشریک بوو، یان عوسمانی کوڕی مەزعون ئەچێتە ژێر سایەی وەلیدی کوڕی موغیرە ...هتد. یاخوود یاسای (احلاف) بۆنموونە: پێغەمبەری خوا ﷺ سوودی لەو فیکرەیە وەرگرتووە، هەستا پەیمانی بەست لەگەڵ گەل و هۆزەکانی تردا بۆئەوەی هاوسەنگییەک درووستبکات و سوود ببینێت لەو هێزەی کە لەجزیرەی عەرەبیدا هەبووە، ئەمەش ئەوە دەردەخات لەوڵاتێکی وەکو فارس کە کیسراکان حوکمیانکردووە و نەیتوانیووە پارسەنگی ئەم هێزە درووست بکات، بۆیە ئەو جێگەیە زۆر لەباربووە کە خوای گەورە ئەم ئیسلامەی تێدا هێناوەتە کایەوە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرغەلی لەپڕ کەوت بەسەر مندا، هاواری کرد شانم سووتا! کە تەماشام کرد تیرێک بەر شانی کەوتووە، هاوارم کرد فریاکەون فەرغەلی بریندار بووە، هەر وام وت تیر بەسەرمەوە وەک باران ڕێژنەی دەکرد، بەپەلە ڕامکرد ئەوان بەقەڵغانەوە فریامان کەوتن تا چووینە پشت دارێک و چەند سواریک لێمان نزیک بوونەوە ئێمەش هەموو کەرەستە و شتەکانمان بە جێهیشتبوو، کتێبەکەی منیش لە ناو کۆپانی ئەسپێکدا بوو ئەویشیان برد هەرچی خواردن و شتمان پێبوو بردیان، شێخ فەرغەلیش برینداره!

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## بۆ دەبێت قورئان بەزمانی عەرەبی بێت؟

لەدوای ئەوەی چەتەکان تیر بارانیان کردین فەرغەلی بریندار بوو، هەموو کەرەستە و تەنانەت کتێبەکەی منیشیان برد. فەرغەلی ڕازی و عابدی نارد بە شوێن چەتەکاندا دوور بەدوور تا هیچ نەبێت کتێبەکە بهێننەوە، پێیوتن کە ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ ئەو دێیەی کە ئاردەکەمان لێکڕین، ئەوەشی پێووتن لەکاتی هەر کارەساتێکدا یەکێکتان بەزوویی بۆ لامان بگەڕێنەوە تا ئاگادار بین، ئەوان ڕۆشتن کەوتنە دوایان.

فەرغەلی بە منی وت هیچ پارەت پێیە؟

ماکوان: یەک کیسە درهەمم پێیە! ئەویش دەستی کرد بەکەشکۆڵەکەی پشتیدا هەشت کیسە پارەی پێبوو. چواری دایە من و باقی خۆی هەڵیگرت و منیش بە پەلە کردمە کۆڵم و ڕووەو دێکە کەوتمە ڕێ، هەرچەندە ماندوو بووم، بەڵام نەوەستام تا گەیشتمە دێکە و چوومەوە بەر دەرگای ماڵی کچە جوانەکە!

هاوارم کرد لەبەردەم پەرژینی حەوشەی ماڵەکەیاندا وەستام، پیاوێک هاتە دەرەوە پێمووت: ئەم بریندارەم پێیە، لێم تێنەگەیشت تا بەزمانی پەهلەوی کەمێک بە شەق و شڕی قسەم کرد تێگەیشت، وردە وردە لە کۆڵمی هێنایە خوارەوە. فەرغەلی خوێنی تێدا نەمابوو، خۆی ڕەش بوو ئەوەندەی تر ڕەش هەڵگەڕابوو! دامانگرت ئاویان گەرمکرد برین و خوێنەکەیان سڕی، مەرهەمێکیان هێناو دایان لە دەوروپشتی تیرەکەو تیرەکەیان دەرهێنا. ئەویش دیار بوو ماندوو بوو خەوی لێکەوت، منیش کیسەیەک درهەمم دایە دەست پیاوەکە وەریگرت، بە منی وت لەلایدا بمێنەرەوە ئێستا دەچم نان و ئاوتان بۆ ئامادە دەکەم.

تا دەمەو بەیان ئاگام لە فەرغەلی بوو چاوی کردەوە وتی نوێژت کردووە؟

ماکوان: نا.

فەرغەلی: تۆ بڕۆ دەستنوێژ بگرە و بێرەوە، منیش تەیەمووم دەکەم.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

چوومە سەر ئاوی ئاژەڵەکانی ماڵەکە و لە دۆڵچەیەکدا ئاوم دەرهێنا و دەستنوێژم گرت و گەڕامەوە بە جەماعەت نوێژمان کرد.

ماکوان: ئیستا تەندرووستیت باشە؟

فەرغەلی: سووپاس بۆ خوا باشم تیرەکە زۆر کاریگەری نەبووە.

ماکوان: شێخ جا باشە من چی بکەم، کتێبەکەیان برد، خۆ هەتاماوم دەبێت لێرە بم!

فەرغەلی دەستی کرد بە پێکەنین و بیری خستمەوە کە گوایە من بە شوێن پێغەمبەر کەوتووم!

ماکوان: ڕاستە، بەڵام ئاخر ماڵ و منداڵم جێهیشتووە.

فەرغەلی: ئاساییە لێرە درووستی دەکەینەوە!

ماکوان: ئاخر ئەوندە سادە نییە لێرە درووستی بکەمەوە، تەمەنێک لە گەڵ هاوسەری خۆمدا بووم، خۆ هەروا بە ئاسانی لەبیر ناکرێت.

فەرغەلی "بە پێکەنینەوە": هیچ چارەیەکی تر شک دەبەیت تا بیکەین؟!

ماکوان: نا، چار نییە، بەڵکوو خوای گەورە بیکات ڕازی و عابید کتێبەکە بهێننەوە.

فەرغەلی: خوا بکات خۆیان سەلامەت بن.

ماکوان: ئێستا چی بکەین؟

فەرغەلی: دوای کاری خۆمان دەکەوین، لێرە بۆ چی هاتووین ئەوە دەکەین.

ماکوان: کە بگەینە خزمەت پێغەمبەری ئازیز صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەوە تاکە ئیشی ئێمەیە، وایە؟




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرغەلی: وایە، کەواتە وەڵامی ئەو پرسیارەت ئەدەمەوە کە بۆچی بەزمانی عەرەبی قورئان هاتووە. وەڵامی ئەوەم دایەوە کە بۆچی لەمەککەوە هاتووە، بەڵام وەڵامی ئەوەم نەدایەوە بۆچی ئەم ئیسلامە لە ڕێگای قورئانەکەیەوە هاتووە بە زمانی عەرەبی؟

ماکوان: هەرچەندە زۆر گرنگ نییە، چوونکە بەهەر زمانێک بێت گرنگ ئەوەیە پەیامەکە بگات.

فەرغەلی: ڕاستە، ئەگەر بە کوردی بهاتایە عەرەب دەیووت بۆ بە عەرەبی نەهاتووە، یان بە تورکی بهاتایە فارس دەیووت بۆ بە فارسی نەهاتووە، کەواتە ئەم پرسیارە هەر تەواو نابێت.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە وایە، خەڵکی وریا و خاوەن ئەقڵ لەو پرسیارە نادوێت!

فەرغەلی: یەکێکیتر لەحیکمەتەکان زمانی عەرەبییە، خەڵکانێک لەوانەیە لەمەیاندا کەمێک جیاواز بن، بەڵام من دڵنیایيم هەیەو پێم باشە جەختبکەینەوە لەسەر ئەم خاڵە، حیکمەتی ئەم پەیامە نێردراوە، ئەویش زمان و زاراوەی عەرەبییە.

ئەم پرسیارە دەکرێت کە دەڵێن: حیکمەت چییە و بۆچی ئەم پەیامە بەزمانی عەرەبی هاتووە؟

زمانی عەرەبی شەریفترین زمانە لەهەموو جیهاندا، ئەمە شک و گومانی تێدانییە، لەبەرئەوەیە قورئانی پیرۆز بەو زمانە هاتۆتە خوارەوە، خوای گەورە ئەم قورئانەی بەزمانی عەرەبی هێناوەتە خوارەوە لەنیوەدورگەی عەرەبیدا بۆ هەموو جیهان، وەک دەفەرموێت:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ [الأنبياء]

(ئەی محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ) ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان (جیهانی ئادەمیزاد و گیاندار و ڕووەک و پەری و... هتد)

بەڵام لەزەمەنی پێغەمبەری خوادا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆچی ئەم قورئانە بەزمانی عەرەبی هاتۆتە خوارەوە!؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەموو دەزانین ئێستا زمانی ئینگلیزی زۆر بەربڵاوە، یاخوود زمانی چینی و فەڕەنسی، لەگەڵ ئەوەشدا زمانی عەرەبی زۆر بەربڵاونییە، بەڵام گرنگیی خۆی هەیە کە هاتنی قورئانی پیرۆز لەلایەن خوای گەورەوە بەو زمانە ڕەوان و پاراوە عەرەبییە بووە.

بەبۆچونی من زمانی عەرەبی دەوڵەمەندترین زمانە، بۆنموونە: هەنگوین زیاد لە هەشتا ناوی هەیە، ڕێوی و شێر چەندین ناویان هەیە، هەروەها کە وشەیەک دەستکاری بکەین کۆمەڵێک مانای هەیە، زمانێکە لەڕاستی دا پاراوە و ئەحکامی گەورەی تیادەبینرێ، هەرئایەتێک هاتۆتە خوارەوە بەوشەیەکی کەم کۆمەڵێک مانا ئەدات بەدەستەوە، هەر موفەسیرێک لەزەمەنی خۆیدا کۆمەڵێک مانای داوەتێ، یەکێکیتر کۆمەڵێک مانای تازەی داوەتێ. عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب وتەیەکی جوانی هەیە لە (نهج البلاغە)دا لەوەسفی قورئاندا دەڵێت: "لایخلق" مەبەستی ئەوەیە لە وشەیەکی کەم مانایەکی زۆر ئەدات، پێغەمبەری خوا ﷺ بەزمانێکی پاراو قسەی کردووە لەگەڵ ئەوەیشدا (جامع الکلام)ی پێدەوترێ، بەکەمترین وشە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێک ئەحکامی هێناوەتەدی، ئەمە ئەوە دەردەخات ئیعجازێکی زۆر زانستیی گەورەی تێدایە بۆ حوکم و داڕشتنی یاساو ڕێسا کە لەهیچ زمانیکی تردا نایەتەدی، ئەوانەی باس لەئیعجازی زانستی و مرۆیی گەردوونی دەکەن دەبێت شارەزابن لەزمانی عەرەبی دا، پاشان ئەو ئیعجازانە دەربهێنن، شێوازەکانی ئیعجازی ئەم ئیسلامە (إتقان) بزانن چییە بەتەواوەتی.

بۆ نموونە: ئەگەر کەسێک تەرجومەی قورئان بکات بۆ زمانێکیتر، بزانە چۆن مەفهوم و دەقەکەی دەگۆڕێت، هەربۆیە ئەم قورئانە لەو جێگەیەوە هات کە خەڵکەکەی عەرەب بوون خۆیان تێگەیشتنێکی باشیان هەبوە بۆ زمانی عەرەبی و تواناو فەساحەتێکیان هەبووە بۆ بەلاغەتی عەرەبی، هەر بۆیە قورئانی پیرۆز بەعەرەبی دابەزیوەتە خوارەوە. خوای گەورە لە قورئان دا دەفەرمووێت:

﴿وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ ۝١٩٨ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ۝١٩٩ كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ۝٢٠٠﴾ [الشعراء].

ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندایەتە سەر خەڵکانێکی تر کە عەجەم بوونایە و بێ دین بوونایە نەیاندەتوانی موسڵمان بن. کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ ویستوویەتی




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

خەڵک موسڵمان ببێت، تەنها ئایەتێکی کورتی خوێندۆتەوە بۆیان و هیچ شتێکیتری نەوتووە (بێئەوەی وەکو ئێمە وەختێکی زۆر گفتوگۆ بکات) لەپاشاندا ئەوکەسە تێگەیشتووە لەزمانەکە و زۆر بەپاراوی ئیسلامەکە چووەتە ناو دڵییەوە.

ئەمەش هۆکارێک بوو لەوکاتەدا، ئەم قورئانە بەو شێوەیە لەو جێگەدا بەزمانی عەرەبی هاتۆتە خوارەوە، ئەو خەڵکە لەو سەردەمەدا خۆیان شاعیربوون لەزمانی عەرەبیدا زۆر باشبوون، (جبیر بن مطعم) دەڵێت: ئێوارەیەکیان گوێم لەپێغەمبەری خوا ﷺ بوو قورئانی دەخوێند، جوبەیر خۆی مووشریک بوو، دەڵێت: "منیش بەئاسپایی گوێم بۆدەگرت". پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانی قورئانیان دەخوێند، تەنانەت گەورە پیاوانی قووڕەیش بەنهێنی گوێیان بۆدەگرتن، ئەو ئایەتەی دەخوێند هەروەکو جوبەیر دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: گوێم لێبو دەیفەرموو:

﴿أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾﴾ [النمل].

دەڵێت: "خەریکبوو دڵم ئەفڕی ئەوەندە هەستم بەئارامی دەکرد، بەو ئایەتە هەستم دەکرد ئەمە شتێکە پەیوەندیی نییە بەسەر کەسێکەوە کە قسە بکات، بەڵکوو ئەمە شتێکە لەجێگەیەکەوە هاتووە، لەلایەن خواوەیە بۆ سەرزەوی".

ماکوان: ڕاستە دەزانیت دوژمنانی ئیسلام هەروەکو (موستەفا کەمال) کە هات یەکەم کار کە کردی زمانی عەرەبی قەدەغەکرد، ئەمەش بۆئەوەی خەڵکی لەدینەکە دووربکەونەوە. کەسێکی بەریتانی هات بۆ میسر پێش هەموو شتێک لەتەنیشت زانکۆی ئەزهەرەوە قوتابخانەیەکی درووستکرد بۆ زمانی بیانی بۆ بڵاوکردنەوەی فیکری عەلمانی، خەڵکەکە وایانلێهات وازیان لەزمانی عەرەبی هێناو قوتابخانەی زمان کرایەوە، بەڕاستی شورەییە بۆ موسڵمانان کەخۆمان بەموسڵمان دەزانین و ئەم ئیسلامەمان خۆشدەوێت، کاتێک قسە لەگەڵ پاکستانییەک دەکەین سەیردەکەین بەزمانی ئینگلیزی قسە دەکات! ئەی باشە بۆچی بەعەرەبی قسە ناکات! هەندێکجار عەرەب لەگەڵ عەرەب خۆیدا، هەروەکو کابرای میسری دەچێت بۆ مەغریب ئەبێت فەرهەنگێک لەگەڵ خۆیدا ببات! چوونکە لەیەکتر تێناگەن، یاخوود مەغریبی و سعودی لەیەکتری تێناگەن، کەهەمووشیان پێیاندەوترێت عەرەب!



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەگەر سەیر بکەین دەبینین ئیمام بوخاری خەڵکی تورکمەنستانە و لەناوچەی بوخارا و سەمەرقەند و دەوڵەتی خەواریزم شاوە هاتووە، دووەم کتێب لەئیسلام دا سەحیحی بوخارییە و ئیمام بوخاری نووسیویەتی لەکاتێکدا خۆیشی عەرەب نەبووە، ئەوە خۆشەویستیی ئیسلامەکەیە وایلێدەکات، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ئەم ئیسلامە ڕۆژانێک بووە گشتی بووە.

بەداخەوە ئێستا دایک و باوکان وایانلێهاتووە شانازی بەمناڵەکانیانەوە دەکەن دەڵێن: زمانی ئینگلیزی باش دەزانێت! لەڕاستیدا ئەمە خراپ نییە، بەڵام بۆچی لەسەر حسابی زمانی عەرەبی بێت؟ داواکارم، بەگشتی ئەوانەی دڵسۆزن بۆ دینەکەتان هەوڵبدەن فێری عەرەبی بین لەهەر جێگەیەک بن، چوونکە ئەم زمانە نەزانین، لەدینەکەمان تێناگەین، زمانی عەرەبی گرنگە بەلامانەوەو خۆشمان ئەوێت، چوونکە زمانی قورئانە و زمانی پێغەمبەرەکەمانە ﷺ (لا فضل لعربي على أعجمي إلا بالتقوي)، ئەمە بانگەشەنییە بۆ عەرەبچێتی، بەڵکوو پێغەمبەریش ﷺ خۆی عەرەب نییە بەعەرەب کراوە، بەڵام زمانی دینەکەمان عەرەبییە بۆیە پێویستە لەدینەکەمان تێبگەین.

عەرەب دژی قورئان بوون سەرەتا کە تێگەیشتن هۆکارێک بووە کە زمانی عەرەبییان زانیوە و شیعریان وتووە، قورئان تەحەدایکردوون بەم زمانە عەرەبییە دەڵێت: ئەگەر ڕاستدەکەن وەرن سوورەتێک بهێنن:

﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ ...﴿٢٣﴾﴾ [البقرة].

جا ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم (قورئانە پیرۆزە) هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمد ﷺ ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوورەتێکی وەك ئەو بهێنن، هاوپەیمان و هاوکارەکانیشتان جگە لە خوا (بۆ ئەو مەبەستە) بانگ بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن.

یاخوود تەحەدایان ئەکات بە:

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجًا ﴿١﴾﴾ [الكهف].

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەم کتێبە کە قورئانە بۆ سەر بەندەی خۆی (محمد ﷺ) دابەزاندووە، هیچ کەم و کووڕی و ناتەواویەکیشی بۆ ڕەوا نەداوە




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەوان بازاڕیان هەبووە بۆ زمانی عەرەبی، نەک هەر نەهاتوون قسە لەسەر ئەم قورئانە بکەن، بەڵکوو بازاڕی ئەوەیان هەبووە کاتێک قورئان هاتووە و قسەی لەسەرکراوە دەستەوسان وەستاون و بێدەنگ بوون، قورئانیان ئەوەندە بەلاوە خۆشەویست بووە ئەوەندە گوێیان لێدەگرت، باشە بۆچی ئێمە ئەو خۆشییە لە قورئان نابینین کاتێک گوێمان لێی دەبێت؟ چوونکە عەرەبی نازانین و نازانین چیمان پێدەڵێت و چیمان بۆ ڕووندەکاتەوە، نەدڵمان دائەخورپێ و نەهەست و سۆزمان دەجوڵێت، مەگەر تەنها ئەوانەی شارەزاییان لەزمانی عەرەبیدا هەیە، زۆرجار کە دائەنیشین لەکۆڕو کۆبوونەوەیەکدا کاتێک قورئانێک دەخوێنرێ خێرا کەسێک لایدەبات، ئەمەش هۆیەکەی تێنەگەیشتنەو دڵی لەخۆیەوە خاودەبێتەوە، بەڵام کەتێگەیشتین دڵمان پاراو دەکات، ئەوانەی قورئانخوێنن زیاتر شارەزان. کاتێک تووشی دڵەڕاوکێ و بێتاقەتی دەبیت یەک دوو سوورەت لەقورئان بخوێنە ﴿... أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾ [الرعد] ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو دڵ و دەروونیان ئارام دەبێت بە قورئان و پەیامەکەی خوای پەروەردگار، ئاگاداربن دڵەکان: هەر بە قورئان و یادی خواو (پابەندبوون بە ئاینەکەیەوە) خۆشنوود دەبن و دەحەوێینەوە.

بزانە چ سووکناییەک بەدڵتا دێت دڵ و دەروونت خۆشی وەردەگرێت، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە جەخت لەسەر ئەم زمانی عەرەبییە دەکەینەوە، چوونکە بەهۆیەوە تێگەیشتنمان لەدینەکەمان و لەقورئانەکەمان ئاسان دەبێت، نەک تێگەیشتن لەعروبە و ئەم جۆرە شتانەی دەوترێ، بەڵکوو مەبەستمان لەدینەکەی خوایە بەتەنها.

فەرغەلی: لەگەڵت هاوڕام؛ وەک عەرەب هیچ پەیوەندیم بەعەرەبەوە نییە، بەڵکوو میسریم یان قیبتیم یان ئیگیبتیم. بەڵام موسڵمانم بە شانازییەوە عەرەبی زومانم، بەڵام هۆکارێکی تریش هەیە لەبیرت نەچێت کە ئەم ئیسلامە سەرەتا بۆ عەرەب و مەککە هاتووە ، ئەزانی چییە؟

ماکوان: نەوەڵڵا نازانم چییە؟

فەرغەلی: ئاشکرایە ڕۆمەکان عیسایان دەپەرست و فارسەکان ئاگریان دەپەرست، بەڵام ئەهلی مەککە خوایان دەپەرست و بڕوایان بە وەحدانییەتی خوا هەبوو، هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێت:


WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ۝﴾ [الزخرف]

سوویند بەخوا ئەگەر لەو خوانەناسانە بپرسیت: کێ درووستی کردوون، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەڵێن (الله)، کەوابوو بەرەو چی و بەرەو کوێ لە ڕێبازی یەکخواناسی لادەدرێن و شوێنی ناحەقی دەکەون؟!

یاخوود دەفەرمووێت:

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ۝﴾ [لقمان]

سوویند بە خوا ئەگەر پرسیار لە خوانەناسان بکەیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی درووست کردووە، ئەوە بە دڵنیاییەوە دەڵێن: (الله)، درووستی کردوون، تۆش ئەی محمد ﷺ بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوا (لەسەر وتنی ڕاستی)، نەخێر وانییە، ئەو وەڵامە لە قەناعەتەوە هەڵنەقوڵاوە، بەڵکوو زۆربەیان نازانن (لە خۆیانەوە قسە دەکەن).

بەگشتی بڕوایان بەبوونی خوای گەورە هەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تووشی هاوبەشدانان بوون، مەبەستەکە ئەوە دەگەیەنێت کاتێک بانگەوازی کەسێک دەکەیت بۆ دینی خوا، ئەگەر بڕوای بەخوا هەبێت باشترو ئاسانترە.

ماکوان: وایە زۆر ڕاستە.

فەرغەلی: کەواتە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە لەو زەوییەوە هاتووە، لەبەرئەوەی بڕوایان بەخوا هەبووە، ئەوانی تر (ئاگر، مانگا، دار، مشک، مەیمون) یان دەپەرست، ئەم ئیسلامە هات بۆئەوەی:

(تدعوا ألأقرب في الأقرب فالأقرب) واتە: هەمیشە تۆ ئەو کەسە نزیکتە کە بانگەوازی بۆ دەکەیت.

پێویستە یەکەمجار بانگەوازی ئەوەبکەین کەبڕوای بەخوا هەیە، دووەم ئەوەی لێیەوە نزیکەو بڕوای بەدین هەیە بەگشتی گەورەیی خوا ڕائەگرێ، ئەمە ئاسانترە بۆ تۆ بانگەوازی بۆ بکەیت. لەگەڵ ئەوەشدام خەڵکی بانگەوازی شیوعی و بێدینەکان بکەن، بەڵام ئەوەی کە




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بیرووباوەڕی نزیکترە ئاسانترە، خوای پەروەردگار کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ی وەکو حیکمەتێک و ئەم ئیسلامەی لەو جێگەیە ڕاگەیاند لەبەرئەوەی بڕوایان بەوەحدانییەتی خوای گەورە هەبوو لە پەروەردگارییەتیدا.

ماکوان: ڕاستە.

لەم قسانە دابووین گوێم لەدەنگی کابرای خاوەن ماڵ بوو وتی وەرنەدەرەوە بانگتان دەکەن، دووکەس بە شوێن ئێوەدا دەگەڕێن دوو تەرمیشیان پێیە!

کەوای وت بەپەلە ڕامکردە دەرەوە...



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بە پەلە ڕامکردە دەرەوە بۆ ئەوەی بزانم کێیە، چی ڕوویداوە؟ عابید و ڕازی بوون ئەسپەکانیان هێنابووەوە و دوو تەرمی ئەوانیشیان هێنابوو!

ڕازی ڕایکرد وتی: ئەبوو ئانا شێخ فەرغەلی چۆنە؟

ماکوان: باشە، ئەی ئەو تەرمانەتان بۆ نەشاردۆتەوە بۆ لەگەڵ خۆتان هێناوتانە؟

عابید: ئەوە بەڵگەی دەستمانە بۆلای شێخ فەرغەلی!

کە ئاوڕم داوە شێخ فەرغەلی دەستی لەسەر شانی ڕازی دانابوو وتی: ماکوان ئەوە بۆیە ئەو دوو لاشەیان هێناوە بۆ ئەوەی بە تۆش و بە منیش بڵێن چەتەییان نەکردووە بە ئازایەتی خۆیان چوون مافەکانی خۆیان و ئێمەشیان گەڕاندۆتەوە، ئەو دوو تەرمەش بەڵگەی دەستیانە و ئیتر پێوویست بەگێڕانەوە ناکات بۆمان بگێڕنەوە چیان کردووە و چۆن شەڕیان کردووە.

"دەستم کرد بە پێکەنین بە کوردی وتم بەڕاستی پێشمەرگەن" چووم کتێبکەم هێنا تووند لە پشتم بەست، ڕەشمەی ئەسپێکم گرت شێخ فەرغەلی لەسەری بوو کەوتینە ڕێ بەرەو مەککە.

فەرغەلی: کوڕینە بەرەو کوفە بڕۆن، لە بیابانی کوفەوە ڕێدەکەین.

ماکوان: بۆ کوفە درووست بووە؟

فەرغەلی: نا، بەڵام ناوچەکە پێی دەوترێت کوفە، لە کۆنەوە پێیوتراوە شارەکە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس درووستی کرد، هەڵبەت ئەو کردییە سەربازگە، ئیتر سەربازەکان لەوێ مانەوە کردیانە شار و پاشان عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب کردییە پایتەختی خیلافەتەکەی خۆی و چوار ساڵ فەرمانڕەوایی لەو شارەوە کردووە ، بەڵام ئێستا کە من و تۆ پێیدا دەڕۆین نەبووە بەشار و تەنها بیابانە و بنەڕەتی وشەی کوفە سریانییە واتە شەڕ و شۆڕ و ناڕەحەتی.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: شێخ ئەم کوڕانە لەگەڵ تۆن زۆر ئازان، بەڕاستی زۆر هۆگریشن بەقسەت دەکەن، ئەمانە خزمی خۆتن؟

فەرغەلی: ئەم دوو کوڕە هیچیان موسڵمان نین، نازانن من و تۆش کێین و بە پارە کڕیومن، خەڵکی شەیبانن گەل و هۆزێکن لە نێوانی بەسرە و کوێت دان ئەوکاتە پێیان وتراوە گەل و هۆزی شەیبان.

ماکوان: زۆر ئازا دیارن.

فەرغەلی: ئەی تۆ نەتزانیوە ئیسلام بۆچی لە ناو عەرەبەوە هاتووە؟

ماکوان: بەیەکەوە باسی هەندیک شتمان کرد پێش ئەوەی جەنابت بریندار بیت ئەو چەتانە بێنە سەرمان.

فەرغەلی: باسی سیفەتێکی تری عەرەبم بۆ نەکردی ئەویش ئازایەتی و ڕاستگۆییانە.

ماکوان: چی؟

فەرغەلی: عەرەبی سەردەمی جاهیلی قسەیەکیان هەیەو دەڵێن: "(كان العرب قبل نزول الرسالة يفتخرون بالموت).

واتە: شانازییان بەمردنەوە کردووە بۆ ئەوەی بکوژرێن، (يستهيون بالحياة تماما) سەرشۆڕی بووە بۆیان کە نەکوژرێن، یەکێک لەعەرەبەکان برایەکی کوژراوە (بلغه قتل اخيه) ئەویش دەڵێت: جا ئاساییە (ان قتله فقتل ابوه واخوه وعمه) ئەوەی کوژراوە باوک و برا و مامیشی کوژراوە. (والله لانموت حذفا) وەڵا ئێمە نامرین ئیلا بەکوشتن نەبێت، لەکۆتاییشدا لەمێژوودا هاتووە و دەڵێت: (والموت تحت ظلال السيوف شرف الموت) مردن لەژێر سێبەری شمشێردا بەڕێزترین مردنە.

بۆیە هەمیشە ئازابوون بۆ مردن و کوشتن نەک لەسەر جێگە مردن!

ماکوان: بەخوا ڕاستە ئیسلام خەڵکی ئازای دەوێت، هەر چەندە توانای بەڕێوەبردنی سەربازییان نەبووە، بەڵام خەڵکێکی ئازا و بەجەرگبوون، خالیدی کوڕی وەلید لەو کەڵە پیاوانەیە



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەناو ئەواندا هەڵکەوتووە، لەجەنگدا دەڵێت: "هەرکاتێک منتان بینی شمشێرەکەم بەرزکردەوە بەرامبەر بەدوژمن، ئێوەیش شمشێر بەرزبکەنەوە". هەمیشە یەکەم کەس بووە شمشێری بەرزکردۆتەوە. بەرائی کوڕی مالیک یەکێکە لە هاوەڵە بەڕێزەکان لە جەنگی یەمامە ئەیخەنە ناو مەنجەنیقێکەوە و فڕێی ئەدەنە ئەو دیوی قەڵاکەوە بۆ ئەوەی دەرگاکە بکاتەوە، ئەو دیوی قەڵاکەیش چوار هەزار مورتەد (هەڵگەڕاوەی)ی لێبوە لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزندا.

فەرغەلی: بەڵێ بەدڵنیاییەوە ڕاستە، ئەمانە نموونەی ئازایەتی و حاڵەتی ئیستیشهادین، هەمیشە عیززەتیان هەبوە و سەریان دانەنەواندووە بۆ هیچ کەس، عیزەت سیفەتێک بووە لەناو عەرەب دا کە حەزیان بەسەربەرزی و ئازادی بووە، لەدواییدا کە ئیسلام دێت.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ...﴾ [فاطر].

ئەوەی سەربەرزی و پایەبڵندی دەوێت، با بزانێت کە هەموو سەربەرزی و پایە بڵندیەک هەر بۆ خوایە...

هێندەیتر عیزەتیان بەرزدەبێتەوە، ئەمە بەگشتی سیفاتی ئەوان بووە.

ماکوان: ئەی چۆن ڕازی و عابیدت کڕیووە؟ شێخ لەبەر من ئازادیان بکە با بیانکەین بە هاوڕێی خۆمان و لەگەڵمان بن.

فەرغەلی: ئاساییە خۆ من بەقەدەر کورەکانی خۆمم خۆش دەوێن، بەڵام ئێستا پێیان بڵێین ئێمە هاوڕێی یەکین ئەوان نازانن هاوڕێیەتی چییە، مادام کڕیومن هەروا بیر دەکەنەوە کە بەندەی منن.

ماکوان: جا ئاساییە تێیاندەگەیەنین، لەبەر خوا ئازادیان بکە با بە کرێ لەگەڵماندا بن.

فەرغەلی: باشە ئاساییە، کەی تاقەتت بوو پێیان بڵێ.

بەڵام بڕوام نییە بەلایانەوە زۆر گرنگ بێت، ئەوان گرنگە بەلایانەوە ژیانیان لەگەڵ ئێمەدا دابین بێت!





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: باشە بەسەر چاو.

فەرغەلی: ئەمانە زۆر ئارام گرن بۆ برسێتی و نەهامەتی، هەرگیز داوای هیچ ناکەن.

ماکوان: بەڕاست؟

فەرغەلی: یەکێک لە سیفەتێکی تریان سەبر و ئارامگرتن بوو، بۆیە ئەم ئیسلامە دراوە عەرەب، ئارامیان دەگرت لەسەر گەرما، وشکی، سەرما، هەژارییەکی زۆر، هەندێک جار بەهەفتە نانیان نەخواردووە و گوێیان نەداوەتە جلوبەرگ و بەژیانێکی سادە ژیاون و زۆر بەئارامبوون، کاتێک ئەم ئیسلامە هاتە خوارەوە پێویستی بە سەبرگرتن هەبوو تابتوانن هەڵیبگرن، تا سەبربگرن لەسەر (برسێتی، جیهاد و قورسیی جەنگ، ماندوو بوونی سەفەری ڕێگەی دوور و درێژ، ئابڵوقەی ئابووریی و کۆششکردن و ..هتد)، بەگشتی زۆر ئارامگربوون.

ماکوان: ڕاستە ئیسلامیش ئارامگرتنی دەوێت.

فەرغەلی: سیفاتێکی تری گرنگیان هەبووە، درۆزن نەبوون.

ماکوان: عەرەب درۆزن نەبووە؟

فەرغەلی: بەڵێ، بەڵێ درۆزن نەبوون وەک بەنی ئیسرائیل و جوولەکە تا دەستکاری کتێبەکانیان بکەن هەموو شتێکیان ڕاستگۆی بووە، تەماشا بکە هەرگیز کەسێک شمشێری لەسەر ملیشیان دانایە پێی بووتنایە موسڵمان بە، قەت موسڵمان نەدەبوو بە درۆ یان لەترسا!

ماکوان: سەیرە چۆن ڕاستگۆ بوون، تێناگەم لە مەبەستت؟

فەرغەلی: سیفەت و ڕەووشتی عەرەب بەشێکی خراپی هەبوو پێشتر بۆم باسکردوویت، بەڵام سیفەتیان هەبووە جێی سەرسووڕمانە، لەناو خەڵکانیتردا بەو شێوەیە نەبووە، بۆ نموونە: ڕاستگۆیی لەناو عەرەب دا سیفەتێکی بەرزبووە، لەناو ئەم ئیسلامەیشدا کەسێک هەتا ڕاستگۆ نەبێت ناتوانێت خەمی ئەم پەیامە لەکۆڵبگرێت، ڕاست و درووست نەبێت ناتوانێت بانگخوازبێت بۆ ئەم ئیسلامە، یەکێک لە گەورەترین سیفەتەکانی موسڵمان ڕاستگۆییە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە (الصادق الامين) ناسراوە، هاوەڵەکەی ئەبوو بەکری سدیق بە ڕاستگۆ ناسراوە، لەبەر ئەوە عەرەب بەگشتی سیفەتی ڕاستگۆییان تێدابووە، درۆیان نەئەکرد



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

و ڕقیان زۆر لەدرۆ بوو، ئەم پەیامە ئەگەر لەناو قەومێکی درۆزندا بهاتایە، وەکو یەهوودی و نەساراکان هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُنَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ الْكِتَابِ وَمَا هُوَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ [آل عمران].

دەستەیەک لەوانەی (کە لە چەند ئایەتی پێشوودا باس کران، واتە جووەکان) زمانیان با دەدەن بە جۆرێک شت دەڵێن، گوایە (تەورات) دەخوێننەوە، بۆ ئەوەی (ئێوە چەواشە بکەن)و وا بنوێنن کە ئەو کتێبە دەور دەکەنەوە، لە حاڵێکدا ئەوەی کە دەیخوێننەوە لەو کتێبەدا نییە (زۆر جار) دەڵێن: ئەوەی کە دەیخوێنینەوە هەر ئەوەیە کە خوا ڕەوانەی کردووە، بەڵکوو هەرگیز ئەوە لەلایەن خواوە نییە، بە دەم خواوە درۆ دەڵێن چاکیش دەزانن کە (درۆ و بوختان دەکەن).

درۆیان بەدەمی خوای گەورەوە دەکرد، ئەمەش لەکوێ لەناو قەومێکدا دابەزیوە شمشێریان خستۆتە سەر گەردنیان هەر ڕاستگۆ بوون، درۆ کردن سیفەتێکی پیسبووە لەناویاندا و بڕوایان بەدرۆ نەبووە.

ماکوان: ئەتوانی نموونەیەکی ڕاستگۆی سەرکردەکانیانم بۆ بهێنیتەوە؟

فەرغەلی: پێش موسڵمانبوونی ئەبوو سووفیان، بۆ وڵاتی ڕۆم سەفەر دەکات، لەوێ پادشای ڕۆم هەواڵی ئەم پێغەمبەرە ئازیزەی ﷺ لێدەپرسێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەبوو سووفیان ڕقی لێیبووە دوژمنی بووە، بەس ناتوانێت دەریببڕێت. پادشای ڕۆم وەرگێڕەکەی بانگ دەکات دەڵێت: "لەدەوروپشتی بووەستن (ئەوانەی عەرەب بوون) ئەگەر درۆیکرد بەدرۆیبخەنەوە"، ئەویش دەڵێت: "لەلای من درۆکردن عەیبە، چوونکە من گەورەی هۆزەکەی خۆمم، ئەوەی شانازی پێوە بکەم سەرم بەرزە کە ناتوانم لەگەڵ خەڵک درۆبکەم و لەبەرامبەر هۆزەکەیشم ناتوانم درۆزن دەربچم".

پرسیار لە ئەبوو سووفیان دەکات دەڵێت: لەناو ئێوەدا "محمد ﷺ نەسەبی چۆن بووە؟





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەبوو سووفیان بەڕاستگۆیی دەڵێت: "هو فینا ذو النسب" یەکێکە لەوانەی شانازیی نەسەبی هەبووە، پاشان پرسیاری لێدەکات دەڵێت: "فهل قال هذا القول من قبلکم احد قط قبله؟" ئایا هیچ کەسێکیتر هاتووە پێش ئەو داوای ئەم پێغەمبەرایەتییە بکات؟

ئەویش دەڵێت: نەخێر؛ پرسیارێکی تر دەکات: "هل کان من ابائه من ملک؟" هیچ کەسێک لە باوو باپیرانی پادشا بوون کە ئێستا بەدوای مووڵکی ئەواندا بێت، سەروەت و سامانێکی بکەوێتە دەست؟ ئەویش دەڵێت: نەخێر!

پاشان دەڵێت: "فأشراف الناس اتبعوه أم ضعفاؤهم؟" ئەو کەسانەی شوێنی دەکەون خەڵکی ئەشرافن یان لاوازەکانن؟

دەڵێت: لاوازەکان.

هەروەها لێی پرسی: "فهل یرتد أحد منهم سخطة لدینه بعد أن یدخل فیه؟" هیچ کەسێک ئەشکەنجە ئەدەن کە پەشیمان ببێتەوە لەدینەکەی خۆی؟

دەڵێت: نەخێر.

پێش ئەوە هیچ درۆیەکتان لەو پیاوە بینیووە کە ئێستا بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکات؟

دەڵێت: نەخێر.

ئەی هەتا ئێستا هیچ غەدرێکتان لێی بینیووە؟

لەوەڵامدا دەڵێت: لەوانەیە غەدرێکی لێبوەشێتەوە، بەڵام تا ئەم ساتەوەختە نەخێر.

خەڵکتان لەیەکتر کوشتووە؟

دەڵێت: بەڵێ.

پرسی: کوشتن و بڕینتان لەگەڵ یەکتریدا چۆن بووە ؟ وتی: " الحرب بیننا وبینه سجال، أي ینال منا وننال منه (هو یقصد بدر وبعدها أحد)". جەنگ لەنێوانماندا ڕوویداوە و جارێک لێیان بردووینەتەوە و جارێکیش ئێمە بردوومانەتەوە) مەبەستی جەنگی بەدر و پاشان ئوحوودە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

چیتان فێردەکات؟

بزانن پیاوێکی مووشریک چۆن وەڵام دەداتەوە، بەڕاستگۆیی ئەبوو سووفیان دەڵێت: " يقول اعبدوا الله وحده ولاتشركوا به شيئا، واتركوا ما يقول اباۆكم ويامرنا بالصلاة والصدق والعفاف والصلة". داوامان لێدەکات تەنها خوا بپەرستین هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەین، داوا دەکات وازبهێنین لەدینی باوو باپیرانمان.

ئەبوو سووفیان لێرەدا وەکو ئەوە وایە ئەم بانگەوازی قەیسەر دەکات بۆ ئەوەی بێتە ناو ئیسلامەوە، هەرچی پێغەمبەری خوا ﷺ داوایکردبوو بەڕاستگۆیی وتوویەتی، ئەمە پیاوەتی و شەهامەت و ڕاستگۆیی ئەو کاتانەیە، ئەم ئیسلامەش خەڵکی ڕاستگۆی دەوێت و بەدرۆزن و بوودەڵە هەڵناگیرێت، خەڵکێک هیچی لەبارا نییە و بەئارەزووی خۆی نان و پیاز دەخوات بەئیسلامەوە، ئەمەیان دەستناکەوێت، ئیسلام ئەم جۆرە کەسانەی ناوێت.

یاخوود کەسێک دێت پێغەمبەر ﷺ شمشێر دەخاتە سەرگەردنی کە لەجەنگدا گرتوویەتی و پێیدەڵێت: موسڵمان دەبیت؟

ئەویش دەڵێت: نەخێر لەگەردنم بدە.

پەشیمان نابێتەوە ڕاستگۆیە، پێغەمبەر ﷺ ئازادی دەکات.

دەڵێت: لەبەر ئەوەی نەتکوشتم ئاوا بەم شێوەیە وازت لەمن هێنا وا مسوڵمان دەبم، لە ڕیوایەتی تردا هاتووە کە بۆیە پێشتر موسڵمان نەبووە بۆ ئەوەی نەڵێن ترساوە بە مونافیق لە قەڵەم بدرێت، مردن هەڵدەبژێرێت بە مەرجێک درۆزن و ترسنۆک دەرنەچێت.

ماکوان: ڕاستە.

لەم قسانەدا بووین ڕوومکردە عابید و ڕازی و پێم وتن ئەوا شێخ ئازادی کردن و ئێوە عەبد نین و هاوڕێ و برای یەکترین! کەوام وت ڕازی و عابید تەماشایەکی فەرغەلییان کرد و دەم و چاویان دا بەیەکدا و دەستیان کرد بە گریان.

من وامزانی خۆشحاڵ دەبن، کەچی ئەوەندە ناڕەحەت بوو ڕازی فرمێسک بەچاویدا هاتە خوارەوە، لە کاتێکدا خەڵکی بۆ ئازادی ژیانی خۆی ئەبەخشێت؟





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

داوام لە فەرغەلی کرد کە عابید و ڕازی ئازاد بکات و ئەویش بە زەردەخەنەوە وتی چیت پێ باشە بیکە، بەڵام ئەوان حەزیان بە کۆیلایەتییە.

وامزانی بۆ خۆشی وادەڵێت کە عابید و ڕازیم بانگ کرد و مژدەی ئازادبوونیانم دا هەردووکیان پێیان ناخۆش بوو، ڕازی گریا هەستم پێکرد زۆر نارەحەت بووە کەچی فەرغەلی پێدەکەنی!

ماکوان: بەڕاستی من هیچ تێناگەم لەو ڕەوشە، مانای چییە خەڵک بۆ ئازاد بوونی خۆی پێناخۆش بێت؟

فەرغەلی: ئەم زەمەنە هەموو کەس بە دوای ئازادی دا ناگەڕێت، خەڵکی بە دوای نان و ژیانی خۆیدا دەگەڕێت، ئێستا ئەوان ئازاد بکەیت، نازانن چی بکەن وا تێدەگەن کە دەستیان لێ هەڵدەگریت، یان ئەوەیە تەبەنییان بکەیت وەک کوڕی خۆمان، یان ئەوەیە وەک کۆیلە بمێننەوە، چوونکە چۆن ئەوان مافی ئەوەیان هەیە کە کۆیلەمان بن، مافی ئەوەشیان بەسەر ئێمەوە هەیە کە ژیانیان دابین بکەین، کەواتە ئەوان بە زمانی سەردەمی خۆمان ئەتوانیت ناوی بنێیت وەک کرێکار، فەرمانبەر، سەرباز هەر ناوێکی تر.

ماکوان: ئاخر خۆ ئەوانە کۆیلە نین، ئەوانە بە پەیماننامەیەک و کۆنتراکتێک کار دەکەن بۆ خاوەن کارێک یان کۆمپانیایەک یاخوود وڵاتێک، ئازادن لە چوون و سەربەستی خۆیاندا.

فەرغەلی: بەشێک لە قسەکانت ڕاستە، بەڵام لە کۆتاییدا بەشێکن لە کۆیلە کە خەڵکێک ئامادە بوو هەموو یاسایەکی تۆ کە بەسەریدا دەسەپێنیت پیادە بکات، ئەویش جۆرێکە لە کۆیلایەتی.

ماکوان: ئەم قسەیەت تاڕادەیەک ڕاستە، لە وڵاتی ئێمەدا خەڵکی بۆ حیزبایەتی دەبنە کۆیلە بۆ لەتە نانێک و دەبنە ماستاوچی!



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرغەلی: ماستاو چی! جا ئەوە مانای چییە؟

ماکوان: جۆرێکە لە کۆیلایەتی، ماستاو چێتی واتە بەرانبەرەکەی چی وت بە قسەی دەکات و ڕەچاوی بیروباوەڕ و مەبدەئی ناکات بۆ لەتە نانێک هەموو ژیانی خۆی دەفرۆشێت.

فەرغەلی: ڕاستە.

ماکوان: کەواتە کۆیلایەتی پێداویستی ئەم زەمەنە بووە؟

فەرغەلی: زۆر جار دایک و باوک بۆ مانەوەی منداڵەکانیان دەیانکردنە کۆیلەو دەیانفرۆشتن.

خۆیان پارەیەکیان دەست دەکەوت منداڵەکەشیان لە مردن ڕزگار دەکرد.

ماکوان: ئەی کوشتنی کچەکانیان، وەک دەڵێن زیندە بەچاڵکردن هۆکاری چی بووە؟

فەرغەلی: هۆکارەکەی ئەوە بوو بۆیان بە خێو نەدەکرا پاشان وەک کوڕ نەبوو تا خاوەن هێزو بازوو بێت، بۆیە هەر بە زیندوویی دەیان خنکاندن بەناوی ئەوەی کە گوایە فریشتەکان کچن باشترە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا!

ماکوان: جا ئەمە پەیوەندی بە ئایین و دینیانەوە هەبوو؟

فەرغەلی: نا، خۆیان دایانتاشی بوو دوایی کردبوویانە دین، تەنها کاهین و جادووبازەکان ڕێگەیان بۆ دانابوون و حەڵاڵی کردبوو بۆیان.

ماکوان: ئەری من با پرسیارێکی ترت لێبکەم شێخ فەرغەلی، ئەم پارانە لە کوێ دەهێنیت؟

فەرغەلی: زۆر دەمێک بوو چاوەڕوانی ئەو پرسیارەم لێدەکردی، جێگایەکمان هەیە پڕیەتی لە ئاڵتوون و زیو، کەرەستەی کۆنی سەردەمی پێش ئێستایە، جێگاکەی ڕازی و عابید دەیزانن و ئەمەش نەخشەی ئەو جێگاییە با پێت بێت هەرکات پارەت نەما یاخوود پێویستت بە پارەو سامان بوو بڕۆ لەوێ دەریبهێنە و بیفرۆشە، بەڵام وریابە هەرگیز ئاڵتوون و زیو بە تەنها مەفرۆشە با عابید و ڕازیت لەگەڵ بێت، ئەو نەخشەیە نزیک ناوچەیەکە بەناوی (نەجران).

ماکوان: نەجرانی ناوچەی مەسیحییەکان؟




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرغەلی: بەڵێ خۆیەتی.

ماکوان: باشە ئەم عەرەبانە چۆن بوون بە مەسیحی؟ ئەوە زانیمان جوولەکە ڕاوەدوونران هاتنە ناوچەی عەرەبەکان و ئاینی یەهوودییان بڵاوکردەوە، بەڵام مەسیحییەکان چۆن توانیان عەرەب بکەنە مەسیحی؟

فەرغەلی: لەڕێگای پیاو چاکێکی نەسرانییەکانەوە بەناوی (فیمیۆن)، خەڵکی وڵاتی شامە بۆ بانگەوازی ئاینی نەسرانی هاتە ناوچەکەو لێی دەگێڕنەوە کە خاوەنی کەرامات بووە.

ماکوان: کەرامات، بۆ ئەوەندە دیندار بووە ئەم کەسە؟

فەرغەلی: کەسێکی یەکتاپەرست بوو، فیمیۆن هاتە ناوچەی ئەفریقا بۆ بانگەوازی ئاینەکەی، دوای ئەوەی هەندێک چەتە و ڕێگر ئەیگرن و دەیفرۆشن بە کۆمەڵێک لە خەڵکی نەجران و کە دەچێتە ئەوێ، عەرەبەکانی نەجران دارێکیان دەپەرست و ئەو دارە ببوە خوای خەڵکی نەجران، فیمیۆنیش داوای لە خەڵکی ئەو شارە کرد ئەگەر خواکەی من خواکەی ئێوەی کوشت خواکەی من دەپەرستن؟

هەموو خەڵکی نەجران وتیان بەڵێ ئەگەر خواکەی تۆ بتوانێت خوای ئێمە بکوژێت ئەوە دینەکەی تۆ هەڵدەبژێرین.

دوای ئەوەی دوعا دەکات لە خوای پەروەردگار دەپاڕێتەوە، خوای گەورەش داواکەی جێبەجێ دەکات هەورە بروسکەیەک دەنێرێت دارەکەی نەجران دەسووتێت!

ئیتر لەو سەردەمەوە خەڵکی نەجران بوونە مەسیحی و ئاینی مەسیحییەت لە ناو عەرەب دا لەو کاتەوە بڵاو بۆتەوە.

ماکوان: ئەی چۆن چوونە ناوشاری یەمەن و خەڵکی یەمەن زۆریان بوونە مەسیحی؟

فەرغەلی: لەڕێگای (عەبدوڵڵای کوڕی سامر)

ماکوان: ئەمە کێیە؟

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرغەلی: چیرۆکی گەل و هۆزی ئوخدودت نەبیستووە؟

ماکوان: با بیستوومە، لە قورئاندا لە سوورەتی (البروج) دایە، جا ئەوە پەیوەندی بەسەر ئەو بابەتەوە چییە؟

فەرغەلی: خوای گەورە باسی ئەو چیرۆک و مێژووە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە، بزانە کە قورئان هەموو شتەکانی مووعجیزەیە، چوونکە ئەو باسە کورتە لە ژیانی گەل و هۆزی ئوخدود کراوە، حیکمەتێکی گەورەی لە پشتەوەیە، ئەویش باس و بڵاوکردنەوەی دینی خوایە بە ناوچەکاندا.

ماکوان: چۆن؟

فەرغەلی: کاتێک کە عەبدوڵڵای کوڕی سامر چووە ئەو جێگایە وردە وردە بانگەوازی نەسرانیی دەکرد، ماڵێکی درووست کرد لەناو شاخەکانی یەمەندا، ئەو دەمە دەسەڵاتداری یەمەن ناوی (زولنەواس) بوو، خۆی لەبنەڕەدا دا ناوی ئەسعەدی حومیرییە، کوڕی یەکێکە لە پاشاکانی یەمەن، ئەوانیش پێیان دەوترا (توبەع)

ماکوان: توبەع چییە؟

فەرغەلی: توبەع پاشاکانی یەمەنن، چۆن ڕۆمەکان هەرقلیان هەیە، فارسیش کیسرا، میسر فیرعەون، حەبەشەکان نەجاشی، یەمەنیش بە پاشاکانیان وتراوە توبەع.

ماکوان: بەڵێ، بەڵێ، فەرموو بەردەوام بە.

فەرغەلی: جا ئەم پادشای یەمەنە کوڕێکی لاو هەڵدەبژێرێت بۆ ئەوەی فێری جادووی بکات و کاری جادووبازی پێبکات، ئەو سەردەمە لە جیاتی دەزگای جاسووسی و مووخابەراتی، ساحیرو جادووبازەکانیان بە کار دەهێنا، ئەو پادشایەش ئەم کوڕە گەنجە هەڵدەبژێریت و دەینێرێت بۆناو ساحیرەکانی یەمەن کە لەشاخەکاندا ژیانیان دەکرد، کە دەچووە لای ساحیرەکان لەسەر ڕێگاکەیدا عەبدوڵڵای کوڕی سامری دەبینی کە یەکێک بوو لە ڕاهیبەکانی نەسرانی؟

ماکوان: ئەی دینی خەڵکی یەمەن چی بوو؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرغەلی: پێشتر ئاماژەمان پێدا، کە زۆربەیان یەهوودی بوون، یەمەنییەکان ئایینی جوولەکەیان هەڵبژارد بوو.

ماکوان: یەهوودییەکان خەریکی سیحر و جادووش بوون!؟

فەرغەلی: بەڵێ بەدڵنیاییەوە جوولەکە هەر خەریکی سیحر و جادوو بازین، بەهەر حاڵ ئەم کوڕە بەردەوام بوو لە فێربوونی جادوو لای ساحیرەکان و لە ڕێگاش دا دەچوو فێری دینداری و خواپەرستی دەبوو لەلای ڕاهیبە نەسرانییەکە کە ناسراوە بە عەبدوڵڵای کوڕی سامری، تا ماوەیەک ناچێتە لای ساحیرەکان و تەوبە دەکات لای ڕاهیبەکە دەمێنێتەوە، زولنەواس بەدوایا دەگەڕێت و بانگی دەکات و پێی دەڵێت بۆ ناچیت بۆلای جادووبازەکان، ئەویش باسی ڕاستی و درووستی ئایینی مەسیحییەتی بۆ دەکات و پێی دەڵێت کە لە ڕێگای عەبدوڵڵای کوڕی سامری یەوە بووە بە نەسرانی .

زولنەواس داوا دەکات کە عەبدوڵڵا کوڕی سامری بکوژرێت و داوا دەکات لە گەنجەکەش واز لە ئایینەکەی بهێنیت و بگەڕێتەوە سەر ئایینی یەهوودی و دەست بکاتەوە بە جادوو، دیارە بە قسەی ناکات و هەڕەشەی کوشتنی لێدەکات و لەکاتی کوشتنی کوڕە لاوەکدا مووعجیزە ڕوو ئەدات، چەند جار هەوڵی کوشتنی ئەدەن لە بەرچاوی خەڵکی یەمەندا ناتوانن بیکوژن، کە لە فەرموودەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە گەنجەکە بە زولنەواس دەڵێت: ناتوانیت بمکوژیت هەتا نەڵێیت بەناوی خوای ئەم گەنجە، ئیتر ئەوکاتە دەتوانیت بمکوژیت، پادشا لەبەر چاوی خەڵکەکەدا داواکەی جێبەجێ دەکات و دەڵێت بەناوی خوای ئەم گەنجە و ئیتر تیرەکەی بەر دەکەویت و دەکوژرێت، لەوکاتەوە زۆربەی خەڵکی یەمەن دەبنە مەسیحی و ئەو منداڵەش کە قسە دەکات لەگەڵ دایکی و هۆزی ئوخدود هەر لەو چیرۆکەدایە کە خوای گەورە لە قورئاندا بۆمان باس دەکات.

ماکوان: ئەی بۆ ناونراون بە گەل و هۆزی ئوخدود، خۆ ئەوانە خەڵکی یەمەنن؟

فەرغەلی: ئوخدود واتە چاڵی پڕ لە ئاگر، ئەو هەموو خەڵکە خراونەتە ناو ئەو چاڵەوە سووتێنران، بۆیە ناونراون بە گەل و هۆزی چاڵی ئاگرەکە!

ماکوان: بەڵێ ئێستا تێگەیشتم، ئەی دواتر چی ڕوویدا!؟




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرغەلی: لەسەر ئەوەی کە چوونەسەر ئایینی نەسرانی یەکتاپەرستی هەتا بڵێیت ئازاری خەڵکی یەمەنیان ئەدا، خەڵکی یەمەن زۆربەی بوونە خواناس و یەکتاپەرست، زیاد لە بیست هەزار خواناسی نەسڕانی کوژران و ناونران بە گەل و هۆزی ئوخدود.

خوای گەورە ئاماژەیان پێ دەکات لە قورئان دا و دەفەرمووێت:

﴿قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ۝﴾

بە کوشت چن، نەفرینیان لێبێت، ئەوانەی کە چاڵیان هەڵکەند (بۆ ئیمانداران).

﴿ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ۝﴾

ئاگری داگیرساوی بەتینیان تیا کردەوە.

﴿إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا قُعُودٞ۝﴾

کاتێک کە بە دەوریدا دانیشتبوون.

﴿وَهُمۡ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ شُهُودٞ۝﴾ [البروج]

لە نزیکەوە چاودێری ئەو کارەساتەیان دەکرد کە بەسەر باوەڕداراندا دەهێنرێت و خۆیان لە نزیکەوە سەرپەرشتییان دەکرد.

جا لەو کارەساتە بە سوێیەی بەرانبەر بە ئیمانداران کرا، کەسێک لە پیاو ماقوڵانی یەمەن ڕایکرد بۆ شام بەناوی (دەوس زولسەعلەبان ) کە چووە لای دەسەڵاتدارانی ڕۆمی شەرقی ئەو سەردەمە ببوونە مەسیحی و کە هاوکاری خەڵکی یەمەن بکات و لە دەست جوولەکە یەمەنیەکان بیان پارێزێت.

دەسەڵاتی ڕۆمی شەرقی بیری کردەوە کە سووپا بنێرێت بۆ یەمەن بۆ هاوکاری مەسیحییەکان، بەڵام دوورە و لە توانایدا نییە بە ئاسانی سووپاکە بگاتە ئەو ناوچەیە، بۆیە دەوسی زولسەعلەبانی نارد بۆ لای نەجاشی حەبەشە کە فریای مەسیحییەکان بکەویت لە




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یەمەن، پایتەختی حەبەشە ناوی (ئەکسیوم) بوو لەساڵی ٥٢٠ بۆ ٥٢٣ زایینی، پادشای حەبەشە حەفتا هەزار کەسی ڕێکخست لە سووپایەکداو بۆ یەکەم جار ناردییە خاکی یەمەنەوە بە سەرکردایەتی دووکەس کەناویان (ئەریاتو ئەبرەهە) بوو، پادشای حەبشە ناسراو بەنەجاشی ناوی (کالب) بوو.

سووپاکەی نەجاشی توانی تەواوی یەمەن بخاتە ژێر دەستی و ئەریات بووە حاکمی یەمەن کە کەسێکی خوێنڕێژ و زاڵم بوو، ئەبرەهە کارەکانی ئەوی بۆ قبوڵ نەدەکرا تا لە ڕێگای شۆڕشێکەوە توانی بیکوژێت خۆی ببێتە حاکمی یەمەن ئەم کارەش نەجاشی توڕە کرد.

لەم قسانە دا بووین فەرغەلی بەسەر ئەسپەکەوە بوورایەوە کەوتە خوارەوە، گیانی ئەدا بۆ مردن!

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## فەرغەلی و کۆتایی تەمەن

لە گەرمەی قسەو باسی مێژوویدا بووین بەڕێکردن بەرەو خوارووی کوفە دەڕۆشتین بەئاواتی ئەوەی بگەینە خزمەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، شێخ فەرغەلی لە پڕ لەسەر ئەسپەکەی کەوتە خوارێ بە پەلە گرتم هاوارم کرد لە عابید و ڕازی بە هانامانەوە بێن، سات بەسات حاڵی خراپتر دەبوو.

عابید چوو گیایەکی هێنا کردیە ناو قاپێکی تەختە و لەگەڵ ئاودا تێکەڵی کرد و دەرخواردیدا، وردە وردە هێور بوویەوە لە پەنای گردۆڵکەیەکدا لاماندا و پاڵمان خست چاوەڕێی بووین تا هۆشی دێتەوە.

لەو کاتەدا بیری ماڵ و منداڵم کەوتەوە، وتم با کتێبەکە دەربهێنم تا ئەو هەڵئەسێتەوە سەرێک لە ماڵەوە بدەمەوە.

خەریکی دەرهێنانی کتیبەکە بووم لە کەشۆڵەکەی پشتم دا بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە،

لە پڕ عابید وتی ماکوان شیعرێکی زۆر خۆشت دەخوێندەوە، زۆر جوان بوو ئەتوانیت بۆم بڵێیتەوە.

ماکوان: ئەوە شیعر نییە عابیدی برام، ئەوە قورئانە!

عابید: قورئان چییە؟

ماکوان: قسەی خوای پەروەردگارە.

عابید: چۆن؟

ماکوان: بۆ ئەوەی خوا بناسین کتێبێکی ناردووە بۆ ناسینی خۆی، چۆنیەتی ڕێکخستنی ژیانی ئێمەی مرۆڤ، بۆ ئەوەی زوڵم نەکەین.

عابید: ئەتوانیت تۆزێکم بۆ بخوێنیت؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: سوورەتی واقیعەم بۆ خوێندەوە وەک تەلەفزیۆنی شاشە ٦٠ تەماشی دەکردم و چاوی پڕبوو لەئاو هەستم پێدەکرد لەگەڵیدا زۆر ئارامە.

عابید: ئەم وشانە زۆر جوانن چۆن گەیشتووە بە تۆ؟

ماکوان: لە ڕێگای پێغەمبەرێکەوە کە خەڵکی شاری مەککەیە!

عابید: مەککە و پێغەمبەر، ناوی چییە؟

ماکوان: محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

عابید: ناوێکی جوانە، یەکەم جارە بیبیستم!

ماکوان: نەمدەزانی چۆن تێی بگەیەنم، بەڕاستی وێستگەیەکی قوورس بوو نەمدەتوانی پێی بڵێم محمد هاتووە یان نا، نەمدەزانی چۆن باسی ئیسلام بکەم، لەزەمەنێکدام یەشتا پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەدایک نەبووە.

خوای گەورە کردی فەرغەلی جوڵایەوە هەموو گیانی بوو بە ئاو، عارەقێکی زۆری کرد، من زۆر ترسام کەچی ڕازی وتی خەمت نەبێت بەرەو باشە دەڕوات.

باشبوو چوومە لای، سەریم خستە سەر ڕانم، عابیدیش بە پارچەیەک پەڕۆ دەیکرد بەناو ئاوداو عارەقەکەی دەسڕی.

ماوەیەکی کورت بەو شێوەیە مایەوە، ئاگام لە ڕازی بوو ئاگری کردەوە دەستی کرد بەنان درووست کردن و پوشوو پەڵاشی کۆکردبووەوە، منیش دووعام دەکرد بۆ مام فەرغەلی.

فەرغەلی: دەستی کرد بە قسە و یەکەم قسەی بانگی منی کردو وتی: ئەگەر مردم بگەڕێرەوە مەیەرەوە تا دەگەیت بە کەسێکی تر ناوی (فەزڵی)ە، هەرچی ئاڵتوون پارەت پێیە بیدە ڕازی و عابید و بگەڕێرەوە ئیتر مەیەرەوە، مەگەر فەزڵیت لەگەڵدا بێت، ئەگەر کتێبەکەش ون بکەیت گەڕانەوەت ئاستەمە و ناگەڕێتیەوە بۆ ژیانی ناو ماڵ و منداڵت، ئەگەر ئەتەوێت بگەڕێیتەوە ئێستا بڕۆ!



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: نارۆم بەجێت ناهێڵم و إن شاء الله تەمەن درێژ دەبێت و دوعای شیفات بۆ دەکەم شێخ گیان.

دەستە ڕەشەکانی خستبووە ناو دەستی من لەناو دەستە سپیەکانی مندا لە کۆتەرە دار دەچوو، بەرزمکردەوە ماچمکرد. دەستی کرد بە پێکەنین، وتی بەوەفایت.

شەو لەوێدا ماینەوە هەستم کرد فەرغەلی باش بووە، چوومە لای باسی عابیدم بۆ کرد کە گوێی لە قورئان بووە خوێندمەوە باسی ئەوەشم کرد لە نوێژکردنەکانماندا بینیوینی و پرسیاری نوێژو دەستنوێژی لێکردووم.

فەرغەلی: هەرچی بۆ باس بکەیت لێت تێناگات، جارێ کاتی نییە تا زەمەنی خۆی.

ماکوان: یاشێخ پێش ئەوەی بگەینە مەککە دەمەوێت باسی ئەوەم بۆ بکەیت کە بۆچی ئەبرەهە دێت بۆ وێرانکردنی مەککە لە کاتێکدا مەسیحییە، هیچ پەیوەندی بەو ناوچەوە نییە؟

فەرغەلی: دوای ئەوەی کە ئەبرەهە ئاریاتی کوشت، نەجاشی ئەو سەردەمە کە ناوی کالب بوو زۆر لە ئەبرەهە تووڕە بوو خۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی بڕواتە ناو خاکی یەمەن، نەزری کرد لەسەرخۆی بە قژ ئەبرەهە ڕاکێشێ بەناو ئەو وڵاتەدا، ئەبرەهە زۆر ترسا داوای کرد کە ئەو هەر لە ژێر دەسەڵاتی نەجاشی حەبەشەدایە و پەیماننامەو میساقی زۆری نارد بۆی کە لەژێر ڕکێفی ئەودایە و ڕاوێژی کرد بە چواردەوری بۆ ڕازیکردنی نەجاشی، چی بکات باشە؟

بڕیاریاندا کە گەورەترین کڵێسا درووست بکەن، بۆ ئەوەی نەجاشی دڵی پێخۆش بێت، لەبەر ئەوەی نەجاشی کەسێکی دیندار بوو.

ماکوان: کڵێسا لە یەمەن یان لە حەبەشە؟

فەرغەلی: بێگومان لە یەمەن، گەورەترین کڵێسای درووست کرد لە یەمەن بەناوی (قوڵەیس)، ئەمری بە هەموو عەرەب کرد کە حەج بکەن بۆ ئەو کڵێسایە، یەکێک لە گەل و هۆزەکانی عەرەب بەناوی (نەسی) کە گەل و هۆزێک بوون لە سەر ئایینی ئیبراهیم مابوونەوە، ڕێزی کەعبە و مانگە حەرامەکانیان دەگرت، ئەو گەل و هۆزە هاتن بە پیسایی هەموو کڵیساکەیان سواغ داو ناوەکەیان پڕکرد لە پیسایی و ڕایانکرد.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کە ئەبرەهە بەمەی زانی و دەشیزانی کە عەرەب نایەن بۆ حەج بۆ ئەو جێگایە، دەڕۆنە مەککە لە کەعەبەدا حەج دەکەن، بڕیاری دا کە بە فیلەوە بڕواتە ناو مەککە و کەعبە بڕوخێنێت!

ماکوان: باشە زۆریک لە بێدینەکان دەڵێن فیل چۆن دێتە ئەو سەحرا و جێگایەوە، ئەبرەهە فیلی لە کوێ بووە ؟

فەرغەلی: بۆ مەگەر ژینگە و کەش و هەوای یەمەن و ئەفریقا وەک یەک نییە؟

ماکوان: نا مەبەستم ئاو و خواردنی فیلەکانە؟

فەرغەلی: ئەی ئەو سووپا گەورەیە چۆن ئاو دەخواتەوە یان نان دەخوات بتوانێت ئاو نان بۆ سووپاکەی دابین بکات ناتوانێت بۆ هەشت فیل دابین بکات؟ کە زۆرێک لەسەرچاوەکانیش ئاماژەیان بە یەک فیل کردووە، خوای گەورە لە قورئان دا هەر ئاماژەی بەخاوەن فیلێک کردەوە نەک چەند فیلێک، خۆ ئەگەر گریمان زۆریش بووبێتن، لەوسەردەمانەدا فیل بە خێو دەکرا بۆ جەنگ، ئێرانیش فیلی هەبووە، لە جەنگی قادسیەدا بەکاریانهێناوە دژی موسڵمانان و خالیدی کوڕی وەلید مشکی بەردایە ناو لووتی فیلەکانیان.

ماکوان: ئێستا بیرم کەوتەوە، کەواتە لە عێراق دا فیل بە کار هاتبێت لە سەحرای ناسریە و زیقار و ئەو ناوچانەی تردا، بۆچی لە یەمەن و سعودیە بەکار نایەت کە ناوچەیەکی سەوز و شاخاوی لەیەمەن و گەرمای هێڵی ناوەڕاست و هەمان ژینگە و هەوای ئەفریقایە، ئەی ئەو ناوچەیە ساسانییەکانی لێنەبوون وا ئیمپراتۆریەتی فارس و ئینجا هەروا بەئاسانی سووپای ڕێکخست بڕوات تێکی بدات.

فەرغەلی: لە ڕێگادا کۆمەڵێک لە گەل و هۆزی عەرەب بۆی دانیشتن بۆ جەنگ، وەک هۆزی (زولنەفر) (خەسعەم) بۆیان چوونەسەنگەر بەسەرکردایەتی (نوفەیل ئیبن حوبەیب ئەلخەسعەمی)[١٢] بەڵام ئەبرەهە سەرکەووت بەسەریاندا. سووپای ئەبرەهە زۆر بەهێز بوو، ئەودەمەش پادشاکانی کیسرای ساسان سەرقاڵ بوون بە یەکتریەوە کوڕو باوک یەکتریان دەکوشت، بۆیە ئەبرەهە توانی ئەو ناوچەیە حوکم بکات لە ساڵی ٥٢٧ تا ٥٧٠ زایینی، ئەم

---

[١٢] نوفیل ابن حوبیب الخثعمی



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سووپایە بەڕێ کەوت تا گەیشتە تائیف، لەناو گەل و هۆزی تائیف کە ناسراون بە سەقیف بۆ تێکدانی کەعبە ڕێنشاندەرێکیان لەگەڵیدا نارد.

ماکوان: هۆزی تائیف وایان کرد، سەیر نییە؟

فەرغەلی: نا سەیر نییە، چوونکە ئەبرەهە بچوایەتە هەر جێگایەک ئەیسووتاند و خاپوری دەکرد بە تەواوەتی تێکی ئەدا بەسەر یەکدا وەک مەغۆل وابوو. بۆیە هۆزی تائیف ترسان کە تووشی ئەو وێرانکاریە نەبن لە لایەن ئەبرەهەوە بۆیە کەسێکیان لەگەڵ نارد بەناوی (زوروغال) ئەو کەسە پێش ئەوەی بگاتە مەککە لە ڕێگادا ئەمرێت، ئیتر گۆڕەکەی دەبێتە جێگای بەردبارانکردنی عەرەب.

دوای ئەوەی ئەبرەهە دەچێتە نزیک مەککە و سووپاکەی لەوێدا دەخات بۆ ئەوەی بۆ ڕۆژێکی تر هێرش بکاتە سەر کەعبە و مەککە وێران بکات، چەند وشترێکی عەبدولموتەڵیب دەگرێت و پێم وابیت هەموو دەیزانین، پێویست ناکات بۆت باس بکەم.

ماکوان: ڕاستە هەموو دەیزانین، ئەی باشە هەست ناکەیت هەڵوێستێکی زۆر ترسنۆکانە بوو، خەڵکی مەککە هەموو چۆڵیان کرد و لەگەڵ ئەوەشدا باپیری پێغەمبەری خوا ﷺ دێتە لای ئەبرەهە زۆر ڕێزی لێدەگرێت و خاوەنی ویقار و هەیبەت و شان و شەوکەتی خۆیەتی، کەچی لە جیاتی ئەوەی داوای لێبکات کە کەعبە تێک نەدات، دەڵێت وشترەکانم بدەرەوە! لە کاتیکدا کەعبە ماڵی خوایە و ئەوان سوودیان لێوەرگرتووە.

فەرغەلی: تا ڕادەیەک قسەکەی تۆ تەواوە، بەڵام چاریان نەبوو هەر دەبوو وابکەن، چوونکە سووپاکەی ئەبرەهە زۆر بەهێز بوو، بۆیە ناچار بوو بڵێت خاوەنی ئەو ماڵە خوایە خۆی دەیپارێزێت، منیش خاوەنی وشترەکانی خۆمم هاتووم داوای شتی خۆم دەکەمەوە.

ماکوان: ئاخر مەبەستی من ئەوەیە، ئەوان کە دەیانزانی وڵات و شار و مەڵبەندەکەیان هەر تێک دەچێت مردن لە پێناویدا ئەوپەڕی شەرەف بوو، ئاخر چۆن هەر وا بە ئاسانی چۆڵی دەکەن؟

فەرغەلی: ئەوەش حیکمەتی تێدایە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: چۆن؟

فەرغەلی: ئەگەر ئەوان شەڕیان بکردایە، ئەوکات پیرۆزی ئەدرایە خەڵککەی کەعبە هەر پیرۆز دەبوو، بەڵام ئەو کاریگەریەیی جارانی نەدەما، هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کاریگەریەی نەدەما، چوونکە خوای گەورە لەدوای ئەو مووعجیزەیە کە بەسەر ئەبرەهە و شاری مەککەدا دەیهێنێت، بەدوای ئەودا بە پەنجا ڕۆژ زۆر شت کۆتایی پێدێت لەسەر زەویدا؟

ماکوان: وەک چی؟

فەرغەلی: پێمان دەڵێت بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ کە لە ساڵی فیل دا لە دایک دەبێت، خەڵکی نابێت چاوەڕوانی تەیرولئەبابیل بن، بەڵکوو دەبێت خۆیان هێز و توانا کۆبکەنەوە جەنگ بکەن. لە جەنگی بەدردا (٣١٦) کەس بوون خوای گەورە تەیرولئەبابیلی نەنارد، لە ئوحوود دا ئەو هەموو موسڵمانە شەهید بوون، پێغەمبەر ﷺ بریندار بوو کەچی خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ تەیرولئەبابیلی نەنارد، ئەمەش مانای وایە ئیتر موسڵمان دەبێت خۆی توانا و هێز کۆبکاتەوە چاوەڕوانی هیچ باڵدارێک نەبێت لە دەریای سوور و سپی و ناوەڕاستەوە.

ماکوان: کەواتە باسکردنی سوورەتی فیل لە قورئاندا، بەواتای دەستنیشانکردنی ساڵەکەیە و جیاوازی لە نێوان زەمەن و سەردەمی شۆڕش و خەباتی پێغەمبەرایەتی و کۆکردنەوەی توانا و هێزە، وایە؟

فەرغەلی: وایە بەدڵنیاییەوە ئەم قسەیە زۆر تەندرووستە.

ماکوان: ئەی لە دوای ئەوەی خوای گەورە ئەو مووعجیزەیەی نیشاندان، سووپاکە بەتەواوەتی لە ناو چوو؟

فەرغەلی: بە تەواوەتی لە ناو چوون، کوڕێکی ئەبرەهە بەناوی موسرووقی کوڕی پادشای یەمەن دوای ئەوە شەڕی دەست پێکرد لە نێوان خەڵکی یەمەن و حەبەشەکان دا، یەمەنییەکان داوایان کرد لە وڵاتی ساسان بچێت بەدەمیانەوە ڕزگاریان بکات لەدەستی حەبەشییەکان، لەڕێگای کەسێکی حومیری بەناوی (سەیف زی یەزن). وڵاتی ساسان دەچێت یەمەن پاک دەکاتەوە لە حوکمی نەجاشی و کەسێک بەناوی (بوهرەز) سەردەکەوێت بەسەریاندا، وڵاتی

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یەمەن دەخاتە ژێر ڕکێفی ساسانییەکان و کوڕێکی کیسرا دەکاتە حاکم لەوێ بەناوی (مەرزیبان )، دوای مردنی کوڕێکی تر بەناوی (دەیجەبان) و کۆتایەکەیان (بازانە).

ماکوان: کەواتە سامانی کوڕی بازان کوڕی کیسرایە دەبێتە موسڵمان و شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەوێت؟

فەرغەلی: بەڵێ؛ ماکوان گیان ماندوو بووم، ئەمەوێت سوورەتی فیل بخوێنم ئیتر ئیسراحەت بکەم.

ماکوان: فەرموو، فەرموو!

فەرغەلی: ئەم سوورەتە کە ئێستا لە قورئاندایە و خوای گەورە دایبەزاندوە واتە بیرخستنەوەیە بۆ هەموو لایەک کە ئەو مێژووە پێویستە بە وردی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت بۆ ئەوەی وانەکانی فێر بین.

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ ١﴾

ئایا نەتبینی (ئەی پێغەمبەر ﷺ) پەروەردگارت بە خاوەن فیلەکان چی کرد؟!

﴿أَلَمۡ يَجۡعَلۡ كَيۡدَهُمۡ فِي تَضۡلِيلٖ ٢﴾

ئایا سەری لێ نەشیواندن و پیلان و نەخشەکانیانی پووچ نەکردەوە؟!

﴿وَأَرۡسَلَ عَلَيۡهِمۡ طَيۡرًا أَبَابِيلَ ٣﴾

پۆل پۆل باڵندەی نەناردە سەریان؟!




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ﴾

تا بە بەردی سەنگ گڵ، بەرد بارانیان بکەن.

﴿فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ﴾ [الفيل]

سەرەنجام وەکو پووش و پەڵاش و گژوگیای خوراوی لێ کردن.

فەرغەلی گیانی دەرچوو بەسەر ڕانی منەوە، هەرچی هاوارم کرد: فەرغەلی! فەرغەلی! هیچ فەرغەلی بۆ ئەبەد چاوەکانی لە یەک داخست.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەدەم گریانەوە هاوارم دەکرد فەرغەلی، فەرغەلی! لەولاشمەوە عابید و ڕازی دەگریان. ئەوەندە گریام هەناسەم پێنەما بوو فرمێسکیش وشکی کردبوو، ئەوەندە مردنەکەی کاریگەری لەسەر دڵم هەبوو.

ماندوو بوونێکی زۆر ڕووی تێکردم هەوڵمدا سەرم بخەمە سەرسنگی فەرغەلی ماندوویەتیم دەرچێت تا گۆڕی بۆ هەڵکەنین و کفن و دفی بکەین.

سەرم لەسەر سنگی نابوو بۆ ماوەیەکی کەم ماندوویەتی پێڵوەکانی چاومی بەیەکدا نا هەر چەند چرکەیەکی پێچو گوێم لە دەنگی خێزانمە دەستی لەسەر شانم داناوە، ڕامدەوەشێنێت دەڵێت: ئەوە ئەو هاتووهاوارەت لەچییە؟ بۆ دەگریت؟ هەڵسە درەنگە بۆ نوێژی بەیانی، نوێژەکەت بکە!

هەڵسام زۆر ماندووبووم چووم دەستنوێژم گرت نوێژی بەیانیم کرد، خەوم لێنەدەکەوتەوە دەستم کرد بە قورئان خوێندن و خەیاڵم هەر لای فەرغەلی بوو دڵم زۆر پڕ بوو، کە قورئانەکەم دەخوێند زۆر دەگریام خێزانم هاتە لام: بۆ وا بێتاقەتی خۆ هیچ ڕووی نەداوە؟

ماکوان: نا وەڵلا هیچ ڕووی نەداوە، بەڵام هەر دڵم کەیلەو حەز دەکەم بگریم. کاریگەری قورئانەکەیە لەسەرم، دوای قورئان خوێندن چوومە لای هەردوو کچەکەم و ماچم کردن و لە تەنیشتیانەوە دەستی هەردووکیانم خستە ناو دەستم و چاوم نا بەیەکدا خەوم لێکەوت. نزیک کاژمێر هەشتی بەیانی بوو خێزانم خەبەری کردمەوە وتی هەستە درەنگە بڕۆ بۆ کار.

کە هەڵسام بەدەم پێکەنینەوە دەستم کردە ملی خێزانم چووم بەرەو دەموچاو شۆردن و خۆ ئامادەکردن بۆ کار.

لەلایەکەوە زۆر دڵخۆش بووم لەناو ماڵ و منداڵی خۆمدا بووم، هەستم بەئارامی دەکرد لەوکاتەوە فێربووم خێزان و منداڵ نیعمەتێکی جوانی خوایە و پێویستە مرۆڤ هەمیشە سوپاسگوزاری لەسەر بکات.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بیری هەندێک لەو کەسانەم کەوتەوە کە بۆ هەرچی کەسە باشن، تەنها بۆ ماڵ و منداڵەکەی خۆی نەبێت، کاتێک کە ئافرەتێک دەبینیت قسەی لەگەڵ دەکات زۆر بە ئەدەب و رۆمانسییەتەوە قسە دەکات، بەڵام لەگەڵ خێزان، خوشک و دایکی بەو پەڕی عەبوسی، ناشیرینی، بێ ئەدەبی قسە دەکات و دەست نوقاوە بۆ خێزان و ماڵ و منداڵی، بەڵام بۆ خەڵکیتر وانییە. هەستم کرد هەندێک کەس کە ڕێزو تەقدیری خێزان نازانێت موستەحەقە بەوەی لێی وەربگیرێتەوە، ئەوەشی ڕێزی خێزان و ماڵ ومنداڵی خۆی دەگرێت پێوویستە خەڵاتی پێشکەش بکرێت.

وەک هەموو ڕۆژانی ئاسایی چوومەوە سەرکارەکەی خۆم، وا هەستم کرد خاوەن کارەکەم تورە بێت کە دابڕاوم لەکار، بەڵام هەموو شت ئاسایی بوو کاتی کار هەموو کاتژمێرەکانم تەواوبوو هیچ ڕۆژێک نەبووکە نەچوبێتم بۆ کارو دابڕابێتم لەکارەکەم!

لەسەر کار بووم لەپڕ بیرم کەوتەوە کە من هاتوومەتەوە بۆ ئەم ژیانەی خۆم ئەی کوا کتێبەکەی مام فەرغەلی؟!

بەپەلە هەر لەسەر کارەوە تەلەفونم کرد بۆ خێزانم وتم کتێبەکەی کە دەمخوێندەوە چی لێهات تۆ لات بردووە؟

باران: بەڵێ من لام برد، چوونکە بەدەستتەوە کەوتبوە ژێرت، بەسەریدا خەوت لێکەوتبوو! بۆ چی بووە؟

ماکوان: هیچ! کە هەڵسام لەخەو لەبەردەستم نەبوو تۆزێک سەیربوو بەلامەوە.

لەدوای ئەوەی کە لەکار تەواو بووم گەڕامەوە بۆ ماڵەوە زۆر بە موشتاقیەوە لەگەڵ ماڵ و منداڵ دا قسەم دەکرد و من هەستم بەدووریيان دەکرد، بەڵام ئەوان زۆر ئاسایی بوون هەر وەک ڕۆژانی تر بوون. بیرم لای فەرغەلی بوو ژیان و هەڵسووکەوتی ئەوێ ماندووی کردبووم، ئەگەر بڵێم زۆر ئارام بووم لەناو ماڵ و منداڵی خۆمدا ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگربوو. ناچار ماوەی یەک هەفتە نەچوومەوە سەر کتێبەکە، بەردەوام کاتەکانم لەگەڵ ماڵ و منداڵ و چوونەدەرەوە و کاتی زۆرم بەخشی بەوان، دوور لە خوێندنەوە و هاوڕێکانم بەسەر دەبرد.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماوەیەکی پێچوو شەوێک بەدیار فەیسبوکەکەمەوە دانیشتبووم یەکێک لە هاوڕێیان داوای لێکردم کە لە تۆڕی پاڵتۆک لە ژووری نەتەوەیی باسێک لەسەر خێزان و ژنەکانی پێغەمبەری ئازیز صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بکەم، چوونکە بێدین و مولحیدەکان زۆر بێحورمەتانە باسەکە دەوروژێنن، جا تکات لێ دەکەم بێیت و هاوکاریمان بکەیت بابەتەکەمان بۆ دەوڵەمەند بکەیت خۆشحاڵ دەبین!

ڕازی بووم چوومە ناو پاڵتۆکەوە کاک دەروون خاوەنی ژوورەکە بوو بەڕێوەبەری گشتی ئەو ژوورە بوو زۆر بەڕێزەوە بەخێرهاتنی کردم، داوای کرد کە من باسێکی خێزانەکانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بکەم و مایکی بۆ ئازاد کردم منیش سووپاس و ستایشی خوای پەروەردگارم کرد و سڵاواتم نارد بۆ پێغەمبەری ئازیز صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، پاشان دەستم کرد بەو باسەی کە لە مێشکمدا بوو.

دەستم کرد بە قسەکردن عەرزی مەجلیسەکەیانم کرد کە کاتی خۆی باسێکم خوێندبووەوە بە عەرەبی و پاشان کاک (هێمن عەبدولعەزیز) بڵاوی کردبووەوە منیش بە هەڵم زانی ئەوە باس بکەم لەو کۆڕەدا، دەستم کرد بە قسەو باسەکانم بەم شێوەیە:

لە ڕوانگەی ئەوەی کە خۆشوویستنی ئافرەت لای پیاوان، ئەگەر چی شتێکی سرووشتی و بەڵگە نەویستە، پێغەمبەری ئازیزیش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ مرۆڤ بووەو سرووشتی بووە سۆز و خۆشەوویستی بۆ ئافرەت جوڵا بێت، بەڵام پێویستە ورد بینەوە لە ژیانی ئەو پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و بزانین بۆچی ژنی هێناوە، هۆکارەکەی چیی بووە؟

لێکۆڵینەوەکان ئەوە دەردەخات ژنانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پیر بوون، یاخوود تەڵاق دراو بوون یان بێوەژن بوون. تەنها یەک کچی تێدا بووە!

خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پیاوێکی شەهوانی بوایە ئەوە دەمێک بوو ئەبو جەهل و وەلیدی کوڕی موغیرە و هەموو ئەو دوژمنانەی تری کە بەخوێنی سەری تینووبوون لەناو قووڕەیشدا دەیانووت محمد پیاوێکی شەهوانی بووە! هەموو پیاوێکی شەهوانیش لەسەرەتاوە ئەگەر شۆڕش بکات زوو هەڵدەخەڵەتێت و بۆ شەهوەتەکانی واز لە کارەکەی دێنێت، لە کاتێکدا نە دوژمنانی توانیوویانە ئەو قسەیەی پێبڵێن، نە ڕۆژێک لە ڕۆژان بەدوای ئافرەت دا گەڕاوە.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## حیکمەتی فرەژنی لای پێغەمبەری خوا ﷺ چی بووە؟

**بێگومان خواستنی هەر ئافرەتێک لەو ئافرەتانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ خواستوونی، حیکمەت و مەبەستی تایبەتی خۆی هەبووە.**

## یەکەم: خاتوو خەدیجە -ڕەزامەندی خوای لێبێت-

**خاتو خەدیجە یەکەم خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو، بێوەژنێکی تەمەن ٣٠ ساڵان بوو[١٣] پێش شووکردنی بە پێغەمبەر ﷺ دوو شووی تری کردبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەنی بیست و پێنج ساڵە و ئەچێت ئەیخوازێت، بیست و پێنج ساڵیش لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ئەژی. تا خاتوو خەدیجەش لە ژیاندا مابو پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لە ژنهێنان نەکردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەنی ئەبێتە پەنجا ساڵ کە خاتوو خەدیجە وەفات دەکات.**

**کەواتە: ئەم کارەی پێغەمبەر ﷺ یەکەم دەروازەی جوامێری پێغەمبەرە و داوێن پاکی ئەو زاتە پاکە گومانەکان ئەڕەوێنێتەوە، تا پاکی و بێ گەردی ئەم سەرمەشق و پێشەنگە وەدیار دەکەوێت.**

**کەسێک لە تافی لاوێتی دا بێت لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا بێت، ئاخر چۆن بیر لەوە ئەکاتەوە و دڵی ئەچێت کە ئافرەتێک بخوازێت کە سەرەڕای ئەوە کە لە خۆی گەورەترە و بێوەژنیش بێ و دوو شووی تری لە پێشدا کردبێت! بەڵام ئەو کارە لە زاتێکی چاکی داوێن پاکی وەک پێغەمبەری سەر ڕاستمان ﷺ ئەوەشێتەوە، کە هەر لە سەرەتاوە مەیلی بەلای چاکەوە بووەو یەکتاپەرستی لە هەموو شت لا گرنگتر بووە.**

---

**[١٣] دەست نیشانی تەمەنی بە دڵنیایەوە نەکراوە، چونکە ناکرێت و ناگونجێت تەمەنی ٤٠ ساڵ بووبێت ئەو هەموو منداڵەشی هەبێت و لە ساڵی یازدەی پێغەمبەرایەتیشدا وەفاتی کردبێت!**



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دووەم: خاتوو سەودە - ڕەزامەندی خوای لێبێت-

ئەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەودەی خواست لە بارو دۆخێکی زۆر دژوار و ناڕەحەت دا بوو، تاکە پشتیوانی پێغەمبەر ﷺ کە خاتوو خەدیجە بوو وەفاتی کرد بوو، دوژمنانی ئیسلام هەموو دژایەتی و ئازارێکیان ئەداو پارە و سەروەتی خۆیان بەکار دەهێنا بۆ لەناوبردنی خۆی و بانگەوازەکەی. بۆیە ئەو ساڵە بە ساڵی ماتەمی ناوی دەر کردبوو، ئاخر ئەگەر دوژمنان دەستیان نەئەچووە ئازاری ئەو پێغەمبەرە ﷺ ئەوا لەبەر خاتوو خەدیجە و ئەبووتاڵبی مامی بوو. دەی ئیستا کێ ماوە کە وەک ئەبووتاڵیب بەرگری لێبکات و وەک خاتوو خەدیجەش دڵنەوایی بکات؟! بەڵام ئەوەتا ئەم جووتە پشتیوانەی ماڵیان لێ چۆڵ کردووە و کەس نییە تا لای لێبکاتەوە. لەم سەریشەوە دوژمنان زۆر بێ بەزەییانە بە هەموو جۆرێک نێزە کەوتونەتە وێزەی ئەم کەڵە پیاوە بەڕێزەی ئیسلام و بێ ڕێزی زۆری پێ ئەکەن.

بۆیە زۆر پێویستی بە ئافرەتێک هەیە کە لایەنی کەم دڵنەوایی داتەوە و پشتیوانی لە کارەکەی بکات، ئەوە بوو خاتوو سەودە ئەخوازێ لە کاتێکدا کە سەودە پەنجا ساڵ تەمەنیەتی.

ئەمەش هەر لە خۆیدا هەرچی گومان و کەشکۆڵی بەتاڵی پڕ لە هەوای دوژمنانی ئیسلام کە پێیان وایە پێغەمبەر ﷺ کەسێکی ئارەزووباز و شەهوانی بووە نایەڵێت، ئەم هاوسەرگیرییەی دووەمی هەموو ئەو گومانانە بەتاڵ دەکاتەوە کە گوایە حەز و ئارەزووی بۆ ئافرەت و شەهوانی بووە، دادپەروەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرانبەر بە ئافرەت لێرەوە بە جوانی دەردەکەوێت.

بێگومان خاتوو سەودەش -خوا لێی ڕازی بێت- پێش ئەوەی کە شوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات، خێزانی سەکرانی کوڕی عەمر بوو، یەکێک بوو لەوانەی کە لەگەڵ مێردەکانیان بەشداری دووەم کۆچکردن بوون بۆ حەبەشە.

لە گەڕانەوەیدا لە حەبەشە مێردەکەی ئەمرێت، خۆشی بێ کەس و قەلەندەر ئەمێنێتەوە، نەشی ئەتوانی کە بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی، چون ئەگەر بگەڕایەتەوە هەڵبەت لە لایەن گەلە ستەمکارەکەیەوە ڕوو بەڕووی ئازار و ئەشکەنجەی زۆر ئەبوووەوە، کەسیش نەبوو کە چاوەدێری بکات، لەسایەیدا بحەسێتەوە. بۆیە ئەبینین کە گەورەی بەزەییداران پێغەمبەری





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەکرەم ﷺ ئەم ڕچە ئەشکێنێ و ئەم پەردەی بێ دەنگییە ئەدڕێنێ و تێمان ئەگەیەنێ کە ئەوە ئیسلامە هاتووە ئەیەوێ خۆی بکاتە خاوەن هەموو بێ خاوەنێ و کەسی هەموو بێ کەسێ، بۆیە هەڵدەسێ مارەی ئەکاتەوە.

لەباسی ئەوەدا بووم کە بێمە سەر ژیانی خاتوو عائیشە و شووکردنی بەپێغەمبەری ئازیز ﷺ لەپڕ بێدینەکان مایکیان ڕفاند و ژووریان شێواند و دەستیان کرد بە جنێودان بە من، هەرچی کاک دەروون دەیوویست کۆنترۆڵی ژوورەکە بکات ئەوەندەی کە زانیمان هاک کرابوون لە ڕێگای ئەدمینێکی ترەوە وتەکانی منیان پێ قوبوڵ نەکرا، بۆیە ئەو شەوە دانیشتنەکەیان لێ تێکداین و درەنگ بوو بۆیە من ناچار بووم کە ژوورەکە جێبهێڵم و کاک دەروون داوای کرد کە سبەینێ کۆڕێکی تایبەتم بۆ بگێرێت لەسەر ئەو باسە، سبەی شەو بە تێرو پڕی باسی ئەو مێژووە بکەم کە پێغەمبەر ﷺ چەند ژنی هێناوە.

## کۆڕێک بۆ بێدەنگ بوون

شەوی ڕابوردوو بانگ کرابوومە ژووری نەتەوەیی لە تۆڕی کۆمەڵایەتی پاڵتۆک، دوای ئەوەی داوام لێکرا کە باسی ئەوە بکەم بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ ١٣ ژنی هێناوە؟

دەستم کرد بەسەرەتای قسەکانم مولحید و بێدینەکان خۆیان پێنەگیرا، دەستیان کرد بە جنێودان ژوورەکەیان تێکدا، بووە هۆکاری ئەوەی کە بیخەینە شەوی داهاتوو. بۆ شەوی داهاتوو منیش خۆم ئامادەکرد پێش وەخت چوومە ژوورەکە نیو کاتژمێری مابوو بۆ کۆڕەکە، هەروا چاوم دەگێڕا و بە نووسین گوێم شل کردبوو بۆ قسەکەرانی ئەو ژوورە. خەڵکانێک ئاخافتنیان لەسەر ئەو باسە دەکرد بەتایبەت ئەوانەی کە خەڵکی کوردستانی ڕۆژهەڵات بوون، چوونکە کاریگەری کۆماری شیعەنشینی ئێرانیان لەسەر بوو. ئیتر بەبێ ئەوەی لە ژیانیاندا کتێبێکیان لەسەر ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندبێتەوە بە پێی پەتی تێکەتبوون سەردەمی پێغەمبەریان بەسەردەمی ئێستاو سەدەی بیست و یەک شی دەکردەوە، بەزەییم بە تێگەیشتن و هزریاندا دەهاتەوە. بەتایبەت چەپەکانی ئێران، زۆر داماوانە کەوتونەتە دژایەتی ئیسلام، نەک بەزانست بەڵکوو بە پەچەکرداری کۆماری ئیسلامییە، ناشزانێت بۆ دژایەتی خودی ئایینی ئیسلام دەکات! ئیتر بووە بە خووی ئەو چەپانەی ئێران بەتایبەت کۆمەڵە و پەژاک و هەندێکیش لە دیموکراتەکان، کەمێک لە دیموکراتەکانی ئێران باشتربوون لە چاو ئەوانی تریاندا.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کاتی من هات و دەستم کرد بە قسە کردن، جارێ هیچم نەوتبوو چەپەکان و بێدین و کۆمەنیستەکان هەموو دەیانووت وانییە قسەکانت ڕاست نییە، منیش وتم پەلە مەکەن با قسە بکەم، ئەوجا لەسەر بنەمای قسەکانم بڵێن وانییە. خۆ ئێوە بە حسابی خۆتان مادییانە بیر دەکەنەوە گوێبیست بن بزانن چی دەڵێم، خۆ غەیب نازانن؟

کاک دەروون مایکی دایە دەستم، وەک پیشەی هەمیشەیی چەپەکانی پاڵتۆک هاتن دەیانووت کاک دەروون ماکوان چییە تۆ کوڕی بۆ سازدەکەیت، ماکوان نەخوێندەوارە!

دەیانووسیت کات بکوژن کوڕ تێکبدەن، پیاوێکی بەڕێز بەناوی کاک شێخ ڕزگار یەکێک بوو لە بەڕێوەبەرانی ژووری نەتەوەیی مایکی گرت، وتی: من ماکوان دەناسم ئەگەر ئێوە دەتوان دە کەستان کۆببنەوە منیش ماکوانتان بۆ دەگرم وەرن لەگەڵیدا گفتوگۆ و مناقشە بکەن!

ئیتر سووپاس بۆ خوا ژوور بێدەنگ بوو، چپە لە کەسەوە نەهات، دەستم پێ کرد تا کەوتمە نیوەی باس لە نیوەکەیدا دیسانەوە دەست کرا بە جنێوو قسەی ناشیرین بە خوشک و دایک و ژن و کەسوکارم.

خوا هەڵناگریت کاک شێخ و کاک دەروونیش درێغییان نەکرد لە فڕێدانی ئەو دەم پیسانە و ژوور بەهێمنی مایەوە.

سەرەتای گفتوگۆکەم ئاوا دەست پێکرد:

لەم بابەتە دەمەوێت ئەوە بڵێم کە خەڵکی موسڵمان جیاوازی هەیە لەگەڵ هەموو کەسێکی تردا کە پابەند نییە بە ئایینی ئیسلامەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لەناو موسڵماناندا دوو شێوە موسڵمان هەیە کە دەکرێت بە دوو چەمک باسی بکەین. ئەم دوو چەمکە پێویستە خەڵکی موسڵمان باش لێبورد بێتەوە ئەویش بریتییە لە موسڵمانی پابەند واتە(مولتەزیم) و کەسێکی سادە کە موسڵمانیەتی وەک باری کۆمەڵایەتی وکلتوری بۆ ماوەیی وەرگرتووە.

ئەم دوو جۆرە خەڵکە زۆر جیاوازن لە ڕەفتار و کرداریاندا، لای ئەو کەسەی کە پابەندە بە ئایینەکەیەوە پێویستە ڕۆشنبیری ئیسلامی بەتەواوەتی هەموو کیان و ژیانی داپۆشێبێت.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ڕۆشنبیرانی ئیسلامی ئێستا کاریگەری عەلمانییەکانی بەسەرەوەیە هەموو ڕەفتار و کرداریان، تەنانەت بیرکردنەوەیان لەگەڵ عەلمانیەکاندا وەک یەکی لێهاتووە ، هەڵبەت مەبەستم گشتی و بە ڕەهایی نییە، بەڵکوو زۆرینە لە ناو موسڵمانانی پابەند بە ئیسلامەوە ئەوە دەبینرێت زیاتر هەست بە ڕۆشنبیری جەماوەرییان دەکرێت نەک ئیسلامی واتە (ماس مێدیا)، هەموو کێشەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە موسڵمانانی پابەند ڕۆشنبیرییەکەیان لاسەنگە و بە ئیسلام پارسەنگیان نەکردووە، جارێ پێش هەموو شتێک دەبێت بزانین پێناسەی ڕۆشنبیر چییە؟ پێناسەی ڕۆشنبیر لە سەدەی پێشودا زیاتر لە سێ هەزار پێناسەی بۆ کراوە، لە ساڵی ڕابردوودا ئاماژە بە زانایەکی ئەمریکی بەناوی "دانییل بل" کرا لە کۆنگرەی ڕۆشنبیری ئەمریکی کە تێیدا زیاتر لەهەزار پێناسەی تر بۆ ڕۆشنبیری کراوە لە لایەن زانایانی ئەنترۆپۆلۆژیا و زانایانی کۆمەڵناسی و...هتد

پێناسەی ڕۆشنبیری لە زمانی ئینگلیزیدا بە واتەی کشتوکاڵ و بەرهەم هێنان دێت، لە زمانی عەرەبیدا بەواتەی هەڵدانی "ڕم" دێت بۆ جێگای مەبەست، لە ناو کورد دا بەو کەسانە دەڵێن کە زانیاری کۆدەکەنەوە لە بووارەکانی ژیاندا تا ڕۆشنبیر دەردەچن، لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئەو ناوەیان پێوە لکاوە.

لە ڕاستیدا ئیسلام لەگەڵ هەر پێناسەیەکیاندا هیچ کێشەی نییە، بەڵام ئیسلام خۆی خاوەنی پێناسەی تایبەتە بۆ ڕۆشنبیری، هەریەک لە بیرمەندانی ئیسلامی بە جۆرێک پێناسەیان کردووە بە بەهێزترین پێناسە لای من پێناسەی دکتۆر موستەفا سوباعییە کە دەفەرمووێت: ڕۆشنبیری ئیسلامی واتە تێگیشتنە لە ئیسلام بە شمولی، هەرچەندە ئەم پێناسەیە تەواو نییە بەڵام واتا گشتییەکەی بەم شێوەیەیە. هەموو دەقەکەم نەهێناوە.

پێناسەی من بۆ ڕۆشنبیری لەدوای گەڕان و لێکۆڵینەوە و پرسیارکردنێکی زۆر، دواندنی دەیان بیرمەندو زانا، من بۆخۆم گەیشتمە ئەو ڕایەی کە بڵێم ڕۆشنبیری بریتییە: لە کۆکردنەوەی زانیاری و کەڵەکە کردنی واتە "تەراکومە" بوونی زانیاری لە مێشکی خەڵکیدا تا بتوانێت شیکاری پێبکات.

لە ڕاستیدا پێناسەکە لە شیکارییەکەوە دەست پێدەکات، مەبەست لە شیکاری ئەوەیە ئەو هەموو زانیارییەی کە کۆ دەکرێتەوە، پاشان چۆن پێچەوانەی دەکەیتەوە بەو مانایەی کەچۆن شیکاری بەو زانیارییە کەڵەکە بووەکان بکەیت واتە "تحلیل" بەو زانیارییانە بکەیت، ئەمە لای من ڕۆشنبیری ئیسلامییە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## سێیەم: خاتوو عائیشە - ڕەزامەندی خوای لێبێت-

دوو نموونەی دەهێنمەوە بۆ ئەوەی زیاتر ئەم باسە ڕوونتر بێت، بە بۆچوونی خۆم ئاشناتان بکەم، بەڵام لێرەدا دەرفەت هەر ئەوەندەیە کە بەوەندە باسەکە کۆتایی پێبهێنم بەم نموونەیە، هەندێک بەرچاو ڕوونی بخەمە بەردەم هەموولاکان.

نموونەی یەکەم: شووکردنی خاتوو عائیشە -ڕەزامەندی خوای لێبێت- بە پێغەمبەری نازدار ﷺ، بۆیە لە خاتوو عائیشەوە دەست پێدەکەمەوە، چوونکە پێشتر ئاماژەم بە دوو خێزانی پێغەمبەری سەرەوەرمان ﷺ داوە کە خاتوو خەدیجە و خاتوو سەودە بوو، خاتوو عائیشە ئەگەر بە ڕۆشنبیری عەلمانی سەیری بکەین هەموو ئیسلامییەکانی ئەم سەردەمە پاساو دێننەوە بۆ ئەوەی کە خاتوو عائیشە تەمەنی نۆ ساڵ نەبووە، تەنانەت کەسێکی ئیسلامی بە منی وت: بریا کاک ماکوان، پێغەمبەر ﷺ ئەو ئافرەتەی نەهێنایە لەو تەمەنەدا.

ئەمە هۆکاری ئەوەیە بە پێوەر و ڕۆشنبیری عەلمانی بیر دەکاتەوە، زەمەن و شوێن و کاتیشی لێتێکچووە. خۆ تەنانەت ئەگەر بە ڕۆشنبیری عەرەبیش بیر بکەیتەوە کارێکی زۆر ئاساییە، پێش ئەوەی شوو بە سەروەرمان ﷺ بکات دەزگیراندار بووە، کۆمەڵگاکە بەو شێوەیە بووە یاخوود کچی عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب خێزانی عومەری کوڕی خەتاب بووە کە هەموو دەزانین عەلی لە تەمەنی دە ساڵی موسڵمان بووە، بەڵام هۆکارەکەی ئەوەیە ڕۆشنبیری ئەو کۆمەڵگایە بەو شێوەیە بوو، یاخوود کەسێکی وەک سەعدی کوڕی عوبەیدوڵلا -ڕەزامەندی خوا لە هەموویان بێت- لەسەرەتاوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە موسڵمان بوون، بەڵام خێزانەکەی کچی ئەبوو بکری سەدیق بوو کە دوو ساڵ دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ لەدایک بووە و پاشان بووە خێزانی سەعدی کوڕی عوبەیدوڵلا، هیچ کەس لەو کۆمەڵگایە لۆمەی کەسی نەدەکرد، چوونکە ڕۆشنبیری عەرەب بەو شێوە بووە پاشان هەموو ڕۆژهەڵاتناسەکان بە کۆمەڵگایەکی ناوازە ناویان بردووە لە دوای وەفاتی سەروەرمان.

کورتەی ئەم باسە گرنگە ئەوەیە کە ڕۆشنبیری واتە دیدو تێڕوانینی مرۆڤ بۆ خواو گەردوون و مرۆڤ و دەسەڵات و ژینگە، پاشان شیکاری و لێوردبوونەوە لەهەر باسێک دەبرێتەوە زەمەنی خۆی و لەگەڵ سەردەمی خۆیدا مامەڵە دەکرێت، لە کاتێکدا زیاد لە ٧٠٠ ئافرەت لە کتێبی (أسد الغابة في معرفة الصحابة )دا هاتووە، هەموو لە تەمەنی ٧ ساڵ بۆ ٩ ساڵ شوویان کردووە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەداخەوە هەندێک کەسیش لە موسڵمانان دەیان لێکۆڵینەوەیان کردووە کە گوایە تەمەنی خاتوو عائیشە لە سەرو ١٦ ساڵەوە بووە، تاکە پێوەر بۆ بوونیادنانی ئەو لێکۆڵینەوە تەنها ئەوەیە کە لەگەڵ خوشکەکەی عائیشە پێوەریان کردووە کە ئەسما تەمەنی ئەو لەگەڵ تەمەنی عائیشە پێوەرکراوە، هەڵە گەورەکەش لێرەوەیە کە ئەو لێکۆڵەرەوانە پەلەیان کردووە لێوردبوونەوەی تەواویان نەکردووە، نەیانزانیوە کە دایکی خاتوو عائیشە و دایکی خاتوو ئەسما جیاوازن -ڕەزامەندی خوا لەهەموویان بێت-

کەواتە بۆ خاتوو عائیشەی هێنا؟

یەکەم ئافرەت کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە کچێنی مارەی کردبێت خاتوو عائیشە بوو، بۆیە ئەگەر لە هاوردنی زەینەب حیکمەتی ئەوەی بووبێت کە سیستەمی تەبەننی هەڵوەشێنێتەوە کە دوایی باسی دەکەین، ئەوا لە هاوردنی عائیشە حیکمەتی لەوە گرنتری هەبوو. دیارە ئەو کاتەی کەوا عائیشەی هێنا تەمەنی عائیشە نۆ ساڵان بوو، چل و هەشت ساڵیش لە دوای وەفاتکردنی پێغەمبەر ﷺ ژیانی بردە سەر! کە ڕەنگە نهێنیی هێنانی عائیشەش هەر ئەوە بووبێت تاکو لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ دەوری پێگەیەنەرو تێگەیەنەری ئوممەت ببینێت. هەموو ئەو زانستە نهێنییانەی کە لای خەڵکی قاتی بوو ئەوا لای عائیشە (وەخت)ی بوو؛ واتە هەموو ئەو زانستانەی کە لای یارانی پێغەمبەر ﷺ دەگمەن بوو، ئەوا لای عائیشە دەست دەکەوتن بەتایبەت لە کاروباری ئافرەتانەوە. چل و هەشت دانە ساڵ ئەم دایکە بەڕێزەمان میراتی پێغەمبەری بە هاوەڵان دەبەخشییەوە. هەتا ئەبینین ئەو کارە زێڕینەی کە ئەوکاتە عائیشە پێی هەڵئەسا ئێستاش کاریگەریی لەسەر حاڵی مسوڵمانان ماوەتەوە، بۆیە کاتێ کە لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ دەچیتە ڕەوزە، ئەوا ئەستووندەیەک ئەبینیت کە ناسراوە بە (ئەستووندەی عائیشە)، کە لە کاتی خۆیدا دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی پێغەمبەر -خوا لە هەموویان ڕازی بێت- کۆڕیان لە دەوری عائیشە ئەگرت پرسیاریان لێ ئەکرد ئەویش فەتوای بۆ ئەدان.

دەگێڕنەوە کە لە کاتی خۆی لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئەبوو بەکر -خوا لێی ڕازی بێت- کە باوکێتی یان هاوەڵانی تری پێغەمبەر ﷺ وەک عومەری کوڕی خەتاب و عوسمانی کوڕی عەففان - خوا لە هەموویان ڕازی بێت-، ئیشکالێکیان بۆ


WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

درووست بووایە ئەوا ئەهاتن و پرسیاریان لە خاتوو عائیشە ئەکرد و وەڵامەکەیان لای ئەو دەست ئەکەوت.

زۆرێک لە زانایانی ئەم دواییە ئەڵێن: چارەکی حوکمە شەرعییەکان لە دوای وەفاتی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە عائیشە وەردەگیرێت. چل و هەشت دانە ساڵ بەردەوامی بە کاری پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەدا. دیارە لە سەرەتادا عائیشە لەو حوجرەیەی کە پێغەمبەری خوای تێدا نێژراوە فەتوای بۆ مسوڵمانان ئەدا، بەڵام لە دوای ئەوەی کە عومەری کوڕی خەتاب کۆچی دوایی دەکات لە حوجرە لەتەنیشت گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەنێژرێت، عائیشە شوێنەکەی خۆی ئەگوازێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە ئێستا پێی دەڵێن ئەستووندەی عائیشە و لەوێدا درێژە بە بانگەوازی ئیسلامی ئەدات.

هەندێ لە یارانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دوای ئەوەی کە پرسیاریان لە خاتوو عائیشە ئەکرد بە هەڵەکانی خۆیان ئەهاتنەوە. بۆیە یەکێکی وەک ئیمامی (السیوطي) -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- کتێبێکی نووسی لەوێدا ئاماژە ئەدات کە چۆن عائیشە هەڵەی کۆمەڵێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَی ڕاست کردۆتەوە. یەک لەو نووسراوانەی کە نووسیویەتی بە ناونیشانی "عين الإصابة فيما استدركته عائشة على الصحابة"یە. لەوێدا نموونەیەک ئەهێنێتەوە، کەوا گەورەمان ئەبوو هورەیرە -خوا لێی ڕازی بێت- ڕۆژێ فەتوایەک ئەدا و ئەڵێت: درووست نییە ئەگەر لەشت پیس بێت بەڕۆژو بیت! کەچی خاتوو عائیشە و ئوم سەلەمە ئەچنە لای و پێی ئەڵێن: نەخێر درووستە، چون پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەندێ جار لە دوای پارشێو غوسلی لەخۆ دەرئەکرد.

هەروەها لە ئەبوو موسای ئەشعەری -ڕەزامەندی خوای لێبێت- دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: (هەر ئیشکالێکمان لە شتێکدا بۆ درووست بووایە، ئەوا پەنامان بۆ عائیشە ئەبرد پرسیارم لەو ئەکرد وەڵامەکەیمان دەست ئەکەوت.)[١٤]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٤] "جامع الترمذي"




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یان ئیمامی زوهری تابعی -ڕەزامەندی خوای لێبێت- دەڵێت: عائیشه زاناترین کەس بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، گەورەترین شارەزا لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەهاتن پرسیاریان لە خاتوو عائیشه ئەکرد.[١٥]

هەروەها عووروەی کوڕی زوبەیر -ڕەزامەندی خوای لێبێت- ئەڵێت: کەسم نەبینیوە کە شارەزاتر بێت لە خاتوو عائیشه باسەکانی لە قورئان، فەرزەکان، حەڵاڵ، فیقه، شیعر، پزیشکی، باسی عەرەب، ڕەگەز و ڕەچەڵەک.[١٦]

ئاشکرایشە کەوا عائیشه (٢٢١٠) [١٧] فەرموودەی گێڕاوەتەوە، کە (١٧٨) فەرموودە بوخاری و موسلیم لەو گێڕاویانەتەوە، واتە: بوخاری (٥٨) و موسلیم (٦٨) فەرموودەیان لێی گێڕاوەتەوە.

کەوا بوو ئەم زانستە بەرفراوانەی کە عائیشه هەیبوو، لە کوێ کەسی تر ئاوا لە کارو باری پێغەمبەر ﷺ بەهرەمەنتر و شارەزاتر ئەبوو کە تەمەنی وەک تەمەنی عائیشه نەبووایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بیخوازێت؟

کەوابو حیکمەتێکی زۆر گەورە هەبوو لەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کچێکی وەک عائیشەی تەمەن نۆ ساڵان بخوازێت، وەک وتمان ئامانج لە ئیسلامەتی ئەوەیە کە ئەم دینە لە مسوڵمانان بگەیەنیت، بۆیە زۆر پێویست بوو کە کەسێک باش شارەزا بێت لە کاروباری ئافرەت و کون و قوژبنە نهێنییەکانی ژن و مێردایەتی بەو خەڵکە ڕابگەیەنێت کە مێشکی ساف بێ و بتوانێ هەموو شتەکان جوان تۆمار بکات و بەچاکی ڕایانبگەیەنێت، ئەوەتاش ئەبینین کە چل و هەشت دانە ساڵ دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ دایکمان خاتوو عائیشه ئەم دیوە نهێنییانە بەخەڵکی ئەناسێنێت.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٥] طبقات ابن سعد ج ٢، قسم ٢ ص ٣٦

[١٦] سير الصحابيات للشيخ عبد السلام الندوي ص ٤٣

[١٧]_ قال الحافظ الذهبي في السير: مسند عائشة (٢٢١٠) احاديث. اتفق لها البخاري ومسلم على مئة وأربعة وسبعين حديثاً وانفرد البخاري (٥٤)، وانفرد المسلم (٦٩)

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یان ئیمامی زوهری تابعی -ڕەزامەندی خوای لێبێت- دەڵێت: عائیشه زاناترین کەس بوو له هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم، گەورەترین شارەزا لەهاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئەهاتن پرسیاریان له خاتوو عائیشه ئەکرد.[١٥]

هەروەها عووروەی کوڕی زوبەیر -ڕەزامەندی خوای لێبێت- ئەڵێت: کەسم نەبینیوه که شارەزاتر بێت له خاتوو عائیشه باسەکانی له قورئان، فەرزەکان، حەڵاڵ، فیقه، شیعر، پزیشکی، باسی عەرەب، ڕەگەز و ڕەچەڵەک.[١٦]

ئاشکرایشه کەوا عائیشه (٢٢١٠) [١٧] فەرمووده‌ی گێڕاوەتەوه، که (١٧٨) فەرمووده بوخاری و موسلیم لەو گێڕاویانەتەوه، واته: بوخاری (٥٨) و موسلیم (٦٨) فەرموودەیان لێی گێڕاوەتەوه.

کەوا بوو ئەم زانسته بەرفراوانەی که عائیشه هەیبوو، له کوێ کەسی تر ئاوا له کارو باری پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەهرەمەنتر و شارەزاتر ئەبوو که تەمەنی وەک تەمەنی عائیشه نەبووایه که پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بیخوازێت؟

کەوابو حیکمەتێکی زۆر گەوره هەبوو لەوه که پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم کچێکی وەک عائیشەی تەمەن نۆ ساڵان بخوازێت، وەک وتمان ئامانج له ئیسلامەتی ئەوەیه که ئەم دینه له مسوڵمانان بگەیەنیت، بۆیه زۆر پێویست بوو که کەسێک باش شارەزا بێت له کاروباری ئافرەت و کون و قوژبنه نهێنییەکانی ژن و مێردایەتی بەو خەڵکه ڕابگەیەنێت که مێشکی ساف بێ و بتوانێ هەموو شتەکان جوان تۆمار بکات و بەچاکی ڕایانبگەیەنێت، ئەوەتاش ئەبینین که چل و هەشت دانه ساڵ دوای وەفاتی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم دایکمان خاتوو عائیشه ئەم دیوه نهێنییانه بەخەڵکی ئەناسێنێت.

---

[١٥] طبقات ابن سعد ج ٢، قسم ٢ ص ٢٦

[١٦] سير الصحابيات للشيخ عبد السلام الندوي ص ٤٣

[١٧]ـ قال الحافظ الذهبي في السير: مسند عائشة (٢٢١٠) احاديث. اتفق لها البخاري ومسلم على مئة وأربعة وسبعين حديثاً وانفرد البخاري (٥٤)، وانفرد المسلم (٦٩)

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## چوارەم: خاتوو حەفسەی کچی عومەری کوڕی خەتاب:- ڕەزامەندی خوای لێبێت-

**خێزانی چوارەمی پێغەمبەری سەروەرو پێشەوامان ﷺ خاتوو حەفسەی کچی عومەری کوڕی خەتاب:**

خاتوو حەفسە بێوەژن بوو، لە پێشدا خێزانی (خونویس کوری حزافە) بوو کە لە شەڕی بەدردا شەهید بوو، ئەمە هاوکات بوو لەگەڵ وەفاتکردنی خاتوو (روقیە)ی خێزانی عوسمان و کچی پێغەمبەر ﷺ، هەروەک لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر ڕەزامەندی خوای لێبێت- گێڕدراوەتەوە و لە سەحیحی بوخاریش دا هاتووە کەوا عومەری کوڕی خەتاب کچەکەی پێشکەش بە عوسمان ئەکات، عوسمانیش دەفەرموێ: باشە بابیرێکی لێبکەمەوە، چەند شەوێکی پێ ئەچێ و دێت و دەڵێت: من وای بە چاک ئەزانم کە جارێ ژن نەهێنمەوە، ئەوجارە دێت و بە ئەبوو بەکر دەفەرمووێ: ئەگەر حەز ئەکەیت حەفسەت لێ مارە ئەکەم، ئەویش بێ دەنگ ئەبێت و چەند شەوێکی پێدەچێت و پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی داوای ئەکات، پاشان ئەبوو بەکر ئەچێتەوە لای عومەر و پێی دەفەرمووێت تۆ داوای شتێکی ئاوات لێکرد بووم، کەچی من وەڵامم نەبوو، بەڵام ئەمزانی کە پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی بوو کە داوای دەستی حەفسەت لێبکات، بۆیە نهێنییەک بوو کە نەمدەویست ئاشکرای بکەم!

هێنانی عائیشە و حەفسە پەیوەندییەکی زۆر بەهێزی درووست کرد لە نێوان خۆی و ئەبوو بەکرو عومەردا. هەر ئەمەش بوو حیکمەتی خواستنی حەفسەی کچی عومەری کوڕی خەتاب -خوا لە هەموویان ڕازی بێت-.

لێرەدا ئەگەر تەماشا بکەیت و ورد ببیتەوە ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە وا بوو کچان ئەدرانەوە بەشوو کە بێوەژن دەکەووتن ئەگەر ئافرەتەکە ہمایەتەوە ئەوکات کەسێکی نەبوو بەخێوی بکات و نەفەقەی بکێشێت، بۆیە عومەری کوڕی خەتتاب خۆی داوا دەکات بیداتەوە بە شوو! لەبەر ئەوە ڕۆشنبیری ئێستاو ئەو سەردەمە جیاوازە، ئەمەش وادەکات دەبێت ئەگەر خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە بکەین بۆ هەر باسێکی مێژووی خەڵکی ئەکادیمی تێگەیشتوو شوێن و کات ڕەچاو دەکات.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## بەردەوامی لە کۆڕەکە، ئارەزووی گەڕانەوە بۆ مێژوو

لەدوای ئەوەی کە چوار لە خاتوونە بەڕێزەکانی پێغەمبەری ئازیزم ﷺ ناساند، باسی هۆکاری شووکردنیان بە سەروەری مرۆڤایەتی کرد، هەریەک لە خاتوو خەدیجە، خاتوو سەودە، خاتوو عائیشە و خاتوو حەفسە کرد - ڕەزامەندی خوا لە هەر چواریان بێت- بەردەوام لە باسی خێزانە بەڕێزەکانی تری پێغەمبەر ﷺ دا بووم لە کۆڕەکەدا.

ئەوەی کە هەستم پێکرد لە خەڵک و ئامادەبووەکان ئەو کەسانە بوون کە سەردەم و زەمەنی پێغەمبەر ﷺ وەک ئەمڕۆی کە خۆمانی تێدا دەژین وێنا دەکەن، نە زەمەن زەمەنی ئێمەیە و نە شوێن شوێنی ئێمەشە، لەبەر ئەم هۆکارە بوو کەڵکەڵەی گەڕانەوە بۆ مێژوو لەوێوە دەستی پێکردەوە و دایەوە خولیای مێشکم.

## پێنجەم: خاتوو زەینەبی کچی خوزەیمە -ڕەزامەندی خوای لێبێت-

بەڵام ناچار لە باسکردنی خێزانەکانی تری پێغەمبەری ئازیز ﷺ بەردەوام بووم و هاتمە سەر باسی خاتوو زەینەب.

ئەویش بێوەژنێکی تەمەن شەستساڵان ئەبێت، ئەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیخوازێت، پێش ئەوە خاتوو زەینەب خێزانی (عوبێیدەی کوڕی حارس)ە -ڕەزامەندی خوای لێبێت- هاوسەرەکەی لە شەڕی بەدردا شەهید ئەبێت، ئەو ئافرەتە یەکێک بوو لەو ئافرەتە خۆ بەخشانەی ئیسلام کە لە پێناو ئیسلام و پەروەردگار دا کاری ئەکرد، ئەو کاتەی کە مێردەکەی شەهید ئەبێت ئەو لە مەیدانی جیهاد خەریکی تیمار کردنی برینداران ئەبێت! زۆر بە سەبرو ئارامگر ئەبێت لە سەر شەهید بوونی مێردەکەی، کە مێردەکەی شەهید ئەبێت کەسێ نییە چاودێری بکات، کاتێکیش کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو هەڵوێستە جوامێرانەی ئەو ئەبینێت ئێستاش مێردەکەی شەهید بووە و کەس نییە کە داڵدەی بدات چاودێری بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ کە تەمەنی پیرۆزی پەنجاو پێنج ساڵە و ئەچێت دەیخوازێت، لەدوای دوو ساڵ لە شووکردنی بە پێغەمبەر ﷺ وەفات دەکات -خوا لێی ڕازی بێت-.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## شەشەم: خاتوو ئوم سەلەمەی هیندی مەخزومی -ڕەزامەندی خوای لێبێت-

کە پێشتر خێزانی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولئەسەد بوو، یەکێک بوو لەوانەی کە زوو باوەڕی بە ئیسلام هێناوە، خۆی و مێردەکەی لە ترسی زەبر و زەنگی بێ باوەڕان ڕائەکەن و ڕوو دەکەنە حەبەشە، دوای گەڕانەوەیان بۆ مەدینە، مێردەکەی لە غەزای ئوحوود شەهید ئەبێت و خاتوو ئوم سەلەمەی پەنجاو پێنج ساڵ و چوار هەتیو لەدوای خۆی بەجێدەهێڵێت، کە دووانیان کوڕ و دووانیان کچ ئەبن، خاتوو ئوم سەلەمە بێ کەس و بێ سێبەر و بێ پەنا دەمێنێتەوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بارو دۆخی ئەو ئافرەتە لە خۆ بووردەیە لەبەرچاو ئەگرێت، بۆیە ئەچێت و داوای لێ ئەکات کە ئەگەر ڕازی بێت ئەیخوازێت.

ئەویش سەرەتا ئەیووت من پیر و بە ساڵ دا چووم، هەتیوم هەیە و پڕکێشیشم واتە قەڵەوم توانای هیچم نەماوە لە هەموو شتەکانی ژیان چوومەتەوە! پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وەڵامی دایەوە و فەرمووی: من باکم بە تەمەنتەوە نییە، کەفالەتی هەتیوەکانت لە خۆم دەگرم لە خواش دەخوازم کە ئەو پڕکێشییەت نەمێنێ، خوای پەروەردگار دووعاکەی پێغەمبەر وەرئەگرێت، ئەویش ڕازی بوو شوو بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بکات.

پێغەمبەری نازادار صلى الله عليه وسلم بوو بە سێبەرو سایەی ئەو ئافرەتە خواناسەی ئیسلام و منداڵەکانیشی زۆر جوان و بە پەروەردەیەکی خواناسی بۆ پەروەردە کرد، پێغەمبەری خوا زۆر کەسایەتی ئەو دایکە وەفادارەی مسوڵمانان لەبەرچاو دەگرت و خۆشی ئەویست.

شایەنی باسە ئوم سەلەمە -خوا لێی ڕازی بێت- یەکێک بوو لەوانەی کە هەڵەی ئەبوو هورەیرەی ڕاست کردبووەوە، هەر ئەویش بوو کە لەگەڵ عائیشە بە یەکەوە فەتوایان دا کە درووستە بۆ کەسێک کە لەشی پیس بێ و بە ڕۆژووش بێت.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

حەوتەم: زەینەبی کچی جەحش -ڕەزامەندی خوای لێبێت-

لەلای بێدین و خوانەناسەکان و دڵ نەخۆشەکان تانەو تەشەر ئەدەن لە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەربارەی هێنانی ئەم خاتوونە بەڕێزە، باسێکی دەکەین کە هۆکاری شووکردنی چیی بوو بە پێغەمبەر ﷺ؟

دیارە خواستنی زەینەبی کچی جەحش، زەرورەتێکی شەرعی بووە کە دەبوایە جێبەجێ بکرایە، چوونکە زەینەب خێزانی زەیدی کوری حاریسە بوو -ڕەزامەندی خوای لێبێت- زەیدیش بە کوڕ کراوی پێغەمبەر ﷺ بوو واتە تەبەنی، ئەو سەردەمەش لای عەرەبەکان باوبوو کە شوێنەواری بە کوڕکراو هەمان شوێنەواری ئەو کەسەیە کە ئەم کوڕەی بە کوڕ گرتووە، واتە مادام زەیدی کوڕی حارس بەکوڕ کراوی پێغەمبەرە ﷺ ئەویش پشکی ئەو شوێنەوارەی بەر ئەکەوێت، بۆیە عەرەب لە سەردەمی جاهلی بە کوڕ کراوەکانیان دەوت: "أنت ابني، أرثك وترثني"

واتە: تۆ کوڕی منی و بەر میراتی من ئەکەوێت و بەر میراتی تۆش ئەکەوم! ئەوەی بۆ باوکەکەش درووست بووایە ئەوا بۆ بە کوڕکراوەکەش هەر درووست بوو، ئەگەر درووستیش نەبووایە بۆ ئەوی تریش هەر درووست نەبوو.

کەوابو ئەگەر بەپێی ئەو هەلومەرجە بووایە ئەوا پێغەمبەر ﷺ بۆی نەبوو کە زەینەب مارە بکاتەوە، چوونکە زەید بەپێی داب و نەریتی نەفامی وەک کوڕی پێغەمبەر ﷺ وابوو، کەواتە لە کوێدا ئەگونجێ کە پێغەمبەر ﷺ بووکی خۆی مارە بکاتەوە؟!

بۆیە هیچ بوارێک نەبوو بۆ لە بندەرهێنان و ڕیشە کێشکردنی ئەو چەمکە هەڵەو خوار و خێچەی کە لە مەڕ بە کوڕکراوان داڕێژرا بوو. بۆیە هاوردنی زەینەب لای پێغەمبەری خوا ﷺ پاش تەڵاقدانی لە لایەن زەیدەوە ئەو چەمکەی ڕاستکردەوە، ئەم حەقیقەتەش لە هەردوو سەحیحی بوخاری و موسلیمیشدا هاتووە.

ئەمە ڕووە شەرعییەکەی بوو، بەڵام لە ڕووە کۆمەڵایەتییەکەشەوە هیچ کاریگەریەکی لەسەر کۆمەڵگای قووڕەیش و نەیارانی پێغەمبەری خوا ﷺ درووست نەکرد، کەس




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لۆمەی پێغەمبەر ﷺ ی نەکرد بە هۆکاری ئەوەی خەڵکەکە دەیزانی کە زەید بە کوڕکراوی پێغەمبەرە ﷺ خۆی ژنی بۆ مارە کردووە، پاشان زەینەب کچی پوری پێغەمبەر ﷺ بووە خۆی داوای کردووە، خۆ ئەگەر پێشتر پێغەمبەر ﷺ خۆی حەزی لێی بووایە هەموو گەل و هۆزەکەی ئەیاندا بە پێغەمبەر ﷺ بە خۆشحاڵییەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ زەیدی مارەکرد.

چەند ساڵێک بەیەکەوە ژیان و ژیانێکی زۆر ناخۆشیان بردە سەر، هەرگیز نەدەگونجان بەیەکەوە، لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا پێغەمبەر ﷺ چەندجارێک خۆی ئاشتی کردنەوە نەیدەهێشت تەڵاق بکەوێتە نێوانیان! چوونکە زەینەب هەمیشە تانە و تەشەری لە زەید ئەدا کە ئەو بەندە بوو ئەمیش کچێکی ئازاد بووە شووی بە بەندەیەک کردووە کە کۆیلەی پورزاکەی بووە! بۆیە لەسەر دڵی قورس بوو ئەو کۆمەڵگەیەش بەگشتی جاهیل بوون، ساڵانی خۆیان ناوناوە جەهالەت، تا لە کۆتایدا تەڵاقی ئەدات و پێغەمبەریش ﷺ بە فەرمانی خوای گەورە مارەی دەکاتەوە. واتە تەڵاق دراوە ئینجا مارەی کردۆتەوە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ، هەموو جارێکیش زەینەب دەیووت: ئێوە کەسووکارەکانتان بەشووی داون، بەڵام خوای پەروەردگار لە سەرو حەوت ئاسمانەوە منی لە پێغەمبەر ﷺ مارە کردووە.

## هەشتەم: خاتوو جوەیرییەی کچی حارث -ڕەزامەندی خوا لێبێت-

خاتوو جوەیریە کە خێزانی مانعی کوڕی سەفوان بوو، ئەو پیاوەی کە سەر سەختترین و ناحەزترین دوژمنی ئیسلام بوو و دژایەتی زۆری لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ هەبوو، لە شەڕی بەنی موستەڵەق دا لە ڕۆژی "المریسیع" ئەکوژرێ و جوەیریەش بە دیلی ئەکەوێتە دەست مسوڵمانان، خاتوو جوەیرییە کچی حارسی کوڕی زیرارە کە گەورەی بەنی موستەڵەق بوو، باوکی پیاوێک بوو کە پلانی زۆر خراپی بۆ مسوڵمانان ئەگێڕا.

هەروەک لە سەحیحی بوخاریشدا هاتووە کە لە عائیشە -خوای لێ ڕازی بێت- گێڕاوەتەوە و ئەڵێت: لەو شەڕەدا چاکترین ئافرەتانی بەنی موستەڵەق بە دیلی ئەکەوێتە دەست پێغەمبەر ﷺ! پێغەمبەریش بەپێی یاسای خومس بەشی خۆی لەو دەستکەوتە دەبێت، ئەوی تریشی بەسەر مسوڵماندا بەخشییەوە، خاتوو جوەیرییەی کچی حارس یەکێک بوو لەو




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەستکەواتەی کە بەر سابتی کوڕی قەیس ئەکەوێت، جوەیرییە دێتە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و پێی دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ من جوەیرییەی کچی حارسم کە گەورەی تیرەی بەنی موستەڵەق بوو، من ئێستا دیلی دەستی شەڕم و پشکە بەری سابتی کوڕی قەیسم و بە نۆ ئۆقیە بەر ئەو کەوتووم، یارمەتیم بدە تاکو خۆم بکڕمەوە و ئەو گرێبەستە (عقد)ە هەڵوەشێنمەوە.

پێغەمبەریش صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: لەوە باشترت ئەوێت؟

ئەویش ئەڵێت: ئەو باشەیە چییە ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ؟

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت : من هەقی سابت ئەدەم، ئەگەر ڕازیش بیت من تۆ ئەخوازم، ئەویش بەم کارەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر دڵشادو شادومان ئەبێت و ڕەزامەندی خۆی دەر ئەبڕێت.

کاتێ کە یارانی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بەم کارەی پێغەمبەر دەزانن ئیتر هەرچی لەهاوەڵان کە ئافرەتانی بەنی موستەڵەقیان بەرکەوتبوو ئازادیان کردن، ژمارەیان سەد ئافرەت ئەبوو.

ئەمەش حیکمەتێکی تری ئەو پێغەمبەرە نازدارە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بوو.

پاشان بەنی موستەڵەقیش کە ئەم کارە جوامێرانەیان لە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بینی، ئیتر بۆ هەمیشەیی دەستیان لە دوژمنایەتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ هەڵگرت، چوونکە ئەو تیرەیە سەرەتا بە چەتە و ڕێگر ناسراو بوون، هەتا ئەڵێن کە هەواڵی ئازاد بوونی جوەیرییە گەشتە لای باوکی پێش ئەوەی کە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بیخوازێت، هات و نۆ ئۆقیەی لەگەڵ خۆی هێنا تا لەگەڵ خۆیدا بیباتەوە، کەچی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ خاتوو جوەیرەی سەر پشک کرد لە نێوان گەڕانەوە لەتەک باوکی یان مسوڵمانبوونی و پاشان شووکردنی بە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

ئەویش مسوڵمان بوون و شووکردنی بە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بەسەر داواکەی باوکیدا هەڵئەبژێرێت، بۆیە خواستنی خاتوو جوەیرییە جگە لەوە کە خێرو بێرێکی بۆ خودی خاتوو جوەیرییە هێنا پێشێ، لە لایەکی ترەوە هۆکارێک بوو بۆ مسوڵمان بوونی و ئازاد کردنی و




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

وازهێنانی لە کاری چەتەیی و ڕێگری. لەم سەریشەوە خەڵکی ئەیانووت: جوەیرییە دەستە ڕاستی تیرەکەی خۆیەتی.

سەرباری هەموو ئەوانە خواستنی جوەیرییە ڕێگەیەکی تری خۆشکرد بۆ دەست هەڵگرتنی بەنی موستەلەق لە کاری چەتەیی و ڕێگری و خراپەکاری و دوژمنایەتی کردنی خوا و پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

## نۆیەم: خاتوو ئوم حەبیبە -ڕەزامەندی خوای لێبێت-

خاتوو ئوم حەبیبە کچی ئەبوو سووفیان -خوا لێی ڕازی بێت- کە لە سەردەمی نەفامی خۆیدا سەرسەختترین ڕقنترین دوژمنی ئیسلام بوو لە دوای ئەبوو جەهل، ئەو ئافرەتە زۆر زوو مسوڵمان بوو و لەگەڵ مێردەکەی کە عەبدوڵڵای کوڕی جەحش بوو کۆچی بۆ حەبەشە کرد، مێردەکەی هەر لە حەبەشە وەفات ئەکات و ئافرەتەکە بە تەنیا ئەمێنێتەوە و کەسیشی چنگ نەئەکەوت کە چاودێری بکات، خۆ ئەگەر بشگەڕێتەوە بۆ لای باوانی ئەوە سەرەنجامەکەی ئاشکرایە کە یان دەبوایە کافر بێتەوە یانیش ڕوو بەڕووی ئازار و ئەشکەنجە بێتەوە، لە مەدینەش کەسێک نییە کە کەفالەت و چاودێری بکات.

کاتێ کە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بە حاڵی ئەزانێ داخوازی دەستی ئوم حەبیبە لە نەجاشی پادشای حەبەشە ئەکات، ئوم حەبیبەش کە بەمە ئەزانێ زۆر خۆشحاڵی و شادومانی خۆی بە داخوازییەکەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەرئەبڕێت، نەجاشیش ڕازی ئەبێ و هەڵئەسێ چوار سەد دینار ئەدات بە ئوم حەبیبە و بە دیاری لەگەڵ شەرحەبیلی کوڕی حەسەن ئەینێرێ بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەوە بوو لەساڵی حەوتی کۆچی ئەگەنە مەدینە. ئەو کاتە ئوم حەبیبە تەمەنی سی و پێنج ساڵ ئەبێت، کاتێ کە ئەو هەواڵە ئەگاتە لای ئەبوو سووفیانی باوکی، ئەویش ڕەزامەنی خۆی دەرئەبڕێت و ئەڵێت: (ئەوە کارێکە لوتی پێ ناشکێت)! واتە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ پیاوێکی ڕێزدارە و پێی سەرشۆڕ نابین!

لێردا حیکمەتێکی گەورە لەو ژنخواستنەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بەدی ئەکرێت، ئەویش سەرنجڕاکێشانی ئەبوو سووفیان بوو بۆ لای خۆی، ئەبوو سووفیانێک کە پێش ئەوە لە هەموو ژیانی دا دانووی لەگەڵ ئەودا نەکوڵاوە وا ئێستا شانازی بەو زاوا نوێیەی ئەکات! هەر بۆیەش بە هانینی ئوم حەبیبە ئەزیەت و ئازار لە سەر موسڵمانان هەڵئەگیرێت، زیاتر وای لە


WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەبوو سووفیان کرد کە مەیل بە لای ئاشتی دا زیاتر لە شەڕ بکات، هەر ئەم کارەش بوو بە دەروازەی ئاشتی مۆر کردن لەگەڵ پێغەمبەر و پاشان هاتنە نێو ئیسلامی ئەبوو سووفیان.

بۆیە دێت ئەچێتە لای کچەکەی و کچەکەشی پێی ڕادەگەیەنێت کە هیچ ڕێز و کەرامەتێکی نییە بە دەر لە مسوڵمانی، ئەگەر باوکیشی بێت، بۆیە واقعی ئەو ڕۆژە تێیگەیاندین کە ئەو جارەی ئەبوو سووفیان چوو بۆ مەدینە بۆ ئاشتی بوو نەک بۆ شەڕ.

وەک باسیشمان کرد سەرەنجامی ئەو کارەی پێغەمبەر ﷺ بوو بەهۆی موسڵمانبوونی ئەبوو سووفیان و پاشان هێنانە پێشی فەتحە گەورەکەی مەککە.

دەیەم: خاتوو صەفییە -خوا لێی ڕازی بێت-

خاتوو صەفییە -خوا لێی ڕازی بێت- خانمێکی هۆزی (قورەیزە) و (هۆزی نەزیر) بوو، کە دوو تیرەی جوولەکە بوون و بەڵێنداری پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان بوون، پاشان ناپاکیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد و لە بەڵێن و پەیمانی خۆیان پاشگەز بوونەوە.

خاتوو سەفییە کچی حوویەی کوڕی ئەختەب بوو کە گەورەی بەنی (قووڕەیزە) بوو، لە دایکیشەوە خوشکی سیمۆئێل بوو کە گەورەی بەنی (نەزیر) بوو، خاتوو سەفییە دوای کوژرانی مێردەکەی لە شەڕی خەیبەردا، بە دیلی ئەکەوێتە دەست مسوڵمانان، دەگێڕنەوە کەوا خاتوو سەفییە کاتێ کە دێتە لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ پێی ئەفەرموێت: (لم يزل أبوك من أشد اليهود عداوة لي حتى قتله اللّه).

واتە: بەردەوام باوکت سەر سەختترین کەس بوو لە جوولەکە کە دوژمنایەتی دەکردین، تاکو خوا خۆی کوشتی، ئەویش ئەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاخر خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ...﴿١٨﴾﴾ [فاطر]

کەس ئۆباڵی تاوانی کەس ناکێشێت.

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت: هەڵبژێرە ئەگەر ئیسلامت هەڵبژارد، ئەوە لای خۆم دەبیت و دەتکەمە هاوسەرم، خۆ ئەگەر جولەکایەتیش هەڵبژێریت ئەوە هەر ڕەنگە ئازادت بکەم و بگەڕێیتەوە لای تیرەکەت. سەفییەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ﷺ من ئیسلام هەڵدەبژێرم، ئیسلامم پێ خۆشترە لەوەی کە ئازادم بکەیت و بچمەوە ناو تیرەکەی خۆم، ئەوەبوو شووی بە پێغەمبەر ﷺ کرد.[18]

بۆیە ئەبینین کە هانینی سەفییە -خوا لێی ڕازی بێت- خەڵکێکی زۆر لە هەردوو تیرەی جوولەکەکان دێنێتە نێو ئایینی ئیسلام و موسڵمان ئەبن، بەمەش هێندەی تر بەرەی شەڕەنگێزان لە بەرەی شەڕخوازیان دا لەگەڵ ئیسلام ڕوو لەکەمبوون ئەبێتەوە، ئیتر جوولەکەش کە زانیان پێغەمبەری خوا زاوایانە دەستیان لە دژایەتی هەڵگرت!

لێرەدا بە ئاشکرا ڕایدەگەیەنم کە خاتوو ڕێحانە و خاتوو سەفییە هەر یەک کەسن، وجوودی خاتوو ڕێحانە وەک خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە باسی دەکەن هیچ بوونی نییەو لە فەرموودەدا باس نەکراوە تەنها مێژووی واقیدی نەبێت ئەویش لە سیرەی ئیبن ئیسحاق دا باسکراوە و لاوازە.

## یازدەیەم: خاتوو مەیمونە -ڕەزامەندی خوای لێبێت-

خاتوو مەیمونە پێش ئەوەی کە شوو بە پێغەمبەر ﷺ بکات دوو شووی تری کردبوو، مێردی دووەمی کە ناوی ئەرحەمی کوڕی عبدولعزی بوو لە هەڤدەی کۆچیدا کۆچی دوایی ئەکات. مەیمونە خوشکی زەینەبی کچی خوزەیمە بوو لە دایکیەوە واتە باوکیان جیا بوو، هەڵبەت لەم شووکردنەی بە پێغەمبەر ﷺ بەرژەوەندییەکی گەورەی بۆ ئیسلام و موسڵمان هێنایە پێشەوە، چوونکە خاتوو مەیمونە لە پێشدا براژنی یەکێ لەو پیاوانە بوو کە گەورەی هەندێ لەو تیرانە بوو کە زۆر دوژمنایەتیان لەگەڵ ئیسلام دا هەبو و پیلانی زۆریان بۆ ئەکێشا، ئەو کاتەی کە داوایان کرد لە پێغەمبەر ﷺ حەفتا لە شارەزایانی ئیسلامیان بۆ ڕەوان بکات تاکوو خەڵکەکەیان لە ئیسلام و ئایینی خوادا بەهرەمەند بکەن، کەچی هێندەی پێناچێت ناپاکیان لەگەڵدا ئەکەن و بە نهێنی بەسەر هەر هەمووان‌دا ئەدەن شەهیدیان ئەکەن.

---

[18] فقال لها النبي صلى الله عليه وسلم: "اختاري فن اخترت الإسلام أمسكتك لنفسي، وإن اخترت اليهودية فعسى أن أعتقك فتلحقي بقومك" فقالت" :يا رسول الله لقد هويت الإسلام، وصدقت بك قبل أن تدعوني إلى رحلك ومالي في اليهودية أرب، ومالي فيها والد ولا أخ، وخيرتني الكفر والإسلام فالله ورسوله أحب إلي من العتق، وأن أرجع إلى قومي"





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئیتر پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆڵەی خوێنی شەهیدان لەو دوژمنە سەر سەخت و ناپاکانە ئەسێنێتەوە، ئیتر کاتی ئەوە دێت کە چۆن بەرەی شەڕ خوازییان لە مێشکا بسڕێتەوە، هەڵدەستێت خاتوو مەیمونە کە لەوان بوو ئەخوازێت و ئەبێت بە زاوایان! ئیتر ببڕای ببڕ دوژمنایەتیان لەگەڵ ئیسلامدا نەکردەوە، هەڵبەت ئەمەش لایەنێکی بەهێزی پێغەمبەر ﷺ بوو، چوونکە ئەگەر سەرنج لە حاڵی دەسەڵاتداران و پادشایان بدەیت کاتێ کە کێشە لە نێوان ئەمان و کەسانی تر هەبوایە هەڵئەسان بە هەر نرخێک بووایە کچێکی لێ ئەخواستن، تاکو ئاگری شەڕخوازی دابمرکێتەوە، ئەمەش لە ناو عەشایەری کوردی خۆماندا هەیە و خزمایەتی لە ڕێگای ژن و ژنخوازیەوە درووست دەکەنەوە، دیارە هەڵوێستی زاوا لای خەزورانی هەمیشە بەهێزە. بۆیە ئەبینین کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی ئاشتی بەرقەرار و ئاسایش جێگیر ببێت، هەر کارێک لە بەرژەوەندی شەرعی خوا بووایە، بۆ کردنی دوو دڵی لێ نەئەکرد.

کۆتایی خێزانی کە باسی دەکەم خاتوو ماریایە -ڕەزامەندی خوای لێبێت-

ئەم خاتوونە ناوی ماریای کچی شەمعونی قیبتییە خەڵکی میسرە، پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە ساڵی شەشی کۆچیدا نامەی بۆ هەموو پادشاو دەسەڵاتدارانی جیهان نارد، لەوانە پادشای میسر بەناوی مقەوقیس داوای لێدەکات موسڵمان بێت، نامەکە بە دەحیەی کەلبی دا دەنێرێت و پاشان ئەویش وەک پادشایەک تەماشای پێغەمبەر ﷺ دەکات، هەندێک دیاری بۆ دەنێرێت لەوانە موستیلەیەکی ئاڵتوون و هەندێک کەرەستەی بەنرخ، پاشان لەگەڵیدا سێ کەس وەک کۆیلە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەنێریت کە ناویان ماریا و سیرینن دوو خوشک بوون ئامۆزایەکیان بەناوی مابور لەگەڵدا بوو. مابور پیاوێک بوو عەورەتی بڕابوو واتە خەساندبوویان، ئەو سەردەمە کە پیاویان بە دیار ئافرەتانەوە دادەنا لە حەرەم سەراکاندا واتە کەچاودێری ئافرەتانی بکردایە پیاوەکە دەبوایە لە پیاوەتی بکەوتایە بۆ ئەوەی خیانەت لە ئافرەتانی پادشا نەکات!

کەدەینێرێت بە دیاری بۆ پێغەمبەری ئازیز ﷺ ئەویش دەست بەجێ ئازادیان دەکات، بەڵام مابور بە ئیمامی عەلی دەفەرمووێت: کە ئەوان خەڵکی ئەم وڵاتە نین هیچ شارەزانین و ئازادکردنیان خیرێکیان پێناگەیەنێت! بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ خاتوو



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماریا دەکاتە خێزانی خۆی و کوڕێکی لێدەبێت، سیرینی خوشکی لە دەحیەی کەلبی مارە دەکات و مابوریش لای ئیمامی عەلی دەمێنێتەوە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەرژەوەندییەکانی فرەژنی لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمانەی خوارەوە بوون:

١- بەرژەوەندیی فێرخوازی.

٢- بەرژەوەندیی شەرعی.

٣- بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی.

٤- بەرژەوەندیی ڕامیاری.

٥- بەرژەوەندیی مرۆڤایەتی یان کەسی.

لە کۆتایی کۆڕەکەدا کاک شێخ بانگی کرد کێ قسەی هەیە فەرموون با قسە بە ئارەزووی خۆی بکات، ئەوەی دەڵێت ئەم قسانەی ماکوان ڕاست نییە ئەوە مایک ئازادە فەرموو ئێوەش سەرچاوەی خۆتان بخەنە ڕوو.

شەوی وا ئارامم نەدیبوو پێدەچوو کارەبای ماڵی مولحیدەکان هەمووی کوژابێتەوە!

ئەو شەوە کەس پرسیاری لێنەکردم لەسەر خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، کۆتایی پێهات و شەو دیسان دەستم دایەوە کتێبەکەی فەرغەلی ویستم دەست بکەم بەخوێندەوە و بڕۆمەوە بۆ مێژوو.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## گەڕانەوە لەمسەر بۆ ئەو سەر

شەو کە کۆڕەکەم تەواو بوو هەستم کرد پێویستم بەگەڕانەوەیە بۆ ئەو سەردەمە، بۆ ئەوەی زیاتر ڕەوش و واقیعەکە ببینم و زیاتر تێبگەم لە باری کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە.

پێش ئەوەی بخەوم دەستم دایە کتێبەکەی فەرغەلی بیخوێنمەوە، خێزانم وتی شەو درەنگە و خۆشت ماندووی هەوڵبدە پشوویەک بدە، بەیانی کە لەکار گەڕایتەوە ئێمە بەرە بۆ ماڵی باوکم و پاشان شەو بە ئارامی هەر خۆت دەبیت، بیخوێنەرەوە قیرە قیڕ و هاتوو هاواری منداڵ نییە.

بەقسەم کرد خەوتم بۆ سبەینی دیسانەوە کەڵکەڵەی کتێب و گەڕانەوە لە مێشکم دا بوو لە دڵی خۆمدا وامدانابوو کە جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ ئەو سەردەمە، بڕوا ناکەم فەرغەلی وەفاتی کردبێت، بەڵکوو واهەستم دەکرد دەیبینمەوە وەک زنجیرە درامایەک دەهاتە بەر چاوم.

شەو هات مۆبایل و تیڤی و هەرچی هۆکاری پەیوەندیم هەبوو لە کامپیوتەرەکەمدا هەموویم کوژاندەوە و کتێبەکەی فەرغەلیم گرتەوە بەدەستمەوە و پێشتر دەستنوێژم گرت و نوێژی عیشا و وترم کرد، وتم نەوەک بەسەریەوە خەوم لێبکەویت نەتوانم بڕۆم بۆ ئەو سەردەمەش.

لاپەڕەیەکم کردەوە چوومە سەر ئەو باسەی کە باسی لە دروستبوونی شەرەفی عەرەب و دەزگای مەککە دەکات بەناوی (دار الندوة) تێنەگەیشتم شەرەفی عەرەب چییە.

بەردەوام بووم لە خوێندنەوەی باسەکە چوومە ساڵی ٤٣٠ زایینی.

چاوم لەسەر کتێبەکە بەرز کردەوە لەنێوانی تاشەبەردێکی گەورەدا بووم، لە خۆشیدا هەڵسامەوە بەملاولای خۆمدا تەماشام کرد بێجگە دڕک و چەوێڵ و گردۆڵکە هیچم نەبینی. تەماشای ئاسمانم کرد جریوەی ئەستیرە و پڕ پڕە لە ئەستێرە، سەرزەوی دیمەنێکی ترسناک و ئاسمانیش کریستاڵ و پڕ لە دووڕ و گەوهەر و مورووی مرواری جوان وا خۆی دەنەخشاند لە ئاسمان. چاوم بەسەر زەویدا گەڕاندەوە و هاوارم کرد فەرغەلی! فەرغەلی! ڕازی! عابید! چەند




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

جار هاوارم کرد هیچ دەنگ نەبوو، شەوێکی جوان و پڕ لەدەنگی سیسرک و خشەی مارو مێروو ئاسمانیش بەنازەوە ئەستێرەکانی چاوییان لێ دادەگرتم.

ئیتر زانیم گەڕاومەتەوە بۆ زەمەنێک کە سەردەمی خۆم نییە، دڵ خۆش بووم، ئەزموونم پەیدا کردبوو کە بەشەودا دەبێت ڕێگا بکەم و بڕۆم. فێرببوم کە شوێن حەوتەوانان و یاخوود حەوت ئەستێرەکە بکەوم دەمگەیەنێتەوە ئاوەدانی، بەلای چەپیدا بۆ عێراق لای ڕاست شام و ڕێک شاری مەککە و پێچەوانەشی مەدینە بوو. نەمدەزانی لەکام جێگایەدام تا حەوتەوانانم دۆزیەوە ڕووە و ئاراستەی مەککە کەوتمە ڕێ، ماوەی چەند سەعاتێک ڕێگام بڕی چوومە نزیک ئاو و سەوزاییەکی فێنک و تێروپڕ ئاوم خواردەوە، بەدەوری خۆمدا هەڵخولام زانیم لەم نزیکانە ئاوەدانی لێیە، چوونکە ئاساییە لە نزیک هەموو ئاوێک ئاوەدانی هەبێ بەتایبەت لەم سەردەمی بێ تەکنەلۆجیا و جاهیلیەتی عەرەبدا.

تۆزێک لەسەر ئاوەکە دانیشتم و دەستنوێژم گرت نەمدەزانی کات کەیە، بەڵام دوو ڕکعات شەونوێژم کرد و دوای تەواو بوونم لەدڵی خۆمدا وتم باشە بڵێی ئەمە ڕاست بێت، یاخوود من تووشی نەخۆشی نەفسی بووم، ئاخر چۆن دەبێت و ڕەوایە من لەزەمەنێکی نوێوە بگەڕێمەوە بۆ هەزاران ساڵ دواتر، ئاخر یان ئەوەیە من نەخۆشم و تووشی نەخۆشی لەبیر چوونەوە یان نازانم هەر ناوێکی تری لێدەنێیت، بڵێیت ئەمە ڕاست بێت کەمنی تێدام؟

پاشان هەرچی هێنام و بردم، بیرکردنەوە و زاکیرە و بیرو هۆشم باش بوو، دەگەڕامەوە بۆ دواوە بۆ پێشەوە هەستم بە هیچ لەبیر چوونەوە و ناڕەحەتییەکی دەروونی نەدەکرد، هەستم دەکرد کە ڕۆژ بەڕۆژ زانیاری زیاتر دەبێت و زانیاریەکانی مێشکی خۆمم هەڵاوێر دەکرد زۆر ئاسایی بووم. دواتر هەڵسامەوە وتم یا الله دیسان لەسەر وشەی یا الله هەڵوەستەم کردەوە و لەدڵی خۆمدا وتم خۆ خوای گەورە سیفاتی (القابض) هەیە کە دەتوانێت دەست بگرێت بەسەر هەموو کات و زەمەن و تەنانەت ڕۆحیشدا! سیفاتێکی تری خوای پەروەردگار (الباسط)ە دەتوانێت ئاسانکاری و هێنان و بردنی کات بەدەست خۆیەتی، دیارە خێرێک لەم هات و چوویەی مندا هەیە، بزانم ئەم هەموو هاتووچوەی من لە نێوانی ئەم دوو زەمەنەدا تا کوێ دەڕوات؟

ترسێک چووە دڵمەوە وتم کتێبەکە دەخوێنمەوە دەگەڕێمەوە بۆ سەردەمی خۆم، کتێبەکەم لە پشتم دەرهێناو دەست بکەم بەخوێندنەوەی بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە دەستمدایە و

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بیخوێنمەوە، لەپڕ زریکە و ئازار لەسەر سەرم هات، ئەوەندەیان کێشا بەسەرمدا نەمدەتوانی چاو بەرز بکەمەوەو هەرچی دەمویست پارێزگاری لە خۆم بکەم، بەڵام هیچ هێزم نەمابوو بەدار ئەیانکێشا بە هەمووگیانمدا لە چوار لاوە هەر دەموچاوی دەمامکدارم دەبیین و هیچی تر. توانام نەما بەرگری بکەم، ئەوەندە ئازارم پێگەیشت لە هۆش خۆم چووم، هەموو گیانم خوێنی پێدا دەهاتە خوارەوە، ئەوەندەی کە پێش لەهۆش خۆ چوونم ئاگام لێبوو کەوتمە ناو جۆگە ئاوێکەوە بەتەواوەتی دنیا لەبەرچاومدا ڕەش بوو، ئاگام لەخۆم نەما.

گەرمایەک لە پشتمی ئەدا وەک لە نزیک سۆپایەکی داری گەرم بم و بۆنێکی ناخۆش لە لووتم دەهات، کە هۆشم هاتەوە بەخۆمدا لەناو دەوارێکی ڕەشدا بووم، خۆرەتاو ئەیدا لە چادری دەوارەکە و منیش بەدەمدا کەوتبووم، ویستم هەڵسمەوە تەماشام کرد قاچم بەستراوەتەوە بە گوریسێک و دەستم لە پشتمەوە بەسراوەتەوە خۆمم بۆ نەدەجوڵلا.

هاوارم کرد، بۆ وا دەکەن، ئێوە کێن؟ هەر چاوم بەرزکردەوە کراس و گیانم هەمووی خوێن بوو وشک ببووە و بۆنی خوێنم لێدەهات. هاوارمکرد پڕ بەدەنگم ئیرە کێی لێیە؟

کەس بەدەممەوە نەهات!

ناچار تۆزێک خۆم ڕاپرسکاند و عارەق و خوێن تێکەڵ بوویەوە و دەستم هەستی بە لووسی دەکرد و پەتەکەم شل کرد هەرچۆن بوو دەستم کردەوە، هیچ کەس بەدەنگمەوە نەهات!

تەنها لەناو ئەو دەوارەدا گوێم لە دەنگی مەڕو بزن بوو.

وردە وردە پەتەکەم کردەوە و پاشان گوریسەکەی کە قاچمی پێبەسترابوو کردەوە، ویستم هەڵسمە سەر پێی خۆم نەمتوانی ئەوەندە لاشەم قورس بوو سەرم گێژی دەخوارد و قاچەکانم توانای هەڵگرتنی خۆمی نەبوو، هەرچۆن بوو چوومە دەرەوەی دەوارەکە گەرمایەکی زۆر بوو ئەو دەوارەی کەمنی تێدا بوو هەرچوار دەوری پەرژینکراوە و وەک گەوڕ بۆ مەڕو بزنەکان بەکاریان دەهێناو هەر چۆن بوو بە پەرژینەکەدا سەرم بەرزکردەوە بەو بەری جێگاکەی من دەوارێکی تر بوو، هەڵسامەوە و بەرەو ڕووی دەوارەکە ڕۆشتم و شمشێرێک هەڵواسرا بوو بە کۆڵەکەی ئەو دەوارەوە کە پێی ڕاگیر کرابوو دەستم دایە شمشێرەکە و وەک گۆچان بەکارم هێنا و لەپڕ گوێم لەدەنگێک بوو قیژاندی! بە دەنگیدا زانیم کە ئافرەتە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: مەترسە من ئازارت پێناگەیەنم، بەس پێم بڵێ بۆ لێرەدام کێ وای لێکردووم.

لەڕاستیدا کەسم نەبینی زۆر دەترسام دیسانەوە لەدواوە بەدار بکێشنەوە بەسەرمدا چوونکە بەرگەی ئەو هەموو پێداکێشانە ناگرم ئەمجارە وام لێبکەنەوە دەمرم.

هیچ هێزم نەمابوو خوێنیشم تێدا نەمابوو هەستم بە لاوازی تەواوەتی خۆم دەکرد، ناچار بۆ ئەوەی لە دواوە زەفەرم پێنەبەن بەدەوری خۆمدا هەر خولم دەخوارد، کە زانیم هیچ نییە دیسانەوە دانیشتمەوە و پاڵم دا بە کۆڵەکەی دەوارەکەوە و هاوارم کرد، هەرکەسێکی دەرکەوە من زۆر ماندووم جامێک ئاو یاخوود تۆزێک شیر هەرچی بێت مەمنون دەبم بمدەرێ و خراپەکار نیم و بەرەو شاری مەککە دەڕۆم.

هیچ دەنگ نەما کەس دیار نەبوو چاوم گێڕا لە نزیکمەوە مەرکانەیەک ئاو دیار بوو ڕووە و مەرکانە ئاوەکە ڕۆیشتم دەستم دایە، ئاوێکی ساردی تێدابوو تێروپڕ لە ئاوەکەم خواردەوە، هەندێک دەست و دەمو چاوم شۆرد، هەستم دەکرد کە ئازاری زۆر لە سەر و شان و قاچمدایە دارو بەردی زۆری پێدا کێشراوە.

دیسانەوە ماندوویەتی و خواردنەوەی ئاوەکە وای لێکردم کە سەرم گێژی دەخوارد، ناچار بووم بە پەلە نوکی شمشێرەکەم خستە سەر زەوی و ڕووەو کۆڵەکەکە چووم پاڵم پێوەداو دیسانەوە بێ هۆش کەوتمەوە،

هۆشم هاتەوە بە خۆمدا دەستم بە شمشێرەکەوە بوو کۆڵەکەکە ڕایگرتبوم، بەڵام دیاربوو بێ هۆشییەکەم زۆری پێنەچوو بوو، هەرچۆن بوو جارێکی تر هاوارم کردەوە وتم من خراپە کار نیم! تۆ کێیت خۆت دەرخە؟ من ماندووم توانای قسەکردنم نییە، تکایە خۆت دەرخە و هاوکاریم بکە، هەرکەسێکی تەنها ڕێگام نیشان بدە، من لە کوێم دەمەوێت ئێرە بە جێبهێڵم.

لەم قسانەدا بووم دوو مانگ دەرکەووتن لە ڕۆژی ڕووناکدا!

وامزانی خەیاڵە، دوو ئافرەتی جوان بە جلی ڕەش و دەموچاوی گەش و چاوی ڕەشەوە هاتن وامزانی گیانم دەرچووە و حۆری بەهەشتن هاتوون بۆ لام!

ماکوان: ئێوە کێن؟

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کچەکان: تۆ کێیت؟ یەکێکیان خەنجەرێکی پێبوو ئەوی تریش ڕمحێکی درێژ! ڕووە و من گرتبووی زۆر دەترسان.

ماکوان: بۆ لە من دەترسن؟

منیش وەک ئێوە دەترسم نازانم بۆچی ئاوام لێهاتووە، دڵنیابن من خراپەکار نیم ئێرە جێدەهێڵم و دەڕۆم. بەس دەمەوێت بزانم بۆ وام لێهاتووە چی دەکەم لای ئێوەی بەڕێز و موحتەرەم؟

یەکێک لە ئافرەتەکان وەڵامی دامەوە کە شەوی ڕابردوو گوێمان لە دەنگی تۆ بووە و هاوارت کردووە پاشان چوویتە سەر ئاوی ئێمە و لەوێ دانشتوویت و ئێمەش بەدار و ڕمح و بەرد کێشاومانە بەتۆدا و دوایی زانیومانە کە ماویت، هێناومانیتەوە بۆ ناو گەوڕەکە و وتمان هاوکاری دەکەین، چوونکە کە بێ هۆش کەوتی هەر هاوارت دەکرد (أَشْهَدُ أَنّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا الله وأَشْهَدُ ان محمداً رسول الله) دایکم بەزەیی بە تۆداهاتەوە، وتی قسەکەی سەیرە با لێرەدا نەمرێت و ئاو نەچێتە ناو برینەکەی و بیکوژێت با ڕزگاری بکەین، مادام ناوی خوا دەبات لەبەر خوا ڕزگاری بکەین.

ماکوان: ئەی کوا دایکتان؟

کچەکان: دایکمان لەگەڵ باوکمان چوونەتە دەرەوە ئاژەڵەکانیان بردووە بۆ لەوەڕاندن بەم نزیکانە دەگەڕێنەوە.

ماکوان: ئێ باشە بۆ واتان لە من کرد، خۆ من ئەگەر خراپەکار بم ئێستا ئەتوانم هەردووکتان بکوژم و چیم بوێت دەیکەم.

کچەکان دەستیان کرد بە پێکەنین وتیان: تۆ ناتوانی بە قاچی خۆتەوە بووەستیت ئێستا ئێمە دەکوژیت؟

ماکوان: ئەی بۆ منتان بینی قیژاندتان، ئەی ئەوە مانای ترسان نییە؟

کچەکان: نا، بەڵکوو خەریکی شۆردن بووین، لە ترسی بێ جلوبەرگیمان هاوارمان کرد نەک لە ترسی تۆ، چوونکە ئەگەر بێبەرگ بین لەوکاتەدا ئەترساین؟




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: بەهەر حاڵ من دەڕۆم بەرە و مەککە، بۆ ئەوەی نەبمە ئەرک بەسەرتانەوە ئەگەر هاوکارییەکم بکەن باشە.

باشە نەتان وت ئێوە ناوتان چییە؟ ئەوەی کە زۆر جوان بوو وتی من ناوم بوسەینەیە[١٩] خوشکەکەشم ناوی باهیلەیە، باوکم ناوی فەزڵی و دایکشم ناوی سەمڕا- یە.

ماکوان: ئەی شێخ فەرغەلی چی ئێوەیە؟

هەردووکیان تەماشای یەکتریان کردو وتیان ئەوە مامی ئێمەیە نازانین لە کوێیە!

لەم قسانەدا بووین لەدوامەوە یەکێک کێشای بەسەرمدا و دیسانەوە تەختی زەوی کردمەوە،

بێ هۆش کەوتم!

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦] ـ (بثينة)

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## سەرەتایەکی نوێ و ژنهێنانی ماکوان

لەگەڵ دوو کچی جواندا قسەم دەکرد، یەکێکیان بە ناوی بوسەینە ئەوی تریش باهیلە، بەئێش و ئازارێکی زۆرەوە چاوەڕێی ئەوەم دەکرد کە دیسانەوە بە فەرغەلیم بناسێننەوە و بچمەوە بۆ لایان، دڵخۆشیان کردم بەوەی کە فەرغەلی مامیانە. لەگەرمەی قسەدا بووین لە پڕ ئازار لە کەلەی سەرم هەڵسا و ئەوەندە ئازارەکەی ڕەق و قوورس بوو دیسانەوە بێهۆش کەوتمەوە!

چاوم کردەوە و هۆشم هاتەوە بەخۆمدا، شەوێکی پڕ ئەستێرە هاتەوە بەرچاوم، بەڵام لە گەوڕی ئاژەڵەکاندا نەبووم، بەڵکوو لەسەر جێگایەکی نەرم و جاجمێکی تەنکی جوانم پێدا درابوو سەریشم بە پەڕۆیەک بەسترا بوو. لەبەردەممدا گۆشتێکی زۆر و نانێکی نیوە گەرم دانرا بوو لەپشتیشمەوە پیاوێک بە دەفرێکی بچوک کە پڕبوو لە مەرهەم پێدەکەنی و دەیووت باشتر بوویت کە ئاوڕمدایەوە تەماشام کرد زۆر شێوە و شکڵی لە مام فەرغەلی دەچێت، بەڵام ئەم گەنج تربوو!

یەکسەر وتم تۆ براکەی مام فەرغەلیت؟

وتی: بەڵێ من فەزڵی-م برای فەرغەلی ئەوەی کە مرد!

دڵم زۆر پڕبوو کەوای وت دەستم کردەوە بە گریان بۆ فەرغەلی ئەویش بە زەردەخەنەوە هاتە لام وتی: هەموومان دەمرین فەرغەلی لای من باسی تۆی دەکرد، زۆر ئازارمان داویت ئەوە دایکی بوسەینە نانی بۆ درووست کردوویت نانەکەت بخۆ قسە دەکەینەوە.

ئەوەندەم برسی بوو دەستم کرد بە نان و گۆشت خواردن، هەرچی سەیری خۆمم دەکرد لە گۆشت خواردندا لە تیمساح دەچووم!

دوای نان خواردن خێزانی فەزڵی هات لەگەڵ هەردوو کچەکەیدا، منیش سەرم داخستبوو وتم (السلام علیکم) دەستیان کرد بە پێکەنین، ئەوانیش وتیان (حییت مساءاً ) ئیتر بۆم دەرکەوت کە سەردەمی جاهیلیە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پاشان هەواڵی بەندەکانی فەرغەلیم پرسی عابید و ڕازی؟

فەزڵی: هیچ ئاگام لێیان نییە و نازانم چوونەتە کوێ!

ماکوان: من دەمەوێت بڕۆم بۆ مەککە هاوکاریم دەکەیت؟

فەزڵی: بە دڵنیایەوە هاوکاریت دەکەم، بەڵام ئەمانەتێکم پێیە کە فەرغەلی داویەتی پێم کە بیدەم بەتۆ، ئەو ئەمانەتەش مەرجی ئەوەی هەیە کە یەکێک لەم کچانەی خۆمت لێ مارە بکەم، ئەوە وەسێتی فەرغەلی برام بووە!

ماکوان: لەخۆشیدا هەموو گیانم پێدەکەنی، لەدڵی خۆمدا وتم ئەمانەت وەرگرم و کچێکیشم لێ مارە بکەن، ئەمە دەرگای نیعمەتی خوایە لێم دەکرێتەوە، بەڵام یەکسەر بیرم لەوە کردەوە خۆ من خێزانم هەیە و خاوەن دوو منداڵم، جا خۆ باران بزانێت ژنم هێناوە دەرگام لێناکاتەوە!

لە دڵی خۆمدا وتم خۆ ئاگای لێی نییە زەمەنی جاهیلیە، ڕوومکردە فەزڵی وتم: مەرجە ژن بهێنم، چوونکە من خاوەن ژن و منداڵم؟!

فەزڵی: ئەی کوا ماڵ و منداڵەکەت لە کوێن لە چ مەملەکەتێکن؟

ماکوان: لە نەرویجن!

فەزڵی: نەرویج کام مەملەکەتە؟

ماکوان: مەملەکەتی ڕۆم!

فەزڵی: ئەی بۆ نەتهێناون لەگەڵ خۆت؟

ماکوان: ئەوە باسێکی دوور و درێژە وازی لێبێنە، ئەگەر ژن نەهێنم ئاساییە؟

فەزڵی: ئاسایی نییە، دەبێت ژن بهێنیت دوو ساڵ شوانیم بۆ بکەیت ئەوکات ئەمانەتەکەت هەموو وەردەگریت مارەیی کچەکەشم ئەدەیت، ئەوە وەسێتی فەرغەلی برام بووە؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: خەرێک بوو قسەیەک بڵێم بە فەرغەلی، بەڵام ڕەحمەتم بۆ نارد ئسلوبی قسەکەم بەلایانەوە سەیر بوو، لە کۆتاییدا ناچار وتم باشە.

فەزڵی: بوسەینەت دەوێت یان باهیلە؟

بوسەینەم هەڵبژارد، چوونکە جوانتر و ناسکتر و باڵا بەرز تر بوو.

سەمرای دایکیان دەستی کرد بە (هەلهەلە) کێشان جارێکی تر گۆشت و نان گەرم کرایەوە و دەستمان کرد بە خواردن و هەرچوارمان وەک خێزانێکی چەندین ساڵە ئەو شەوەمان بردە سەر، بریاری دا چەند ڕۆژێکی تر بوسەینەم لێ مارە بکات، بەڵام نابێتە خێزانم هەتا وەکوو لە دارونەدوەی قووڕەیش مارەی نەکات!

کەباسی دارونەدوەی کرد زۆرم لا سەیر بوو وتم: بۆ ئێمە لەم جێگایەوە چەندە لە مەککەوە دوورین؟

فەزڵی: هەموو ڕۆشتنی شەو ڕۆژێکە زۆر دوور نین!

ماکوان: کەی دەڕۆین بۆ مەککە؟

فەزڵی: با فێری شوانیت بکەم ئەمانەتەکەش دوای دارونەدوە نیشانت بدەم، باشە؟

ماکوان: باشە؛ لەهەوڵی ئەوەدا بووم خۆم نزیک بکەمەوە لە بوسەینە، بەڵام هەرچی لێی نزیک دەبوومەوە دەیوت دوای نەدوە (بعد الندوة).

چارم نەما چاوەڕوان بووم، فێریان کردم کە چۆن شوانی بکەم و بردیانم بۆ سنووری لەوەڕاندنی مەڕ و ماڵاتەکەی و گۆچان و چوار سەگیان دامێ و هەموو ڕۆژێک لەگەڵ فەزڵی دەچووم بۆ لەوەڕاندی ئەو مەڕ و ماڵاتە و ئەویش لەبەیانییەوە دەستی دەکرد بە گۆرانی و قسەکردن لەبەر خۆیەوە، هەر پرسیارێکم لێدەکرد نەیدەزانی خەریک بوو دڵم شەقی دەبرد، ناچار بووم وەعدی دابوومێ دوای مارەکردنی کچەکەی ئەمانەتەکەم پێدەڵێت.

ماوەی هەفتەیەک لەم شوانییە بەردەوام بووم، ئیتر زۆر بێزار بووم نە فەیسبووکێک، نە تەلەفونێک، نە پەیوەندییەک بە خەڵکانێکەوە، ئیتر بەڕاستی ژیانێکی زۆر ناخۆش بوو. فێری




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئارامگرتن و لە خۆ بووردەیی بووم زیاتر ئەو چەند ڕۆژە، دوای ئەوەی هەفتەکە تەواو بوو فەزڵی ئاگاداری کردمەوە کە بەیانی دەچین بۆ مەککە و لە داروندەوە ژن مارە دەکەین، خۆت بگۆڕە سبەینێ باهیلە و سەمرا دەڕۆن بۆ شوانی و ئێمەش بۆ مەککە!

بۆ بەیانی بەرە و مەککە کەوتینە ڕێ، دوای شەو و ڕۆژێک گەیشتینە شاری مەککە.

(سبحان الله) چیم دی!

خەڵکی بە ڕووت و قوتی بەدەوری کەعبەدا دەسووڕانەوە، بازاڕ پڕ بوو لە خەڵک جمەی دەهات لەولا هاوار بۆ فرۆشتنی بەندە و کۆیلەکان دەکرا و ئافرەت هەرزان فرۆشدەکران.

پرسیم بۆ بەڕووتی بەدەوری کەعبەدا دەسووڕێنەوە؟

فەزڵی: لەبەر ئەوەی ئەوانە جلی قووڕەیشیان لەبەردا نییە، هەر کەس بیەوێت حەج بکات دەبێت جل لە قووڕەیش بکڕێت، یان بە ڕووتی دەبێت تەواف بکات.

ماکوان: لەوکاتەوە تێگەیشتم ئەمە هەموو بازرگانی قووڕەیشە درووستی کردووە بۆ ئەو خەڵکەو یاسای پیاوە دەوڵەمەندەکانە سەپاندوویانە بەسەر خەڵکیدا کە بۆ تەوافی کەعبە و حەج دێن.

لای بەشێکی بازاڕەکە دەنگی قامچی پیاوانی ورگ زل دەهات لە کۆیلەکان و هەژارە بێدەرەتانە کانیان دەدا، یان ئەو نەدارانەی کە پارەیان نەبوو، یاخوود هەڵەیان کردبوو، لەولاشەوە جوانی جل و بەرگی قووڕەیش و بۆن خۆشی ئەوان و پێکەنین و قاقای پڕ تێری ئەوان!

کاروانەکان لە شام و یەمەنەوە دەهاتن و هەموو جۆرە کەرەستە و شتوومەکێکیان پێبوو، میلیشیای گەل و هۆزەکانی قووڕەیش لە ناو بازاڕدا پەرژ و بڵاو بوون، هەر گەل و هۆزە جۆرە جل و بەرگێکی سەربازییان لەبەردابوو، میلیشیاکانی خۆیان ڕەنگاوڕەنگ کردبوو، نموونەی بەنی مەخزوم جل و بەرگیان سوور بوو، بەنی ئومەییە سپی بوو، بەنی هاشم ڕەش بوو...هتد



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

جۆرە حوکمێک پیادە دەکرا وەک ئەوەی بازاڕەکە دابەش کرابوون بەسەر چەند لایەکدا هەر میلیشیایە و بازرگانەکانی خۆیانی دەپاراست، هەروەک چۆن کۆمپانیاکانی ئێستا گرێبەندی لەگەڵ وڵات و دەسەڵاتەکاندا دەبەستن و بە هێزی سەربازی دەیان پارێزن.

زۆریکیش لە ئافرەتانی خانەدان و خانمانی زۆر ڕاقیم دەبینی بە بازاڕدا دەگەڕان و بەدەیان کۆیلە و کەنیزەک لەسەر دارە کورسییەک هەڵیان گرتبوون و کەژاوەیان هەبوون، شارێکی پڕ سەیر و سەمەرە، لەولاوە قیڕەی برسێتی و هاواری منداڵ و ژن و هەژار تێکەڵ بووبوو، لەلایەکی تریشەوە دەم بینی پیاوێک ئاوی هێناوە هەنگوینی تیکەڵ کردووە ئەیدات بە حاجییەکان. هەموو لاکان ڕێزیان دەگرت زۆر بە ویقارەوە تەماشا دەکرا، هاوکاری خەڵکی دەکرد.

ئەم هەموو دیمەنانە منی سەرسام کردبوو، فەزڵی پیاوێکی گەمژە و نەزان بوو لەگەڵ مندا نەمدەزانی چۆن پرسیار بکەم، هەرچیم لێدەپرسی نەیدەزانی وەڵام بداتەوە، ناچار دەچووم پرسیارم لەخەڵکی دەکرد چەند جارێک لە بوسەینە و فەزڵی ون بووم، هەرچۆن بوو دۆزیمنەوە توڕەبوون لێم هەردووکیان وتیان وەرە بەڕێگاوە با بڕۆینە دارولنەدوە.

چووینە لای دارولنەدوە لەنزیک کاهینێکی قژدرێژی ناشرین وەستاین فەزڵی کیسەیەک پارەی دەرهێنا و دایە دەستی و من و بوسەینە و فەزڵی چووینە ژوورێکی بچوکی ناو دارولنەدوەکەوە، چاوەڕێمان کرد تا چەند کەسێکی تر هاتن و ئەوانیش هەر کاهین بوون هەموو بۆگەنییان دەهات، مۆڕەیان لە من دەکرد.

فەزڵی کیسەیەک پارەی تری دەرهێنا و دایە دەست ئەوان، ئەوانیش هەندێک لە شێوەی ئاردو شتی وردیان پرژاند بەسەرماندا و پیرۆزباییان لێکردین، وتیان بڕۆن ئەوە ئەم ژن و مێردایەتییەمان پیرۆز کردوەوە.

منیش هیچ پارەیەکم پێنییە، زۆرم تینوو بوو داوام کرد لە فەزڵی من پارەم پێنییە تینومە و برسیشمە؟

فەزڵی: ئێستا دەچینەوە لای ئەسپ و وشترەکانی خۆمان ئاو و نانمان پێیە دەیخۆین.

ماکوان: ئەوەندە نامەرد بوو هیچی نەدامێ، وتم ئەقڵی پێدەشکێت کەچی ئەقڵی پێنەشکا، بیرم کردەوە کە خۆم ڕزگار بکەم لەم کابرایە، من بەدوای چیوەم ئەویش چۆن لەگەڵمدا





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەرخورد[٢٠] دەکات، من بەدوای ئەوەدا دەگەڕێم بزانم پێغەمبەر ﷺ هاتووە، بەدوای ئامانجی خۆمەوەم ئەویش بمبات شوانیم پێبکات، بیرم لەوە کردەوە ڕاکەم لە شاری مەککەدا خۆم بشارمەوە.

لەدەرفەتێک دەگەڕام بۆ ڕاکردن، بوسەینە هاتە لامەوە دەستی خستە ناو دەستم ڕایکێشام و بردمیە لای ئافرەتێک لە بازاڕی مەککەدا ئاو و هەنگوینی بۆ کڕیم و تێر ئاوم خواردەوە بە زەردە خەنەیەکەوە وتی ماندوویت حەسایەوە؟

دوای لەدڵی خۆمدا وتم: تۆ ئەمڕۆ ژنت هێناوە ڕاکردن بۆ پیاو عەیبە دانبەخۆتا بگرە، با ماڵی فەزڵی ببێتە بارەگات و دوای بە ئیسراحەت هاتووچوو دەکەیت، ئەمانەتەکەش کە فەرغەلی بۆی بەجێهیشتووم دەزانی چییە، لەم قسانەدا بووم لەگەڵ دڵی خۆم و لەتەنیشت بوسەینەشەوە دەڕۆشتم، دوو کەس لەگەڵ فەزڵی هاتنە لامان و وتی ئەمە ماکوانە!

---

[٢٠] ـ هەڵسوکەوت.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## جیابوونەوەی خۆشەوویستان و گەیشتن بە خۆشەوویست تر!

لەگەڵ فەزلی و بوسەینە لەگەڕانەوەدا بووم بەرەو خێوەت و چادرگەکەی ئەوان، لەڕێگادا گەیشتن بە دووکەسی بەهەیبەت و جل و بەرگ جوان و دوای ئەوەی کە پرسیاری منیان کرد، زانیان کە من ناوم ماکوانە و هاوڕێی فەرغەلی بووم ئەوانیش دەست بەجێ هاتنە لام و ڕێز و سڵاوی خۆیان نیشاندا و منیش زۆر سوپاس و پێزانینم بۆیان دەربڕی.

لەگەڵ فەزلی چوونە دووری من و بوسەینە، قسەیان دەکرد بەیەکەوە و منیش وتم بە بوسەینە ئەمانە کێن؟

بوسەینە: من نایاناسم، بەڵام کە مامە فەرغەلی هاتووە بۆ لامان زۆر جار ئەم دووکەسەی لەگەڵدا بووە بەیەکەوە بینیومن!

ماکوان: ناویان چییە؟

بوسەینە: ناویان سەعد و عەبدوڵلایە!

ماکوان: چ کارەن؟

بوسەینە: بازرگانن.

ماکوان: چۆن من دەناسن؟

بوسەینە: نازانم!

ماکوان: بە پێکەنینەوە تۆ چی دەزانیت، ئەی پێم بڵێ لەم دەوروبەرە ناوی (محمد) ت بیستوە؟

بوسەینە: ناوی وام نەبیستووە لە ناو عەرەب ناوی وانییە، ئەو ناوە لە ناوی ڕۆم دەچێت!




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: ئەبێت، ئیتر هیچم نەوت زانیم ناوی (محمد) زۆر نامۆیە لە ناویاندا و بەو پێیە بێت جارێ پێغەمبەر ﷺ لەدایک نەبووە.

لەم قسانەدا بووین هەندیک قسەو باسی ترم لەگەڵ بوسەینەدا دەکرد و پرسیاری ناوچەکەی خۆیانم دەکرد و کەوتوونەتە کوێی مەککەوە، لەپڕ هاتنەوە بۆ لامان.

فەزڵی: ئەم دوو کەسە نزیکی فەرغەلی برای منن، ئەوان ئەمانەتەکەت پێ ئەدەن لای ئەوانە، لەگەڵ ئەوان برِۆ دوایی کەی تەواوبوون دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ لای بوسەینە؟

ماکوان: ئەی من ئەمرِۆ ژنم مارەکردووە چۆن دەبێت برِۆم خێزانەکەم بەجێبهێڵم؟

سەعد: تۆ مەبەست ژنهێنانە یان ئەتەوێت ئامانج و وەسیەتنامەکەی فەرغەلی جێبەجێ بکەیت؟

ماکوان: بەدڵنیاییەوە من ئامانجم هەیە و بەدوای ئامانجی خۆمەوەم، بەڵام یان ئەم کچەتان لێ مارە نەکردمایە، یاخوود بۆ ئێستا جیامان دەکەنەوە؟

عەبدوڵلا: ئەتوانیت لەگەڵ خۆت بیهێنیت، بەڵام ڕێگای ئێمە و تۆش دژوارە، بۆ ئەو ئافرەتە بکەوێتە نارِەحەتی لەگەڵتدا؟ لەدوای تەواو بوونی کارەکانمان دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ لای ئێمە دەتهێنینەوە.

ماکوان: ناچار ڕازی بووم، تەماشایەکی بوسەینەم کرد هەستم کرد کەرامەتی زۆر شکاوە، زۆر بەزەییم پێدا هاتەوە هیچ چارەشم نەمابوو، هەر ئەوەندە چوومە لای وتم: ببورە کارەکەی من وایە دەبێت برِۆم بەدڵنیاییەوە دەگەڕێمەوە بۆ لات.

هیچی نەوت بە دەم گریانکی زۆرەوە ڕووە و لای وشترەکەیان کەوتە ڕێ، ماڵ ئاواییم لەوان کرد و بەدڵێکی شکاوە بەجێیان هێشتم و یەکەم جارە کارەساتی جیابوونەوەی یەکەم شەوە ببینم، کە ئازارێکی زۆر بە سوێی هەبوو.

بردیانمە بازاڕ چەند پارچە جلوبەرگێکی نایاب و جوانیان بۆ کرِیم لەگەڵ ئەسپێک و شمشێر و چەند کیسەیەک پارەیان دامێ لەگەڵ وشتریک بۆ هەڵگرتنی کەل و پەلەکانی خۆم، چەند



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

تورەکەیەک ئارد و مێوژ و مەرکانەیەکی پڕ لە ئاو، لەگەڵ چەند کوپەڵەیەک لە هەنگوین و ڕۆن ...هتد، خستیانە سەر پشتی وشترەکە.

تا سەرقاڵی کڕینی ئەم کەرەستانە بووم زۆر گرنگیم بە بوسەینە نەدا بیرم نەبوو، بەڵام لەدواییدا بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەو کچە دڵ شکاو بوو، بەڵام دڵخۆشی خۆم بەوە ئەداوە کە هیچ ڕووی نەداوە نە خۆشەوویستی دروست بووە نەبۆتە خێزانم، زیاتر مەبەستم ئەوەبوو کە نەم گواستۆتەوە.

عەبدوڵڵا و سەعد تا بڵێی بە هێز و بە توانا بوون لەگەڵ ئەوەشدا زۆر چاوکراوە و زیرەک دیار بوون، هەر پرسیارێکم لێبکردنایە دەست بەجێ ڕوونکردنەوەیان دەدامێ بەدرێژی بۆیان باس دەکردم تا دەیانخستمەوە بنج و بناوانی باسەکەم.

لەدوورەوە پیاوە باشەکەم بینی کە ئاو و هەنگوینی دابەش دەکرد بەسەر حاجیەکانی مەککەو ئەوانەی کە بتەکانیان دەپەرست و لەلایاندا وەستابوون ئەم خواردن و ئاوی بۆ دەبردن بە خۆڕایی بەسەریاندا دابەشی دەکرد.

ڕوومکردە عەبدوڵڵا: ئەم پیاوە بەڕێزە کێیە؟

عەبدوڵڵا: ئەم پیاوە ناوی شەیبەیە و ناسراوە بە عەبدولموتەڵیب.

ماکوان: ئەوە باپیری پێغەمبەرە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ؟

عەبدوڵڵا: بەڵی خۆیەتی!

سەعد: ماکوان ئێمە هیچمان خەڵکی ئەم زەمەنە نین، وەک چۆن فەرغەلی فێری کردی دەبێت وا هەنگاو هەڵبهێنینەوە کە لەم سەردەمەدا ژیان دەکەین، تکایە با کەس پێمان نەزانێت!

ماکوان: واتە ئێوەش وەک من لە زەمەنێکی ترەوە هاتوون؟

عەبدوڵڵا: بەڵێ بۆیە وەریشمانگرتیتەوە لە فەزلی، چوونکە هەتا بڵێی درۆزن و بەرژەوەند خوازە، وەسییەتنامەی فەرغەلی ئەوە بووە کە بتداتەوە دەستی ئێمە نەک ئەو قسانەی ئەو لەگەڵی کردبوویت، نە باسی ژن هێنانی کردووە، نە دوو ساڵ شوانیشی بۆ بکەیت.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماكوان: سوپاسم كردن وتم پەیمان دەدەم وەک ئەوەی ئێوە دەتانەوێت وادەبم، گوێ بۆ ئامۆژگارییەكانتان دەگرم، زۆر دڵخۆش بووم و ئارام بوومەوە، بەڵام لە خۆشەوویستی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر چاوم لەسەر باپیری پێغەمبەر ﷺ بوو. پرسیم ئەی پێغەمبەر ﷺ لە دایک نەبووە تا ببینین؟

سەعد: نا جارێ باوكیشی لەدایک نەبووە، عەبدولموتەڵیب تەنها یەک كوڕی هەیە ناوی حارسە. ماكوان: بچین لە نزیكەوە ببینین، زۆر حەزدەكەم ببینم!

عەبدوڵڵا: دەچین و بەدەستیشی ئاومان بداتی و سڵاوێكی لێدەكەین و پرسیاریكی لێدەكەم باشە؟

ماكوان: باشە، بەرەو ڕووی عەبدولموتەڵیب چووین، پیاوێكی بەڕێزو خاوەن ویقار بەدەوریدا چەند كەسێک بە شمشیر و ڕمحەوە وەستابوون كە چووینە لای و سڵاومان لێكرد، وەڵامی سڵاوی داینەوە و دەست بەجێ ئاوی داینێ و وتی بەخێربێن بۆ مەككە و پێداویستیتان چییە؟

عەبدوڵڵا: وتی دەمانەوێت هەندێک پێداویستی ئاژەڵ بكڕین.

عەبدولمەتەڵیب: پێستەمان زۆرە، هەرچەندتان ویست هەیە، بۆ شام دەیبەن، بۆ ناو ڕۆم، یان بۆ حەبەشە؟

عەبدوڵڵا: ئیمە بازرگانین لە كوێ بفرۆشرێت لەوێ دەیفرۆشین بۆ هەردوولا دەیبەین.

عەبدولموتەڵیب: ناوتان چییە؟

عەبدوڵڵا: من ناوم عەبدوڵڵایە و برادەرەكەشم ناوی سەعد.

عەبدولموتەڵیب: ئەی ئەوگەنجەی تر لەگەڵتاندایە عەرەبە؟

عەبدوڵڵا: نا، ئەو ڕۆمە و عەرەبی دەزانێت بازرگانە شەریكمانە.

عەبدولموتەڵیب خۆشحاڵی دەربڕی ئیمەی بردە حەوشەیەكی گەورە لەوێ پڕ بوو لە پێستەو تەماشامان كرد بڕیارياندا دوای ماوەیەكی تر بگەڕێینەوە پێستەكانی لێبكڕین.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەگەڵ عەبدوڵڵا و سەعد گەڕامەوە، ئەوان لە نزیک مەککە چادر و دەواریان هەڵدابوو، بۆ کەرەستە و شتوومەکەکانیان زیاد لە ١٠ کەس خزمەتکار و پاسەوانیان هەبوو.

چوومە لای عەبدوڵڵا و پێم ووت: پێویستم بەزانیارییە ئێستا کەیە ئێمە تێیدا دەژین؟ زانیاریم دەوێت لەسەر ڕەوشی مەککە و ئێستا؟ ئایا ئەبرەهە هاتووە؟ ئینجا ئەو هەموو پەیکەر و بتە چیبوو لای ئەو پێستانە دانرابوون؟

عەبدوڵڵا: بازرگانیی قووڕەیش تەنها دوو شتی سەرەکییە، ئاژەڵداری و خۆشکردنی پێستە و فرۆشتنی بە مەملەکەتەکانی چواردەووری و هەروەها لای خەڵکی بەگشتی لەم دەورووبەرەیاندا بەتایبەت عەرەب بت و پەیکەرەکانی قووڕەیش زۆر دەکڕن و بە خوای خۆیانی دەزانن، ئەم دوو سەرچاوەیان هەیە بۆ بازرگانی واتە پێستە و فرۆشتنی وشتر و مەڕو ماڵات، پاشان دروستکردنی بت و پەیکەر.

سەعد "هاتە لامان دانیشت": نا جارێ ئەبرەهە نەهاتووە، تەنانەت ئاوی زەمزەمیش نەدۆزراوەتەوە، بۆ پرسیارەکانی تر هەوڵبدە پرسیارەکانت هەڵبگرە بۆ مامۆستاکەی ئێمە و خۆشت!

ماکوان: مامۆستاکەی من و ئێوە کێیە؟

عەبدوڵڵا: ناوی نومەیر-ە!

ماکوان: کەی دێت بۆ لامان؟

عەبدوڵڵا: پێدەچێت هەفتەی داهاتوو بگاتە لامان، چوونکە لە ڕۆمە و بەرەو ئێرە دێت.

ماکوان: ئەرێ بەڕاست کەس دەزانێت ئەمڕۆ چەند شەممەیە؟

سەعد: ماکوان ئاگاداربە! لەم سەردەمەدا خەڵکی شەممە و یەکشەممە و دووشەممە بەکار ناهێنن، لای ئەوان جیاوازە.

ماکوان: ئەی چی بەکار دەهێنن، چۆن ڕۆژەکانی هەفتە دەژمێرن؟





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سەعد: ئەمان لە ڕۆژی یەک شەممەوە سەرەتای هەفتەیانە، بۆ نموونە یەک شەممە ناوی (الاول)ە، دوو شەممە ناوی (اهون)ە، سێ شەممە ناوی(جبار)ە، چوارشەممە (دبار)ە، پێنج شەممە(مؤنس)ە، هەینی (عروبة)ە و شەممە(شیار)ە.

ماکوان: تا ئێستا ئەوەم نەزانیوە، بەڵام شتێکی تر لەناو عەرەبدا سەرنجی ڕاکێشاوم، بەندە و کۆیلەکانیان زۆر بەناوی جوان بانگ دەکەن، منداڵەکانیان بەناوی ناشرین و ڕەق بانگ دەکەن، بۆنموونە منداڵەکانیان ناویان شێرە (اسد)، سەگە (کیلاب)، بەردە (صخر)، تاڵە(مر)، ڕەقە، ناشرین و سوتێنەر و گوژاڵک (حنظلة)، عەبوسە، مارو دووپشکە...هتد، کەچی بەندەکانیان ناویان مەرزوقە، (فلاح، فرح، موضحیک )و ناوی زۆر جوانییان لێناون بۆ؟

سەعد: عەرەب دەڵێن: ناوی منداڵەکانمان بۆ دوژمنەکانمان ناو دەنێین، ناوی عەبدو و کۆیلەکانمان بۆ خۆمان ناو دەنێین!

ماکوان: ئەو چەند ڕۆژە لە چاوەڕوانیدا بووم ڕۆژانە دەچوومە ناو شاری مەککە لەگەڵ خەڵکیدا گفتوگۆم دەکرد، زۆرێک لە خەڵکی بووە ناسیاوم. بەردەوام بووم لەچاوەڕوانی و گەڕان بەدوای ئەو ونبوانەی کە خەڵکی نەیاندەزانی، چاوەڕێی نومەیریشم دەکرد بگەڕێتەوە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## دۆزینەوەی ونبویەکی تر

لە چاوەڕوانی نومەیردا بووم بگەڕێتەوە ئەم کەسایەتییەش بناسم، چوونکە ناوەکەی واتەی پڵنگ بوو زۆر ترسناک و ئازا و سەرکردە دەهاتە بەرچاوم، لەشەوێکدا لە دەوارەکەی عەبدوڵلا و سەعد لەپڕ کاروانێک هاتنە بەردەم دەوارەکەیان.

چ قەرەباڵغییەکی درووست کرد! ئەو شەوە هەموو قووڕەیش لەبەردەم دەوارەکەی ئێمەدا کۆببوونەوە، هەموو چاوەڕێی خاوەن کاروانەکەیان دەکرد، عەبدوڵلا و سەعدم بینی لەدوای کەسێکەوە وەستابون وەک پاسەوان، لە دڵی خۆمدا وتم ئەوە نومەیرە بۆیە وا بەڕێزەوە وەستاون. نومەیر پیاوێکی جوان خاس و باڵا بەرزی هێمن و لەسەرخۆ بوو، ڕووە و من هات بە زەردەخەنەوە سڵاوی لێکردم وتی من نومەیرم: باشی ماکوان، ژیان لێرە چۆن دەگوزەرێنی؟

ماکوان: زۆر باشم، خۆشحاڵم بە ناسینی جەنابتان، عەبدوڵلا و سەعد باسی تۆیان بۆ کردم، زۆر خۆشحاڵ بووم کە بەسەلامەتی گەیشتی.

زۆر بە ویقار بوو هەموو ئەوانەی دەورووپشتی وەک پاشا ڕێزیان لێدەگرت.

نومەیر: کاروانێک کەرەستەم هێناوە ئەم شەو هەمووی دەفرۆشم ماوەیەک بەیەکەوە دەبین، ئەزانی بە چەند وشتر دەڵێن کاروانێک "بەپێکەنینەوە"؟

ماکوان: چەند وشترێک.

نومەیر: ڕاستە چەند وشترێک، بەڵام پێی ناوترێت کاروان ئەگەر لە ٥٠ وشتر کەمتر بێت!

ماکوان: چۆن منت ناسی هەوڵت داوە بمدۆزیتەوە، هیچ پەیوەندییەکت لەگەڵ مام فەرغەلی هەیە؟

نومەیر "بە پێکەنینەوە": ئەو هەموو کەرەستە و کاروانە و خەڵک و بەندەیە لێرەیە، هەمووی خاوەنەکەی فەرغەلییە و ئەویش هەمووی بەخشیووە بەتۆ، واتە ئێستا ئێمە هەموو





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بۆتۆ کار دەکەین و ئەمە میراتی تۆیە کە بۆت ماوەتەوە لە فەرغەلییەوە ئەویش بەئێمەی وت کە هەموو بارەکە ماکوان خاوەنیەتی و بیپارێزن.

ماکوان: خوای گەورە لە فەرغەلی خۆش بێت، بەڕاستی مەرد و پیاو بوو -ڕەحمەتی خوای لێبیت-.

یەکەم جاریش کە بینیم لە میسر هەر دەست و دڵ باش بوو!

نومەیر"بەپێکەنینەوە": ئەی ئێمە بۆ خراپ بووین، نەهاتیتە ماڵمان لە میسر.

ماکوان: کەی هاتمە ماڵتان؟

نومەیر: ٢٠١٢/١٢/١٢

ماکوان: ڕاستە ئەو بەرواره من لە لوکسور بووم، بەس لەماڵی کوڕێک بووم ناوی عەزیز بوو خەڵکی ئیسماعیلییە بوو، لە ڕووباری نیل ئاوم خواردبووەوە لەبەرئەوەی ئەو ئاوە بەکتێریای تیایە نەخۆش کەوتبووم، فەرغەلی ئەوی پێناساندم ئەو بردمی بۆ خەستەخانە، بەس عەزیز زۆر گەنج بوو.

نومەیر: ڕاستە؛ عەزیز کوڕی منە!

ماکوان: خۆشحاڵم؛ نەمزانیبوو کەواتە تۆش خەڵکی زەمەنی منیت؟

نومەیر: بخەوە ماندووین، بەدڵنیاییەوە زیاتر قسە دەکەین.

ماکوان: باشە، فەرموو دەزانم ماندوویت با من زیاتر بە پرسیارەکانم ماندووت نەکەم.

ئەو شەوە ئەوەندەی تر فوزولی بۆ زیاد کردم، بەڵام زۆر دڵخۆش بووم. بەیانی کاتێک نوێژی بەیانیم کرد خوای گەورە دوو دیاری بۆ ناردبووم کە کردمەوە چاوەکانم بوو، هەرچەندە چاوەڕوانی نومەیرم دەکرد هەڵسێت لە خەو، لەوکاتەدا سەعد و عەبدوڵڵا هاتن و هەرچی بە سەر وشترەکەی منەوە بوو دایانگرتبوو و وتیان ئاگات لە وڵاخ و وشترەکەت بێت، ئەوانیش پێویستیان بە هاوکاری تۆیە، هەفتەیەکە نەچوویت بەلایاندا.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نومەیر هەڵسا لە خەو چووم بۆلای و وتی خۆت ئامادەکە بەیەکەوە دەچین بۆ شاری مەککە.

خۆم ئامادەکرد و بەرەو شاری مەککە کەوتینە ڕێ لە ناو شاری مەککەدا یانە و شوێنی دانیشتنی پیاوانی گەورەی تێدابوو وەک چایخانە، ئەو سەردەمە قووڕەیش پێیاندەوت (نادي)، چووینە نادییەک دانیشتین و لە دوورەوە عەبدولموتەڵیبی نیشاندام وتی دەزانی ئەوە کێیە؟

ماکوان: بەڵێ، دوێنێ چوومە خزمەتی باپیری پێغەمبەرە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، پرسیارم کرد لە سەعد و عەبدوڵلا وتیان تا ئێستا باوکی پێغەمبەریش صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نە دایک نەبووە، لە ئێستادا یەک کوڕی هەیە ناوی حارس و خۆشی ناوی ( شەیبە)یە نازناوی عەبدولموتەڵیبە.

نومەیر: ڕاستە ناوی شەیبەیە مامی ناوی موتەڵیبە، کاتی خۆی لە دەرەوەی مەککە ژیاوە مامی هێناویەتیە مەککە، وایان زانیوە کۆیلە و عەبدی نوێی مامەی بووە، ئیتر ناوزەدکراوە بە بەندەی موتەڵیب.

ماکوان: ئەوە تێنەگەیشتم بۆچی لە دەرەوەی مەککە بووە؟

لەم قسانەدا بووین خواردنەوەیان بۆ هێنایین کە لەو سەردەمەدا ئەوەی کە دەفرۆشرا لە یانەکاندا، شەراب و نەبیز و ئاوی هەنگوین بوو، بۆ من و نومەیر ئاوی هەنگوینیان هێنا و وەک چای و قاوەی ئێستا ئەوەیان دەگێڕا لە نادییەکاندا و بەڵام تەنها لە شەواندا خواردنی تێدا دەفرۆشرا.

نومەیر: باپیری باوکی عەبدولموتەڵیب ناوی قوسەی کوڕی کیلاب بووە ساڵی ٤٠٠ تا ٤٨٠ زایینی ژیاوە، پیاوێکی ئازاو خانەدان بووە، نازناوی قووڕەیش لە مەککە وە وەرگیراوە، پێشتر ئەگەر فەرغەلی باسی کردبێت، خوزاعە بە شەڕ مەککەیان داگیر کردووە، ئەوە بوو ئاوی زەمزەمیشیان پڕکردەوە دژی گەل و هۆزی خوازعە، ماوەی ٥٠٠ ساڵ خوزاعە لە شاری مەککەدا فەرمانداریان کردووە، یەکەم کەسیش کە بتپەرستی بڵاو کردەوە هەر ئەم گەل و هۆزە بوون لە ڕێگای سەرکردەکەیانەوە بەناوی عەمری کوڕی لوحەی.

ماکوان: بەڵێ ڕاستە پێشتر لەگەڵ فەرغەلی دا باسمان کردووە ئەویش بۆی شیکردمەوە، بەڵام ئێستا ئەم باسە چ پەیوەندی هەیە بە پرسیارەکەی منەوە؟




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نومەیر: چۆن پەیوەندی نییە، بۆ ئەوەی بزانیت لە ئێستادا لە شاری مەککەدا لە عەبدولموتەڵیب گەورەتر نییە چۆن گەیشتۆتە ئەو مەرتەبە و پلە و پایە، ئەتەوێت بزانیت یان وازی لێبێنم و هەنگوین و ئاوەکە بخۆین؟

ماکوان: نا ببورە مەبەستم ئەوە بوو کە زیاتر تێبگەم.

نومەیر: قوسەی کوڕی کیلاب کە باپیرە گەورەی پێغەمبەرە باپیری باوکی عەبدولموتەڵیبیشە ئەمانە هیچیان عەرەب نین، لە بنەڕەتدا لە نەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمن - سەلامی خوایان لێبێت - باوانیان دەگەڕێتەوە بۆ گەل و هۆزی جورهەم کە هاتن لە تەنیشت بنەماڵەی هاجەر خاتوون لە مەککە نیشتەجێ بوون و ئیسماعیل- سەلامی خوای لێبیت - کچی لەو گەل و هۆزە خواست و لەگەڵ عەرەب تێکەڵ بوون بۆیە بەمانە ناوترێت عەرەبی ڕەسەن، بەڵکوو هەموویان بەعەرەب کراون.

ماکوان: کەواتە پێغەمبەریش عەرەب نییە، بەڵکوو بە عەرەب کراوە؟

نومەیر: بەڵێ بەدڵنیاییەوە عەرەب نین، چوونکە ئیبراهیم - سەلامی خوای لێبیت - دەڵێن خەڵکی عێراق بووە، هەندیکیش دەڵێن کورد بووە!

ماکوان: کەواتە دەبوو ئێمەی کورد زۆر بەرگریمان لە پێغەمبەر بکردایە، چوونکە بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە بۆ کورد، بەڕاستی ئەمە جێگای خۆشحاڵی منە.

نومەیر: ڕاستە، بەڵام ڕاستتر ئەوەیە کە ئیبراهیم لە بابلییەکان بووە، بۆیە کاتێک دەریدەکەن لە بابل، دەپاڕێتەوە دەڵێت خوای پەروەردگار لە دەرگای خواوە بۆ ماڵی خوا دەچم، باب واتە دەرگا وە ئیلیش واتە الله، یاخوود خودا.

ماکوان: کەواتە بنەڕەتی بنەماڵەی پێغەمبەری خوا دەگەڕیتەوە سەر ئیسماعیل، ئەوانیش عەرەب نین بە عەرەب کراون؟

نومەیر: بەڵێ ڕاستە نازناوی قوسەی قووڕەیش بووە، هەندێکی تر دەڵێن: نازناوی فەهری باپیری قووڕەیش بووە ئەمیش هەڵیگرتۆتەوە، کچێک لە بنەماڵەی خوزاعە دەخوازێت، کە ناوی (حُبّی بنت ابن حبيشة بن سلول بن عمرو الخزاعية)، چەند منداڵێکی لێ دەبێت لەوانە:




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

عەبدولمەناف کوڕی قوسەی، ناوی خۆی موغیرەیە (المغيرة).

عەبدولدار کوڕی قوسەی، ناوی عبدوڵلا.

عەبدولعزی کوڕی قوسەی، بەشێک لەم باوانە دەچێتەوە سەر خاتوو خەدیجە، خێزانی یەکەمی پێغەمبەر [illegible] و زوبیری کوری عەوام.

عەبدولقوسەی کوڕی قوسەی، ناوی عبد بڕە کچی قوسەی.

خوشکێکیان هەیە لە دایکێکی ترە ناوی: تەخمیری کچی قوسەی.

ئەمە پێکهاتەی قووڕەیشە، ئەم بنەماڵەیە قووڕەیش پێکدەهێنێت لە مەککەدا.

لەدوای ئەوەی باوکی خێزانی قوسەی دەمرێت کە گەورەی خوزاعەیە ٥٠٠ ساڵ زیاتر فەرمانداری شاری مەککە دەکەن، ئیتر لە دوای مردنی خەزوریەوە داوای دەسەڵات و فەرمانڕەوایی شاری مەککە دەکاتەوە، خوزاعەش نایدەنەوە و سووپا لە هەردوولا کۆدەبێتەوە بۆ شەڕکردن.

لەدوای مردنی حەبیشە ناسراو بە حولەی، قوسەی داوای دەسەڵات دەکاتەوە، دەسەڵاتی مەککە بریتی بووە لەچەند شەرەف و دەزگایەک، ئەویش گۆڕینی پەردە و شۆردن و وەرگرتنی کلیلی کەعبە و چاودێری کردنی ماڵی خوا، ئاودان بە حاجی و کۆکردنەوەی پارەی زۆر بۆ کاتی هاتنی حاجی و ئامادەکردنی خواردن و گۆشتی وشتر بۆ حاجییەکان، ئەمانە هەمووی لە ناو عەرەب دا بە شەرەف ناوزەد دەکرا، ئەو گەل و هۆزانە شەڕیان دەکرد بۆ ئەوەی ببنە خاوەن ئەو شەرەفە.

ماکوان: شەڕ و جەنگی ئەوان لەسەر خزمەتکردن بووە بەخەڵکی و حاجییەکان بە گشتی؟

نومەیر: بەڵێ، بەڵێ لەناو عەرەبدا پێیوتراوە شەرەف، گەل و هۆزەکانیان سەربڵند دەبوون بە گەورەتر تەماشا دەکران شەڕی هەردوولا خوزاعە و قووڕەش تەنها لەسەر شەرەف بووە.

شەڕ دەستی پێکرد لە هەردوولا سووپا کۆبوویەوە، ئەوەی لەبەرەی قووڕەیش بوو هاتنە ناو جەنگەکە، خوزاعەش گەل و هۆزێکی گەورە بوو دەستکرا بەجەنگ.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

جەنگی نێوان هۆزەکان لەسەر شەڕ

نومەیر لە دەستپێکی جەنگی نێوانی دوو گەل و هۆزی ناو شاری مەککە، قوورەیش و خوزاعە باسێکی گەرمی بۆ کردم ، بەڵام پرسیارێک هات بە مێشکمدا لەوکاتەدا نەموویست بەسەرم دا تێپەڕێت.

پرسیم جەنابی نومەیر! پێش ئەوەی باسەکەم بۆ تەواو بکەیت کە عەرەب ئەوەندە حەزیان بە شەرەف و خزمەت بووە، ئیتر چۆن ساڵی خۆیان ناوناوە جاهیلی، لە ڕاستیدا ئەوان شەڕیان لەسەر شتی جوان کردووە بەگشتی خزمەت بووە بەخەڵک.

نومەیر: ڕاستە، بەڵام جاهیلییە مرۆڤ لەسەر خزمەتکردن مرۆڤی تر بکوژێت، ساڵانی جاهیلی هەموو بەمانای ئەوەنایەت کە خاوەنی ڕەوشت نەبوون، یاخوود توانای ئیدارییان نەبووە، بەڵکوو جاهیلی عەرەب لە بیرو باوەڕیاندا بووە، عەرەب تاڕادەیەک خاوەنی هەڵوێست بوون کە ساڵانی خۆیان ناوناوە بە جاهیلی، بەڵام لە ڕاستیدا خاوەنی ڕەوشتی زۆر جوان بوون، بۆیە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە دێت دەفەرمووێت: (إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق) بۆ ئەوە هاتووم کە ڕەوشتە جوانەکان تەواو بکەم، کەواتە ئەمە ئەوە نیشان ئەدات کە ڕەوشتی جوانیان هەبووە.

ماکوان: ڕاستە، دوای ئەوەی کەدەست کرا بەشەڕ کێ سەرکەوتوو بوو؟

نومەیر: بەداخەوە کەس سەرکەوتوو نەبوو، بەڵکوو لەهەردوولا خەڵکانێکی زۆر کوژران ئیتر وای لێهاتبوو لەناو شاری مەککەدا ماڵ نەبوو کوڕ و باوک و تەنانەت ئافرەتانیشیان نەکوژرێت، خەریک بوو هەموویان بەرەو لەناوچوون دەچوون.

ناچار هەموویان داوایان کرد کە سوڵح و ئاشتەوایی بکرێت و لەسەر ئەوە دانیشتن و سوڵح کرا، کە کەسێکی ئاقڵ بکەوێتە نێوانیان، کەسێکیان هەڵبژارد بەناوی عەمری کوڕی عەوف،

[21] رواه البخاري

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یاخوود ناوی یەعموری کوڕی عەوفە، هەردوولا لەسەر ئەوە کۆک بوون کە ئەو کەسایەتییە ببێتە دادوەر لە نێوانیاندا.

لەدوای ئەوەی چوونەلای عەمری کوڕی عەوف، قوسەی کوڕی کیلاب ئاماژەی بەوەدا کە خاکی مەککە خاکی باوباپیرانیەتی ئەمانە، کەعبەیان درووستکردووە، خوزاعە داگیرکەر بوون ئەگەر چی ماوەی (٥٠٠) ساڵە فەرمانداری شاری مەککە دەکەن، مەککە لەبنەڕەتدا دەگەڕێتەوە سەر ئیسماعیل و منیش نەوەی ئیسماعیل-م.

عەمری کوڕی عەوف دادوەری کرد، بەوەی کە هەموو شتێک دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی قووڕەیش و خوزاعە هیچ مافی بەڕێوەبردن و هیچییان نییە، هەموو شەرەفی عەرەبی گەڕاندەوە بۆ قووڕەیش و لە پاراستن و پەردەی لەبەرکردنی کەعبە و ئاودان بە حاجییان و ناندان و هەمووی گەڕاندەوە بۆ قوسەی کوڕی کیلاب و ئەویش بووە خاوەنی مەککە.

ماکوان: ئەی ئەم هەموو گەل و هۆزە چییە لە ناوشاری مەککەدا لە بەنی ئوممیە، بەنی مەخزوم، بەنی هاشم و ...هتد؟

نومەیر: هەموو نەوەکانی قوسەیین ئاوا زۆر بوون!

ماکوان: ئەی بۆ کارەکانیان دابەش کردووە هەر گەل و هۆزە شتێکی لەبەر دەستدایە؟

نومەیر: لەدوای ئەوەی کە هەموو دەسەڵاتی مەککە گەڕایەوە بۆ قوسەی، ئەوکات خاوەنی چەند کوڕێک بووە پێشتر بۆم باسکردی، یەکێک لە کوڕە گەورەکانی بەناوی عەبدولدار زۆر داماوبوو کەسایەتییەکی لاوازی هەبوو، کوڕەکانی تری هەمووی ئازا و چەبوک و خاوەن کەسایەتی بەهێز بوون، لە پیریدا پێش مردنی هەموو دەسەڵاتەکەی دایە دەست ئەم کوڕەی و بۆ ئەوەی لەو لاوازییەوە دەربیکات و بەهێز بێت، بەڵام لەدوای مردنی خۆی ڕێزیان لە وەسیەتەکەی گرت و هەموو هاوکاری عەبدولدار بوون، بەڵام کە ئەویش وەفاتی کرد براکانی دەسەڵات و شەرەفەکانیان لە شاری مەککە دابەش کرد و تا ئێستاش بەردەوامە، کە بنەماڵەی پێغەمبەر [illegible] لە کوڕانی عەبدولمەنافە و کوڕێکی دەبێت ناوی دەنێت هیشام ئیتر ئەمانە ئاودان و ناندانی حاجیانیان دەکەوێتە ئەستۆ.

ماکوان: ئەی دارولنەدوە چییە؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نومەیر: دارولنەدوە هەروەک ئەم نادییانەی ئێستا کە لێی دانیشتووین، یەکەم جار لە ساڵی ٤٦٠ زایینی قوسەی کوڕی کیلاب درووستی کرد بۆ کۆبونەوەی گەل وهۆزەکان بۆ بەڕێوەبردنی کاروانی بازرگانی و ڕاوێژ، تەنانەت بۆ ژن مارەکردنی خەڵکی دەچوونە ئەو ماڵەی کە قسەی درووستی کرد، خاوەنی سەرەکی ئەو ماڵە قووڕەیش بوو، بەڵام هۆزی خوزاعە و غەنیش بەشداربوون تێیدا پیاوە گەورە و پیرەکانیان لەوی کۆدەبوونەوە بڕیارییان ئەدا.

ماکوان: وەک پەرلەمانی یۆنانییەکان یاخوود زەمەنی ئێمە؟

نومەیر: بەڵێ هیچ جیاوازییەکی نییە، هەر گەل و هۆزە بە گوێرەی توانا و گەورەیی و دەسەڵاتی خۆیان نوێنەریان تێیدا هەبوو.

ماکوان: بیستومە دەڵێن ئەم دارولندوەیە بە قاپێ عارەق کڕدراوە؟

نومەیر: ڕاستە حەکیمی کوڕی حیزام لە کوڕانی عەبدولداری کوڕیی بە قاپێ عارەق کە شەوێک هەردوولایان دەیانخواردەوە لەو شەوەدا بە سەرخۆشی لێیکڕین هەموو عەقد و پەیماننامەیەکی پێ ئیمزاکردن!

ماکوان: ئەی چۆن فرۆشراوە؟

نومەیر: لەسەردەمی معاویەدا بەکەسێک فرۆشرا ناوی شەیبەی کوڕی عوسمان بوو لەتەنیشت ماڵەکەی خۆیەوە بوو ویستی گەورەی بکات، ئەویش فرۆشتی بە سەد هەزار دینار، معاویەش گلەیی لێدەکات بۆ فرۆشتوویەتی بەو پارەیە؟ ئەویش دەڵێت، من بە قاپێ عارەق کڕیومە، ئێستا فرۆشتوومە بە سەد هەزار دینار ئەوە پارەکەشیم کرد بەخێر، تا سەردەمی معاویە مابوو، لەبەر ئەوەی حوکمڕانی مەککە لەمەدینەوە بوو ئیدارەی جاهیلی گۆڕا بۆ ئیسلام، ئیتر نە لەسەردەمی خیلافەتی ڕاشدین و دوای ئەویش نەوەی ئوممەیە، هیچ ئەرزشێکی نەما بۆ ماوەیەک کرایە تەویلەی ئاژەڵ و دوای ئەوە تێکدرا خرایە سەر مزگەوتی حەرەم و مزگەوتەکەی پێ گەورە کرا.

ماکوان: ئەی ڕاستە بەردە ڕەشەکە لە ناو کەعبەدا نەبووە لە دارولنەدوەدا بووە؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نومەیر: قسەیەکی وا هەیە دەڵێن لە سندوقێکدا لە دارولنەدوەدا هەڵگیراوە، بەڵام پێناچێت ڕاست بێت.

ئەی کاتمان درەنگ کرد نەگەڕێینەوە بۆ دەوارەکەی خۆمان؟

ماکوان: فەرموو.

لەگەڵ نومەیر هەڵساین بەرەو دەوارەکە بڕۆین ماوەیەک بە ناو شاری مەککەدا سووڕاینەوە، لەپڕ بوسەینە، لە دواوە پشتی گرتم!

بوسەینە: ماکوان هەروا بە ئاسانی دەستبەردارم بوویت؟

ماکوان: ئاخر بوسەینە خۆ من نەمگواستیتەوە، تەنها مارەکردنێک بوو ئەویش باوکت درۆی لەگەڵ کردم، دەنا من خاوەنی خێزانم دوو منداڵم هەیە.

بوسەینە: جا با خاوەن دوو منداڵ و خێزان بیت، من خێزانی تۆم ڕامکردووە هاتووم بۆ لای تۆ و ناگەڕێمەوە نەزرم کردووە هەر دەبێت خێزانی تۆ بم!

ماکوان: ئاخر ڕێگای من سەختە و دژوارە، پێناچێت بتوانیت لەگەڵ من ژیان بکەیت، لەم گفتوگۆیەدا بووم لەگەڵ بوسەینەدا و باوکی گرتی و دەستی کرد بەلێدانی و لەبەرچاوی خەڵکیدا و شمشێری لێدەرهێنا کە بیکوژێت و نومەیریش سەیری ئێمە دەکات و بەدوای قسەی منەوەیە.

منیش ئەوەم پێ قوبوڵ نەکرا، ئافرەتێک شوێن من بکەوێت لەبەر من خۆی بخاتە نارەحەتییەوە منیش ئەوەندە سپڵە و بی وەفا بم هەروا لێگەڕێم بکوژرێت، شمشێری خۆمم دەرهێناو خستمە سەر ملی فەزلی و وتم ئەگەر خوێن بێت لە بوسەینە گەردنت ئەپەڕێنم.

هەرکە شمشێرم دەرهێنا بەدوامدا چەند کەسێک لە پیاوانی نومەیر شمشێریان دەرهێنا و فەزلیان بردە دواوە و منیش بوسەینەم دەرهێنا لەژێر شمشێرەکەیدا خستمە پشتی خۆمەوە هاوارم کرد ئەوە خێزان و شەرەفی منە کەس بۆی نییە لێ نزیک بێتەوە.

فەزلی هاتە لام وتی شیربابییەکەی بدەو ببە!



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: من شیربایی نادەمە کەس تەنها مارەیی ئەدەم.

فەزڵی: مارەییەکەی ٣ ئۆقیە ئاڵتوونە؟

ماکوان: من نازانم سێ ئۆقیە ئاڵتوون چەند دەکات، بەڵام دەتوانم بە پارە بتدەمێ.

نومەیر هات و چوارسەد درهەمی دایە دەست فەزڵی زۆر بە ئاسانی کچەکەی جێهێشت و دای بە من هەروەک کالا و شتوومەک پێی فرۆشتم.

بەڕێزەوە بوسەینەم سواری ئەسپەکەی خۆم کرد، لەگەڵ نومەیردا بردمەوە بۆ لای دەوارەکەی خۆمان لە دەرەوەی شاری مەککە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دوای ئەوەی کە بوسەینە ڕای کردبوو لەماڵی باوکی بۆ ئەوەی لەگەڵ من بێت، باوکی دوای کەوتبوو دۆزییەوە و ویستی بیکوژێت، بەڵام توانیم لەدەستی ڕزگاری بکەم و لەگەڵ خۆم بردمەوە بۆ دەوارەکەی کە تێیدا دەمامەوە لەگەڵ نومەیر و پیاوەکانی.

دڵخۆش بووم بەهاتنی و وتم ئیتر خێزانمە و لەلامە.

ئەو شەوە نومەیر هەموو لایەکی ئاگادار کردەوە کە ئەم شەو ئاهەنگی گواستنەوەی بوسەینە و ماکوانە.

چەند مەڕێک درا بەزەویدا بۆ برژاندن، دەمەو ئێوارەیەکی خۆش بوو هەموو ئەو هاوڕێ و عەبدو کۆیلانەی لەوێدا بوون گۆرانیان دەوت و سەما و خۆشیان بوو.

ڕم بازێن و شمشێربازی و سوار سوارێنی ئەسپ و یاری سەوڵەجان و هەموو ئەمانە تابلۆیەکی ئەو ئێوارە.

چوومە لای بوسەینە دڵ نەواییم کرد و وتم ئەو هەموو ڕێزو خۆشەوویستییە بۆ من و تۆیە، تەواو تۆ هاوسەری خۆشەوویستی منی.

هەستم کرد دڵ شکاو بوو زۆر هەستم بە ئازارەکانی دەکرد لەو کۆمەڵگەیە ئەوەی ڕێز بێت لەئافرەت ناگیرێت، وا تەماشای ئافرەت دەکرا، بارە بەسەر دایک و باوکییەوە و دەبێت بدرێت بە شوو بۆ ئەوەی نەجاتیان بێت لە دەستییەوە، تەنانەت ئەو کچانەی کە دەمانەوە شوویان نەدەکرد یان بۆ کاری قوورس و شوانی و تەنانەت زۆر جار دەفرۆشران بە هۆکاری ئەوەی باوکەکە دەیووت ئیتر ناتوانم چیتر بەخێوت بکەم، خۆیان دەیانکرد بەکۆیلە.

ئافرەتان دڵشکاو بوون لەو کۆمەڵگەیە بەتایبەت کچان کە لە ماڵی باوکیان بوون، هەستم بە هەموو ئازارەکانی بوسەینە دەکرد، هەرچۆن بوو فرمێسکەکانم بۆ سڕی پێم وت ئەوەندەی




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

توانیم هاوسەرێکی باش دەبم بۆت، لە غیابی مندا زانیت دیارنەمام و زۆرم پێچوو ئەتوانیت دوای ساڵێک شوو بکەیتەوە.

لەم قسانەدا بووم لەگەڵ بوسەینەدا چاو ڕەشی و جوانی و دەم و چاو خەفەتاوی و تەماوییەک، وردە وردە خۆشەوویستی درووست دەکرد لە دڵمدا، لەو کاتەوە تێگەیشتم کە خۆشەوویستی بەرزترین پلەیە، خوای پەروەردگار لە فیترەدا بەخشیوویەتی بە ئێمە، لە مەوەدە و ڕەحمەتیش گەورەتر خۆشەوویستییە، مەوەدەو ڕەحمەت درووست دەکات، دڵم یەک پارچە خۆشەوویستی بوو بۆ بوسەینە.

لە پڕ نومەیر بانگی کردم هاواری کرد بە پێکەنینەوە وەرە مەحبوبی دڵ بە جێبهێڵە، وەرە لەگەڵ هاوڕێ و خۆشەوویستان سەما بکە بانگت دەکەن، دیار بوو ڕێوڕەسمی ئەو سەردەمە وابوو هەموو بەدەوری زاوادا سەمایان دەکردو شمشێرەکانیان بائەدا.

دەستکرا بە نان خواردن و قسەی خۆش لەو سەردەمەدا هەموو شەوان زوو دەخەوتن، منیش دڵ خۆش بووم شەوی زاوایەتییە، دەوارێکی بچوک لەناو دەوارەکەماندا ئامادە کراوە وەک ژوورێک پڕ لە کەژاوە بۆ من و بوسەینە، خۆم ئامادە کرد بۆ شەوی زاوایەتی.

لەپڕ بە هاواربانگی نومەیر کرا: کە لە شاری مەککە شەڕ دەستی پێکردووە!

منیش لەتەنیشتییەوە دانیشتبووم لەگەڵ عەبدوڵلا و سەعددا قسەی خۆشمان دەکرد، ئەوان هەڵسان ناچار منیش لەگەڵیاندا هەڵسام.

ترسی ئەوەیان هەبوو کە زۆرێک لە کەرەستەو کەلوپەلەکانی نومەیر لە مەککە بوو کە دەستیان بەسەردا بگیرێت، یاخوود بەهۆکاری شەڕەکە بسووتێنرێت.

هەموو هۆزەکانی قووڕەیش کۆببوونەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ عەبدوملوتەڵیب.

ناچار شوێن نومەیر و سوارەکانی کەوتم چوومە لای بوسەینە پێمووت: پاش کەمێکیتر دێینەوە، بۆ من جوان نییە، نەڕۆم، چوونکە ئەمانە بۆمن ئیش دەکەن و هەموو سەروەتەکە خۆم خاوەنیم، خۆ بادانێک بوو لەبەرچاویدا و بۆ ئەوەش بوو کە ئەو پەیامەی بدەمێ کە هاوسەرەکەت دەوڵەمەندە و ئیتر تۆش دڵخۆش بە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

چووین بەرەو مەککە، خەڵکی شاری مەککە کۆببوونەوە لە نزیکی کەعبە، کۆمەڵێک لە پیاوان لەدەوری عەبدولموتەڵیب بوون بە ڕمح و شمشێرەوە پاسەوان بوون کۆمەڵێکیش بەدەوریاندا دەڕۆن بۆ شەڕ خۆیان ئامادەکرد بوو، حارسی کوڕیشی وەک شێر پەلاماری ئەدان و نەیدەهێشت لەباوکی نزیک ببنەوە. باوکی لەگەڵ چەند کەسێک خەریکی هەڵکەندنی چاڵێک بوون.

هەستیشم بە لاوازی عەبدولموتەڵیب دەکرد هاواری دەکرد خوای کەعبە (دە) کوڕم پێببەخشە، یەکێکیان دەکەمە قوربانیی، چەند جار هاواری کرد خوای کەعبە (دە) کوڕم پێببەخشە یەکێکیان دەکەمە قوربانیی سەری دەبڕم لە پێناوی تۆدا!

لە پڕ نومەیر خۆی کردە ناو شەڕەکە ویستی خەڵکەکە لە هەردوو تەرەف هێمن بکاتەوە، لەو ساتەدا ئاوێک لەبن پێی هەموویانە هاتە دەرەوە هەموو خەڵکەکە سەرسام بوون و تیان عەبدولموتەڵیب ڕاستی کرد، زەمزەمی دۆزییەوە خەونەکەی ڕاست دەرچوو! خوای کەعبە ڕاستی لەگەڵ کرد ئەوە ئاوی زەمزەم دۆزرایەوە، هەموو پیاوانی قووڕەیش چوون بۆ لای، هەریەک لە ئاوەکەی دەخواردەوە، ئەویش سووپاسی خوای دەکرد دەیووت ئەوە من خاوەنی زەمزەمم.

نومەیر: ماکوان بڕۆ ئاوی زەمزەم بخۆوە خۆت تێر ئاو بکە و مەرکانە و هەموو کەلەوپەلەکانت پڕ ئاو بکە.

ماکوان: باشە.

عەبودولموتەڵیب داوای لە هەموو پاسەوانەکانی کرد، کە بەدەوری زەمزم دا کۆببوونەوە ئیتر ئەو خاوەنیەتی، پیاوانی قووڕەیش دەیانووت ئێمەش شەریکین لەگەڵت، دەبێت لەو ئاوەدا بەشداربین، ئەویش دەیووت ئەو ئاوە من خاوەنیم کەس بەشدار نابێت، هاوبەشی کەس ناکەم.

شەڕ کۆتایی هات خەڵکەکە بڵاوەیان کرد، وتیان با شەڕ ڕوونەدا، کەسێک دادوەریمان بکات، ئەوانیش هەموو لەسەر ئەوە ڕێکەووتن کە کەسێکی کاهین هەڵبژێرن ئەو دادوەریان بکات، خەڵکی شاری مەککە هەموو دادوەری و مەحکەمەیەکی خۆیان دەبردە لای کەسێک ناسراو بوو بەکاهینی بەنی سەعد لە شاری یەسریب، کە دوایی ناوی دەگۆڕێت بە شاری مەدینە.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دیاربوو لەو سەردەمەدا زۆر بڕوایان بە کاهینەکان هەبوو، بۆیە بڕیاریاندا بۆ بەیانی بەرەو شاری مەدینە بکەونە ڕێ تا ئەو کاهینە نێوەندگیرییان بۆ بکات.

نومەیر بڕیاریدا کە ئەم شەو هەموو بەدەوری شتوومەک و کاڵاکاندا بمێنینەوە نەکو شەڕ ڕووبداتەوە، منیش هەر خەیاڵم لای بوسەینەیە.

ماکوان: چوومە لای نومەیر و وتم چی ڕوویداوە؟

نومەیر: عەبدولموتەڵیب لەشاری یەسریب لەدایک بووە، لەڕاستیدا خۆی ناوی شەیبەی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدولمەنافە لەدوای ئەوەی کە باوکی دەمرێت ئەمیش لە نزیک دێیەکی شاری مەدینەدا ژیان بەسەردەبات و دوای ئەوە مامی ناوی موتەڵیبە دەچێت بە شوێنیدا بیهێنێتەوە، چوونکە لەدوای باوکی ئەم دەبێتە حاکمی شاری مەککە و جێگری باوکی دەبێت و لە نزیک مەدینە پرس بەدایکی دەکات و دەڵێت دەمەوێت شەیبە بەرمەوە بۆ مەککە و ببێتە جێنشینی باوکی. ئەویش دەڵێت ئەگەر ئارەزوومەند بوو ببە، بەڵام ئەگەر نەیویست لای من دەمینێتەوە.

دایکی شەیبە کە دوایی دەناسرێت بە عەبدولموتەڵیب، خەڵکی شاری مەدینەیە و لە کچانی بەنی نەجارڕە، لە هۆزی خەزرەجییە، بۆیە ماڵە خاڵوانی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی شاری مەدینەن، دایکی عەبدولموتەڵیب ناوی سەلمای کچی عەمرە. ئیتر شەیبە مامەی هەڵدەبژێریت، لەگەڵ مامی دەکەوێتە ڕێ بەرەو مەککە. کەدێتە شاری مەککە نازناوی عەبدولموتەڵیبی لێدەنرێت، خەڵکی شاری مەککە وادەزانن بەندەیەکە و مامەی کڕیویەتی ناوی شەیبەی لێدەبێتەوە بە بەندەکەی موتەڵیب دەناسرێت.

تا ئەم ساتە وەختە ئەو قسە ڕۆیشتووە لەشاری مەککەدا وەک پاشا فەرمانڕەوایی دەکات، دارولنەدوەش ناتوانێت بڕیاری ڕەت بکاتەوە، بەڵام زۆر کەم منداڵە، بۆیە داوا لە خوای گەورە دەکات دە کوڕی بداتێ، ئەگەر بووە خاوەنی دە کوڕ یەکێکیان دەکاتە قوربانی!

ماکوان: ئەی چۆن ئاوی زەمزەمی دۆزییەوە؟

نومەیر: چەند شەوێک لەسەریەک خەونی بینیوە، ناونیشانی ئەدەنێ کە ئەو جێگایە هەڵکەنێت ئاوی زەمزەم ئەدۆزیتەوە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: واتە بەخەون پێیان وتووە، خەونەکەش ڕاست دەرچووە؟

نومەیر: بەڵێ، بەڵێ ڕاست دەرچووە، ناونیشانی هەڵکەندنەکەشیان پێوتووە، سێ شەو لەسەر یەک هەمان خەوی بینیوە.[٢٢]

## خنکان لە بێ ئاویدا!

ئەو شەوە هەموو لە شاری مەککە خەوتین، لە لای بەشێک لەو شتوومەک و کەرەستانەی کە نومەیر هێنابووی بۆ فرۆشتن لە شامەوە، کە ڕۆژبوویەوە وتم دەچمەوە بۆ لای بوسەینە ئەم شەو هەر چاوەڕێی من بووە. لەوەدا بووم بچم بە نومەیر بڵێم دەمەوێت بچمەوە بۆ لای بوسەینە، بەدوای نومەیردا دەگەڕام هەواڵیم دەپرسی بزانم لە کوێیە؟ کەچی هەرکەسم دەبینی هەواڵی نومەیرم دەپرسی، دەیانوت نومەیر بە شوێنتا دەگەڕی هەواڵی تۆ دەپرسێت!

دۆزیمەوە پێم وت فەرموو لە خزمەتام!

نومەیر: قافڵەی قوورەیش کەوتوونەتە ڕێ بەرەو شاری یەسریب، ئامادەی شوێنیان بکەوین بڕۆین، چوونکە من بەدوایاندا دەڕۆم.

ماکوان: خەریک بوو بڵێم ئاخر بوسەینە چاوەڕێی منە، بەڵام لەڕووم نەهات وتم بەڵێ ئامادەم!

نومەیر: خۆت ئامادە بکە، چوونکە کاروانەکە دەرچوون با زوو فریایان بکەوین. پێدەچێت ئێستا گەیشتبنە ناوچەکانی حودەیبییە.

---

[٢٢] سمعتُ عليَّ بنَ أبي طالبٍ وهو يُحدِّثُ حديثَ زمزم قال: بينا عبدُ المطلبِ نائمٌ في الحِجرِ أُتِيَ فقيل له: احفُرْ بَرَّةً، فقال: وما بَرَّةُ؟ ثم ذهب عنه، حتى إذا كان الغدُ نام في مضجعِه ذلك فأُتِيَ فقيل له: احفِرِ المضنونةَ، قال: وما المضنونةُ؟ ثم ذهب عنه، حتى إذا كان الغدُ فنام في مضجعِه ذلك فأُتِيَ فقيل له: احفِرْ طَيْبَةَ، فقال: وما طَيْبَةُ؟ ثم ذهب عنه، فلما كان الغدُ عاد لمضجعِه فنام فيه فأُتِيَ فقيل له: احفِرْ زمزم، فقال: وما زمزم؟ فقال: لا تُنزَفُ، ولا تُذمُّ. ثم نعت له موضعَها فقام يحفرُ حيثُ نُعِت.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: باشە، لە دڵیشەوە زۆر حەزم بەگەڕانەوە بوو بۆ لای بوسەینە، بەڵام چارم نەما ناچار بەیەکێک لەو کەسانەی لەگەڵماندا بوو هەواڵم ناردەوە بۆ بوسەینە کە پێی بڵێت کارێکمان بۆ هاتۆتە پێش پێدەچێت پانزە بۆ بیست شەومان پێبچێت.

کەوتینە ڕێگا بەرەو یەسریب و لە ڕێگادا کە گەیشتمە ئەو شارە بۆنی خوێنی لێدەهات، شەڕێکی خوێناوی تێیدا ڕوویدا بوو زۆربەی خەڵکی ناوچەکە چۆڵیان کردبوو، هەواڵیان پرسی کە ئەو کاهینەی نێوەند گیری دەکات و ناسراوە بە کاهینی بەنی سەعد لە کوێیە؟

هەواڵیان دایە قووڕەیش واتە قافڵەی عەبدولموتەڵیب کە ئەو کاهینە بە سەفەر چووە بۆ ناو خەیبەر و لەوێیە.

هەمووان بەرەو خەیبەر ڕۆیشتن و نەوەستان، لەتاو سەرقاڵی خۆمان کە دەمانویست زووبگەینە لای کاهینەکە بۆ ئەوەی دادوەرییەکەیان بۆ بکات، کەس بیری نەبوو کە ئاو و نان بۆ قافڵەکان دەستەبەر بکات و کەوتنە ڕێ بەرەو خەیبەر. منیش خەیاڵم لای بوسەینە بوو بیرم نەبوو کە لە شاری یەسریب داوای ئاو بکەم.

لە نیوەی ڕێگەدا کەس ئاوی پێنەما هەموو خەریک بوو دەخنکاین، گەروومان لە تینوان وشک ببوو، ناچار هەموو بڕیاریاندا کە گۆڕ هەڵبکەنن بۆ یەکتر و تا ئەوکاتەی دەمرن.

زۆر بێزار بووم لە خۆم ڕووم کردە نومەیر وتم: بەو ئاسانیە خۆمان بۆ مردن بدەین بەدەستەوە؟

نومەیر"بەزەردەخەنەوە": ئەگەر عەبدولمەوتەڵیب مرد با ئێمەش بمرین.

ماکوان: ئەوان خەریکی هەڵکەندنی گۆڕن، هەمووی بۆ مردن خۆی ئامادە کردووە.

نومەیر: چاوەڕێ بکە، پێناچێت کەس بمرێت، لێرەدا شتێک ڕوو ئەدات هەموومان بە خۆشی و شادی دەگەڕێینەوە بۆ مەککە، عەبدولموتەڵیبیش زیاتر ناو و ناوبانگ دەردەکات.

ماکوان: چاوەڕێم، بەڵام ئەگەر مردم زۆر داوای لێبوردن لە بوسەینە بکە.

نومەیر: مردن زووە بۆ من و تۆ!





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەپڕ گوێم لە هاوار و پێکەنین و سووپاسگوزاری بوو بۆ خوای پەروەرەدگار، هاواریان دەکرد سووپاس بۆ خوای کەعبە.

ماکوان: ئەوە چی ڕوویداوە جەنابی نومەیر؟

نومەیر: ئاو لەژێر سنگی وشترەکەی عەبدولموتەلیبەوە هەڵدەقوڵێت!

ماکوان: بەڕاستتە؟

نومەیر: بڕۆ بیبینە بەچاوی خۆت.

کە چووم هەموو مەرکانەکانمان[٢٣] پڕ ئاو کرد، خۆشمان تێر ئاومان خواردەوە، لەو بیابانە وشکەدا ئاوێکی سارد و شیرین هەڵدەقوڵا و هەموو لاکان پێدەکەنین. عەبدولموتەلیب هاواری کرد لە پیاوانی قووڕەیش و قافڵەکەی ئەتوانن پێم بڵێن ئێمە کاتێک هەموو بۆ مردن خۆمان ئامادەکردبوو، بەڵام ئەم ئاوەی کەلێرەدا هەڵقوڵاوە مانای چییە؟

قووڕەیش هەموو وتیان نیشانە و بەڵگەو واتای ئەوەیە کە تۆ خاوەنی زەمزەمی و ئیتر ئێمە هیچ ناڵێین و تۆ زیاتر لەجاران برا گەورە و سەروەرمان بە، ئێمە لە ئاستی تۆدا بێدەنگین.

گەڕاینەوە بەرەو شاری مەککە، لەڕێگادا پرسیم لە نومەیر بۆچی کەعبە ئەو ناوەی هەیە؟

نومەیر: وشەی کەعبە لە زمانی عەرەبیدا واتە چوارگۆشە و لە (مکعب) وە هاتووە، بەڵام ناوی تر زۆرە لەوانە (بیت الحرام)، بیت الله...هتد.

ماکوان: ئەی بۆ قووڕەیش لە عەرەفات ناوەستن، دەچنە سەر شاخەکانی موزدەلیفە دەوەستن بۆ حەج؟

نومەیر: قووڕەیش خۆی بەدەوڵەمەند و خاوەن سەروەت دەزانن، وەک چۆن جوولەکە خۆیان بە خەڵکی باشتر دەزانن، بۆیە ئەوان لە کاتی حەج دا دەچنە سەرکێوی موزدەلیفە و خەڵکی فەقیریش هەموو لەسەر کێوی عەرەفات دەوەستن.

---

٢٣ ـ گۆسکە ـ شەربە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: ئەی حەج واتای چییە؟ وا لەم سەردەمی جاهیلیە خەڵکی دێنە حەج و بڕوایان پێیەتی.

نومەیر: لە زمانی عەرەبیدا وشەی حەج لە ڕووی زمانەوانییەوە واتە: گەورە

حەج لە ڕووی زاراوەوە واتە: ئەو جێگا پیرۆزانەی کە حاجییان بۆی دەچن وەک عەرەفات، موزدەلیفە، دەوری کەعبە (طواف)، سەفا و مەروە...هتد.

یەکەم ماڵ لەسەر زەویدا درووستکراوە ماڵی خوایە، کەعبەش واتە چوارگۆشە.

شاری گریان (مەککە) لە بنەڕەتدا ناوی بەککەیە واتە جێگای گریان یان ئەو جێگایەی کە زۆر خەڵک تێیدا دەگری ناوی مەککە لەوە هاتووە. بە گوێرەی قۆناغەکان خەڵکی کردوویەتی بە مەککە، خوای گەورە لە قورئان دا بە بەککە ناوی بردووە

﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ﴾ [آل عمران]

بەڕاستی یەکەم خانە و ماڵ و مەنزڵگایەک کە بۆ خەڵکی دانرا لەسەر زەوی (بۆ خوا پەرستی) ئەوەیە کە لە مەککەدایە کە هیدایەت و ڕێنمویی بەخشە بۆ هەموو خەڵکی جیهان.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## کەعبە چۆن دامەزراوە و کێ درووستی کردووە؟

بۆ یەکەم جار کە خوای گەورە مرۆڤی درووستکردووە بۆ ئەوەی ئەرک و فەرمانیشی بۆ دیاری بکات، خوای گەورە ماڵێکی بۆ خۆی دەستنیشان کرد بۆ ئەوەی ببێتە ڕووگەی خەڵکی و بەندایەتی تێدا بکەن، لەهەمان کاتدا هەر لەو ماڵەوە خوای گەورە دەستنیشانی ئەرکەکان دەکات و مافەکانیشیان دابین دەکات.

ئەو کەسەی کەعبەی درووست کرد باوکی هەموو مرۆڤەکانە، ئادەم - سەلامی خوای لێبێت- لەدوای چل ساڵ لە درووستکردنی ئەو مزگەوتە بوونیادی مزگەوتێکی تری دانا بەناوی مزگەوتی قودس، کە ناسراوە بە مزگەوتی ئەقسا[٢٤]، واتا مزگەوتێکی دوور، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی گێڕاوینەتەوە.

پاشان لەدوای ڕووداوی لافاوەکەی پێغەمبەر نوح -سەلامی خوای لێبێت- کەعبە دەڕووخێت لەسەر زەویدا بوونی وەک ماڵ نامێنێت، بەڵام بناغەکەی وەک پاشماوەیەک دەمێنێتەوە.

ماکوان: بۆ دەبێت یەک ڕووگە هەبێت هەموو ڕووی تێبکەین؟

نومەیر: پێش ئەوەی باسی ئەوە بکەین کێ درووستی کردووە بۆ جاری دووەم دەمەوێت فەلسەفەی ئەم ماڵە بزانین واتە: حیکمەت چییە لە درووستکردنی یەکەم ماڵی خوا لەسەر زەویدا؟

بۆ ئەوە درووستکراوە کە یەکەم ڕووگەی خەڵکی بێت و دینداران لەسەر یەک ڕووگە کۆبکرێتەوە، ڕای جیاواز لە ڕووی بیروباوەڕەوە لە نێوانیاندا نەبێت و گومانیشی تێدا نییە ئاماژەیە بۆ یەکتاپەرسی خوای مووتەعال، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە لە ئێستادا مووعجیزەیەکی زۆر گرنگی تێدا دەبینرێت، کە (سێ) ئەندازیاری سەربازی ئەمریکی ئاشکرایان کردووە لە کاتی هاتنیان بۆ جەنگی کەنداو بەم جۆرە بینیویانە و دواتر باسیان کردووە: بینیان لەماوەی چەند خولەکێکدا کە موسڵمان پێیدەڵێن: قامەت- واتە خۆ ئامادەکردن بۆ هەڵسانەوە

---

[٢٤] مسجد الأقصى



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بۆ نوێژ، ماوەیەکی کەمە بۆ نوێژی فەرزێک دوو بۆ سێ ملیۆن خەڵک لە کاتی مەراسیمی حەجدا ڕیز دەبن، هەمووی ناگاتە دوو دەقیقە.

ئەو ئەفسەرانە ئەوەیان باسکردووە کە ئەگەر لە ڕووی سەربازییەوە ئەم کارە ئەنجام بدرێت ئەوا چەندین هەفتە و مانگمان پێویستە بۆ ڕێکخستنی ئەو خەڵکە لەو جێگایەدا بەوشێوەیەی کە ڕیزیان بەستووە. بەشێوەی ئیدارەیەکی بەهێز کە پێکهاتبێت لە پەنجا هەزار کەس بۆ ڕیکخستنی سێ ملیۆن لەو جێگایەدا، بەڵام لە کەعبەدا لەماوەی چەند خولەکێک دا ئەو خەڵکە بێ چاودێرێک هەمووی خێرا ڕیز دەبن

ماکوان: ڕاستە جوانە، ئەی کێ بۆ جاری دووەم کەعبەی بینا کردووە؟

نومەیر: لەدوای ئەوەی باوکی مرۆڤایەتی، بە فەرمانی خوای گەورە لەسەر زەوی بناغەی ئەوماڵەی دامەزراند، چوونکە هەمان ماڵ وەک ڕووگەی فریشتەکان لە ئاسماندا هەیە بە ناوی ماڵی ئاوەدان[25] بۆ ئاوەدان کردنەوە و بیناکردنەوەی ئەو ماڵە بۆ جاری دووەم کەسێکی دیکە ناسراو بە باوکی پێغەمبەران، ئیبراهیم لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕی - سەلامی خوای گەورەیان لێبێت- درووستیانکردەوە.

ماکوان: ئەو چیرۆکەم بە کورتی بۆ باس دەکەیت؟

نومەیر: ئیبراهیم -سەلامی خوای لێبێت- ماندووترین پێغەمبەرە، ناڕەحەتی زۆری بەسەردا هاتووە. دوو وێستگە لە ژیانیت بۆ دەگێڕمەوە، بۆ ئەوەی بزانیت چەندە ناهەمواری بەسەردا هاتووە، لەگەڵ ئەو هەموو ناهەمواریی‌یەدا ئەم پێغەمبەرە خۆشەوویستەمان ڕازیبوونی خۆی هەمیشە نیشانداوە، لەدوایدا خوای گەورە بۆیکردووە بە باشتر.

وێستگەی یەکەم: خوای گەورە فەرمان ئەدات بە ئیبراهیم کە منداڵ و ژنی دووەمی ببات بۆ جێگایەک کە کەسی لێ نییە، خواردنی لێ نییە، ئاویشی لێ نییە! ئەمە لە کاتێکدایە کە خێزانی یەکەم سارا خاتوون ئافرەتێکی نەزۆک بووە. خوای گەورە لە خێزانی دووەمی (هاجەرە خاتوون) کوڕێکی پێدەبەخشێت بە ناوی ئیسماعیل، لەو خۆشی و شادییەدا ئەم پەیامە لە لایەن خوای گەورە دێتە خوارەوە بۆ ئیبراهیم، هەموویان ڕازین بە فەرمانەکە و دەست بەجێ پیادەی

---

[25] البيت المعمور



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەکەن، لە ناوچەی فەڵەستینەوە دەکەونە ڕێ بۆ بیابانی عەرەبستان و ناوچەکانی مەککە. خوای گەورە فەرمان دەکات بە ئیبراهیم بە جێیان بهێڵێت و بگەڕێتەوە بۆ لای سارا خاتوون لە فەڵەستین، ئەمە لەڕاستیدا مەگەر تەنها ئیمانی پێغەمبەر ئیبراهیم - سەلامی خوای لێبێت- بتوانێت ئەو کارە ئەنجام بدات!

ماکوان: هۆکار و حیکمەت چییە ئیبراهیم -سەلامی خوای لێبێت- ئەم کارەی ئەنجامداو خوای گەورە بۆ داوای لێکرد؟

نومەیر: سەرەتا بۆ ئەوەی ئیبراهیم و ئەوانەی کە شوێنکەوتووی ئیبراهیمن ئەوە بزانن کە خوای گەورە فەرمانێکی کرد بەدڵنیاییەوە لە بەر چاکەی مرۆڤەکانە و خزمەتە بە مرۆڤایەتی، مەرج نییە ڕاستەوخۆ بزانیت ، بەڵام لە دواییدا بۆت دەردەکەوێت ئەمەش مووعجیزەیە، هەموو فەرمانێکی خوای گەورە باشترینە بۆ مرۆڤ، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە فەرمانی خوای گەورە بەندایەتییە لێکۆڵینەوە لێی و بەدوای حیکمەت گەڕان و پرسیار و وەڵامدا نەگەڕێیت، بەڵکوو بە یەقین و دڵنیا بیت لە خوای خۆت و هەرچی فەرموو بێ دوو دڵی پیادەی بکەیت، ئەمەش پێناسەی بەندایەتییە بۆ خوای پەروەردگار.

ئیبراهیم -سەلامی خوای لێبێت- ئەو ژن و منداڵەی جێهێشت لەو جێگایەدا بێ کەس، مێژوونووسان دەڵێن: خواردن و ئاو تەنها بەشی چەند ڕۆژێکیان پێ بوو.

دوای ئەوەی کە خواردن و ئاویان نەما دایکی لە تاو گریانی ئیسماعیل چەند جارێک لەسەر تەپۆڵکەی سەفا ڕایدەکرد بۆ تەپۆڵکەی مەروە، حەوت جار ئەم کارەی ئەنجامدا بە هیوای ئەوەی کەسێک ببینێت، بەڵام بێ هودە گەڕایەوە لای منداڵەکەی و بینی لە ژێر قاچەکانی ئیسماعیلی کوڕییەوە ئاوێک دەنگی قوڵپەی دێت و بەنەرمی تەیی دەکات، لە خۆشیدا هاواری کرد: زەم زەم، واتە کۆیکەرەوە، کۆیکەرەوە لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکرد، لە خۆشیاندا هەر دەیوت کۆیکەرەوە ئاوەکە کۆکەرەوە واتە دەیفەرموو زەمی زەمی. لەو کاتەوە ئەو ئاوە لەو جێگایەدا هەڵدەقوڵێت بە ملیۆنەها خەڵکی لێیدەخواتەوە ناسراوە بە ئاوی زەمزەم. لەوکاتەوە ئاوەدانی دەستی پێکردۆتەوە لەو جێگایەوە پاش ماوەیەک ئیبراهیم -سەلامی خوای لێبێت- دەگەڕێتەوە لایان ئیتر لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕی کەعبە بینا دەکەن بانگەوازی حەج لەو سەردەمەوە دەست پێدەکات لەو ناوچەیەوە.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: ئەی بۆ ئێمە حیکمەتی سەفاو مەروە چییە؟

نومەیر: حیکمەتی ئەوەیە کە هەر کەس کۆشش بکات و کاربکات خوای گەورە نائومێدی ناکات، هاجەرە خاتوون جاری یەکەم کە لە تەپۆڵکەی سەفا ڕایکرد بۆ تەپۆڵکەی مەروە، کەسی نەدی، حەوت جار ئەو کارەی کرد، بەڵام لە دوای کارکردنی و هەوڵدانی خوای گەورە نائومێدی نەکرد و دیاری پێبەخشی ئەویش ئاوی زەمزەم بوو.

ماکوان دەمەوێت باسی گەورەیی و مووعجیزەی ئاوی زەمزەمت بۆ بکەم، کە زۆر گرنگە بیزانیت. ماکوان: فەرموو، خۆشحاڵ دەبم!

نومەیر: مووعجیزەی ئاوی زەمزەم لەوەدایە کە پێکهاتەکەی لەو ناوچەیەدا شازە لە ڕووی تامەوە، هیچ ئاوێکی دیکە تامی ئەو ئاوە نادات. تەنانەت ئەگەر بیریک هەڵبکەنرێت پێکهاتەی تامەکەی جیاوازە، لە هەمووی گرنگتر زیاتر لە ناو لاشەی مرۆڤدا دەمێنیتەوە مرۆڤیش لە برسێتی تێر دەکات بە خواردنەوەی ئەو ئاوە، ئاوێکی مووبارەکیشە هەرکەس بۆ هەر مەبەستێک بە ڕاستگۆیی بیخواتەوە دەڵێن خوای گەورە پێیدەبەخشێت، نموونەی ئیمامی شافعی دەهێننەوە کە دەڵێن دایکی ئاوی زەمزەمی داوەتە محمد کوڕی ئیدریس کە ناسراوە بە (شافعی) بە نیازی ئەوەی ببێتە زانا.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## فەلسەفەی حەج چییە؟

سەرەتا کە دەڵێن فەلسەفەی حەج چییە؟ واتا گەڕان بە دوای ئەو نهێنی و حیکمەتانەی کە لەناو ئەم پرۆسەیەدا هەیە کە یەکێکە لە پێنج پایەکەی ئیسلام.

هەر کەسێک کە دێتە ناو ئیسلامەوە دەبێت ئەم پێنج پایەیە لە خۆیدا پیادە بکات و لەسەر ئەم پایانە بیناو بوونیادی ئیسلامەتی خۆی بکات، هەر یەک لەم پایانە خوارو لار و نووقسان بێت ئەوا ئەو بوونیاد و بینایە دەڕوخێت!

ماکوان: جەنابی نومەیر باسی زەمزەم و حەج و سەفا و مەروەت بۆ کردین، ئەی عەرەفات چییە و لە چییەوە هاتووە؟

نومەیر:عەرەفات گردێکە لە نزیک شاری مەککە، بە دەووریدا شاخی سەختی ڕوتەڵە و پڕ بەرد و خۆڵە، ناوی ئەم جێگایە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە لە دوای جیابوونەوەی باوکە ئادەم و دایکە حەوا لەیەکتر، دووبارە لەم جێگایەدا یەکتریان بینیوەتەوە کە ناوی عەرەفاتە، ناوەکەی لە تەعاروفەوە سەرچاوەی گرتووە، واتە: بەیەکگەیشتن و ناسینەوە، هەروەها لەم جێگایەدا هەموو حاجییان دەبێت کۆببنەوە هەستێکی ناسین و یەکتر خۆشوویستن لە ناو گەلانی جیهاندا دەبینرێت و دروست دەبێت، لەمسەر بۆ ئەوسەری دوونیا لەو جێگایەدا ئەو خەڵکە تەعاروف دەکەن، پاڕانەوە و نیازەکانی خۆیان بە خوای پەروەردگاریان دەڵێن تا ئێوارە کە خۆر دەنیشێت، هەموو خەڵکی لەوێدا دەمێننەوە دوایی بەرە و موزدەلیفە دەکەونە ڕێ، ئەو ئێوارە ئیتر ئەوەی چووەتە حەج دەبێتە حاجی.

ماکوان: ئەی موزدەلیفە چییە لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە؟

نومەیر: موزدەلیفە ناوچەیەکی دیکەیە لە نزیک شاری مەککە، نزیکەی شەش کیلۆمەتر دوورە لە عەرەفاتەوە، لەم سەردەمی جاهیلییە دەوڵەمەندەکانی قوورەیش بۆ حەجکردن لە سەر موزدەلیفە دەوەستان و لەوێدا کۆدەبوونەوە، خەڵکی هەژار و میوانانی ماڵی خوا هەموو لە عەرەفات کۆدەبوونەوە تا پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دێت و بێ جیاوازی ڕەگەز و چینایەتی هەمووی لە عەرەفاتدا کۆکردەوە، پاشان شەوێکی دانا کە لەو جێگایەدا بێمێننەوە کە





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ناوی موزدەلەیفەیە، دەبێت لەوێدا بخەون نوێژی بەیانی بکەن و بکەونە ڕێ بەرەو شەیتان ڕەجمکردن. ناوی موزدەلیفە لە کۆکراوەی خەڵکی مردووەوە هاتووە، ئەگەر ئەو شەوەی کە حاجییەکان لەوێن بەچاوێکی سەرنجەوە تەماشای ئەو خەڵکە بکەیت هەمووی بڵاوبونەتەوە ماندوون و بە جلی ئیحرامەوە خەوتوون وا دەبینیت هەمووی (مردوون) لەم جێگایەدا کۆکراونەتەوە! یاخوود دەڵێن کۆبوونەوەی ئادەم و حەوا بووە لەو جێگایەوە خانەوادەیان پێکهێناوەتەوە، خوای گەورە باسی ئەو جێگایەی کردووە لە قورئاندا بە (المشعر الحرام) کە زانایان دەڵێن مەبەست لێی هەموو موزدەلیفەیە نەک مزگەوتەکە لەوێدا مزگەوتێکی لێیە. ئەو شەوە هەموو حاجییان لەوێدا دەمێننەوە تا نوێژی بەیانی و بۆ بەیانی دەکەونە ڕێ بەرەوە شەیتان ڕەجمکردن و لەوێدا ٦٣ یان ٨٤ بەردی بچوک کە قەبارەکەی لە نێوانی پاقلە و نۆک دا بێت هەڵدەگرنەوە بۆ ڕەجمکردنی شەیتان، ڕەجمکردنی سێ شەیتانە وەک کورد وای پێدەڵێت، بەڵام لە بنەڕەتدا ناوی (الجمار الثلاث)، تا دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ ئەوکارە ئەنجام ئەدرێت و ڕۆژانە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو جێگاییەی کە لێی دەمێننەوە بەناوی مینا.

ماکوان: ئەی ڕەجمکردنی شەیتان چییە و لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە؟

نومەیر: ئەم جێگایە لە شوێنکدایە کە پێی دەوتریت عەقەبە، واتە ئەو جێگایەیە کە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەگەڵ ئەنساردا کۆبویەوە، شەیتان ئەمەی زۆر پێناخۆش بوو، هیچ کەس لە قووڕەیش ئاگایان لەم کۆبونەوەیە نەبوو، کە شەیتان بەمەی زانی لەسەر تەپۆڵکەیەکەوە هاواری کرد: قووڕەیش فریای محمد بکەون ، ئەگەرنا لەناوتان دەبات! هەڵبەت لە ڕیواتەکاندا هاتووە بە ناوی "موزمیم" پێغەمبەری صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ناوزەد کردووە ئیتر پێغەمبەر لەوێدا بەرد بارانی کرد، بۆ ئەوەی ئەو کۆبونەوەیە ئاشکرا نەکات.

ڕیوایەتی مێژوویی ترمان هەیە لەسەر ئەو باسە ئەویش دەڵێن: ئەوکاتەیە کە شەیتان ویستویەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلی لە فەرمانی خوای پەشیمان بکاتەوە، ئیبراهیم - سەلامی خوای لێبێت- لەو جێگایەدا بەردبارانی کردووە.

ڕیوایەتێکی مێژووی دیکەمان هەیە دەڵێت: شەیتان زۆری پێناخۆشە کە خانەوادە درووست دەبێت، هەمیشە شەیتان حەزی بە هەڵوەشاندنی خێزانە، بۆیە کە ئادەم و حەوا بەیەک گەیشتنەوە، ویستی دیسانەوە وەسوەسەیان بۆ درووست بکات و ئادەم شەیتانی دایە بەر بەرد.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بۆیە حاجیانیش دەڕۆن بەرد بارانی شەیتان دەکەن، پەیمان نوێ دەکەنەوە کە نێوانیان لەگەڵ شەیتان تێک چووە. خۆیان ساغ کردۆتەوە بۆ پەروەردگاریان، جا شەیتان جۆری زۆرە لە ئێستادا واتە نەفی هەموو شەیتانەکان دەکەیت لە پێناوی پەروەردگاردا، ئیتر دوای ڕەجم کردنی شەیتان دەگەڕێنەوە بۆ پشوو لە مینا.

ماکوان: ئەی مینا چییە لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە؟

نومەیر: مینا واتای زۆری هەیە، چوونکە دەکرێت ناو بێت یان کردار بێت یان ئاوەڵناو بێت، یان ئاوەڵ فرمان بێت، بەڵام لەبنەڕەتدا واتەی ئاوات پێ خواستنە، ئەم جێگایە لادێیەکی بچوک بووە لەنزیک شاری مەککە، کە لە ئێستادا بوونی نەماوە هەمووی جێگا چادری ئەو کۆمپانیانەیە کەخەڵکی دەبەن بۆ حەج و جێگای پشوو و حەوانەوەی حاجییانە، سێ ڕۆژ یاخوود چوار ڕۆژ لەو جێگایەدا دەمێننەوە و ڕۆژانە دەڕۆن بۆ شەیتان ڕەجم کردن، لەم جێگایەدا مرۆڤ دەبێت دڵ خۆشبێت و تەنانەت نوێژی سوسنەتیش ناکرێت، نوێژەکان بە قەسر و جەمع دەکرێت. جێگەی یاری و گاڵتەو گەپ و قسەی خۆش و حەوانەوەیە. هاوەڵان و پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەم جێگەیەدا قسەی خۆش و یاری و بە خۆشیی ئەو ڕۆژانەیان بردۆتە سەر.

دواتر کە ئەو سێ ڕۆژە تەواو دەبێت یاخوود هەیە دوو ڕۆژ دەمێننەوە، چوونکە ڕۆژی سێیەم سوونەتە، بەڵام دوو ڕۆژەکەی دیکە فەرزە، دوای ئەوە دەگەڕێنەوە بۆ شاری مەککە و تەوافی (إفاضة) دەکرێت ئیتر هیچ فەرزێک لە ئەرکان و پێداوویستییەکانی حەج نامێنێت و حاجیان حەجیان کردووە.

ماکوان: حیکمەت و فەلسەفەی حەج چییە؟

نومەیر: ئەگەر نوێژ کردن فەرز بێت، ڕۆژوو فەرز بێت، بە هەمان شێوە حەجیش فەرزە، واتە پێوویستە دەبێت مرۆڤ لە کاتێکدا توانای هەیە لەهەموو بووارەکانەوە بۆ حەج کردن دەبێت بڕوات، کەواتە پایەو ئەرکانی ئیسلامە و قسەی تێدانیە کردنی، خوای پەروەردگار دەفەرموویێت:





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ مَّقَامُ إِبۡرَٰهِيمَۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنٗاۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٩٧﴾ [آل عمران]

(لە کەعبەدا) نیشانەو بەڵگەی زۆرو ئاشکرای تیایە، شوێنی تایبەتی خواپەرستی ئیبراهیمی لێیە، ئەوەی بچێتە ناوی لە هەموو دەستدرێژییەک ئەمین و ئاسوودەیە. خوای گەورە لەسەر خەڵکی بڕیاری داوە حەج و سەردانی (بەیت، کەعبە) بەتایبەت ئەوانەی کە توانای (دارایی)یان هەیەو (تەندروستییان باشە)، جا ئەوەی کە باوەڕی نیوە حەق پۆشە، ئەوە با بزانێت کە خوا بێ نیازە لە هەموو خەڵکان ( پێویستی بە چاکە و پەرستنی کەس نییە).

پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت: (بني الإسلام على خمس: شهادة أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله وإقام الصلاة وإيتاء الزكاة وصوم رمضان وحج البيت من استطاع إليه سبيلا)[٣٦]

واتە: ئیسلام لەسەر پێنج بنەما بنیات نراوە:

یەکەم: گەواهی (شەهادەت) أَشْهَدُ أَنْ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا الله وأَشْهَدُ ان محمداً رسول الله

گەواهی ئەدەم کە خوا تاکو تەنهایە و محمد پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خوایە.

دووەم: نوێژکردن.

سێیەم: زەکاتدان (پاک کردنەوەی ماڵ).

چوارەم: ڕۆژوو گرتن.

پێنجەم: سەردانی ماڵی خوا، ئەوەی لە توانای دابێت.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٦] متفق عليه



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بۆیە بە ئایەت و فەرمووده بۆم هێنایەتەوە دەمەوێت بە ڕاشکاوانە بڵێم هەر کەس لەخۆیەوە لە سەر پایەیەکی ئەم ئیسلامە قسە بکات و زیاد و کەمی بکات ئەوە بەدڵنیاییەوە کافرە و لە بازنەی ئیسلامەتی دەچێتە دەرەوە.

ماکوان: کەواتە پێویستە لێرەدا بڵێین، ئەو کەسانەی کەدەڵێن لەسەردەمی ئێمەدا ئەو پارەیە کۆدەکرێتەوە بدرێت بە هەژار و بێدەرەتان، یاخوود بۆ هاوسەرگیری گەنجەکان بەکار بێت وتەیەکی زۆر بێمانایە، بە بەڵگەی ئەوە بێمانایە کە ئەو هەموو داوێنپیسە ڕۆژانە سەفەر دەکەن بۆ وڵاتانی تری دوونیا بۆ سەرسەرییەتی و داوێنپیسی و مەشرووب خواردنەوە، کە دە ئەوەندەی ئەو کەسەی کە حەج دەکات لەماوەیەکی کەمدا سەرف دەکات و کەس جورئەتی نییە پێیان بڵێت ئەو پارەیە بۆ نادەن بە هەژارو هاوسەرگیری لاوەکان؟ یان ئەو هەموو کۆمپانیایەی مەشرووب و مەی خواردنەوەیە چ سوودێکی هەیە؟ ئەی بۆ پارەکەی نادرێت بە هەژار و بێدەرەتان و لاوەکان، یاخوود ئەو هەموو ڕاگەیاندنە بێمانایانەی حیزبەکان کە لە سەروەت و سامانی خەڵکی سەرف دەکرێت بۆ خزمەتی حیزب...هتد.

ئەو هەموو سەروەت و سامانەی کە لەلای مشەخۆرەکان کۆبۆتەوە یاخوود لای بەرپرسەکانە کە شەوانە لەسەر سنگی ئافرەت بە قومار ئەیدۆڕێنن و بە داوێن پیسی خۆیان بەکاری دێنن بۆ کەس باسی ناکات و جورەئەتی نییە بڵێ بیدەن بە هەژار و بێدەرەتان و لاوەکان؟

بێجگە لەو هەموو ڕۆتیناتانەی تر کە ڕۆژانە دەکرێت لە دامودەزگاکاندا تەنانەت لەناو ماڵ و خێزانەکاندا بۆ ئەوانە قسە و کۆمێنتیان نییە؟ تەنها بۆ ئەو کەسانەی کەدەچنە حەج دەبێت دەمتان خوار بکەنەوە، ئابوری وڵات تێکدەچێت، بەڕاستی پێوانەتان دوو مەننە

﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ۝ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكْتَالُوا۟ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ۝ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ۝﴾ [المطففين]

هاوارو ئاهو ناڵە بۆ تەرازووبازەکان، بۆ ئەوانەی کە لەکێشان و پێواندا لەکڕین و فرۆشتندا تەرازوو بازی و فێڵ دەکەن (یان لە هەڵسەنگاندنی خەڵکیدا ڕاست ناڵێن).

ئەوانەی کاتێك شت لە خەڵکی دەکڕن بە تەواوی، بە زیادەوە لێیان وەردەگرن.

بەڵام کاتێك شتیان بۆ دەپێون یان دەکێشن لێی دەدزنەوە و کەمیان دەدەنێ و فێڵیان لێدەکەن.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لێرەدا نموونەی تر زۆرە باسی بکەم، نامەوێت سەرت بەشتی لاوەکییەوە ئازار بدەم، بۆیە دێمە سەر ئەو پرسیارەی کە ئایا حەج سوودی چییە؟

نومەیر: حەج ڕاهێنان و مەشقێکە بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ قیامەت و مردن! ئەوەی لە قیامەت و مردن ڕوو ئەدات تۆ بە ڕاستی و بە چاوی خۆت لە حەج دا دەیبینیت.

چۆن؟

سەرەتا مرۆڤ مەشقێکی مەیدانی دەکات بۆ مردن کە دەچێت بۆ حەج وەک ئەوە وایە نەگەڕێتەوە، وەسیەت دەکات باسی پارە و سەروەت و سامانی دەکات بۆ خێزان و کەسە نزیکەکانی وەک ئەوەی ئیتر ناگەڕێتەوە.

پاشان دەڕوات گەردنی خۆی بە خەڵکی ئازاد دەکات و ئەوەی مافێکی لایبێت هەوڵ ئەدات بیداتەوە، ئایا ئەمە هەوڵێک نییە بۆ گۆڕانکاری و چاکسازی تاک کە دەوڵەتان و وڵاتای ئێستای جیهان بە ملیۆن دۆلار بۆ ئەو چاکسازیی دڵ و دەروون بەکار دێنن کە ناونراوە بە (بیردۆزو مۆدێلێکی ڕەفتاری مرۆڤ و پەیوەندی لەسەر بنەمای تێگەیشتنی زمانەوانی) یان گەشەپێدانی مرۆیی. (N.L.P)

پاشان ڕاستەوخۆ مەشقی مردن دەکات کفن دەکاتە بەری کە ئیحرامە، هیچ بەرنامە و ڕێبازو بیردۆزێک نییە مەشقی کارێک بکات کە مرۆڤەکان حەتمەن دەیچێژن ئەویش مردنە. تەنها ئیسلام نەبێت، ئیسلام دەیەوێت مەشق بە خەڵکی بکات ڕاهێنانیان پێبکات بۆ ئەو پرۆسەیەی کە حەقە.

دوای ئەوە کە مرۆڤ خۆی ئامادەکرد و کفنی کردە بەر بە سروودێکی زۆر سەرسووڕمان دەست پێدەکات و هاوار دەکەن.

لبیک اللهم لبیک لبیک لا شریک لک لبیک، إن الحمد والنعمة لک والملک، لا شریک لک.

واتە: خوای من ڕووە و زاتی پیرۆزت هاتم، هاتم کە دڵنیام لەوەی هیچ هاوبەشێکت نییە، نە لە دەسەڵات و نە لە پەرەستن دا، بەڕاستی سووپاسی نیعمەت و دەسەڵات هەر بۆ زاتی پیرۆزی تۆیە، دووبارەی دەکەمەوە کە هیچ هاوبەش و شەریکێکت نییە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دوای ئەوەی کە دەچیتە کەعبە و ماڵی خوای گەورە دەبینیت، هەست بەسامێکی زۆر دەکەیت، وا هەست دەکەی بەئیمانت ڕووە و خوای گەورە وەستاوی لە ماڵەکەیدا کە شانی لای ڕاستت ڕووت دەکەیت هەست دەکەیت ئەو کاتەیە کە فریشتەکان کفنەکە لەسەر ڕووت لادەبەن و لێپرسینەوەی ناو گۆڕت لەگەڵ دەکەن، بەردەوام لەم کەش و باردۆخی ناو مردنەدا دەژیت و لەگەڵ ئەوەشدا هەست بە ئارامی دڵ و دەروونت دەکەیت.

پاشان قۆناغی دووەم بەرەو قۆناغی مەشق پێکردنی ناو قیامەت و ڕۆژی وەستانە لە گۆڕەپانی مەحشەردا، ئەویش ئەوکاتە دەست پێدەکات کە بەڕۆژانی پێش تەشریق ناسراوە واتە پێش عەرەفە. دیسانەوە ئیحرام دەبەستیتەوە ڕووە و عەرەفات دەکەویتە ڕێ، هەست بەوە دەکەیت کە قیامەتە، ئەو ڕۆژە لەبەر ئەو گەرما ڕووە و خوای مووتەعال ڕاوەستاویت داوا دەکەیت کە خوای گەورە لێت خۆش بێت، ئەو خەڵکە بەرەو موزدەلیفە دەکەونەڕێ بەچاوی خۆت قیامەت دەبینی لەسەر ئەو شاخ و بەرد و خۆڵە ڕووتەڵە، هەموو خەڵکی هیلاک کەوتوون و بێ سەروەت و سامان و بێ هیچ کەرەستەیەک، بێجگە ئیحرامەکەی بەرت هەموو وەک یەکن لە ئەوروپی، ئاسیایی، ئەمریکی، ئەفەریقی، لەسەر ئەو زەوییە و خۆڵە ڕاکشاون و چاوەڕوانی نوێژی بەیانی دەکەن بۆ کەوتنە ڕێ بەرەو شەیتان ڕەجمکردن.

حیکەمەتی شەیتان ڕەجمکردن ئەوەیە کە قیامەتت بۆ دەردەکەوێت، ئەوانەی شوێنکەتووی شەیتان بوون یاخوود شوێن ڕێچکەی شەیتان کەوتبوون، تۆ دەچیت دەیان بوغزێنیت و بەردبارانیان دەکەیت. وەلائی خۆت بۆ خوای مووتەعال دووبارە دەکەیتەوە، کە دەگەڕێیتەوە بەو گەرمایە بەرەو تەوافی ئیفازە دەڕۆیت وەک ئەوە وایە ئەو خەڵکە لە سەفاو مەروەدا بڕۆنە لای پێغەمبەران و داوای شەفاعەتیان لێبکەن، ئەو سێ ڕۆژە هەست دەکەیت چوویتە لای پێغەمبەران (سەلامی خودایان لەسەر).

لەدوای تەوافی خواحافیزی ڕاستەوخۆ دەڕۆیت بۆ شاری مەدینە لە خزمەتی پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ دا لە مەدینەدا دەبیت بۆ ماوەی هەفتەیەک دەچیتە بەهەشت کە لە نێوان ڕەوزەی شەریف و مینبەرەکەیدایە.

ئەمە زۆر بە کورتی بوو لەسەر حیکمەتی حەج و وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی کە کردت.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

گەیشتینەوە نزیکی مەککە بە ئاواتی چوونەوە بۆ لای بوسەینە ئەم قسە و باسانەمان لەگەڵ نومەیردا کرد، کاتێک گەیشتینەوە ناو مەککە نومەیر وتی: دیسانەوە گەورەترین ئاهەنگت بۆ سازدەکەم دەزانم مافم خواردوویت و ئیتر شەوی خۆتە و ماندووت ناکەین.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## گەڕانەوەیەکی چاوەڕواننەکراو

لەگەڕانەوەم بەرەو شاری مەککەی پیرۆز، بەخۆشحاڵییەوە بۆ لای بوسەینە بەئاواتی زاوایەتی و لەهەمان کاتیشدا بەزەیم پێیدا دەهاتەوە دەمووت ئاخر چۆن دەبێت ژن بهێنیت ماوەی ٢٠ ڕۆژ بەجێی بهێڵیت.

هاتمەوە بۆ دەوار، بوسەینە چاوەڕێی دەکردم هەموو گیانی پێدەکەنی، هات بەرەو ڕووم خەریک بوو خۆی بخاتە ژێر ئەسپەکەم، منیش دابەزیم خستمە سەر ئەسپەکەی خۆم، ڕەشمەی ئەسپەکەم گرت بەناو خەڵک و هاوڕێ و دۆستەکانمدا بردم تا گەیاندمەوە دەوارەکە. نانێکی زۆری ئامادە کردبوو دەستکرا بە نان خواردن.

نومەیر هات بۆ لام لە تورەکەیەکی ڕەش دا ملوانکەیەکی گەورەی دەرهێنا و دایمێ وتی: برۆ بیدە بە بوسەینە ئەوە دیاری منە بۆ ئێوە.

چووم کردمە ملی ئینجا چوومە ناو دەوارەکەی خۆمان پاڵم دا بە دۆشەکێکی نەرمەوە، زۆر ماندوو بووم وتم با سەرخەوێک بشکێنم دوایی هەڵدەسم خۆم دەشۆم. بە بوسەینەم وت ماندووم پشوویەک ئەدەم، چاوم چووە خەو خەوێکی خۆشم لێکەوت.

زەنگی مۆبایلەکەم بە ئاگایی هێنامەوە، کە چاوم کردەوە لە ماڵی خۆمان بووم کاتی نوێژی بەیانی بوو لە نەرویج و کتێبەکەی فەرغەلی لە تەنیشتمەوە کەوتبوو هەڵمگرتەوە بە ڕێزەوە دامنا، بەڵام حەپەسابووم نەمدەزانی چیبکەم بەماڵەکەی خۆماندا هەڵدەسوڕام پەردەی پەنجەرەم لا ئەدا دەمووت خوایە بۆ وام لێهاتووە؟ چارەم نەما ناچار زانیم کە گەڕاومەتەوە بۆ زەمانی خۆم، لە وڵاتی نەرویجم لە ماڵی خۆمان، دەستنوێژم گرت و نوێژی بەیانیم کرد. بەزۆر دەمویست خەوم لێبکەوێتەوە، بەڵکوو بگەڕێمەوە بۆ شاری مەککە لەدڵی خۆمدا دەمووت ئاخر بوسەینە چاوەڕێم دەکات چۆن وا دەبێت؟

لەناو جێگاکەمدا وەک ئەوە وابوو بەخاکەناز ئەمدیواودیوم بکەن، خۆم بائەدا خەوم لێنەدەکەوتەوە ڕۆژ شەممەیە ماڵ و منداڵیش لە ماڵی باوکیانن، تا سەعات نۆی بەیانی هەر خەوم لێنەکەوتەوە ناچار تەلەفونم کرد بۆ خێزانم، زۆر بەگەرمی چۆنی و چاکیم لەگەڵ کرد و





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەواڵی ئانا و لین-ی کچمم دەپرسی وەک ئەوەی ماوەیەکی زۆرە جێم هێشتوون، خەریک بوو بڵێم گەورە بوون؟!

باران: ئەوە چییە ئەڵێی دە ساڵە لێت دوورین، بۆ وا هەواڵ دەپرسیت، دوێنی ئێمەت هێنا بۆ ماڵی باوکم! چی بووە کتێبەکەت تەواو نەکرد؟

ماکوان: نەوەڵڵا تەواوم نەکرد، بەڵام چوومەوە بۆئەو زەمەنە ئەم بەیانییە هاتمەوە.

باران: ئەی دەنگو باسی ئەو زەمەنەی تۆی لێبوو چی بوو؟ وا بڕوات ئەو کتێبە شێتت دەکات!

ماکوان: باش بوو، بەڵام بە بێ پرس ژنێکی ترم هێناوە پێم نەوتوویت. بەخوا پێشم خۆش نەبوو، بەڵام هێنام!

باران "بەپێکەنینەوە": ئەوە دەڵێی چی تا دێمەوە دەبێت تەڵاقی بدەیت، ئەی خائین!

دەستم کرد بە پێکەنین وتم: ئاخر خۆ زەمەنی تۆ نییە لەوێ نەبوویت، بڕوا بکە لەوێ بوویتایە نەم دەهێنا.

باران "بەپێکەنینەوە": خائین؛ نابێت ژن بهێنیت لەوێ بم یان لەوێ نەبم.

ماکوان: دەی ئاخر تازە ژنم هێناوە چی بکەم؟

باران: نازانم بڕۆ بگەڕێوە هەرچیت کردووە تەڵاقی بدەو زوو وەرەوە بە شوێن ئێمەدا، شەوێک لە ماڵ نەبووم خێرا چوویت ژنت هێناوە!

خوا حافیزیمان لەگەڵ یەککرد، لە دڵی خۆمدا بیرم لە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ ی ئازیزە دەکردەوە دەفەرمووێت: ئافرەتان شوشەن مامەڵەی جوانیان لەگەڵ بکەن.

ئەو ڕۆژە نەچوومە دەرەوە لەماڵ لەسەر قەنەفەکە پاڵ دەکەوتم، دەچوومە ناو جێگای خۆم ئەوەندەم بەخۆم وتبوو بخەوە، خۆمم لێبوو بەمنداڵ. شوکور ماندووبووم چاوم چووە خەو



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەخۆشی ئەوەی خەوم لێکەوت زوو زوو خەبەرم دەبووەوە، بەڵام ماندوویەتی زۆری بۆ هێنابووم دوای چەند جارێک بەخەبەر هاتن خەوێکی قوڵم لێکەوت، کە چاوم کردەوە دڵخۆش بووم بەوەی گەڕابێتمەوە بۆلای بوسەینە، بەڵام هەر لەماڵی خۆمان بووم.

چوم بەشوێن ماڵ و منداڵا بیانهێنمەوە، کە خێزانم بینی وتی کوا ژنەکەت؟

ماکوان: لە دەوارەکەدا جێمهێشتوە بەتەنهایە لەناو ئەو خەڵکەدا.

باران: ئەوە خۆ دڵی بۆی ئەسوتێ؟! ئەمە کچی کێیە هێناوتە؟

ماکوان "بە پێکەنینەوە": خەڵکی خزمانی لای مەککەیە، بەتەمام سەرێکی قووڕەیشیش درووست بکەم.

باران: ئەمانە نازانم بۆ دوێنێ شەو نەچوویتەوە بۆ ئەوەی تەڵاقی بدەیت؟

ماکوان: وەڵڵا پارەی بلیتم پێنەبوو، بۆیە.

باران: ئەم چیرۆکە چییە دەیخوێنیتەوە؟

ماکوان: چیرۆکی من چیرۆکی کەسێکە کە عاشقی دەریا بوو، بەڵام بەلەمی نەبوو،

ئارەزووی سەفەری بوو، بەڵام هاوسەفەری نەبوو!

چیرۆکی من چیرۆکی کەسێکە کە ئەشکەنجە و ئازاری زۆری بینی، بەڵام هاوار و ناڵەی نەکرد،

گریا بەڵام فرمێسکی نەڕشت!

چیرۆکی من چیرۆکی کەسێکە کە پڕ بوو لە هاوار، بەڵام بێدەنگ بوو بۆ ئەوەی گوێی لە هەموو دەنگەکان بێت.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بۆ خۆشی من و خێزانم ئەم قسانەمان دەکرد، لە پڕ تەلەفونم بۆهات لەلایەن هاوڕێیەکی بەڕێزەوە لە نەرویج، دواى چۆن و چاکی وتی: سبەی شەو لە ماڵی ئێمەی ناونانی کوڕەکەمە و تۆش دەبێت ناوی بنێیت.

ماکوان: خۆشحاڵیم دەربڕی شەو چوومە ئەوێ، دواى ناونانی منداڵەکەی هەندێک قسەم کرد باسی مافی منداڵم کرد بەسەر دایک و باوکەوە، چوونکە لە دانیشتنەکەدا باسی ئەوەم کرد کە هەمیشە باسی مافی دایک و باوک بەسەر منداڵەوە دەکەین، بەڵام ئەمەوێت باسی ئەوەتان بۆ بکەم ئەی مافی منداڵ چییە بەسەر دایک و باوکەوە.

بە سێ خاڵی سەرەکی دەستم پێکرد کە دەبێت دایک و باوکەکە لە هەڵبژاردنیاندا باشتر هەڵبژێرن، واتە پێش درووستکردنی منداڵ دەبێت دایک و باوک چاک و پەسەند بن بۆ یەکتری، تا منداڵەکە لە ژینگەیەکی باشدا پەروەردە ببێت. باسی مافی دووەمم کرد دەبێت ناوێکی جوانی بۆ بدۆزنەوە، هەروەها باسی ئەرکی دایک و باوکم کرد کەدەبێت بیروباوەڕی ئیسلامی فێری منداڵەکانی بکات نەک نوێژ کردن، بەڵکوو گرنگە منداڵی فێری عەقیدە بکەیت لە سەرەتاوە.

باسەکە نزیکەی نیو کاتژمێری خایاند، پیاوێک بەناوی هاوڕێ وتی: کاک ماکوان بێزەحمەت ئەی پێم ناڵێیت مافی ئەو منداڵە چی بووە کە سەربڕێت ناوی ئیسماعیل بوو؟

ماکوان: من نەبیستووە ئەو منداڵە سەربڕێت، ڕوومکردە مەجلیسەکە وتم بێزەحمەت هەواڵی نوێ هەیە بۆ سەربڕینی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم -سەلامی خوا لە هەردووکیان بێت- هیچی نوێ ڕوویداوە من ئاگادار نەبووبێتم؟

مەجلیسەکە دەستیان کرد بە پێکەنین وتیان: نەخیر!

پیاوێک بەناوی کاک ئەحمەد وتی: خوای گەورە بەرانێکی ناردووە بۆ ئەوەی لە جیاتی ئیسماعیل سەری ببڕێت.

ماکوان: کاک هاوڕێ تێگەیشتی کە ئیسماعیل سەرنەبڕاوە، بەڵکوو بەرانێک لەجیاتی ئەو سەربڕاوە؟

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هاوڕێ: کاک ماکوان هەست ناکەیت ئەسڵی کارەکە شتێکی باشە، بەڵام بۆ دەبێت ئەو شتە ڕوویدات؟

ماکوان: ئەم پرسیارە مەعقولترە کە ئاوا بە شێوەی پرسیار ئامێز ڕەخنەکەشت دەگریت؟

هاوڕێ: سووپاست دەکەم ئەگەر وەڵام بدەیتەوە.

ماکوان: بەسەرچاو، لەو سەردەمەدا لەناو عەرەب و خەڵکی حەبەشە و یەمەن وا باوبوو یەکەم منداڵ ئەگەر کوڕ بێت لە پێناوی خوادا منداڵەکەیان بکەنە قوربانی! لەناو ئێرانییەکانی کۆندا منداڵێکیان دەکردە قوربانی و بەئاگر دەیانسووتاند بۆ ئاتەشگەکانیان. لە ناو گەلانی تریشدا باوبووە بە جۆرێک لە جۆرەکان.

ئیبراهیم -سەلامی خوای لێبێت - لە ناو گەلانی دوونیا ناوبانگی دەرکردبوو، بەو هۆکارەی بڵاو ببوویەوە کە لەناو بابلییەکاندا نەسووتاوە لەناوئاگردا هاتۆتە دەرەوە، پاشان لە میسر پاشاکەی هاجەرە خاتوونی دایکی ئیسماعیلی پێشکەش کرد لەبەر ئەوەی مووعجیزەی لێ بینی، هەروەها بە گشتی لە ناو عەرەب ڕێزی زۆر لە ئیبراهیم -سەلامی خوای لێبێت- دەگیرا بەو پێیەی بینای کەعبەی درووست کردبوو. عەرەبیش بۆ حەج کردن دەچوونە ئەو ناوچەیە زۆر بە گەورە تەماشای خانەوادەی ئیبراهیم دەکرا.

پێغەمبەر ئیبراهیم -سەلامی خوای لێبێت- بۆ ئەوەی ئەوکارە قیزەونە نەهێڵێت، هەڵسا بەوەی لە ڕووی مەیدانییەوە خۆی ئەنجامی بدات لە دواييد بەخەڵکی بڵێ خوای گەورە مرۆڤ کوشتن قبوڵ ناکات، بەڵکوو ئەگەر دەتانەوێت قوربانی بکەن پێوویستە سوود بەخەڵکی بگەینن! خوای گەورە فێری کرد کە خەڵکی فێر بکات ئاژەڵ بکەنە قوربانی بۆ ئەوەی مرۆڤەکان سوود وەرگرن، تا خوای گەورە بەرانێکی بەدیاری بۆ نارد بۆ ئەوەی خەڵکی لاسایی پێغەمبەر ئیبراهیم - سەلامی خوای لێبێت- بکەنەوە، چیتر کوڕەکانیان سەر نەبڕن، واتە ئیبراهیم هەڵسا بەنەهێشتنی ئەو کارە.

ڕوونە کاک هاوڕێ؟

هاوڕێ: بەڵێ ڕوونە، ئەی بۆ دەبێت ئاژەڵ بکرێتە قوربانی، ئاژەڵیش گوناحە وایە؟





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: کوڕی باش تۆ لەتەنیشت منەوە بوویت لەسەر سفرە، هەرچی گۆشت بوو بەشی منیش بوو هەموویت خوارد، ئیستا بیانووی چی دەگریت؟ ئەگەر داریش بکرایە بە قوربانی تۆ ئەتوت بۆ ژینگە باش نییە! چوونکە خەڵکێک بەدوای ڕەخنەگرتن دا بێت قسەی لێنابڕێت، بەڵام لەبیرت نەچێت لەگەڵ من پێت ناکرێت. ئەتوانم لە جێگایەکدا بتوەستێنم، کەی وازت لە گۆشت خواردن هێنا ئەوکات ئەو قسە بکە!

هاوڕێیەکمان بەناوی کاک ئەنوەر لەوێدا بوو وتی: کاک ماکوان لەم چەند ڕۆژانە چووین بۆ سوید بۆ گۆشت کڕین لەبەر ئەو نەمانتوانی ئێمە بیکڕین ئەوەندەی کڕیبوو، ترساین گومرک بکرێین و باجمان لێبسێنن!

ئیتر تا مەجلیسەکە تەواو بوو ئەوەندە بە ئاقڵی دانیشتبوو کە ئەیوویست قسە بکات تەماشایەکی منی دەکرد، لە وە دەترسا وەڵامی بدەمەوە. ئەو شەوەمان بردە سەر بەخۆشی و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، چاوەڕوان بووم شەو دیسانەوە بگەڕێمەوە هەوارگەی دنیای ئەولام.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## بێهیوا بوون لە گەڕانەوە!

لەو ماڵەی کە بانگێشت کرابووین بۆ ناونانی منداڵەکەیان لە باسی حەزرەتی ئیبراهیم و سەربڕینی ئیسماعیلی کوڕی - سەلامی خوایان لێبێت- تەواو بووم، گەڕامەوە ماڵەوە خولیای ئەوە کەوتە مێشکم کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من کوڕی دوو سەر بڕاوەکەم، زۆر گەڕام بەدوای سەرچاوەکەدا تەماشام کرد ئیبن عەساکیر لە مێژووی دیمەشق دا باسی کردووە، بەڵام لەڕاستیدا هیچ پەیوەندی نییە بەفەرموودەوە، وەک ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووبێتی: (أنا ابن الذبيحين) من کوڕی دوو سەر بڕاوەکەم، واتە باوکی پێغەمبەر ﷺ ناوی عەبدوڵڵا بووە ویستراوە سەر ببڕێت لەلایەن باپیرییەوە و پاشان پێغەمبەر ئیسماعیل -سەلامی خوای لێبێت- کە باپیری گەورەی پێغەمبەری خوایە ﷺ ویستراوە سەرببڕێت لەلایەن باوکییەوە ئیبراهیم - سەلامی خوای لێبێت- گەڕان بە شوێن ئەم باسانەدا قسەو باسی ناو عەرەب بووە نابێتە فەرموودە، بەڵام ڕاستە کە قسەکە کراوە کێشەکە لەوەدایە کە پێغەمبەر ﷺ نەیفەرمووە، بەڵکوو قسەی خەڵکییە.

من خولیای ئەوە لەمێشکمی دابوو کە ئیبراهیم -سەلامی خوای لێبێت- ئەو کلتورەی نەهێشت چۆن کەسێکی تر دەیەوێت زیندووی بکاتەوە گەورەی هەموو عەرەبە؟

کتێبەکەی فەرغەلیم کردەوە بەدوای ئەوەدا دەگەڕام بۆچی عەبدولموتەڵیب دەیوویست عەبدوڵڵا سەرببڕێت، لەگەڵ ئەوەشدا بە دڵ ئارامییەکی زۆر خۆشەوە دەستم کرد بە خوێندنەوە بە هیوای ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لای بوسەینە، دەستم دایە کتێب و لەخوێندنەوەی ئەوەدا بووم کە ئازارێکی زۆر لەدڵ و دەروونی عەبدولموتەڵیب لە ڕووی مەعنەوییەوە درووست بووە کە تەنها خاوەن یەک کوڕ بوو ئەویش ناوی حارس بوو، لەدوای ئەوەی قووڕەیش دەیوویست ئاوەکەی لێ بسێنن و ببنە شەریک لەگەڵیدا، بۆیە نەزریکرد واتە لەسەر خۆی فەرزی کرد ئەگەر بووە خاوەنی (دە) کوڕ ئەوە یەکێکیان دەکاتە قوربانی و سەری دەبڕێت، خوای گەورە لەدوای زەمەنێکی کورت (دە) کوڕی بەخشییە عەبدولموتەڵیب.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یەکەم: حارس کوڕە گەورەی بوو، باوکی لە ژیاندا بووە ئەو مردووە لە منداڵەکانی (عوف، عبد الله، أبو سفيان، أمية، ربيعة، نوفل، عبد المطلب و أروى)

دووەم : عەبدولمەناف ناسراو بە ئەبوو تاڵیب گەورەی قووڕەیش لەدوای وەفاتی باوکی، لە منداڵەکانی

(طالب، عقيل، جعفر، علي، أم هانئ و جمانة).

سێیەم: ضرار، پێش هاتنی پێغەمبەرایەتی محمد صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ مردووە.

چوارەم: زوبیر کە لە شاعیرە ناودارەکانی قووڕەیش بوو پێش هاتنی پێغەمبەرایەتی محمد صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ مردووە،

منداڵەکانی ناویان (طاهر، عبد الله، حجل، قرة وضباعة).

پێنجەم: عبدولعز ناسراو بە ئەبوو لەهەب لە دوای شەڕی بەدر بە نەخۆشی بەکافری مرد، منداڵەکانی ناویان (عتبة، عتيبة، معتب و درة).

شەشەم: موسعەب ناسرا بوو بە (الغيداق) هیچ منداڵی نەبووە.

حەوتەم: مقوم منداڵەکانی ناویان (عبد الله، بكر وهند).

هەشتەم: قثم کە بە منداڵی مردووە.

نۆیەم: موغیرە ناسراو لەقەبی بە (بِحِجْل) منداڵی نەبووە.

دەیەم: عەبدوڵلا کە تەنها محمد صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ی هەبووە.

یانزەیەم: عەباس منداڵەکانی (فضل، عبدالله، عبيدالله، قثم، معبد، عبد الرحمن، كثير، حارث، تمام، أم حبيب، صفية وآمنة).

دوانزەیەم: حمزة ناسراو بە شێری خوا (أسد الله) لە جەنگی ئوحوود شەهید بوو، منداڵەکانی (يعلى، عمارة، عامر و فاطمة).



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کچەکانی عەبدولموتەڵیب:

یەکەم: دایکی حەکیم کە نەنکی عوسمانی کوڕی عەفانە لە دایکەوە.

دووەم: عاتیکە منداڵەکانی عەبدوڵلا بن ئەبی ئوومەیە[٣٧].

سێیەم: بڕە بنت عەبدولموتەڵیب[٣٨]، منداڵەکانی ئەبوو سەلەمە بن عەبدولئەسەد مەخزوومی.[٣٩] چوارەم: ئومەیمە[٣٠]، منداڵەکانی عەبدوڵلا بن جەحش[٣١]

پێنجەم: ئەروی، منداڵەکانی تولەیب بن عەمرو.[٣٢]

شەشەم: سەفییە، منداڵەکانی زوبێر بن عەوام.[٣٣]

لەدوای ئەوەی کە (دە) کوڕی بۆ دەمێنێتەوە، بڕیار ئەدات کە ئیتر نەزرەکەی کردوویەتی بیهێنێتە دی، ئەویش ئەوەیە دەبێت کوڕێکی سەرببڕێت. یەکێک لە کاهینەکانی مەککە زارێک لە ناو پەرداخ یاخوود کوپێکدا هەڵئەدات ناوی عەبدوڵلا دەردەچیت، باوکیشی ناچار عەبدوڵلا دەبات چەقۆ تیژ دەکات لە نزیک کەعبەدا پاڵی دەخات بۆ سەر بڕین، بەپەلە خەڵکی قووڕەیش لێی کۆدەبنەوە و بەزۆر و پاڵ پێوەنان عەبدوڵلای کوڕی لە ژێر دەستی دەردێنن و دەڵێن دەتوانیت فیدییەکەی بدەیت و لە لایەن کاهینی بەنی سەعدەوە فیدەییەکەیت دەخاتە سەر وشتر.

دەچنە لای کاهینی بەنی سەعد و لەوێدا (دە) جار ناوی عەبدوڵلا دەردەچیت، کە دەبێت (دە) جار هەڵبژاردن بکرێت لە نێوان کوڕەکانیدا کامیان زۆر دەرچوو ئەوکەسە دەکرێتە قوربانی و پاشان لەبریدا (دە) وشتر دەکرێتە قوربانی یاخوود فیدییە، هەر دە جارەکە عەبدوڵلا

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٧] عبدالله بن أبي أمية
[٣٨] برة بنت عبد المطلب
[٣٩] أبو سلمة بن عبد الأسد المخزومي
[٣٠] أميمة
[٣١] أم المؤمنين زينب بنت جحش
[٣٢] طُلَيْب بن عمرو
[٣٣] الزبير بن العوام


WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەردەچێت و (١٠٠) وشتر دەکاتە فیدییەی عەبدوڵلا ی کوڕی تا لەو چەرمە سەرییە عەبدوڵلای کوڕی سەرفراز دەبێت و لێی دەردەچێت.

عەبدوڵلا لە ژیانیدا خەریکی بازرگانی بووە، باوکی لە ناو شاری مەدینەدا داخوازی کچێک دەکات بۆ کوڕەکەی کە ناوی ئامینەی کچی وەهەبە، هەردوو بنەماڵەکە نزیکی یەکن و ئەوان لە بەنی نەجاڕن و عەبدوڵلایش بەنی هاشم کە هەردوو تیرەکە لە قووڕەیشن.

ژیانی عەبدوڵلا هەروەکوو کەسێکی ئاسایی بووە، خێزانیشی ئامینەی کچی پیاوێکی ناوداری مەدینە بووە وەهەب کوڕی عەبدولمەناف، هەر دوو خانەوادە کە ناودار و بەڕێزی ناو عەرەب بوون.

عەبدوڵلا لە نێوان شام و مەککەدا تەنها سەرقاڵی بازرگانی بووە نوێنەری قووڕەیش بووە بۆ بازرگانی لە نێوانی غەززە و شام دا، لە تەمەنی ٢٠ ساڵییەوە تا تەمەنی ٢٥ ساڵی لەو کارە بەردەوام دەبێت، کۆتا سەفەری بۆ شاری غەزە دەبێت و بە سەروەت و سامانی قووڕەیشەوە، وەک وەزیری ئابوری قووڕەیش مامەڵەی لەگەڵدا کراوە. هەر ئەو ساڵە خێزانی ئامینە خانی کچی وەهەب سکی پڕ دەبێت بە شەریفترین مەخلوق و خۆشەوسترین مرۆڤ لەسەر زەویدا کە محمد صَلَّىٰاللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ-ە پێغەمبەری کۆتا زەمانە، عەبدوڵلا بەدڵخۆشی دەڕوات بۆ بازرگانییەکە تا لە گەڕانەوەیدا دیاری جوان بۆ خێزان و منداڵەکەیان بهێنێتەوە لەگەڕانەوەیدا لە شاری مەدینە نەخۆش دەکەوێت و لەوێ دەمێنێتەوە بە هیوای چاکبوونەوە کاروانەکەی قووڕەیش دەنێرێتەوە بۆ شاری مەککە و خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام نزیکەی مانگێک ماڵی خاڵوانی لە شاری مەدینە بە نەخۆشییەکەیەوە دەمێنێتەوە لە و لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەڵیب دەمرێت، هەر لەوێدا لە گۆڕستانی تایبەت بە بەنی نەجاڕ دەینێژن کە ناسراوە بە (دار النابغة). ئەو کاتەی ئەو وەفات دەکات خاتوو ئامینە سکی بە پێغەمبەر صَلَّىٰاللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ پڕ دەبێت، تەمەنی سکەکەی دوو مانگ و دوو هەفتەیە.

لەدوای خۆی وەک میرات پێنج وشتر و ڕانێک مەڕ و خزمەتکارێکی ئافرەتی حەبەشی کە ناسراوە بە دایکی ئەیمەن بۆ پێغەمبەرصَلَّىٰاللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ بەجێ دەهێڵێت.

ئەو شەوە سەرقاڵ بووم بە خوێندنەوەی کتێبەکەی فەرغەلییەوە دەموویست بگەڕێمەوە بۆ ئەو سەردەمە، بەڵام دیار بوو هەرچی سەرم بەرز دەکردەوە هەر لە وڵاتی نەرویج لەماڵی




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

خۆمان بووم، چارم نەما ناچار سەرم بەرز کردەوە بیرم لەوە دەکردەوە باشە من ئافرەتێکم بە جێهیشتووە لەو خاک و خۆڵەدا ئایا خەڵکی ئێستا چی بە من بڵێت. لەدڵی خۆمدا دەمووت دەبێت ئەو کەسانە کە لەوێن حورمەتی بگرن هاوکاری بکەن؟ خۆ من لەدەسەڵاتی خۆمدا نییە کە بەجێم هیشتووە حەق نییە لۆمە بکرێم.

خێزانم دەنگی بەرز کردەوە وتی: ماکوان ئەوە لەگەڵ کێ قسە دەکەیت؟

ماکوان: لەگەڵ خۆم!

باران: وەڵڵا هەر ئەمەمان مابوو، ئەی بۆ نایەیت قسە بۆ من بکەیت؟

ماکوان: واهاتم؛ بیر لەوە دەکەمەوە چۆن بگەڕێمەوە بۆ سەردەمی جاهیلی عەرەب؟

باران: ناشێت هەر بیرت لای ئەو نەبێت؟

ماکوان: بیریشی لێبکەمەوە هیچ دەسەڵاتم نییە، نە سەردەمی من و تۆیە و نە جێگاکەشی هەر من و تۆ خاوەنی نین.

باران "بەپێکەنینەوە": بەم قسانە هەڵم مەخڵەتێنە ناخوات، خێرا بگەڕێرەوە تەڵاقی بدە.

ماکوان: هیچ ڕێگا چارەیەکم نەماوە بۆ ڕۆیشتن نازانم چۆن بگەڕێمەوە؟

باران: بۆ تەلەفونێک ناکەیت بۆ فەرغەلی لە میسر، بەڵکوو ئەو بتوانێت هاوکاریت بکات

ماکوان: ئاخر ئەو لەو سەردەمەدا مردووە.

باران: جا کێ ئەڵێت لەم سەردەمەدا مردووە.

ماکوان: وەڵڵا خۆ بیرۆکەیەکی باشە، چەند سەعاتمان فەرقە لەگەڵ میسر؟

باران: جیاوازییمان نییە.

ماکوان: وەڵڵا باشە، با خێرا تەلەفونێک بکەم.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

تەلەفونم کرد کەسێک وەڵامی تەلەفۆنەکەی دامەوە کوڕی فەرغەلی بوو، داوام کرد لەگەڵ فەرغەلی دا قسە بکەم، بەڵام وتی بەداخەوە ماوەی مانگێکە کۆچی دوایی کردووە.

پرسیم ئەتوانم لەگەڵ عەزیز قسە بکەم، یاخوود ژمارەی تەلەفۆنی هەیە؟

ژمارەکەی عەزیزم وەرگرت، لەدوای داخستنەوەی تەلەفۆنەکە ڕاستەوخۆ تەلەفۆنم بۆ عەزیز کرد

وەڵامی دایەوە یەکسەر وتی (ئەیوە)!

ماکوان: ئەمەوێت لەگەڵ نومەیری باوکت قسە بکەم.

عەزیز: باوکم چۆن دەناسیت؟

ماکوان: ئاشنایەتیەکمان هەیە، تکایە یان تەلەفونەکەی بۆ بەرە یاخوود ژمارەکەی خۆیمم بدەرێ؟

عەزیز: پەلە مەکە ئێستا دەچمە لای لەدەرەوەی دوکانەکە دانیشتووە.

قسەم لەگەڵ نومەیردا کرد، وتم من دەناسیتەوە؟

ئەویش وا قسەی لەگەڵ دا دەکردم کە لە ژیانیدا منی نەدیوە!

ئیتر بێ هیوا بووم لەوەی کە نامناسێتەوە، ناچار تەلەفۆنەکەم داخستەوەو داوای لێبووردنم لێ کرد و پێم وت ببورە وام زانی دەمناسیت.

عەزیز وای زانی دەمەوێت بچمەوە بۆ میسر بەدوای شوقەدا دەگەڕێم، وتی ئەگەر شوقەت دەوێت من بۆت پەیدا دەکەم، باوکم ئەو شتانە نازانێت.

ماکوان: ناسووپاس هەر حەزم کرد هەواڵێکتان بپرسم.

باران: کەسیانت دەست کەوت؟

ماکوان: نا بێ هیوا بووم.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

باران "بەپێکەنینەوە": باشە ئەو چاکتر، نەجاتمان بوو بەدەستیانەوە.

پاش کەمێک لە قسەکانمان تەلەفۆنم بۆ هاتەوە لە میسرەوە، نومەیر بوو!

ماکوان من تۆ باش دەناسم هەر ئەو نومەیرەم کە لە زەمەنی جاهیلی دا بەیەکەوەین، بەڵام حەزم نەکرد هەندێ کەس بەو نهێنییانە بزانێت تا دوکانمان داخست و ئێستا دەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم.

ماکوان: ئەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ ئەو زەمەنە چی بکەم؟





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەتەواوەتی بێ هیوا بووم لە گەڕانەوە بۆ سەردەمی جاهیلییەتی عەرەب، ناچار تەلەفونم کرد بۆ نومەیر لە میسر. ئەویش سەرەتا نائومێدی کردم، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم تەلەفونی بۆ کردمەوە و پێی ڕاگەیاندم کە دەتوانم بگەڕێمەوە، بەڵام گرنگە ئەو پرنسیپە بپارێزم کە هۆکاری گەڕانەوەمە بۆ ئەو سەردەمە.

ڕێگاکەش کە نیشانی دام بۆ گەڕانەوە بەم شێوەیە بوو:

نومەیر: بە پشتی بەرگی کتێبەکەی فەرغەلی-یەوە شتێک نووسراوە ئەوە بخوێنەرەوە و پاشان بڕۆ سەر ئەو جێگایەی کە تۆم تێدا بەجێ هێشتووە هەوڵ بدە بەیانی پێنج شەممەیە بەڕۆژوو بەو لە دوای بەربانگ دەست بکە بەخوێندنەوەی.

زۆر دەست خۆشیم لە نومەیر کرد، ماڵئاوایمان لەیەک کرد بە هیوای بینینەوە لە خاکی مەککەی پیرۆز لە جێگاو شوێنی خۆماندا.

بۆ ڕۆژی دواتر بەڕۆژوو بووم، دوای بەربانگ و نوێژی عیشا دەستمکرد بە خوێندنەوەی کتێبەکەی فەرغەلی چوومە سەر ئەو باسەی کە عەبدوڵڵای باوکی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ وەفات دەکات.

لەکاتی خوێندنەوەی بابەتەکەدا بووم لە پڕ ڕۆشنایيەکی زۆر چاوەکانی پێداخستم، چاوم نابەیەکدا و کە بەرزم کردەوە لە بەر خۆر و گەرماییەکی زۆردا بووم کە گەرماکەی ئەوەندە زۆر بوو بەپەلە خۆم گەیاندە بەر سێبەرێکی تاوێرە بەردێک لە بناری شاخێکی وشک و برینگدا.

هەندیک بەدەوری خۆمدا هەڵخولام بەڵکوو شوێن و جێگایەکی ئاوەدانی بەدی بکەم تا ڕووە ئەو جێگایە مل بنێم، بەڵام گەرماکەی سووتێنەر بوو هەرچیم دەکرد جورئەتی ڕێکردنم نەبوو، چوونکە نە ئاوم پێبوو نەهیچ توێشویەک.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لە دوورەوە قافڵەیەکم بەدی کرد کە ڕووەو لای تاوێرە بەردەکە دەهات منیش مامەوە تا ئەو کاروانە گەیشتە لام.

کاتێک کە نزیک بوونەوە منیش هەڵسامە سەرپێ ڕووە و لای کاروانەکە بەڕێکەوتم دوو ئەسپ سواریان هاتنە لام و شمشێریان بەدەستەوە بوو، بەڵام زانیان من هیچم پێنیە بێجگە کتێبێک و جلەکانیشم سەیر و سەمەرە بوو لای ئەوان، چوونکە هەر لێم ورد دەبوونەوە بردمیانە لای کەسێک ناوی سولەیمان بوو.

سولەیمان: چی دەکەیت بۆ لێرە بە تەنهایت وخەڵکی کوێیت؟

ماکوان: ڕێگام لێ هەڵە بووە و خەڵکی دەشتی شامم و بنەڕەتم لە کوردە و بازرگانم، هاتوچۆی شاری مەککە و شام دەکەم، شەریکم هەیە ناوی نومەیەرە و دەوارمان لە نزیک شاری مەککەیە.

کەوام وت سولەیمان زۆر ڕێزی لێگرتم کەمێک ئاوی دامێ منیش سووپاسم کرد.

سولەیمان: ئێمە دەچین بۆ شام چەند شەو و ڕۆژێکمان ماوە پێت خۆشە لەگەڵمان بێیت؟ دوایی ئەتگەڕێنینەوە بۆ مەککە بۆ لای کاروانەکەتان و نومەیر، چوونکە نومەیر هاوڕێ و دۆستی منە.

ماکوان: سووپاستان دەکەم لوتف دەنوێنن هاوکاریم بکەن..

سولەیمان بردمی بۆ لای گەورەی کاروانەکە کە تەماشام کرد عەبدولموتەڵیبە، باپیری پێغەمبەری خوا ﷺ، خۆم ناسیمەوە بەڵام ئەو یەکسەر وتی ئەمە گەورەی قووڕەیشە و سەروەر و گەورەی ئێمەیە.

منیش لە خۆشەوویستی ئەوەی کە باپیری پێغەمبەر و ناویم لە سیرەدا بیستووە، پێشتریش لەگەڵ نومەیردا بینیبووم زۆر بەگەرمی ویستم تەوقەی لەگەڵ بکەم، دەستم خستە ناودەستی بە توندی گوشیم و زۆر ئیحترامم بۆ دەربڕی دیاربوو ئەویش خۆشحاڵ بوو بە ڕێزەکەی من.

لەکاتی قسەکردندا بووم لەگەڵ جەنابی عەبدولموتەڵیب لە پڕ چەند پیاوێکی تر لە نزیک سێبەرەکەی ئێمە هاتن لەگەڵ سولەیمان و عەبدولموتەڵیب وەستان، جەنابی عەبدولمەتەڵیب




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەستی کرد بە قسەکردن و وتی: ماوەی چەند ڕۆژێکمان ماوە بۆ غەززە ئێستا لە بوسرا دوورکەوتوینەتەوە و نزیکی دەریای مردووین.

لەو نێوەندە دا سێ بازرگان و بەخۆی سەرپەرشتی ئەو کاروانەیان دەکرد ئەوانیش"عەبدولمەتەڵیب، سولەیمانی کوڕی موجاشە، حوەیحەی کوڕی حەلاج و حەمرائی کوڕی ڕەبیعە"

لەگەڵ هەر چواریان تەعاروفم کردو بەرەو شاری غەززە کەوتینە ڕێ، لەڕێگادا عەبدولمەتەڵیب باسی سووپای حەبەشەی دەکرد، بە ناڕەحەتییەکیشەوە باسی ئەوەی دەکرد کە عەبدوڵڵای کوڕی وەفاتی کردووە لە شاری یەسریب.

لەماوەی دیاری کراودا کە دانرابوو گەشتینە غەززە و جلوبەرگیان بۆ من کڕی، داوام لێکرا کە ئیدارەو سەرمەشقی ١٥ بۆ ٢٠ وشتر بکەم، ئەسپێکیان دامێ و منیش بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە قبوڵم کرد، لە ناوشاری غەزەدا لەگەڵ ئەو چوار پیاوەی قووڕەیش دەگەڕام، زۆر ڕێزیان لەمن گرت دیار بوو دەیانزانی نومەیر کێیە.

لەناو بازاڕی شاری غەززەدا دەسووڕاینەوە کەسێکی ڕیش درێژی یەهوودی هاتە لای عەبدولمەتەڵیب و سولەیمان پێی وتن:

ئێوە خەڵکی وڵاتی نەجدن؟

ئەوانیش هەموو وتیان: بەڵێ!

کەسەکە یەکێک بوو لە گەورە پیاوانی یەهوود و حبرێک بوو لە حیبرەکانی یەهوود،

ڕوویکردە عەبدولمەتەڵیب و سولەیمانی کوڕی موجاشە پێی وتن: بەم نزیکانە پێغەمبەرێک لە وڵاتی ئێوە دەردەچێت ناوی (محمد) دەبێت.

بۆ یەکەم جار گوێیان لە ناوی وا دەبێت، پێشتر لە ناو عەرەبدا کەسێک نەبووە بەناوی (محمد).

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

زۆر قسەکەیان بەهەند وەرنەگرت، بەڵام ئاگام لێیان بوو هەریەک لەوان وتیان ئەگەر منداڵمان بوو ناوی دەنێین (محمد)، دوای ئەوە بۆم دەرکەوت کە باپیری سلێمانی کوڕی موجاشە شاعیرێکی گەورەی عەرەبە لە موعەلەقات بەناوی (فەرزدەق).

گەڕاینەوە بەرەو مەککە تاگەیشتینەوە شاری مەککە لە نزیک شاری مەککە وشترەکانم لەگەڵ ئەسپەکەدا تەسلیم بە کاروانەکە کردەوە سووپاسم کردن، بەڵام ئەسپەکەی دایەوە خۆم، منیش بەپەلە بۆ بن دەواری خۆمان ڕێگام گرت تا بگەمە لای بوسەینە، کە نزیک بوومەوە هەموو چاوەڕێیان دەکردم نومەیر بەرەو ڕووم هات و باوەشم پێداکرد و خۆشحاڵی خۆمم دەربڕی و لەگەڵ هەموو دۆستان و بەتایبەت لەگەڵ عەبدوڵلا و سەعد دا زۆر بەگەرمی و قسەی خۆشمان کردو هەواڵی بوسەینەم پرسی بۆ دیار نییە؟

نومەیر: چۆتەوە بۆ سەردانی ماڵی باوکی لەوێیە، بەیانی دەچین دەیهێنینەوە.

ماکوان: زۆر باشە، ئەو شەوە باسی سەفەرەکەم کرد لەگەڵ عەبدولمەتەڵیب، بەخۆشحاڵییەوە بردمانە سەر، بۆ بەیانییەکەی ئەسپەکەی خۆم و ئەو ئەسپەشی بە دیاری وەرمگرتبوو لە کاروانەکە دا بردم بۆ ئەوەی بوسەینە بهێنمەوە، عەبدوڵلا و سەعد هەردووکیان لەگەڵمدا هاتن و بەرەو ماڵی فەزلی ڕۆشتین تا گەیشتمە نزیکیان هاوارم کرد بوسەینە! بەڵام کەس دەنگی نەبوو.

چوومە ناو دەوارەکە کەسی تێدا نەبوو، وا هەستم کرد لە لەوەڕاندنی ڕانەکەنیان بن.

ماوەیەک ماینەوە تا فەزلی و خێزانەکەی هاتنەوە، بەڵام بوسەینەم بەدی نەدەکرد لەگەڵیان دا کە گەیشتنە لامان خێرا وتم کوا بوسەینە؟

هیچیان وەڵامیان نەدامەوە بەرەو ڕووی فەزلی چووم ئێخەیم گرت، وتم کوا بوسەینە؟

دایکی دەستی کرد بە گریان وتی: هەردوو کچەکەم لەلایەن چەتەکانەوە ڕفێنران، دەستی ڕاکێشا بۆلای تەپۆڵکەیەک، وتی بوسەینە بە خەنجەری یەکێکیان خۆی کوشتووە، ئەوە گۆڕەکەیەتی.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بڕوام نەکرد وتم درۆ دەکەن ڕووم کردە سەعد و عەبدوڵڵا وتم ئاوا حورمەتی من دەپارێزن؟ چۆن ئاگاتان لێی نەبووە بەو دەردە ڕۆشتووە؟

کەس وەڵامی نەدامەوە منیش بە ئەسپایی و دڵ پڕییەوە بەرەو سەرگڵکۆکەی ڕۆیشتم و لەسەر گۆڕەکەی دانیشتم و زۆر بەزەیم پێدا هاتەوە، نەمدەزانی داوای چی بۆ بکەم، بەڵام لەدڵی خۆمدا دام نابوو کە بەهەشتییە بەو پێیەی کە ئەهلی (فەترەیە)و تا ئێستا ئیسلام نەهاتووە.

لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆیەکی گەرم لەسەر گۆڕەکەی دانیشتم، تا دایکی بوسەینە هاتە لام بەدەم گریانەوە ئاوی بۆ هێنام، داوای لێکردم کە لەبەر گەرماکەدا لاچم و بچمە دەوارەکەیان، بەڵام عەبدوڵڵا و سەعد بە پەلە هاتن بۆ لام وتیان: نومەیر بانگت دەکات و دەڵێت بەپەلە بگەڕێتەوە بۆ مەککە، سووپایەک ڕووی کردۆتە ئەو شارە و دەیەوێت داگیری بکات بۆ ئەوەی بەزووترین کات شتوومەک و کەرەستەکانمان کۆبکەینەوە و بیانکەینە کاروانێک و بیدەین بەو شاخ و هەردە دا.

ماکوان: سووپای چی؟

سەعد: ئەبرەهە!

ماکوان: جا ئەوە ترسی ناوێت، هەمووومان و نومەیریش دەزانێت کە خوای گەورە لە ناویان دەبات بە سەربازانێکی خۆی کە باڵندەی ئەبابیلیان پێدەوترێت.

سەعد: ڕاستە، بەڵام نومەیر دەیەوێت کە تۆ بە چاوی خۆت ببینی.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## لەدایکبوونی نوور

بەپەلە گەڕامەوە بۆ شاری مەککە بۆ لای نومەیر بیینم شاری مەککە کەسی تێدا نەماوە، هەموو ڕایانکردۆتە سەر شاخەکانی دەورو پشتی مەککە!

زۆر جێگای تێڕامان بوو بەلامەوە، خەڵکی ئەو شارە بەرگری لە ماڵ و سەروەت و سامانی خۆی ناکات و تەنانەت بەرگری لەماڵی خواش ناکات، هەمووی ڕادەکات و خۆی دەپارێزێت. دوایی وتم گرنگ نییە سەردەمی جاهیلییەتە.

هەموو چووینە سەر شاخەکان و لە نزیک شاری مەککە لە نێوانی تائیف و مەککەدا سووپاکە هات، من دەمزانی هیچ ڕوونادات خوای گەورە بە سەربازانێک کە یەکێکن لە لاوازترین درووستکراوەکانی پەروەردگار لە ناویان دەبات.

چوومە لای نومەیر لەسەر شاخی قوبەیس لەمەککە وەستا بووم، باڵندە وەک پەڵە هەورێکی ڕەش لەدوورەوە بەدی دەکرا تا نزیکتر دەبووەوە ڕەنگی تۆختر دەبوو.

لەسەر سووپاکەی ئەبرەهە دابارینە خوارەوە بە قاچیان وردە بەردێکی بچوک فڕێ ئەدرایە خوارەوە، بەر هەرکامێکیان دەکەوت هاوار و قیژەی ئەسپ و وشتر و لورەی فیلەکانیان دەگەیشتە ئاسمان.

دیمەنێکی زۆر ترسناک بوو، خەڵکی قووڕەیش ئەوەیان بینی بەچاوی خۆیان، بەڵام هەموو ڕەنگی مردوو لەناوچاویان نیشتبوو، ئەو سووپایە بەتەواوەتی توانەوە و داڕزان بەناخی زەویدا و هیچ وجودێکیان نەما، وەک چۆن تێزاب دەکەیت بە شتێکدا و دەیتوێنێتەوە بەو شێوەیە دەتوانەوە لەگەڵ خاکدا تێکەڵ دەبوون.

لەساتە وەختێکی کەمدا کۆتاییان پێهات، منیش دیمەنەکەم زۆر لا ترسناک بوو بۆیە هەر سوورەتی (فیل)م دەخوێند.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ ۝﴾

ئایا نەتبینی (ئەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ) پەروەردگارت چی کرد بە خاوەن فیلەکان؟!

﴿أَلَمۡ يَجۡعَلۡ كَيۡدَهُمۡ فِي تَضۡلِيلٖ ۝﴾

ئایا سەری لێ نەشیواندن و پیلان و نەخشەکانیانی پووچ نەکردەوە؟!

﴿وَأَرۡسَلَ عَلَيۡهِمۡ طَيۡرًا أَبَابِيلَ ۝﴾

پۆل پۆل باڵندەی نەناردە سەریان؟!

﴿تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٖ مِّن سِجِّيلٖ ۝﴾

تا بە بەردی سەنگ گڵ، بەرد بارانیان بکەن.

﴿فَجَعَلَهُمۡ كَعَصۡفٖ مَّأۡكُولِۭ ۝﴾ [الفيل]

سەرەنجام وەکو پووش و پەڵاش و گژوگیای خوراوی لێ کردن.

لەدوای ئەم ڕووداوە خەڵکی مەککە زۆر لوت بەرز بوون دەست درێژییان دەکردە سەر هەموو تیرە و هۆزەکانی عەرەب، بەپێچەوانەشەوە لەناو عەرەب دا زۆر خۆشەوویست و مووبارەک تەماشایان دەکرا، بەهۆکاری ئەوەی خوای گەورە ئەو سووپایەی لەناوبرد بڵاو بوویەوە کە مەککە ئەمین و پارێزراوە لەلایەن پەروەردگاری کەعبەوە.

بەڵام لەوکاتەوە بۆم دەرکەوت ئەوە بەتەنها مەککە نییە خوای گەورە دەیپارێزێت، بەڵکوو ئەوە کەسێکە وا لە ڕەحمی ئافرەتێکدا، کە ناوی ئامینەیە، ئەو منداڵەی سکی، دەبێت ئەمین



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بێت، لەشارێکدا کە بەناوی ئەمن و ئاسایش ناوی دەرکردوە (البلد الامین) خۆشی لەداهاتوودا دەبێتە (الصادق الامین).

بەدەم خۆمەوە ئەم قسەم دەکرد، نومەیر تەماشای دەکردم لە پڕ وتی ئەوە بەچییەوە سەرقاڵی؟

ماکوان: هەندێک شتم بۆ دەرکەوت جەنابی نومەیر کە پێشتر نەمدەزانی، ئەویش نەمدەزانی هەر دوو سوورەتی فیل و قووڕەیش بۆچی بەیەکەوە دابەزیوون، بەڵام ئێستا تێگەیشتم کە هەردووکیان تەواوکەری مێژوو چیرۆکی پێش هاتنی سەروەری مرۆڤایەتی محمد ﷺ، زۆر جار وامدەزانی باسی دوو ڕووداوە تەنها بۆ بیرخستنەوەی دەسەڵات و گەورەیی خوای پەروەردگارە، بەڵام ئێستا تێگەیشتم کە هەتا زیاتر سەردەم و ژیان بەرەو پێشتر بڕوات تێدەگەین ئەگەر دوژمنی خوا گەورەترین هێز بەکار بهێنێت، خوای گەورە بە بچوکترین هێز لەناوی دەبات!

نومەیر: وتەکانت ڕوون نییە زیاتر ڕوونی بکەرەوە.

ماکوان: تەماشای ئەو (فیل)انە بکە، زیاد لە ١٣ (فیل)م بژارد وە تەماشای ئەو چۆلەکانەش بکە بەئاسمانەوەن. خوای گەورە فیل و هاوڕێی فیلەکانی بە لاوازترین لەچاو ئەواندا لەناوبردن و هەموویان بوونە پووش و پەڵاش بەوناوەدا، بیریشم لەوە دەکردەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجا ڕۆژی تر لەدوای ئەم ڕووداوە لە دایک دەبێت. هەموو ئەمانە مێشکی منیان سەرقاڵ کردووە و کەوتومەتە بیرکردنەوەیەکی چڕو پڕەوە.

ئیتر لەوەوە تێگەیشتم کە خوای پەروەردگار دەیەوێت پەیام بدات بە هەموو عەرەب و جیهانیان، خوای پەروەردگار کە خوای محمد-ە ﷺ ئەو سوپایەی لەناو بردووە، نەک بتەکان و پەیکەرەکانتان بەناوی لات و مەنات و...هتد ، ئیتر بزانن کە خوای گەورە بەهەمان شێوە پشتوو پەنای محمد-ە ﷺ هەمان خوای تەیروئەبابیلە.

پاشان ڕۆژەکانم دەژمارد، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەچوومە بەردەرگای ماڵی عەبدولمەتەڵیب بەس بۆ ئەوەی بزانم کەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەدایک دەبێت.



پەنجا ڕۆژم ژمارد لەدوای ڕووداوەکانی سووپای ئەبرەهە بە فیلەکانیەوە، بۆ بەیانییەکەی خۆم ئامادەکرد بچمە بەردەرگای ماڵی دایکی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرانبەر ماڵی عبدولموتەڵیب بوو هەرچۆن بووە ببینم شەوەکەی زۆر بە خۆشحاڵییەوە خەوتم، چاوەڕێی کازێوەی بەرەبەیانم دەکرد بۆ ئەوەی زوو بچمە ناو بازاڕی شاری مەککە و لەوێیەوە چاوم بە نوور بکەوێت، چاوم بە بەڕێزترین و بەشەرەفترین کەس بکەوێت، یەکەم کەسە دەچێتە ناو بەهەشت و خاوەنی حەوزی کەوسەرە، کە کوفر دەسڕێتەوە و هەڵبژێردراوی خوای پەروەردگارە.

بەو ئومێدەوە خەوم لێکەوت!

کەسێک واخەبەرم دەکاتەوە لەخەوهەڵمدەسنێت، چاوم کردووە تەماشام کرد خێزانمە دەڵێت: هەستە کاتی نوێژی بەیانییە.

نەمهێشت کەس بزانێت بەدەم گریانەوە چووم بۆ دەستنوێژ گرتن، ئەو بەیانییە ئەوەندە گریام تا هەردوو چاوەکانم ئاوسا بوون، وەک ئەو ڕۆژە دەهاتەوە بیرم کە باوکم بە خاک سپێدرا. چارم نییە هەموو ڕۆژەکە بێزار بووم لەکار گەڕامەوە بۆ ماڵەوە بەئومێدی ئەوەی جارێکی تر کتێبەکەی فەرغەلی بخوێنمەوە بگەڕێمەوە بۆ ئەو سەردەمە چوومە سەر ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەدایک دەبێت، هەندێک باس کرابوو کە بۆ یەکەم جار لە مێژووی ساسانی و ئاگرپەرستەکانی زەردەشتی دا بە لەدایکبوونی محمد ﷺ ئاگرەکە دەکوژێتەوە. بەلەدایک بوونی هیچ ئازار و ناڕەحەتییەکی نەبووە بۆ دایکی، لەکاتی هاتنە دنیایدا بەدەستەکانی لە داوێنی دایکی هاتۆتە دەرەوە سەری بەرز بەرەو ئاسمان، خەتەنە کراو، بەزەردەخەنەوە لەدایک بووە، نەگریاوە. هەرچەندە گەورەیی پێغەمبەر ﷺ لەو وەسفانەیدا نییە، بەڵکوو لە پەیامەکەیدایە کە قورئان و ئیسلامە.

ئامینە خاتوونی دایکی دەگێڕێتەوە: "کاتێک هەستیکرد بەوەی سکی پڕە بەپێغەمبەر ﷺ نوورێک لە لاشەمەوەی دەرچوو هەموو باڵەخانەکانی بووسرای لەشام ڕووناک کردەوە"، هەروەها دەگێڕێتەوە: "ئەو شەوەی لە کاتی لەدایکبوونی محمد ﷺ چەند ئافرەتێکی لەگەڵدا بوون وەک مامان مانەوە بەلایەوە، لەوانە دایکی عوسمانی کوڕی عاس و دایکی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، ئەو دووانە دەڵێن ئەو شەوە ئاسمان پڕبوو لە نوور ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوامان دەبینی".



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەواڵ ئەدرێتە عەبدولمەتەڵیبی باپیری دەست بەجێ داوای دەکات، دەیباتە ناو ژووری کەعبە و وەک گەورەییەک و شەرەفێک کە بلکێت بە پێغەمبەری خواوە ﷺ، تا ئەو کاتە بۆ منداڵی کەس وا نەکرابوو ببرێتە ناو کەعبە.

پاش ئەوەی کە (محمد)ی بردە ناو کەعبەوە زۆر نزاو پاڕانەوەی لە پەروەردگار کرد و لە کۆتاییدا کە هاتە دەرەوە وتی: ئەوە ناوم نا محمد ﷺ، خەڵک پرسییان محمد واتای چییە؟

ئەویش لەوەڵامدا وتی مانای سووپاسکراوە، دەمەوێت لە ئاسمان سووپاسی خوا بکات و لەسەر زەویش خەڵکی سوپاسی بکات.

بە بیستنی هەواڵی لەدایکبوونی محمد ﷺ زۆریک لەمامەکانی لە خۆشیدا بەندە ئازاد دەکەن، لەوانە ئەبوو لەهەب بەندەیەک ئازاد دەکات، لەو سەردەمەشدا ئازادکردنی بەندە وەک مووژدانە وابووە تەنها پیاوانی گەورە کردوویانە یاخوود بۆ شتی زۆر گەورە و دڵخۆشکەر ئەوکارە ئەنجام دراوە.

عەبدولمەتەڵیب خۆی دەگێڕیتەوە دەڵێت: "پیش لەدایکبوونی محمدی کوڕی عەبدوڵڵا خەونم بینی؛ لە خەونەکەمدا درەختێکی بەرز سەری بۆ ئاسمان بڵند کردبوو پەل و پۆشی بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوادا هاوێشت بوو، ئەمبینی عەرەب و عەجەم سووجدەیان بۆ دەبرد، هەرچەندە خەڵکی زیادی بکردایە ئەو زیاتر نوورو درەخشانی درەوشاوە تر دەبوو زیاتر پەل و پۆی دەهاویشت. بەردەوام دەڵێت: لە خەونەکەمدا بینینم خەڵکی قووڕەیش خۆیان هەڵواسیبوو بە لقەکانیدا بۆ ئەوەی هەریەکە و لقێک بۆ خۆی بەرێت، ویستم منیش وابکەم و خۆم بە لقێکیدا هەڵبواسم، بەڵام گەنجێک پێشمکەوت و شوێنەکەمی گرت٠ لە ژیانمدا جوان خاسی وەک ئەوگەنجە و بۆنخۆشی وەک ئەو لاوە جوان خاسەم نەدیبوو، بەردەوام لە گێڕانەوەی خەوەکەیدا دەڵێت: ویستم منیش بەشم بەربکەوێت، بەڵام نەیانهێشت من پشکی خۆم بەرم ئیتر بەدڵتەنگی و ناڕەحەتییەوە خەبەرم بووەوە.

ئەم خەونەم گێڕایەوە بۆ کەسێکی حەکیم لە خەون، ڕاڤەی خەونەکەی بۆ کردم بەوەی کە لەنەوەکانی من کەسێکی تێدا دەردەچێت هەموو ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، خەڵکی گویڕایەڵی دەبێت".





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

حسانی کوڕی سابت دەگێڕێتەوە: "منداڵ بووم تەمەنم ٧ساڵان بوو جوولەکەکان هاواریان لێهەڵسا وتیان ئەوە ئەستێرەکەی ئەحمەد دەرکەوت، هاواریان دەکرد لەشاری مەدینە کە ئەحمەد لە دایک بوو".

بە لەدایک بوونی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئازادی دەستی پێکرد.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

وەکوو شێت و هار بەدوای ئەوەدا دەگەڕام کە بگەڕێمەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام هەرچیم دەکرد نە دەگەڕامەوە، زۆر عاشقانە کتێبەکەی فەرغەلی-م دەخوێندەوە، بەڵام بێ سوود بوو.

ئەوەی کە بەدیم کرد لە کتێبەکەی فەرغەلی دا ئەوە بوو وای لێ تێگەیشتم وەکوو ئاماژە بە من بدات بڵێت هەوڵمەدە بۆ گەڕانەوەت ئەوە بەدەست تۆ نییە، بەڵکوو ئەو کاتە دەگەڕێیتەوە کە پێویست بکات، چوونکە لێرە بەدواوە زەمەن و سەردەمی منداڵی پێغەمبەرە ﷺ، ئەوەندە باسەکانی خێرا نین و هیچ ئاماژەیەکی پەروەردگاری و گرنگ نییە تا بگەڕێیتەوە بەچاوی خۆت ڕەوش و کەش و بارەکە ببینیت. ڕاستە هەندێک ڕووداو ڕووئەدات بە لەدایکبوونی، بەڵام خوێندنەوەت بۆی گرنگترە نەک چوونت. واهەستم دەکرد لەجیاتی ئەوەی من کتێبەکەی فەرغەلی بخوێنمەوە ڕێک پێچەوانەکەی بوو، کتێبەکە منی دەخوێندەوە ئامۆژگاری دەکردم، دەمووت باشە دەبێت کتێبێک هەبێت ئاوا بتخوێنێتەوە؟

بەردەوام بووم لە خوێندنەوەی ئەو کتێبە ناوازەی فەرغەلی، چاوم چەشنی عەشقێک لەسەر وشەکان بەرز نەدەکردەوە، هەستم دەکرد ئەم کتێبە وشە و دێڕەکانی بە سەعات تەواو نابێت و لەگەڵیشدا چەند دێڕێکە بەڵام جیهانێک مانام ئەداتێ، کاتێک ڕستەیەک تەواو دەکەم، بیابانێک زانیاریم نیشان ئەدات. هەرچی دەمەوێت بڕۆمەوە سەری دێڕ بۆ باسێکی نوێ نووسینەکان وەکوو نوورێک دوای خۆی دەسڕێتەوە، بە نوور وشەی ترم بۆ دەنووسێت، ئەو شەوە تەنها بە لاپەڕەیەکەوە سەرقاڵ بووم هەر تەواو نەبووم.

چوومە سەردێڕێک نووسرابو شۆڕشێک لە ئاسمان و شۆڕشێک لە زەوی، کە ئەو سەردێڕەم بینی زیاتر تەشوویق بووم بۆ خوێندنەوە، سەراپا هەموو گیانم جۆش و خرۆشی ئەدا بۆ ئەو شۆڕشە.

لە پڕ چاوم کەوت بەوەی کە لەمەودوا دەرگای ئاسمانەکان داخران، ئیتر هیچ شەیتان و جنۆکەی ساحیرەکان ناتوانن بە ئاسماندا هاتوچۆ بکەن، هەموو دەرگاکان داخراون، خوای گەورە



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بە نێزەک ئەدات لێیان و هەموو ئەوانەی کە لەبوارەکانی جادووبازی کاردەکەن و دەستیان تێکەڵە لەگەڵ شەیتانەکان حەیران مابوون، هیچکام لە حەکیم و دانشمەندانی ئەو جادووبازانە نەیاندەزانی چی ڕوویداوە! هەواڵیان بۆ نەدەهات، جنۆکەی شەیتانەکان کە دەڕۆشتن هەواڵ بهێننەوە بە سووتاوی دەکەوتنەوە سەر زەوی یاخوود لەناو دەچون و دەمردن. ئەو شەوە هەرچی شەیتان و جن و جادووبازەکان بوون دەگەڕان بزانن چی ڕوویداوە؟

ئیبلیس بەدوای ئەوەدا دەگەڕا بزانێت نەوامیس و یاساکانی ئەم کەونە بۆ گۆڕاوە؟!

لەپڕ هاوار هەڵسا لە ئاسمانەکانەوە نەیزەک باران بوو شەوق و زەوقی جیهان و ئەم کەونە زیاتر دەگەشایەوە، منیش لەخۆشەوویستی لەدایکبوونی ئەو سەروەرە بەرقییەکم لەدڵی خۆمەوە نارد و وتم:

نامەیەکی کراوە لە دڵی ماکوانەوە ...

ساڵەها بوو زەوی لەحەسرەتی بارانێکی ژیانبەخش دا دەسووتا..

دەرمانی تینووێتی و ڕەش و تاریکی خۆی لەئاسمان چاوەڕێ دەکرد ..

ساڵەها بوو کە زەوی ببووە بیابانێکی وشکی بیرو باوەڕی جاهیلی و قوڕاوی خورافیات..

لەناکاو لەشەوێکی هەرگیز لە بیر نەکراودا بارانی ڕەحمەتی ئیلاهی دەستی بە بارین کرد..

زەوی تینووی تێر ئاو کرد ..

گوڵێکی جوان بەناوی محمد مصطفی ﷺ لە بیابانی حیجازدا شکۆفا.

بەڵێ بە لەدایکبوونی ئەو ﷺ بیابانی جەهل و خورافات بووە بووستانی میهرەبانی و گۆڕا بۆ بیرکردنەوە.

ئەوە پەیامهێنەری ئیلاهییە، لەشاری پیرۆزی مەککە لە خانەوادەیەکی خواناس دا لە دایک بوو.

لەشەوی ١٢ی ڕەبیعولئەوەل لەدایک بوو .





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

جیهانی بە وجوودی خۆی منەوەر کرد و مەدینەکەشی هەر منەوەر کرد.

ئەو شەوە لە ئاسمانی مەککەدا ئەستێرە باران بوو ..

دانیشتوانی عەرشی مەلەکوت بۆ بەخشینی ئەمانەتەکەیان هەموو هاتبوونە سەر زەوی..

هەر لەو کاتەدا بوو پایەکانی کۆشکی کیسرا ڕووخا و ئاتەشگەی زەردەشتی فارسی کوژایەوە..

بۆ ئەم لەدایکبوونەت شەیتانەکان و تاغوتەکان ڕایانکرد..

بتەکانی جاهیلی یەک لە دوای یەک ڕووخان..

نوری ئیمان لەسەرانسەری جیهاندا دەدرەوشایەوە..

پەیامی ئیسلام لەدڵەکانەوە جێگای خۆی کردەوە، مرۆڤایەتی لە چنگی زوڵم و جەهل ڕزگاری بوو..

ئەم شەو لەو یادەدا ئاسمانەکان و زەوی نوور بارانە ..

ئەوانەی لە چواردەوری عەرشدان لەشەوقی گوڵ لەسەر لێویان پێکەنین و شادی و خۆشییە، زەوی گوڵ باران دەکەن..

هەوا پڕ لە بۆنی عەتر و (بوغورد).

شاری مەککە میلادی کۆتا سەفیری ئیلاهی ڕەسولی حەق و ڕەحمەت یاد دەکاتەوە..

ئەو کە نگینی[٣٤] پێغەمبەرانە لەناو ئەو هەموو عەتر و نوورەدا خوداوەند چەپکێک گوڵی بەخشییە ئامینە..

زەمین و فەلەک غەرقی خۆشی و شادی بوون..

---

[٣٤] ـ ئاوێنە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فریشتەکان فەوج فەوج بۆ پیرۆزبایی دەهاتنە سەر زەوی..

منیش دڵخۆشم بە میلادی مووبارەکی گوڵە بۆنخۆشەکەی ئامینە..

ڕێگای درەوشاوە و نوور بەخشی دیدەی هەموو گەردوون و خاکیان..

بەهەموو ئێوەی ئازیز پیرۆز دەڵێم.. ئەمە نامەکەی دڵمە.

خۆشم دەوێیت پێغەمبەر گیان صلى الله عليه وعلى آله وسلم.

ئەوەندە گریام لە خۆشەوویستی لە دایکبوونی، دەمزانی جەهالەت چۆن درێژکراوەی ئەو زەمەنەیە بۆ ئێستاشمان، تاکە چارەسەر تەنها دەستگرتنە بە ڕێگاو تەریقەتی سوونەتی بۆن خۆشی ئەو.

بەڵێ کتێبەکەی فەرغەلی پێم دەڵێت: محمد لەدایک بوو، لە ڕۆژی دووشەمەی مانگی چواری ساڵی ٥٧١ زایینی.

لەخۆشی لە دایک بوونی ئافرەتێکی کۆیلە بەناوی (ثويبة الأسلمية) خزمەتکاری ماڵی ئەبوو لەهەب بوو ئازاد کرا، لەوکاتەدا لەلایەن ئامینە دایکی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەواڵ برا بۆ ئەبوو لەهەب کە ئامینە هاوسەری عەبدوڵڵای برای کوڕێکی بووە، ئەبوو لەهەبیش لەخۆشەوویستی محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئەو ئافرەتەی ئازاد کرد، هەر ئەو هۆکارەشە کە ئەبوو لەهەب هەموو دووشەممەیەک سزای لەسەر هەڵدەگیرێ، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە خوای پەروەردگار بۆ خۆشەوویستی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەرچی بکرێت ئەگەر کافریش بێت خوای پەروەردگار پاداشتی ئەداتەوە.

خۆشەوویستمان بە چاودێری خوای پەروەردگار گەشەی دەکرد..

﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ۝﴾ [الضحى]

مەگەر پەروەردگارت نەیبینیت بەهەتیوویی و خێرا دەرووی لێ کردیتەوە و لانەی بۆ سازاندیت؟!

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەهۆکاری ئەوەی شاری مەککە دۆڵێکی دوور لە سەوزایی و هەوا پەنگی تێدا دەخواردەوە لە کاتەکانی حەج دا، ئەو دەمەش سەردەمی جاهیلیەتی عەرەب بوو، لە مانگە حەرامکراوەکاندا حەجیان دەکرد و شاری مەککە زۆر قەرەباڵغی ڕووی تێدەکرد، گەورە و خانەدانەکانی قووڕەیش منداڵەکانیان ئەدا بەناوچەکانی دەورووبەری مەککە وەکوو هەوازن و سەقیف...هتد . ئەم ناوچانە دوور بوون لە شاری مەککەوە بۆ ئەوەی منداڵەکانیان بەجوانی و لەهەوایەکی ساف دا پەروەردەبن، ئافرەتانی هەوازن زیاتر ناسرا بوون بە زمانپاراوی عەرەبی بۆیە ساڵانە دەهاتن بۆ ئەوەی منداڵی خانەدانەکانی قووڕەیش هەڵبگرنەوە وەکوو دایەن بۆ ماوەیەک شیریان بدەنێ و لە ئاووهەوایەکی سازگاردا بە بڕە پارەیەک بۆیان پەروەردە بکەن، لەو سەردەمەدا نەنگی بوو ئەگەر ئەوماڵانەی ئەوکارە دەکەن خانەدانەکانی قووڕەیش مناڵیان پێنەدانایە، بەچاوێکی کەم تەماشا دەکران کە ئەو خانەوادانە بەباشی کارەکەی خۆیان ئەنجام نادەن بۆیە مناڵیان نادەنێ.

ماڵێک هەبوون لەناو هۆزی هەوازن دا بە بنەماڵەی سەعدی کوڕی بەکر ناسرابوون، بەناوی حەلیمە کچی ئەبی زوئەیب، باوکی ناوی عەبدوڵڵای کوڕی حارسی کوڕی جەشنەیە (حليمة بنت أبي ذؤيب)، ناوی أبي ذؤيب (عبد الله بن الحارث بن شجنة) هاوسەرەکەی ناوی حارسی کوڕی عەبدولعزی-یە (حارث بن عبد العزى) ساڵێکی زۆر بێ دەرامەتی بوو بۆ ئەو خێزانە، ناچار ساڵی وەرگرتنی منداڵ بوو بڕیاریان دا ئەوانیش منداڵێک لەبنەماڵە خانەدانەکانی قووڕەیش بهێنن تا بتوانن پارەیەکیان چنگ بکەوێت، بۆ ئەو مەبەستە هاتن بەرەو شاری مەککە.

زۆڕ گەڕان منداڵیان دەست نەکەوت بەهۆکاری ئەوەی ئەوان درەنگ گەیشتنە ناو شاری مەککە و وشتر یاخوود وڵاخی باشیان نەبوو تا زوو بگەنە ناوشار، خەڵکی هاوپیشەکانیان زووتر گەیشتبوون زۆربەی منداڵە دەوڵەمەندەکانیان بردبوو، ئەو دەمەش وا باوبوو کە منداڵی هەتیوو کەم هەڵدەگیرایەوە بەهۆکاری ئەوەی کە بێ باوکە و پێناچێت پارەیەکی باشیان پێ بدەن، ئەوانیش کەهاتنە ناوشار و منداڵەکان هەموو درابوون بە خەڵکانی تر محمد ﷺ تاکە منداڵێک بوو کە مابووەوە، ئەم خێزانە بۆ سومعە و بۆ ئەوەی نەڵێن منداڵیان دەست نەکەوتوە ناچار بوون کە بچنە لای عەبدوملەتەڵیب و بەناچاری وتیان لەوانەشە خێرێکمان دەست بکەوێت، با بیبەین تا لە ناو دۆست و خزمانماندا تانەمان لێنەدرێت بۆیە (محمد) یان برد، ئەگەرچی پارەشیان وەرگرت وەکوو هەموو خێزانەکانی تر، بەڵام هەر نابەدڵ بوون، چوونکە منداڵی بێ باوک کەمتر ڕەواجی پێدەدرا لەلایەن ئەو خێزانانەوە کە شیریان ئەدا بە منداڵەکان.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

حەلیمە دەگێڕێتەوە دەڵێت: کە (محمد)م ﷺ نا بەسنگمەوە بۆ ئەوەی شیر بخوات هەستم بە ئارامی کرد، سنگم پڕبوو لەشیرو بەرەکەتێکی گەورە لە سینەمەوە بۆ شیردان سەرچاوەی گرتبوو.

هەر خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێت: لەو ساتە وەختەوەی کە ئەو منداڵەمان هەڵگرتووە هەموو شتێک گۆڕا، تەنانەت تاکە بزنێکمان هەبوو بۆ شیردان بۆ خواردنەوەی خۆمان ئەوەندە شیری ئەدا کە زۆر لە جاران زیاتربوو لەبەشی خۆشمان لێی دەمایەوە بێجگە لەوەی کە ڕۆژ بەڕۆژ ژیان و ماڵ و داهاتیان زیاتر بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە مایەوە، دایکی سەردانی دەکرد، چەند جارێ دەیهێنایەوە بۆ شاری مەککە بۆ بینینی کەسووکاری، لەدوای تەواو بوونی دوو ساڵ لە شیردانی حەلیمە گەڕاندییەوە بۆ لای دایکی، بەڵام ئەوەندەی خۆش دەویست، زۆر هەستی بە بەرەکەت و مووبارەکیەکی زۆری ئەم منداڵە دەکرد بۆیە جارێکی تر داوای کردەوە کە (محمد) ﷺ لای بمێنێتەوە زیاتر ئاگاداری بێت تا بەجوانی زمانی عەرەبی ئەو ناوچەیە وەردەگرێت، لایان مایەوە تا گەیشتنی بە تەمەنی ٤ ساڵی توانای یاری کردن و چوونەدەرەوە و ڕاکردنی هەبوو لەگەڵ منداڵانی تردا.

ئیبنوو عەباس دەگێڕیتەوە کە خوشکی شیریی پێغەمبەری خوا ﷺ بەناوی شەیما دەگێڕێتەوە بۆ دایکی حەلیمەی سەعدیە دەڵێت: "لەکاتی گەرمایی نیوەڕۆدا بوو بینیم هەورێک سێبەری کردبوو بۆ (محمد ) ﷺ" دایکیشی دەیگێڕتەوە بۆ هاوسەرەکەی و هاوسەرەکەشی دەڵێت: "ئەم کوڕە کەسێکی ئاسایی نییە، بەڵکوو لەشان و شەوکەتییەوە دیارە لە ئێستاوە کە کەسێکی گەورەیە"!

ماوەی مانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو جێگایە چەند ڕایەکی جیاوازی لەسەرە، بەڵام من ئەو ڕایەم لا پەسەندترە کە دەڵێت تا تەمەنی پێنج ساڵی لەوێ ماوەتەوە.

ئەوەمان بیر نەچێت کە پێغەمبەر ﷺ لە منداڵیدا لە خۆشەوویستی ئەوەی کە بە هەتیوی لە دایک ببوو باوکیشی پیاوێکی بەڕێز و خاوەن پێگە و جوانخاسی شاری مەککە بوو، ئامینەی دایکیشی لە خانەدانی بەنی نەجار بوو زۆر خۆشەوویست بوو لە ناو شاری



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

مەککە، هەر ئەوە بووە هۆکاری ئەوەی کە پێغەمبەر زۆرێک لە ئافرەتانی مەککە شیریان داوەتێ.

لە تەمەنی منداڵیدا پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ یاری دەکات، لە پڕ منداڵان لەدەوری (محمد) صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ رادەکەن و هەواڵ دەهێننەوە بۆ حەلیمە کە دوو کەس هاتن و سکی (محمد) یان بە چەقۆ هەڵدڕی!

حەلیمەش بەڕاکردن دەڕوات بۆ لای (محمد) صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بزانیت چی ڕوویداوە لێیدەپرسێت بۆ وا ڕەنگت تێک چووە؟

دیارە ڕەنگی دەموچاوی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ زەرد ببوو، ترس و بیمی پێوە دیار بووە، لە جێگای خۆیدا دانیشتبوو تا حەلیمەی دایکی شیری چووەتە لای و لەوەڵامدا (محمد) صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: دوو کەس هاتن و سکیان هەڵدڕیم و قاپێکی ئاڵتوونیان پێبوو، وتیان ئەوە دڵتە دەریان هێناو پاک شۆردیان، بەشێکیان لێدەرهێنا و فڕێیان دا وتیان ئەوە بەشی شەیتانە، دوایی دڵمیان خستەوە جێگای خۆی و سکیان بۆ دووریمەوە.

حەلیمە تەماشای سکی کرد پێوەی دیار بوو کە سکی دووراوەتەوە، تا کۆتایی تەمەنی پیغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بە سنگ و سکیەوە دیار بوو کە دووراوەتەوە!

کە ئەم ڕووداوە ڕوویدا لەترسا گەڕاندیانەوە بۆ لای دایکی، حەلیمە و هاوسەرەکەی لەوە ترسان کە شتێکی بەسەر بێت، ڕووداوەکە بۆ دایکی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەگێڕنەوە، ئامینە خاتوون بەدڵنیایەوە پێ وتن دڵنیابن خوای گەورە دەیپارێزێت!

دوای ئەوەی کە گەڕایەوە بۆ لای دایکی، زۆربەی کات لەلای عەبدولموتەڵیبی باپیری بوو، لەگەڵ خۆیدا دەیگێڕا بەناو شاری مەککەدا لە مەجلیسەکاندا لەگەڵیدا بوو، بۆهەموو مەجلیسی پیاوە گەورە و خانەدانەکانی قووڕەیش دەیبرد، هیچ کەس نەیدەتوانی لەسەر جێگای باپیری پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دابنیشێت، کەس لە کوڕەکانیشی تاکە کەسێک کە لەجێگاکەیدا دادەنیشت پێغەمبەری خوا بوو صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، بە سەرسووڕمانەوە لێی دەپرسن چۆن دەهێڵیت ئەو منداڵە لەجێگاکەتدا دابنیشێت؟




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت: ئەم کوڕەم، یاخوود ئەم نەوەیەم هەموو ڕۆژهەڵات دەخاتە ژێر دەستی و شانوشەوکەتی زۆر بەهێز و گەورە دیارە، لەبەر ئەوە گەورەیی ئەو لە جێگاکەی من گەورەترە.

ئامینەی دایکی ویستی بیبات بۆ مەدینە، لەوەدابووم بیخوێنمەوە باسەکەی کە دایکی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پێکەوە بچن بۆ مەدینە خەوم لێکەوت بەسەر کتێبەکەی فەرغەلی-یەوە، زۆر ماندووبوم بەخوێندنەوەیەوە، چوونکە نووسینەکانی وەکوو گەردەلولێک وابوو لەسەر لاپەڕەکانی بەجوانی وشەکان لوولیان دەخوارد لەهەمان لاپەڕەدا هەر ڕستەیەکم دەخوێندەوە لادەچوو ڕستەیەکی تری نیشان ئەدام، نازانم چەندە خەوتم؟ بەڵام چاوم کردەوە لە باخێکی خۆشدا لەبن دارخورمایەکدا پاڵ کەتبووم.

هەستم بە تینویەتی زۆر دەکرد بەدوای ئاودا گەڕام بیخۆمەوە، جۆگەلەیەکی ئاوم بەدی کرد دیار بوو سەرچاوەیەکی جوان و پاکی هەبوو، بەدوای سەرچاوەکەدا گەڕام بۆ شۆردنی دەموچاوم و تێر ئاویش بخۆمەوە، دڵ خۆش بووم زانیم گەڕاومەتەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، بەڵام نەمدەزانی لە کوێم.

هەستم دەکرد لە دێیەکەدام گوێم لە دەنگی گریانی منداڵێک بوو لەگەڵ ژنێکدا کە هەر دەیووت دایکە تۆش بگەڕێوە لەگەڵماندا!

لەدوورەوە تەماشام دەکردن، هەستم دەکرد چاڵێک پڕ دەکەنەوە منداڵەکە دەگریا و ژنەکەش لەگەڵی دەگریا، وتم با لەخۆمەوە نەچمە پێشەوە نەوەکوو تووشی کێشەیەک ببم.

گریانی منداڵەکە زۆر ئازاری ئەدام کە هاواری دەکرد دایکە وەرە بابگەڕێینەوە بۆ شاری مەککە.

کەنزیک بوومەوە دەستی منداڵەکەی گرت و ڕۆشتن. چەند کەسێکم بەدیکرد لێم پرسین من لە کوێم؟ ڕێبوارم و ڕێگام هەڵە کردووە.

لە وەڵامدا وتیان تۆ لە جێگایەکدای ناوی ( الأبواء) نزیکە لەشاری یەسریب، ئینجا زانیم ئەو منداڵە پێغەمبەری خوا بوو صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەو چاڵەش گۆڕی دایکی بوو، ئەو ئافرەتەش دایکی ئەیمەن بوو!

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەپەلە ڕامکرد تا پێیان بگەمەوە دەمزانی دەگەڕێنەوە بەرەو شاری مەککە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## لەگەڵ پێغەمبەر لە شاری مەککە و کوچەو کۆڵانەکانی دا

لەدوای ئەوەی کە چوومە ئەو جێگایەی کە منداڵەکە دەگریا و هاواری دەکرد دایکە بابڕۆینەوە بۆ شاری مەککە، بۆم دەرکەوت کە ئەو منداڵە پێغەمبەری خوایە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، چوومە ئەو جێگایەی لێی وەستابوون تەماشام کرد گۆڕێکە بۆم دەرکەوت دڵنیابوومەوە ئەوە گۆڕی دایکی پێغەمبەری خوایە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، لەسەر گۆڕەکە دانیشتم و بیرم لەوە کردەوە کە ئەم ڕووداوەم بە دەرس وتۆتەوە، خۆم هاتەوە بیرم کە پێغەمبەری خوا بۆ سەردانی گۆڕی باوکی دەچێت بۆ ماڵە خاڵوانی بۆ یەکەم جار لە شاری مەدینە، کەچی لەو شوێنەدا دایکی لەدەست ئەدات و دەگەڕێتەوە بۆ شاری مەککە. لە سەر گۆڕەکە هەڵسام تا شوێن ئەو ئافرەتە بکەوم کە منداڵەکەی پێیە، دڵنیابووم ئەو منداڵە پێغەمبەرە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەو ئافرەتەش ناوی ئوم ئەیمەنە، چوونکە دەمزانی کە ئەوان دەمبەنەوە ناو شاری مەککە دەگەمەوە بە نومەیر.

لەسەر گۆڕەکە هەڵسام کەوتمە شوێن ئەو منداڵ و ئافرەتەکە لە دوورەوە بەدیم دەکردن وەکوو ڕەشاییەک نەمدەویست لێم ون بن، شوێنیان کەوتم لە ڕێگادا زۆر ماندوو دەبووم، هەرکات لێیان نزیک بوومایەتەوە خۆم دەهێشتەوە بۆ ئەوەی هەر لەدوورەوە بەدوایاندا بڕۆم.

لەهەر شوێن و دەوارێکدا کە دەمبینی لام ئەدا، پارەی نومەیرم پێبوو شیر و ئاوم دەکڕی.

ئاواتەخواز بووم بەوەی بگەم بەو منداڵە، دەمزانی پێغەمبەری خوایە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، چ هەستێکی خۆش و جوانم هەبوو لەخۆشیاندا بە جێ پێی منداڵەکەدا دەڕۆشتم، زۆر جار وام لێدەهات دەمووت دەچمە خزمەتی دەستەکان و چاوە فرمێسکاوییەکانی ماچ دەکەم.

دەمزانی چەند ماندووە فرمێسک بەچاویدا دەهاتەوە خوارەوە بێ دایک و بێ باوک، داخۆ ئەم منداڵە کە بەشەرەفترین مەخلوقی سەرزەوییە چەندە ماندووە؟

دەمزانی هەرچی فریشتە و تەنانەت خوای گەورەش چاودێریمان دەکات، دەمزانی چ بەرەکەتێکی خوا دێتە خوارەوە بەسەرماندا و لەبەر خاتری ئەو منداڵە هەر ڕۆشتم لەدوای شەش ڕۆژ ڕێکردن گەیشتینەوە ناو شاری مەککە، لە دوورەوە بینیم پێغەمبەری خوا



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نەچووەوە بۆ ماڵی خۆیان، چوونکە پێشتر لە شاری مەککە ماڵەکەیانم دەزانی، ڕاستەوخۆ دەستی ئوم ئەیمەنی بەرداو ڕۆیشتە ماڵی باپیری و باوەشی کرد بە باپیردا و بەگریانەوە ئەگریا باپیریشی خیرا کردیە باوەش و وتی ئوم ئەیمەن چی ڕوویداوە؟

ئوم ئەیمەن: دایکی محمد خاتوو ئامینە وەفاتی کرد!

عەبدولمەتەڵیب کردییە باوەش و چەند جار ماچی کرد وتی: قەینا کوڕی خۆم هەر ماچی دەکرد دەی وت قەینا کوڕی خۆم!

ئیتر بینیم چۆن خۆشەویستی هەموولا بۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فوارەی دەکرد، ماندوو بوو بردیان ئیسراحەت بکات، لە چاوی من ون بوو گەڕامەوە بۆ ئەو دەوارەی لە نزیک شاری مەککە هەڵماندابوو لەوێ عەبدوڵلا و سەعدم بینی هەواڵی نومەیرم پرسی وتیان بۆ هێنانی کەرسەتە چووە بۆ شام.

ڕۆژان گوزەری دەکرد عەبدوڵلا هات بۆ لام وتی: ماکوان  بۆ ژن ناهێنیت؟

ماکوان: ژنم هەیە پێویستم نییە.

عەبدوڵلا: کەی ژنت هێناوەتەوە؟

بیرم کەوتەوە کە مەبەستی ژنی خۆم نییە لەو زەمەنەی کە خۆم تێیدا دەژیم، بیرم کەوتەوە مەبەستی بوسەینەیە کە کوژراوە، لەدوای ئەوە لەو زەمەنە کە زەمەنی قووڕەیشە دەبوو ژن بێنیەتەوە، وتم بیرم لێنەکردۆتەوە.

عەبدوڵلا: بۆ ناچیت لە بازاڕ جاریەیەک بکڕیت خۆ تۆ پارەداریت با وەکوو خێزانت لەگەڵتا بژی.

ماکوان: ئاخر من ئارەزووم نییە بەوەی ژن بکڕم بە پارە و بە جاریەی خۆم بەکاری بهێنم، ژنهێنان عەشق و خۆشەویستییە عەبدوڵلا



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

عەبدوڵلا: ئەی گوناحن ئەو جاریانە، بە کۆمەڵ دەیانکڕن لە شار و وڵاتەکانی ترەوە دەیانهێنن، ئەوانیش حەزدەکەن ڕزگاریان بێت لەو قەفەسانە، خۆ تۆ ئەگەر بیکڕیت گەورەیی تۆ دەردەخات ئەوانیش پێیان خۆشە.

قسەکەی عەبدوڵلا خەیاڵی جوڵاندم بۆ شتێکی زۆر سەرنج ڕاکێش، کەواتە کڕینی جاریە لەو سەردەمەدا نیشانەی پیاوەتی بووە، بەشێک بووە لە ڕزگار کردنی ئافرەتان لەدەستی ئەو خاوەنانەی کە وەک دەواجنی مریشک بەکاریان دەهێنان.

هاوارم کرد عەبدوڵلا ئەسپەکەم بۆ زین بکەن لەگەڵ سەعد دەڕۆین بۆ بازاڕی مەککە، ڕووەو بازاڕی مەککە چووین. چوومە بازاڕی عوکاز لەتەنیشتی بازاڕێکی تر هەبوو ناوی زولمەجاز بوو، چوومە ئەو جێگایەی کە خۆمی تێدا فرۆشرام، یادی بەخێرو قەبری پڕبێت لە نوور، خوای گەورە لێیخۆش بێت، فەرغەلی لەو جێگایەدا کڕیمیەوە، کە چاوم کەوت بە کۆیلەکان زۆرم پێناخۆش بوو، هەندێک لە کۆیلە پیاوەکان کە دەچووم بەلای مێز و شوێنی وەستانیان دا لەبەر ئەو خۆرو هەتاوەدا خۆیان وانیشان ئەدا کە بەهێز و بە توانان بۆ ئەوەی بیانکڕم و ڕزگاریان بێت لەدەستی ئەو کەسەی کە دەیانفرۆشێت.

ئافرەتەکانیش کە منیان ئەبینی هەریەکە بەناسکی دەستێکی دەهێناوە بە دەمو چاویدا بۆ ئەوەی بفرۆشرێن و ڕزگاریان بێت لە تینوویەتی و برسێتی ئەو کەسەی کە ئاوا بە جوملە دەیانکڕێت و تاک تاک ئەو مرۆڤانە دەفرۆشێتەوە، بێجگە لەوەی کە منداڵ و دایک بەیەکەوە دانرابوون. جاری وا هەبوو دایکەکەیان نەدەویست و منداڵەکەیان دەبرد و لە دایکەکەیان جیا دەکردەوە، بەڕاستی دڵتەنگی و کارەسات بوو بۆیە تەماشایەکی مەککەم کردەوە سەیرێکی کەعبەم کرد و وتم خوایە گیان زوو بنێری، ئینجا تەماشای ئەو خەڵکەشم دەکرد هەمووی خوێن سارد وەکوو ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت وابوو.

خۆشم خەریکی کڕینی چوار ئافرەت بووم، یەکێک بۆ خۆم و یەکی دانەیەکیش بۆ ئەوانی تر (عەبدوڵلا، سەعد و نومەیر).

وتم خۆ ئەگەر نومەیریش نەیووسیت هەر هەڵیدەگرن لەژێر چادر و دەوارەکەماندا نان درووست بکات و ڕزگاریشیان بێت لەم کەسانە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەسەعد و عەبدوڵڵام وت بڕۆن سەرودانە هەڵبژێرن و لەکۆتاییدا پارەکەیانم دا و گەڕاینەوە، کە تەماشای ئەو چوار ئافرەتەم کرد وەکوو ئەوە وابوو هاتبێتن بۆ بەهەشت، ئەوەندە خۆشحاڵ بوون، دوو ئافرەتی بەتەمەن و کە زیاتر مەبەستم بوون بۆ دروستکردنی نان و هێنانی ئاو تەنها لە ژێر دەوارەکەدا بن، دوانیشیان بۆ عەبدوڵڵا و سەعد وەکوو خێزانی خۆیان، لەگەڵیاندا بژین و ئازادیان بکەن ماڵ و منداڵ پێک بهێنن.

ئەو ئێوارە خواردنێکی زۆر خۆشیان بۆ درووست کردین کە تامەکەی ئێستاش لە ژێر دانمدایە، قەرەخەرمانێک بوو بە گۆشتی مەڕ لێیان نابوو بە دووکەڵی دار ئەوەندەی تر خواردنەکەی بەلەزەت کردبوو.

چەند شەوێ مامەوە لە چاوەڕوانی هاتنەوەی نومەیردا بووم لە شام، بەڵام شەوێکیان درەنگ دایان بەسەرماندا هەموومانیان دیل کرد و بردیانین، دوای ئەوەی بۆمان دەرکەوت چەتەی بادیەی دەووربەرەکانی مەککە بوون، ئەو ئێوارە ئەوەی فریامان کەوت ئەو دوو ئافرەتە بە تەمەنە کە بوون کە بە شمشێرەوە خۆیان کرد بە پشتیاندا بە تیروکەوانی گڕاوی دەوارێکی خۆمانیان سوتاند و هەموو ئەسپ و وشترەکانی ئەوانیشیان پەرتو بڵاوە پێکرد، منیش لە خۆشی ئەو کارەی کە کردیان هەردووکیانم ئازاد کرد.

پێم وتن: ئازادم کردن لە مانەوەتان لە ڕۆیشتنیشتان ئەگەر بڕۆن پارەتان ئەدەمێ بۆ ئەوەی توێشووی ڕێگاتان هەبێت.

یەکێکیان ناوی ئاسە بوو وتی: ئەگەر ڕازی بیت لێرە دەمێنینەوە، پێمان خۆشە خزمەتکاری ئێوە بکەین.

ماکوان: ئێوە دایک وخوشکی ئێمەن پێڵاوتان بان چاو و بان سەرمان.

شەوێک عاشقانە بەدوای کتێبەکەی فەرغەلییەوە هاتم دەستم کرد بە خوێندنەوەی وتم بزانم چی تر ڕوو ئەدات؟

لە سەروبەندی خوێندنەوەکەیدا چوومە ئەو لاپەڕەیەی باسی ئەوەی دەکرد کە بازاڕی سەقیف و هەوازن کاروکەسابەتی تێدا نەمابوو بەهۆکاری ئەوەی هەموو خەڵکی لەگەڵ قووڕەیش دا کاریان دەکرد، قووڕەیشیەکانیش ئەوەی خەڵکی ناو مەککە نەبوایە نەیاندەهێشت



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کاڵا ساغ بکاتەوە لەناو بازاڕەکەدا دەبوو کاڵاکان بفرۆشێت بە قووڕەیشییەکان، ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە هەوازن و سەقیف بیر لەوە بکەنەوە هێرش بکەنە سەر شاری مەککە!

گەورە پیاوانی هەوازن و سەقیف دەترسان لەوەی کە قووڕەیش سەرکەوێت بەسەریاندا، هەروەک چۆن خوای گەورە فیلەکانی لەناو برد لەڕێگای تەیرولئەبابیل.

لە کۆتاییدا کاهین و جادووبازەکانی ناو هەوازن و سەقیف وتیان کاتێک ئەبرەهە هاتووە بۆ ئەوە هاتووە کە ماڵی خوا (کەعبە) تێک بدات، خۆ ئێوە بۆ تێکدانی کەعبە ناچن، بەڵکوو بۆ ئەوە دەچن کە ئەو بازاڕە و قوتی خەڵکەکە لە ژێردەستیاندا دەربهێننەوە.

لە خوێندنەوەی ئەو باسەدا بووم کە شەڕ دەستی پێکرد، چاوەکانم بێ ئەوەی بەدەست خۆم بێت نا بەیەکداو بۆ چەند ساتێکی کەم خەو هاتە چاوم وەنەوزێکم دا، کاتێک چاوم کردەوە تەماشام کرد لە ژوورەکەی خۆمم لە ناو کتێب و جێگاکەمدا.

کە خەبەرم بوویەوە زۆر بێتاقەت بووم، چوونکە ئیشەکانم تەواو نەکردبوو تەماشای کاتژمێرم کرد هەموو چەند سەعاتێک بوو خەوم لێکەوتبوو کە ئەو هەموو ڕۆژانە گەڕابوومەوە بۆ زەمەنی قووڕەیش.

بەردەوام بووم لەسەر خوێندنەوەی کتێبەکە چوومەوە سەر ئەو بەشەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ مامەکانی شەڕ دەکات لەدژی داگیرکردنی شاری مەککە، هەوازن و بەشێک لە سەقیف هێرشیان هێناوە بۆ شاری مەککە، ئەو دەمە تەمەنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ١٠ بۆ ١٢ساڵان بووە بەشداری دەکات لەو شەڕەدا، تیر دروووست دەکات و دەیداتە دەستی مامەکانی، یەکەم شەڕ بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری تێدا کردووە، پاشان لەشەڕەکەدا تاڕادەیەک قووڕەیش سەرکەتوو دەبێت داوا دەکەن کە بەشێک لەبازاڕی مەککە بۆ هەوازن و سەقیف بکرێتەوە، ئیتر بۆ ئەوەی بازاڕی سەقیفیش گەرم بێت بتێک ئەدرێت بە سەقیف، لە مەککەوە دەچن بۆ تائیف بۆ پیرۆزکردنی ئەو بتە بەناوی نەئلە و ئیساف.

شەڕێکی زۆر گەورە لە شاری مەککەدا بەرپا دەبێت لە نێوانی هۆزەکانی شاری مەککە (کیلان و قەیسی عیلان) کە شەڕەکە ناونراوە بە فوجار، ئەم شەڕە بووە هۆی ئەوەی کە

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

خەڵکێکی زۆر لەیەکتر بکوژن تا لە کۆتاییدا بنەماڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ واتە بەنی هیشام کەوتنە نێوانیانەوە لەگەڵ هەندێک لە هۆزەکانی تری قووڕەیش لەماڵی عەبدوڵڵای کوڕی جدعانی تەمیمی کۆتایی پێهات، ئەو دەمە پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەنی ٢٠ ساڵان بوو وەکوو پیاو ماقوڵانی بەنی هیشام بەشدار بوو لەو پەیماننامە و حیلفەدا کە ناسراوە بە (حیلفی فضول).

لە تەمەنی ٧ ساڵیدا عەبدولمەتەڵیبی باپیری وەفاتی کرد، مامی ئەبوو تاڵیب بردییە لای خۆیو لەگەڵ حەمزە و جەعفەردا پەروەردەی کرد، لەماڵی مامیدا زۆر شت فێربوو لەوکارانەی کە فێر بوو: تیرهەڵدان، سوارچاکی، شوانی، بەردەوام بوو لە شوانی تا تەمەنی گەیشتە ٢٠ ساڵان وەکوو پیاو مەعقولێک تەماشا دەکراو پیاوێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو، هەرگیز لە ناو خەڵکی شارەکەدا درۆی لێ نەبیستراوە، کوڕێکی ئازا بووە و هاوکاری پوورەکانی دەکرد، ڕۆژێک لە ڕۆژان سووجدەی بۆ بت و پەیکەرەکان نەبردووە و بڕوای پێیان نەبووە، بەڵام دەریشی نەبڕیوە.

خێزانم هات پرسی ئەوە بۆ ناخەویت؟

ماکوان: خەریکی خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەرم ﷺ.

باران: ماوەی چەند ڕۆژێکە هەر لەولاپەڕەیەدایت، هۆکار چییە؟

ماکوان: ئەو لاپەڕەیە لاپەڕە نییە! ئەوە بەتەنها زەمان و مەکانت پێ دەناسێنێت!

باران: بۆ چییە؟

ماکوان: وەرە تەماشای کە بزانە چییە؟

باران هاتوو چاوی خستە سەری بینی وشەکان سوور دەخۆن و سەما دەکەن، خێرا چاوی لەسەر لابرد وتی ئەوەچییە؟

ماکوان: ئەوە نهێنی ئەو کتێبەیە کە منی بەلای خۆیەوە داناوە، ئەمبات و دەمهێنێت و وازیشی لێناهێنم تا نەگەمە ئامانج و کۆتاییەکەی بزانم بۆ کوێم دەبات!

باران: باسی چیدەکات؟




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماكوان: باسی منداڵیی پێغەمبەری خوا ﷺ دەكات.

باران: خۆ كتێبی زۆرت هەیە لەوبارەیەوە بۆ هەر ئەمە؟

ماكوان: ئەم كتێبە ئەمبات لەگەڵ خۆیداو بۆ ناو واقیعەكە!

باران: ڕادەبوێری!

ماكوان: نا خۆت تەماشات نەكرد نەتتوانی؟

باران: نا نووسینەكەی جوان نییە، بۆیە چاومی ئێشاند.

ماكوان: بەهەر حاڵ بڕۆ بخەوە، منیش زۆرم نەماوە تۆزێكی تر دەخوێنمەوە، لەم بەشە تەواوبم كتێبەكە دادەخەم دەخەوم.

بەردەوام بووم لە خوێندنەوەی چوومە سەر ئەو بەشەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ كارو كەسابەتی چی بووە لە شاری مەككەدا.

سەرسامیشم بەوەی لەم كتێبەدا هەمووشتەكان ئاشكرایە و هیچی شاراوەی تێدا نییە.

هیچ كەسێكیش لەسەر ئەم زەویەدا ژیاننامەی بەو شێوەیە نەنووسراوەتەوە.

بۆیە واگرنگی پێدراوە، چوونكە هەموو هەڵسكەوتوو ڕەفتارێكی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئێمەی موسڵمان تەشریعە و یاسا و ڕێسایە.

تەمەنی پێش پێغەمبەرایەتی دیارە كە پێغەمبەری خوا ئەم پیشە و كارانەی هەبووە و كردووە.

یەكەم: شوانیی كردووە بۆ هەر سەرێك قیراتێكی وەرگرتوە كە نیو درهەم یاخوود نیو دینار بووە.

دووەم: كاری حیجامەی كردووە، بە هۆكاری حیجامەكەی دەستكەووتی هەبووە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سێیەم: شارەزا بووە لە دروستکردن و داتاشینی تیر و سەری تیر کە ناسراوە بە -نبل- بۆ مامەکانی و بەنی هاشم درووستی کردووە لەو ڕێگاوە دەستکەووتی هەبووە.

چوارەم: کاری بازرگانی لە نێوانی شام و مەککەدا کە یەک جار چۆتە شام، بەردەوام بووە لە بازرگانی لە ناو شاری مەککەدا کە زۆربەی جار بەبازاڕدا گەڕاوە شتوومەک و کەرەستەی کڕیوە و فرۆشتووە.

پیاوێکی دەوڵەمەند بووە بەهۆکاری پارەی خێزانییەوە خاتوو خەدیجە -ڕەزامەندی خوای لێبێت-. بەردەوام پێغەمبەری خوا صَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ لە بازرگانی کردندا بووە لە ناو شاری مەککەدا هەندێک جاریش پێستەی حەیوانی کڕیوە ناردوویەتی بۆ حەبەشە، زۆرێک لە ئەهلی مەککە حەزیان کردووە کە هاوبەشی بکەن لە بازرگانیدا تەنانەت پێش پێغەمبەرایەتی جێگای متمانەی شاری مەککە بووە، زۆربەی خەڵکی ئەو شارە پارە و سەروەت و سامانی خۆیان لە ماڵی پێغەمبەردا داناوە، هۆکاری ئەوەش کە عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیبی هیجرەتی پێنەکرد لەگەڵ خۆیدا، هەموو ئەو سەروەت و سامانانەی خەڵکی لەلای بوو لە شاری مەککە دا لە ڕێگای (عەلی)یەوە گەڕاندییەوە بۆ خاوەنەکانیان.

یەکێک لە هۆکارەکانی ناسینیشی لەگەڵ ئەبوو بەکر، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و عوسمانی کوڕی عەفان ئەو بازرگانە بەناوبانگانە دەگەڕێتەوە بۆ کاری بازرگانیان و تێکەڵاو بوونیان لە بازاڕی مەککەو عوکاز و بازاڕەکانی چواردەوری شاری مەککە و تائیف.

تەنانەت پێغەمبەری خوا صَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ لە شاری مەککەدا دەوڵەمەندتر بووە لە زۆربەی مامەکانی عەباس و ئەبوو لەهەبی لێدەربچێت، زۆر جار پارەی ئەدا بە کڕینەوەی بەندە و کۆیلەکان و ئازادی دەکردن لەگەڵ ئەبوو بەکردا مزگەوتێکیان لە شاری مەککە درووستکردبوو لە تەنیشت ماڵی ئەبوو کردا بووە، زۆرێک لە کاری بانگەواز لەوێ و لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم دەکرا، تەنانەت خەرجی بانگەوازەکە لە ڕێگای پێغەمبەرەوە بووە دوای ئەوەی کە بووە پێغەمبەر خۆی زیاتر خەریکی بانگەواز بوو. زەیدی کوڕی حارس و ئیمامی عەلی و هەندێک لە خزمەکانی خەدیجە بازرگانیان دەکرد و لە ڕێگای قازانجی کارەکانییانەوە بانگەوازەکەیان بردە پێشەوە، ئەو ڕۆژەشی کە کۆچی کرد بۆ مەدینە ئەو وشترەی ئەبوو بەکر ئامادەی کردبوو بۆ پێغەمبەر صَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ، پارەی وشترەکەشی گەڕاندەوە بۆ ئەبوو بەکر.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەمە بەشێكی كەمی ژیانی بوو لە شاری مەككە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

گەڕانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەشوێن درووستکاری ئەم بوونەدا

ئێوارەیەکیان لە بازاڕ دەگەڕامەوە خۆم کرد بە مۆڵێک دا لەناو ئەو مۆڵەدا لە دوکانێک دا بەناوی (ئارک) بەهۆکاری جەژنی چەندین ساڵەی کردنەوەی ئەو دوکانە لە نەرویج بۆ فرۆشتنی کتێب و پێداویستی قوتابخانە و فەرمانگەکان، هەرچی کتێب و باسی چالاکی چەند ساڵەی خۆی دەکرد لەبەردەم دوکانەکەیاندا لە ئینفۆگرافیکێکدا دانرابوو.

کەسێکم بینی سیمای ڕووخساری لە لیۆ تۆلستۆی فەیلەسوف و ڕۆماننووس و چاکسازێکی کۆمەڵایەتی ڕوسی دەچوو.

نووسرابوو بۆ یەکەم جار یەکەم کتێبی تۆلستۆی زۆرترین فرۆشی هەبوو بەناوی مەملەکەتی پەروەردگار لە ناخدا، کتێبێکی فەلسەفی بوو چوومە دوکانەکە و سەیری کتێبەکەم کرد دوای ئەوە بەدوای بەرهەمەکانی تریدا گەڕام کە لە بەشی کۆتایی کتێبەکەیدا نووسرابوو، بینیم یەکێک لە کتێبەکانی بەناوی فەرمانڕەوایی پێغەمبەر محمد ﷺ زۆر لام سەیر بوو! کەسێک لە سەردەمی قەیسەردا ژیابێت و مەسیحی بێت لە ساڵەکانی ١٨٢٨ لەدایک بووە ١٩١٠ وەفاتی کردووە چۆن شتی وای نووسیوە؟ سەرنجی ڕاکێشام داخۆ چی نووسیبێت لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ ؟

گەڕامەوە ماڵەوە بەدوادا چوونێکی جدیم کرد بەشوێنیدا، زۆرێک لەسەرچاوەکان گەڕام تا دۆزیمەوە چ پەیوەندییەک لە نێوانی ئەو گەیشتنی بە ئیسلام و ناسینی محمد پێغەمبەری خوا ﷺ کە بۆم دەرکەوت ئەم پیاوە گەورەیە تەنها گەیشتووە بە خزمەتی چل فەرموودەی ئیمامی نەوەوی بەزمانی ئینگلیزی لەوسەردەمەدا وەرگێڕدراوە، تەنها ئەوانەی خوێندۆتەوە، کتێبەکەیم دۆزییەوە و خوێندمەوە ئەو وەسف و پیاهەڵدانەی ئەو هەڵیداوە بەسەر پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ، هەرگیز بڕوام نەکرد کە ئەوکەسە مەسیحی بێت، بەردەوام بووم لەسەر گەڕان بەدوای بەرهەمەکانیدا بینیم کەوا ١٠٠ بەیت شیعری بەسەر ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ دا نووسیوە، کە خوێندمەوە تا ئەم سەردەمەشی لەسەر بێت هەرگیز بڕوام نییە ئەو کەسە یاخوود ئەو فەیلەسوفە موسڵمان نەبووبێت، چوونکە بە ئیمان و خۆشەویستییەکەوە قسە لەسەر پێغەمبەر خوا




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەكات، مەگەر ئەحمەد شەوقی ئەوەندە بەیت و قەسیدەی جوانی بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم نووسیبێت.

لە فەیسبووک نووسینێکم پۆست کرد لەسەری وەکوو پیشەی هەمیشەی مولحیدو نەخوێندەوارەکانی کورد کە ئاگایان لە ئیسلام نییە، هەمووی دەیانووت ماکوان لەخۆیەوە شت دەنووسێت و درۆ بەدەم خەڵکییەوە دەکات، دوای ئەوەی کە کتێبەکەم بۆ دانان و سەرچاوەکانم خستە بەردەستیان، بەدڵنیاییەوە مولحیدی کوردی و عیلمانیەکان بەگشتی زۆر بێچاو و ڕوون خۆیان هیچ تەریق ناکەنەوە خاوەنی ئینسافیش نین، بەڵکوو کاتێک تەریق دەکرێنەوە بێدەنگ دەبن و دەچنە دواوە، کوڕێکی هاوڕێم بەناوی ڕێباز لە زانکۆی پاریس دەیخوێند پەیوەندی پێوە کردم.

ڕێباز: کاک ماکوان پرسیارێکم هەیە، نووسینێکتم بینیوە لەسەر تۆلستۆی لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، بەڵام دەمەوێت پرسیاری ئەوەت لێبکەم ڤۆڵتێر شانۆگەرییەکی نووسیوە لەسەر محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم، ئایا تاچەند ئاگات لێیە؟

ماکوان: ئاگام لێیەتی و ئەوەندەی بزانم مولحیدەکان و بێدینەکان بەکاری دەهێننەوە بۆ ئەوەی گوایە لەو شانۆگەرییەدا باسی ناشیرینی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم کراوە، هەرچەندە شانۆگەرییەکەم نەخوێندۆتەوە!

ڕێباز: کاک ماکوان بیخوێنەرەوە، بەڵام پێش ئەو شانۆگەرییە بزانە بۆچی دەرکراوە و چۆن گەڕاوەتەوە، من خۆم زۆر سەرسامم بە فرانسیس ڤۆڵتێر، لە زانکۆ زۆریک لەپەییڤ و دیدو تێڕوانییە سیاسییەکانی کە بەشێکە لە مەنهەجی بەشی ئێمە، لە زانستە سیاسییەکان دەخوێنم.

ئەوەی سەرنجی ڕاکیشام ئەوەبوو لە زانکۆیەکی وڵاتی فەڕەنسا کە وڵاتی عەلمانییە و زۆر خۆی بە عیلمانی دەزانێت، لە پلە بەندیدایە بۆ ئەو بوارە نایەوێت بێتە خوارەوە، لەو پلە یەکییەدا خۆی بەخاوەنی شۆڕشی عەلمانی دەزانێت، لەگەڵ ئەوەشدا وەسفێکی ئەو بیرمەند و ناسراوی بوواری عەلمانییە، زۆر بەجوانی وەسفی ئیسلام دەکات.

کە ڕێباز وای وت بەجێم هێشت چوومە سەر سەرچاوەکان، شانۆگەرییەکەم خوێندەوە هەر پێنج فەسڵەکەی بە مەشهەدەکانیەوە کە تەماشام کرد لە ڕاستیدا ئەم ناوە وەرگیراوە لە ناوە





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

جەزائیرییەکانەوە هیچ پەیوەندی بەسەر ئیسلام و پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم نییە ، بەڵکوو پێش نووسینی ئەو شانۆگەرییە زۆر شتی جوان و سەرنج ڕاکێشی لەسەر ئیسلام و محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم وتووە، کەجێگای بایەخە و لە زۆرێکی خەڵکی شاراوەیە بەتایبەت لەناو عیلمانییە کوردەکان و مولحیدەکانی.

هەروەها لە کتێبەکە بینیم (گۆتێ) شاعیر و فەیلەسوفی گەورەی ئەڵمانی نامە بۆ سەرکردەی ئەو سەردەمەی فەڕەنسا دەنێرێت و بۆی باس دەکات، دەڵێت ئەو شانۆگەرییە مەبەست پێی خودی (محمد) نییە، بەڵکوو ئەوە مەبەست تەنها دەسەڵاتی کڵێسا و دەربەگ و پیاوانی ئایینی کڵێساییە! چوونکە (گۆتێ) زیاد لە ١٠٠ شیعری هەیە لەوەسفی پێغەمبەری نازداردا صلى الله عليه وعلى آله وسلم، لە وەسفی قورئان دا لەشەوی لەیلەتولقەدر گەورەترین ئاهەنگ بۆ قورئان دەگێڕێت!

دەقی قسەکانی ڤۆڵتێرم بینی لەسەر ئیسلام و خودی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم کە شتی ئەوەندە جوانی نووسی بوو بڕوام نەکرد کە ئەم پیاوە خۆی بە فەیلەسوف و پێشەوای عەلمانییەت بزانێت، یەکێک لە دەقی قسەکانی کە بۆ پیاوانی ئایینی دەنێرێت.

لەیەکێک لە نامەکانی وەکوو ڕیسالە وایەو دەبێتە کتێب و کۆتا کتێبیەتی لە ساڵی ١٧٧٠ زایینی نووسیویەتی دژ بە دەسەڵاتی مەسیحی و کڵێسا تێیدا دەڵێت، قسەکەی وەکوو خۆی دەهێنم: (لەڕاستیدا ئایینی محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئایینیکی پڕ حیکمەت و پاکەو لەهەمانکاتدا مرۆڤ دۆست و ڕەقە، هەر خۆی ڤۆڵتێر قسەکانی شیکاری بۆ دەکات و دەڵێت: کەدەڵێم حیکمەتی تێدایە دوورە لە شێتی و هاوبەشدانان بۆ خوای پەروەردگار، ئیسلام خاوەنی وشەی تەلیسماوی نییە، کەدەشڵێم ڕەقە توندە، هەموو جۆرە مەی و قومارێک قەدەغە دەکات و لایان حەرامە، فەرمانیشی کردووە بە پێنج نوێژ لە ڕۆژێکدا و پاکیشە چوونکە ڕێگای داوە و دەستنیشانی کردووە کە فرەژنی لە ٤ ئافرەت زیاتر نەبێت.

کە دەشڵێم مرۆڤ دۆستییە، لەبەرئەوەیە کە فەرمانی کردووە بە دەستگیرۆیی هەژاران و فەرمانەکەی زیاترە لە فەرمانی حەجکردن و شتێکی تریشی کە پێویستە زیادی بکەم ئەویش ئەوەیە ئایینێکی لێبووردەیە).





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

زۆر باسی تریشی کردووە لەبارەی زەکات و خێر و چاکەو دەستگیرۆیی هەژاران. ئەوەی زیاتر سەرنجی ڕاکیشام لە کتێبی فەرهەنگی فەلسەفی ڤۆڵتێردا باسی شتێکی زۆر سەرسام دەکات کە هەست دەکەیت زانایەک و بیرمەندێکی ئیسلامییە ئەم قسەیە دەکات، وەکوو خۆی دەقی قسەکانتان بۆ وەردەگێڕم.

لە کتێبی فەرهەنگی فەلسەفی ساڵی ١٧٦٤ بڵاوکراوەتەوە ڤۆڵتێر دەڵێت:

جارێکی تر پێتان دەڵێمەوە (مەبەستی خەڵکی فەڕەنساو ئەوانەی شوێن ئایینی کڵێسا کەوتوون لەپیاوانی ئایینی) ئەی جاهیل و ئەحمەقەکان وا قەناعەتان پێکراوە و پێتان وتراوە لەلایەن جاهیلەکانی ترەوە کە لەڕاستیدا ئایینی محمد ئایینیکی شەهوانییە، بەڕاستی من پێتان دەڵێم ئەوە هیچ ڕاستییەکی تێدانییە، بەوە هەڵیان خڵەتاندون لەم بوارو باسانە و کاری تری ئیسلام کە ناشیرینە، ئەی قسیس و ئەحبارەکان ئەگەر لێتان قەدەغە بکرێت خواردن و خواردنەوە لە سەرەتای بەیانیەوە تا کۆتایی شەو لە مانگی گەرمای تەمموزدا کە مانگی ڕەمەزان دەکات و مانگێک بەڕۆژوو دەبن؟ پاشان ئەگەر لێتان قەدەغە بکرێت کە چیتر نابێت مەی بخۆن و قومار بکەن بە هەموو شێوەکانییەوە وازدەهێنن؟

ئایا لەسەرتان فەرز بکرێت بچن بۆ حەجێک لە بیابانێکی سووتێنەردا دەڕۆن؟ یاخوود ئەمرتان پێبکرێت کە لەسەروەت و سامانی خۆتان لە سەدا دوو و نیو بدەن بە هەژاران دەیکەن؟ یاخوود بڵێت بۆتان نییە لە چوار خێزان زیاترتان هەبێت قبوڵی دەکەن؟ ئەوە ئێوەن لاتان ئاساییە نەک هەشت خێزان و دە خێزانتان هەبێت، بەڵکوو زیاتریش کە حەزەکانی خۆتانی پێ تێر دەکەن، ئیتر باسی شەهوەتی چی دەکەن بەرانبەر بە ئیسلام بەڕاستی و ڕاستگۆیی پێم بڵێن ئەم ئایینی ئیسلامە ئایینی شەهوانییە؟

هەموو ئەمانەم خوێندەوە بۆم دەرکەوت لە ڕاستیدا ئەوانەی قسە بە ئیسلام دەڵێن زۆر نەخوێندەوارن! ئەوانەی خوێندەوارن و فەیلەسوفی گەورەی ئەم جیهانەن، چەند بە حورمەت و ڕێز و ئینسافەوە قسەیان لەسەر کردووە.

لە خۆشەوویستی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستم دایەوە کتێبەکەی فەرغەلی و بەخۆشەوویستی ئەو خۆشەوویستەوە چوومەوە ناو باسەکانی، لەسەرەتای ئەوەدا بووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتی ئەوەی بوو خێزان پێکەوە بنێت و لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا،



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەو هۆکارەی کوڕێکی ڕاستگۆ، ئیشکەر و خۆشەوویست بوو لە شاری مەککەدا ناو و ناوبانگی بە دەستپاک و ڕاستگۆ دەرکردبوو، ئیدارەی قافڵەیەکی بۆ ئافرەتێکی دەوڵەمەندی شاری مەککە کرد بەناوی خەدیجە خاتوون کچی خوەیلد. لە کاتی چوونیدا بۆ بازرگانی چاودێری بەسەر محمد ﷺ دانابوو بۆ ئەوەی بزانێت ئایا دەستپاکە؟ یاخوود ڕەوشت و ئاکارو ڕەفتاری چۆنە؟ لە دوای ئەوەی کە هەواڵی بۆ هاتەوە لەلایەن چاودێرەکانیەوە کە گەنجێکی داوێن پاک و دەست پاک و خاوەن ڕەوشتە، تا ئێستا ئەو وەسفەی لە سەرقافڵەکانی تری نەبینیبوو، بەدەستپاکی زۆرترین سوود و قازانجی گەیاندە خاتوو خەدیجە خۆشی کوڕێکی جوانخاس و قۆز بوو لەشارەکەدا دڵی چووە سەر محمد ﷺ کەسێکی نارد بۆ ئەوەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ بڵێن بچێتە داوای.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەودەمە ڕەدی کردەوە فەرمووی لە ئێستا دا بیری لە خێزانداری نەکردۆتەوە تەمەنی ٢٥ ساڵ بوو، ئەو دەمەش خاتوو خەدیجە تەمەنی ٢٨ ساڵ بوو.[٣٥]

پاش هەوڵێکی تری خاتوو خەدیجە بەڕەدکردنەوەکەی کە ئەوەندەی تر سەرسامی بوو، چوونکە چەندین پیاوی بەتوانا و خانەدانی ئەو سەردەمە حەزیان دەکرد خدیجە خاتوون بکەتە هاوسەری خۆیان و ئەو ڕازی نەدەبوو، ئێستا گەنجێک خاوەن سەروەت و سامانێکی زۆر نییەو ڕەدی دەکاتەوە کە ببێتە هاوسەری یەکێک لە ئافرەتە دەوڵەمەندەکانی شاری مەککە، ڕاستە خودی محمد ﷺ یەکێکە لە خانەدان و ناودارانی قووڕەیش، بەڵام لەڕووی پارەو ماددەوە ئەو ماوەیە زۆر دەستکوورت بوون، تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێک جار کرێکاری دەکرد و شوانی بۆ خەڵکی دەکرد.

بۆ جاری دووەم لەڕێگای پووری پێغەمبەرەوە ﷺ هەوڵێکی تر ئەدرێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی دەبێت بەوەی لەگەڵ خاتوو خەدیجەدا هاوسەرگیری بکات.

---

[٧] ئەوانەی کە دەڵێن تەمەنی خاتوو خەدیجە ٤٠ ساڵ بووە ڕاست نییە لە واقیدییەوە وەرگیراوە واقیدیش مەترووکە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم زۆر خۆشەوویستی خاتوو خەدیجە چووە دڵییەوە، چوونکە تەقدیری ئەوەی دەگرت کە لەبەر خوو ڕەوشت و ئەخلاقی خودی محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم خۆشیویستووە، بۆیە ئەویش خۆشەوویستی بۆ درووست بوو، ژیانێکی بەختەوەریان پێک هێناوە دوو کوڕ و چوار کچیان بوو بەناوەکانی (عەبدوڵلا، قاسم، ڕوقیە، ئوم کەلسوم، زەینەب و فاتیمە).

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم پێش ئەوەی وەحی بۆ بێت بنەماڵەی ماڵی ئەبوو تاڵیب هەژار کەووتن، ئەویش عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیبی بردە لای خۆی بۆ ئەوەی ئەرکێک کەمتر بێتەوە لەسەر شانی ئەبوو تاڵیب، عەلی لە منداڵییەوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەخێوی کردووە وەکوو کوڕی خۆی وابوو، لەسەرەتای هاوسەرگیری خاتوو خەدیجە و پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هاوسەرەکەی کۆیلەیەکی پێشکەش بە محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم کرد بۆ خزمەتکردن و بەردەستی کردنی، بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەبەر ئەوەی پەروەردەکراوی خوای گەورە بوو پێش پێغەمبەرایەتیشی ڕازی نەبووە بەوە چووە ناو شاری مەککە و بە ئاشکرا ڕایگەیاند کە ئەو کۆیلەی ناوێت و دەیکاتە کوڕی خۆی، زەیدی ناونابوو کوڕەکەی محمد.

لەناو ئەو جەنجاڵییەی ژیاندا ڕۆژیک نەبیستراوە یان یاداشت نەکراوە و نەبینراوە کە پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بچێت سووجدە بەرێت بۆ بتێک یاخوود پەیکەرێک لە شاری مەککە، ئەم پێغەمبەرە ئازیزە صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەمیشە لە ڕامان و بیرکردنەوەدا بووە ساڵانە لە مانگی ڕەمەزان دا گەورە پیاوانی قووڕەیش دەچوونە ئەشکەوتەکان و ماوەیەکی زۆر دەمانەوە لە ئەشکەوتەکاندا بە بیرکردنەوە سەفای دڵ و دەروون وەکوو شێوە تەسەوفێک خەڵوەتیان دەکرد تا ماوەی مانگێک دەمانەوە، زیاتر ئەمە لە ناو عەرەب و قووڕەیش بەتایبەتی باو بوو، پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وعلى آله وسلم ڕۆژانەو سات بەدوای سات لە بیرکردنەوەدا بوو، وەکوو بڵێی خوای گەورە ڕایبهێنێت بۆ کارێک لەناو خەڵکی شاری مەککەدا بە پیاوێکی بەئەدەب و خاوەن شکۆ و بەڕێز، وەکوو دەوڵەمەندی شاری مەککە ئاماژەی بۆدەکرا و هاوڕێی زۆرێک لە بازرگان و ناسراوەکانی شاری مەککە بووە.

لە کتێبەکەدا باسی ئەوەم دەخوێندەوە کە هاوڕێکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم کێ بوون، لە پڕ سەرم گێژی خوارد، گەرمای نیوەڕۆی عەرەبستانی سعودیە دای لەسەرم، هەستم

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کرد گەڕاومەتەوە بۆ زەمەنی پێش پێغەمبەرایەتی، لەدوورەوە کەعبەم بەدی کرد ئیتر دڵنیابوومەوە کە لە مەککە دام،

وەکوو شێت لەخۆشیاندا دەگەڕام بەڵکوو پێغەمبەری خوا ﷺ ببینم لە ناو شاردا دەسوڕامەوە، دەمووت ئێستا چەندە خۆشحاڵم کە ئەبوو بەکر دەبینم، عوسمان دەبینم، عومەر دەبینم هەموو ئەو پیاوچاک و هاوەڵانە دەبینم بەو عاشق بەناو مەککەدا دەسوڕامەوە لەپڕ بە قامچی درا لە پشتم هاوارم لێ هەڵسا و وتم نەفام ئەوە بۆ قامچی دەوەشێنیت؟ هەر واموت زیاد لە دە شمشێر بەدەست، شمشێریان دەرهێنا بۆ کوشتنم هاتن.

پرسیارم لێکرا تۆ خەڵکی کوێیت چی دەکەیت لە مەککە؟

زانیم چاودێرەکانی بازاڕی شاری مەککەن پێمووتن من شەریکی نومەیرم و بە ئەسڵ خەڵکی ڕۆمم، بەڵام دەمێکە لەم ناوچەیە بازرگانی دەکەم، هەروام وت بەستیانمەوە لەبەر ئەو گەرماییە و وتیان دەچین هەواڵ لە نومەیر دەهێنینەوە لەو بادییە، دوای ئەوە ئەگەر ڕاستت نەکرد لەگەردنت ئەدەین و سەرت دەبڕین.

ئەوەندە گرنگ نەبووبەلامەوە خۆشحاڵ بووم بەوەی کە بگەم بەخزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دواییش لە ملم بدرێت ئاساییە، بەس بە چاوی خۆم ببینمەوە، چوونکە پێشتر لە ژێر دەوارێکدا بینیبووم. شەوم بەسەر داهات من هەر بەسترابوومەوە بە کۆڵەکەیەکەوە چاوەڕێی ئەوەم دەکرد عەبدوڵلا یاخوود سەعد یان سەبا و نومەیر کەسێک بێت بۆ لام ئازادم بکات.

لە نیوەی شەودا بیرم کەوتەوە ئەو زەمەنەی ئەوانم ناسیوە چەندین ساڵ پێش ئێستا بووە لەوانەیە زەمەنەکە بە ٣٠ بۆ ٣٥ ساڵ گۆڕا بێت.

دوای لەدڵی خۆمدا وتم بەخوا تەواو سەرپەڕاندنەکەم مسۆگەرە، خۆ هەر سەرم دەپەڕێنن با هاوار بکەم یا محمد، یا ئەبوو بکر، یا عمر، بەڵکوو کەسێک بێت بە هانامەوە خۆ هەر بیشیان بینم خۆشحاڵ دەبم!




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەنزیک کەعبەوە هەندێکی لێبوون بە ڕووتوقووتی تەوافیان دەکرد، بانگم کردن کەسێک تۆزێک ئاو و خواردنێکم بداتێ، کەس پاسەوانم نەبوو کەچی کەسیش جورئەتی ئەوەی نەدەکرد بێت دەست و قاچم بکاتەوە.

بۆم دەرکەوت ئەو جێگایەی منی لێبەسترابومەوە شوێنی تاوانبارانە کە پاسەوانەکانی بازاڕ دەیانبەستنەوە هیچ کەس ناچێت بەلایاندا، هەیە لەسەر دزی دەگیرێت یاخوود لەسەر کاڵای ڕێگا پێنەدراو...هتد.

منیش لەو جێگایەدا بووم هیچ کەس نەیدەتوانی بمکاتەوە مەگەر پاسەوانەکان کە بە فەرمانی دارولنەدوەی قووڕەیشی دانرابوون، واتە شاری مەککە خاوەنی یاساو دەستووری تایبەت بەخۆی بوو.

بەهەر حاڵ لەدەمەو بەیانیەدا کچێک هات لەگەڵ پاسەوانێکدا کردیانمەوە و قاچەکانم هەمووی سڕ ببوون ئەوەندە بەپێوە وەستابووم هەر کردمیانەوە کەوتمە سەر زەوی، ئاویان دامێ خواردمەوە و وتم بە ئافرەتەکە تۆ کێیت؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## نامەیەکی ئیلاهی بۆ سەر زەوی و ڕێزی مرۆڤایەتی

لەدوای ماندوبوونێکی زۆر کە بەسترابوومەوە ئافرەتێک ڕووەوە من هات لەگەڵ پاسەوانێک هەر لە بوسەینە دەچوو، وامزانی بوسەینەیە زیندوو بۆتەوە! کە نزیک بوویەوە وتم: بوسەینە خۆتی؟

وتی: نا من نەفیسەم، ئاماژەی کرد بۆ پیرێژنێک وتی دایکم چاوەڕێتە لەویا وەستاوە.

چوم بۆ لای بینیم خوشکەکەی بوسەینەیە، بەڵام زۆر پیربووە پشتی چەماوەتەوە و لەسەر لێواری مردندایە.

ماکوان: لێم پرسی ئەوە بۆ وا پیر بوویت؟

باهیلە: ئەی تۆ بۆ وا نەگۆڕاویت؟

بە پارچە ئاڵتوونێک ئازادی کردم کە کە کاتی خۆی بۆ بوسەینەم کڕی بوو، لەگەڵیدا چوومەوە بۆ ماڵەوە بینیم کچە جوانەکە کچی ئەوە، ڕێک لە بوسەینە دەچوو، پرسیم ئەوە بوسەینەیە؟

باهیلە : نا ئەوە نەفیسەی کچمە ڕاستە لە بوسەینە دەچێت!

ماکوان: چی ڕوویداوە لەدوای ئەوەی چەتەکان تۆیان ڕفاند ؟

باهیلە: لەو سەردەمەوە ئەم پیاوە منی بردو ئێستا لێرە لە شاری مەککەدا دەژین و ٣ منداڵم لێی هەیە ئەم کچە و دوو کوڕ!

لە دوورەوە بینیم پیاوێکی پیری پەککەوتە بوو!

ماکوان: ئەی بۆ وازی لێناهێنیت؟ ئەو تۆی دزیوە، بەدەستی ئەوان خوشکەکەت کە خێزانی من بوو کوژراوە!

باهیلە: ئاخر چی بکەم کەسم نییەو باوکی سێ منداڵمە، ئینجا کوڕەکانم قبووڵ ناکەن.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: ئەی ئەو ئاڵتوونەی منت پێ ئازاد کرد، ئاڵتوونەکەی بوسەینە نەبوو؟

باهیلە: ئاڵتوونی بوسەینە بوو گەڕاندمەوە بۆ خاوەنەکەی، من بۆچیمە خۆشحاڵ بووم کە تۆم بینییەوە، بەڵام ئەوەندەی تەماشای تۆ دەکەم زۆر سیحراویت ناگۆڕێیت.

بۆ وا دەکەیت بۆ ئەوەندە خۆت تووشی ناڕەحەتی و ئازار دەکەیت؟ هەندێک جار ئەوەندە بە هێزو تواناوە دەردەکەویت و هەندێک جاریش کۆیلەو عەبدی بەردەستی ئەم ورگ زل و چەتانەیت.

ماکوان: بەدوای خۆشەویستەکەمدا دەگەڕێم ، تینووی ئەوم!

باهیلە: ئەی نازانی بوسەینە مردووە؟ زیاد لە ٧٠ ساڵە مردووە!

بۆم دەرکەوت زەمەن بۆ من وەستاوە بۆ ئەوان دەڕوات، بۆم ڕوونکردەوە ڕاستە بوسەینەم خۆش دەویست، بەڵام ئەم خۆشەوویست و بەدوادا گەڕانە هەرگیز لە خۆشەوویستییەکەی تێرت ناکات، بەدوای کەسێکدا دەگەڕێم ئەو فریادڕەسی من و تۆ و هەموومانە، دێت تا هەرچی خراپەو ناڕەحەتییە لەناوی ببات.

ئەو باوکمانە و سەرکردە و پێشەوا و خۆشەوویستی هەموومانە!

باهیلە: کێیە؟

ماکوان: ناوی محمدی کوڕی عەبدوڵڵایە پیاوێکی بەڕێزە بەدوای ئەودا دەگەڕێم، ئەیناسیت؟

باهیلە: ئەی چۆن نایناسم ئەوە دەستپاک و ڕاستگۆی شاری مەککەیە، خۆشەوویستی هەمووومانە، هاوکارمانە هەمیشە دەم بەخەندە و دەم بەپێکەنینە، ئەو خۆشەوویستە و یارمەتیدەری هەژارانیشە.

ماکوان: ئەتوانی بمبەیتە خزمەتی؟ چیت دەوێت بۆ دەکەم.

باهیلە: بەسەرچاو کەی پێتخۆشە با بڕۆین؟

ماکوان: جارێ با بڕۆین، بزانم نومەیر و دەوارەکەی خۆمان بدۆزمەوە، دوایی دێمەوە بۆلات.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

باهیلە: ئەو کەسە کێیە و بۆ چیتە، بازرگانی لەگەڵ دەکەیت؟

بازرگانێکی دەستپاکە دڵنیابە!

ماکوان: نا هەردوو قاچەکانی ماچ دەکەم و دوایش دەستەکانی دەنێم بەدڵمەوە تێر تێر دەیگوشم بەخۆمەوە، بەڵام ئێستا دەڕۆم دوایی دەگەڕێمەوە بۆ لاتان.

باهیلە: مەڕۆ با نەفیسە تۆزێک نان و ئاوت بۆ بنێت بیخۆ.

نەفیسە نانی بۆ هێنام، چاوەکانی هەروەک بوسەینە دای لەدڵم، لێم وەرگرت و وردە وردە ڕۆشتم، کەوتمە ڕێ بۆ نزیک بادیە و ژێر دەواری کۆنی خۆمان، لەدڵیشمدا بوو زەمەنەکە گۆڕاوە هەر دەمووت ئاخۆ ئەوان لەوێ مابن یاخوود چییان بەسەر هاتووە؟

نزیک بوومەوە لە دەوارەکان هەمووی وەکوو خۆی بوو، بەڵام تەنها نومەیرم بینی ئەویش وەکوو خۆم نەگۆڕابوو، لەناو دەوارەکەدا دانیشتبوو وەکوو چاوەڕێی من بکات وابوو، یەکمان بینی و باوەشمان کرد بەیەکدا.

نومەیر: دەمێکەیە چاوەڕێتم، خۆشحاڵت کردم بە هاتنەوەت.

ماکوان: ژیانم زۆر گۆڕاوە، بەڵام ڕازیم بەو مەرجەی بگەمە خزمەتی.

نومەیر: ئەتەوێت چی بکەیت دوای ئەوەی بە خزمەتی گەیشتی؟

ماکوان: سیرەکەی دەنووسمەوە و ژیانی باس دەکەم بۆ خەڵکی سەردەمی خۆمان وەکوو خۆی، دەستی و قاچ پێغەمبەر ﷺ ماچ دەکەم.

لە دیدو بۆچوونی خۆمەوە ڕەهەندەکانی ژیانی ئەو خۆشەوویستە ﷺ جیاوازتر بناسێنم، وەک ئەوەی کە خەڵکانی تر باسیان کردووە مەبەستی من لە لەدایکبوونی تا وەفاتی نییە، بەڵکوو خوێندنەوەی هەموو ڕەهەندەکانی ژیانە لەم گەڕانەم بە شوێنی دا، ژیانە بۆن خۆشەکەی ورد و درشتی تاڕادەیەک بنووسمەوە.

کەواتە لەم گۆشە نیگاوە پڕۆژەیەکمان دەست پێکردووە نومەیر وایە؟





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نومەیر: وایە؛ ئەگەر بۆمان بکرێت سەرکەوتووبین پڕۆژەیەکی نوورە.

ماکوان: بە پشتیوانی خوا ناویشی دەنێم نوور، چوونکە خوای گەورە بەنوور باسی کردووە، دەمەوێت ئاشکرای بکەم بۆ خەڵکی بزانین سەروەرمان پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە پڕۆژەی بینا کردنی مرۆڤ دا چۆن هاوەڵانی پەروەردە کردووە، ئێمەش لە سەر مەنهەجی ئەو ڕێدەکەین.

بیناکردنی هەموو بوونیادێک پێویستی بە پلان و کۆکردنەوەی وزە و تواناکانەوەیە کە پێشتر دەبێت خۆتت بۆ ئامادە کردبێت، ئەم بوونیادەش کە دەستمان پێکردووە بینای ئیسلامە کە ئێستا لە بەردەستماندایە، بەڵام سەروەرمان چۆن خەڵکەکەی لەسەر پەروەردە کردووە. ئەوە ئامانجی منە؛ هەموو هەوڵێکم دەخەمە کار، بەڵکوو خوای گەورە لەم ڕێگایەوە لەبەر خۆشەوویستی ئەو پێغەمبەرە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە دڵی مندا هەوڵێک بێت بۆ ئەوەی کە ببێتە خێرێکی نەبڕاوە، بەڵکوو نەوەکانمان سوودی لێوەربگرن کە هەرچەندە بەوەی نازانم ئەوەندە بە شێوەیەکی نایاب بینووسم، بەڵام ئەم تەپوتۆزە کە ناوی ماکوانە هەر ئەوەندەی لێهەڵدەسێت. وەک مەحووی لە بەحری نووری خۆیدا دەفەرمووێت: بەڵکوو ببێتە بووردەیەکی کوردی

منیش دەڵێم: بەڵکوو هەژمار بکرێت لە سیرەی مووبارەک و بۆنخۆشی پێغەمبەرمان صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

نومەیر: چۆن سەردی[٣٦] ژیانی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەنوسیتەوە؟

ماکوان: سەرەتا دەگەڕێین بزانین چی دەبینین و دەبیستین و وردبینی بۆ دەکەین، باس لە هەر وێستگەیەکی ژیانی سەروەرمان دەکەم. دەمەوێت ئەوە بگاتە خوێنەر بۆ سەروەرمان ئەم کارەی کردووە، هۆکاری چییە و حیکمەت لە کارەکانی سەروەرمان کە کراوە چین، سرووشتی ئەو ڕووداوانە چۆن بووە، ئەو بۆچوونە بۆ دەربڕاوە لەو کات و سەردەمەدا؟

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٦] ـ شێواز.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەم لێوردبوونەوەیە دەتوانین بگەینە ئەو ئامانجەی کە دەمانەوێت، ئەویش بینا کردنی مرۆڤی موسڵمانە تا بتوانین ئوممەتەکەی لەسەر بینا بکەین کەچۆن پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بینای کردووە.

زۆربەی خەڵکی چیرۆکی ژیانی سەروەرمان لە لەدایکبوونی تا وەفاتی دەزانێت، یاخوود لە پێغەمبەرایەتی تاکو کۆچی. زۆرێک لە جەنگەکان و غەزاکان شارەزان، تەنانەت لێکۆڵینەوەی باشی بۆکراوە، بەڵام ئامانجی من و تۆ لەم باسانەی دوایماندا ئەوەنییە، بەڵکوو ئەوەیە چی لە پشتی پەردەوە هەیە ئاشکرای بکەین، واتە بەزمانی سەردەم کەوالیسەکان ڕووماڵ بکەین بۆ خوێنەر و بۆ خەڵکی تریش بە گشتی بەدەنگ و نووسین.

بۆ نموونە وەڵامی ئەو پرسیارانەمان دەست دەکەوێت لەم باسەدا، پرسیار بکەین و بڵێین بۆ یەکەمجار ئەبوو بکر بانگکرا بۆ ئیسلام یان خاتوو خەدیجە؟ بۆچی زەیدی کوڕی حاریس و عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب بانگێشتکران؟ بۆ بانگەوازەکە لەسەرەتاوە بە ئاشکرا نەبوو؟ بۆ گەل و هۆزەکەی دژایەتیان کرد؟ ئایا محمد بانگەوازی بۆ ڕاستی و حەق نەدەکرد بۆ نەیتوانی لەسەرەتاوە گەلەکەی قەناعەت پێبکات؟ بۆ بانگەواز لەوکاتەدا ئاشکرا دەکرێت مەبەست لەو کاتە چییە؟ زۆر پرسیاری تر بە پشتیوانی خوا ئەگەر تەمەن باقی بوو ڕوونیان دەکەینەوە جێپێکانی هەڵدەگرینەوە بە شوێنی دا دەڕۆین.

ئامانجی دووەم ئەوەیە وەڵامی ئەو عەلمانی و بێباوەڕانە بدەینەوە کە محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەک خۆی ناناسن و مووعجیزەکانی ئاشکرا دەکەین لە ڕووی سیاسی و فیکری و بەڕێوەبردن و تەنزیم...هتد.

دەیان هۆکار هەبوون بۆ ئەوەی خەڵکی ڕوو لە ئیسلام وەرگێڕن، ئایا دەشێت ئەو هۆکارانە لەم سەردەمەدا دووبارە بێتەوە؟ ئەی چۆن پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕووبەڕووی وەستایەوە و دوژمنانی بە چی ئامرازێک دژایەتیان کرد؟ بە کام هۆکار توانی چارەسەری کێشەکان بکات؟ ئەی چۆن خەڵکی مەککە موسڵمان بوون؟

نومەیر: دەی با بڕۆین منیشت بۆ ئەو کارە مووبارەکە تەشویق کرد، بۆچی دانیشتوویت هەستە بڕۆین هەنگاو هەڵبهێنەرەوە، ئەم هەموو پرسیارە چییە دەیکەیت و منیشت سەرقاڵ کرد، با هەوڵ بدەین وەڵامان دەست بکەوێت.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: ئەم پرسیارانە هەموویان چاکەی ئەوەیان هەیە کە چۆن بتوانین لە سەر ژیانی پێغەمبەرمان صلی الله علیه وعلی آله وسلم بنیادی کەسایەتی خۆمان بکەین .

دیسان پرسیار دەکەم و دەڵێم: بۆچی پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم فەرمانی کرد بە هاوەڵان -ڕەزامەندی خوایان لێبێت- کۆچ بکەن بۆ حەبەشە؟ چی لە پشت کۆچی موسڵمانان هەیە بۆ حەبەشە؟ بۆ یەمەنی هەڵنەبژارد یان جێگایەکی تر یاخوود میسر یان عێراق؟

بۆچی هەموو ڕوویان کردە شاری مەدینە؟ بۆچی موسعەبی کوڕی عومێری نارد بۆ ئەوەی خەڵکی تر فێر بکات، بۆ ئەبوو بەکر نەبوو یاخوود عومەر یان بۆ هاوەڵێکی تری هەڵنەبژارد؟

بۆ لە مەککەوە بۆ شاری تائیف تەشریفی برد؟ بۆچی تائیفی هەڵبژارد؟

هەموو ئەم وێستگانەی کەباسم کرد ئەگەر شیکاری بۆ بکەین یارمەتیدەرە بۆ وەڵامی ئەو ئامانجەی کە دەمانەوێت بەم شیکارییە مەیدانییە لەخزمەتی پێغەمبەردا بین نومەیر گیان؟

ئەم پرسیارانە دەتوانێت پایەی بینای بوونیادەکە دابمەزرێنێت، کە ئەویش مەبەستی ئێمەیە، چوونکە ئیتر بۆمان دەردەکەوێت چۆن سەروەرمان بنیادی کەسایەتی هاوەڵانی داوە کە توانییان دوو ئیمپراتۆری گەورەی دوونیا بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان لە ماوەیەکی زۆر کەم دا موسڵمان بوون.

دڵنیاتان دەکەمەوە موسڵمانان ناتوانن هیچ بکەن ئەگەر جێگا پێکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم هەڵنەگرنەوە پلانەکانی ئەو پیادە نەکەن، بێئەوەی یەک خاڵ بەجێبهێڵین، واتە خاڵ بە خاڵی دەبێت پیادە بکرێت، ئەوکات دەتوانین بوونیادی ئەم کۆمەڵگایەی خۆمان بکەین.

موسڵمانان سەرکەووتنی تەواوەتی بە دەست بێنن، بەڵام گرنگە بزانین چۆن ژیانی پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم قۆناغکاری بکەین، لەگەڵ ڕەوشی خۆماندا بیگونجێنین و لێیوردبینەوە و توێژینەوە دەکەین بۆ ئەو کات و ڕەوشەی ئەو بڕیارانەی تێدا دراوە، ئیتر بەو پێیە دەگەینە ئەو ئامانجەی کە دەمانەوێت.

لێرەوە سیرەکە دەست پێدەکەم، بەڵام بە شێوەیەکی کلاسیکی نا بەڵکوو بەو شێوەیەی کە ئاماژەم پێدا مەیدانی، هەموو لەخزمەتیدا دەبین و بە شوێنیدا دەڕۆین و دەگەڕێین و خۆمان




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

قسەی لەگەڵ دەکەین، واتە لە سەردەمی وەحییەوە دەست پێدەکەین کە چۆن بوو بە پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم، مانای ئەوەیە نییە لە ژیانی پێش پێغەمبەرایەتی محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەم بکەینەوە، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە کە ئێمە پرۆژەکەی خۆمان بەرینە پێشەوە، ئەویش گۆشە نیگای خۆمان ئەوەبوو کە بینای کەسایەتی خۆمان و ئوممەتەکەمان بکەین؟

مەبەستی منیش لێرە دا ئەوەیە کە لە کارە مەیدانییەکەماندا ڕاستە بۆ خۆی مێژوو زاڵە بەسەریدا، بەڵام هەمووی لە بوواری شەرعی ئیسلامدایە، ئیسلام لەسەرەتای وەحییەوە دەست پێدەکاتکەواتە بۆیە لێرەوە دەستمان پێکرد ئێمە بە شەریعەتی ئیسلام بینای کەسایەتی خۆمان دەکەین لە ژیانی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم.

وەرە با بڕۆین بۆ ماڵی باهیلە، ئەو لەماڵەوە چاوەڕێیە بمان بات بۆ ماڵی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم.

نومەیر: بابڕۆین...

ماکوان: پێش ڕۆشتنمان ئەو منی ئازاد کرد بە ئاڵتوونەکەی بوسەینە، ئەگەر پارەمان لایە با بیدەینەوە، من هیچ پارەم پێ نییە.

نومەیر: بۆ گیرا بوویت؟ جا چی زۆرە پارە، ئەوە لەپشتی ئەو ئەسپە بۆم ئامادە کردوویت لایەکی پڕە لە ئۆقیەی ئاڵتوون و درهەم، لەژێر ئەو دەوارەی لای مەڕەکاندا چەندین ئاڵتوونم شاردۆتەوە بڕۆ تەماشا بکە چیت بەدڵ بوو بیهێنە.

ماکوان: دەستخۆش!

چووم جوانترین ئاڵتوونی لە ژێر دەواری مەڕەکاندا کە نومەیر شاردبوویەوە بۆ هەڵبژێرم، پارچەیەک ئاڵتوونی جوانم بۆ هەڵبژارد لەبەر ئەوەی زۆر لە بوسەینە دەچوو!

بڕیارماندا دوای ئەوەی ماندوویەتییم دەربچێت ئەم شەو بمێنینەوە لە بادیەی خۆمان و دوای لەگەڵ نومەیر بۆ بەیانی کەوتینە ڕێ بۆ مەککە.

لەڕێگا لەگەڵ نومەیر قسەمان دەکرد باسی ئەوەمان دەکرد کە ئێستا کاتی وەحییە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

باسی ئەوەم بۆ نومەیر دەکرد کە وەحی لە قورئان دا چۆن باس کراوە، ئامانج چییە لە باس کردنی؟

هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ لە ئەشکەوتی (حیرا) ئەو دەمە کە دەستپێدەکات کاتێکی یەکلا کەرەوەیە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، من وای دەبینم سات و کاتێکی ئەوەندە گرنگ و گەورەیە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بەڵکوو تا ڕۆژی قیامەت پەندو عیبرەتی لێوەردەگرین.

ساتە وەختی هاتنی وەحی واتە ژیان لە تاریکییەکی بێوێنە دا دەژیا، مرۆڤایەتی بەرەو سەرگەردانی دەڕۆیشت هیچ ڕەوشت و بەهایەکی کۆمەڵایەتی تەنانەت لە ڕووی یاساو دەستووری گەلانەوە نەمابوو، مرۆڤایەتی بەرەو نەهامەتی و سەرلێشێواوی هەنگاوی دەناو ئاگات لەم ڕەوشەیە کە من و تۆی تێدا دەژین چی یاسایەکی دارستانییە؟

تا خوای گەورە وەحی نارد و لە سوورەتی المائدة دا فەرمووی:

﴿يَهْدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ [المائدة]

بەڕاستی لەلایەن خواوە ڕووناکییەکی ئاشکراتان بۆ ڕەوانە کراوە (کە محمد پێغەمبەرە) هاوڕێ لەگەڵ کتێبێکی ئاشکرادا (کە قورئانە)، (بێگومان) خوا بەو قورئانە پیرۆزە هیدایەت و ڕێنمونی ئەو کەسانە دەکات کە بە شوێن بە دەستهێنانی ڕەزامەندیی ئەودا وێڵن، بەرەو ڕێبازەکانی ئاشتی و ئاسوودەیی دەیانبات، بەفەرمانی خۆی لە تاریکستانەکان دەریان دێنێت و ڕزگاریان دەکات و دەیانخاتە ناو ڕووناکییەوە، ڕێنمونییان دەکات بۆ سەر ڕێگەو ڕێبازی ڕاست و درووستی (دینداری و خواناسی و چاکە).

زۆر دەبیستین لەسەر ئەم ڕووداوە گەورەیە کە هاتنی سرووشە بۆ سەروەرمان محمد ﷺ، بەڵام کاممان حەقی خۆیمان داوەتێ تا ئێستا قەدری گەورەیی ئەم ڕووداوەمان نەگرتووە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەگەر مرۆڤ لێوردبوونەوە بکات واتە خوای پەروەدگارمان نێرراوی دەنێرێت لە مرۆڤ کە پەیامی خۆیمان بۆ ڕوون بکاتەوە، ئەمەش بۆ خۆی منەتێکی زۆر گەورەیە بەسەرمانەوە ڕێزو حورمەتێکی زۆرە لە مرۆڤ گیراوە. پەروەردگارمان لە سوورەتی آل عمران دەفەرمووێت:

﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾﴾ [آل عمران].

بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران بەوەی کەلە ناو خۆیاندا پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوون کە ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە دڵ و دەروونیان پاک و پووخت دەکاتەوە و فێری قورئان و داناییان دەکات، هەرچەندە پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆچوو بوون.

پرسیار لێرەدا ئەوەیە: لە کاتێکدا مرۆڤ چەندە خۆشحاڵ دەبێت کە لە لای پادشایەکی دنیاییەوە، یاخوود سەرۆک وڵاتێک نامەیەکی بۆ بێت ئامۆژگاری بکات، وا هەست دەکەیت کە ئەو پادشا و سەرۆک دەوڵەتە تۆی خۆش دەوێت و ڕێزێکی زۆری لێناوی.

داخۆ چەندە خۆشحاڵ بیت لە لایەن ئەم پادشایەوە کە موڵکێکی کەمی لەبەر دەستدایە و ناتوانێت خۆی بپارێزێت لەوەی کە تووشی ئازار و نارەحەتی نەبێت، یاخوود لە مردن و ژیان هیچی بەدەست نییە؟!

کەواتە خوای گەورە بە تواناو دەسەڵات و هێزو قودرەتمەندی خۆی پێغەمبەرێکی بۆ ناردووین و پەیامێکیشی پێیدا ڕەوانە کردووە، مرۆڤ بۆ خۆی زۆر بوونەوەرێکی بچوک و لاوازە و لەسەر ئەم زەمینە دەژی. کە ئەستێرەیەکە لەناو قاترلیۆن ئەستێرەدا لە ئاسمانی یەکەمدا هەیە، یاخوود لە کۆمەڵەی کاکێشاندا کە بەچاو نابینرێت ئەوەندە بچوک دەبێتەوە لەناو ئەم هەموو گەلە ئەستێرەدا، کەچی خوای گەورە پەیامی خۆی بۆ مرۆڤ ناردووە!

ئاخۆ قەبارەی ئەم زەمینە چەندە لە چاو هەموو گەردووندا؟ یاخوود قەبارەی مرۆڤ چییە لە چاو زەویدا؟ یان قەبارەی مرۆڤ لە چاو گەردووندا چییە؟ یاخوود قەبارەی مرۆڤ بەرانبەر بە فریشەتەکان چییە؟





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

زۆرێک لە خەڵکی قەدری ئەم ڕووداوە ناگرن کە هاتنی سرووشە، چوونکە قەدری خوای گەورە نازانن.

خوای پەروەدگارمان پێویستی بە ئێمە نییە، پێویستی بە هیچ شتێکی تریش نییە لەم گەردوونەدا، نە چاکە و نە خراپەی ئێمە هیچ کاریگەرییەک لەسەر خوای گەورە درووست ناکات، ئەو لە ڕەحم و لوتف و کەرەمی خۆیەتی کە نێردراوێکی لە مرۆڤ بە پەیامێکەوە بۆ ئێمە ڕەوانە کردوین، کە مژدەمان دەداتێ بە بەهەشت و دەمانترسێنێت لە دۆزەخ، بۆ ئەوەی کردەوەی باش بکەین. ئەو پەیامەشی کە ناردوویەتی بە بەڕێزترین فریشتەدا ناردوویەتی کە جوبریلە - سەلامی خوای لێبێت- بۆ بەڕێزترین مرۆڤی ناردووە کە محمدە صلى الله عليه وعلى آله وسلم و بەڕێزترین وتەی ناردووە کە قورئانە.

نومەیر: هەندێک جار بە ڕابرودوو قسە دەکەیت و هەندێک جاریش لەناو واقعیی و ڕەوشەکەدا.

ماکوان: ناحەقم مەگرە زەمەن و سەردەمەکەم لێ تێکچووە، کێشە نییە خۆ دەزانیت مەبەستم ڕووداوەکانە بەگشتی.

کەواتە لەو ساتە وەختەوە ئەو پەیامە کە وتەی خوای پەروەردگارمانە، دەستووری ژیان دەبێت لەسەر زەویدا تا ئەوکاتەی زەوی لە ناودەچێت.

ئەم ڕووداوەی کە مرۆڤی بەڕێز کردووە لە سوورەتی الإسراء دا دەفەرمووێت:

﴿۞ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ۞﴾ [الإسراء].

بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لەنەوەی ئادەم گرتووە و بەسەر وشکانی و دەریادا (بە جۆرەها هۆکاری گواستنەوە) هەڵمان گرتوون، لە ڕزق و ڕۆزی چاک و جۆراوجۆر بەهرەوەرمان کردوون (لە خۆراک و پۆشاک و ماڵ و ناوماڵ و...هتد) بەڕاستی ئێمە ڕێزی زۆری ئەوانمان داوە بەسەر زۆربەی ئەو بەدیهێنراوانەدا کە درووستمان کردوون (لەهەموو ڕوویەکەوە).



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سرووش جوانترین و گەورەترین ڕێزە کە لەمرۆڤایەتی گیراوە، لەگەڵ ئەو ڕێزەی کە پەروەردگار گرتوویەتی لە مرۆڤایەتی پێغەمبەرێکی ناردووە بە دەستوورو مەنهەجێکەوە تا مرۆڤ بتوانێت ژیانی خۆی لەسەر ڕێکبخات، لە هەموو فەرهەنگ و ڕەهەندەکانی ژیانەوە، بەڵام مرۆڤ ئەم ڕێزە هەست پێناکات و پێشێلی دەکات، ڕوو دەکاتە هەندێک خۆشی ژیان و شەهوەتی خۆی تێردەکات، تا ئەو کاتەی لە ناو خۆشی و ئەو شەهوەتانەدا ون دەبێت، چوونکە قەدری مرۆڤایەتی و ڕێزی خۆی نازانێت! تەنانەت زۆر جار ئازاری خەڵکی دەدات، ئەشکەنجە بەکار دێنێت، هەست بەوە ناکات مرۆڤێک کە ڕێزی لێگیراوە ئازار و ئەشکەنجە و زوڵم لە مرۆڤێکی ڕێزلێگیراو لای خوا ئەدات!

زۆر جاری تر هەیە ڕێزو قیمەتی مرۆڤ دەچێتە خوار ئاژەڵیشەوە، هیچ ئەرزشێکی نامێنێت.

بیرکردنەوە لە سرووش یەکخستنی هزری مرۆڤەکانە بۆ یەکتری و تەنانەت خودی مرۆڤ خۆشی، تێگەیشتنە لە چەمک و واتەی برایەتی مرۆڤایەتی لەسەر زەویدا، کە چۆن بەیەکەوە ژیان بەرنەسەر.

سرووش: بریتییە لە نامەی خوا بۆ سەر زەوی بۆ ئەوەی ڕاییگەیەنێت بە مرۆڤ و ئاگاداری بکاتەوە کە چی بکات و چی نەکات.

سرووش: بریتیە لە درەخشانی ڕووناک و ڕێنموونی و ڕێبەری.

سرووش: تەنها تەکلیفات و داواکردن نییە، بەڵکوو نیعمەتی خوایی و ڕەحمەتی پەروەردگارمانە بۆ مرۆڤ.

خوای کردگارمان ئێمەی درووستکردووە هەر ئەویش دەزانێت چی بەکاردێت بۆ ئێمەی مرۆڤ، پەروەدگارمان پەی بە ڕابردوو ئێستا و داهاتوومان دەبات ئەو ئاگادارە بەسەرمانەوە زانیاری بەسەر هەموو شتێکدا هەیە لەم بوونەدا، ئەم وەحییەی بۆ ناردووین تاکو ببێتە ڕێبەرێک و ڕێنموونیمان بکات بۆ کاری چاکەو فەرمان بەچاکە ڕێگری لە خراپەو کاری خراپە.

شوێنکەووتنی وەحی خۆشبەختی دوونیا و قیامەتە، سەرپێچی کردنیشی نەگبەتی و نەهامەتی هەردوو دونیایە!





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەگەر لێكۆڵینەوەیەكی ورد لەسەر وەحی بكەین دەبینین: لە بیابانێكی وشك بێ ئاو پڕ لە سەراب، كە بە درێژایی ڕۆشتن لە تراویلكە زیاتر هیچ نابینی، تۆش لەو بیابانەدا تینوو، ماندوو و شەكەت ڕێگات لێ ون بووە، بۆ توشنە[٣٧] لەپێك ئاو ئامادەی سەروەت و سامانت ببەخشیت، كەسێك دێت لە ناكاودا دەتگەیەنێتە پاڵ كانیاو سەوزاییەكی خۆش و فێنك، تێر ئاو دەخۆیتەوە لە ون بووی ڕێگا ڕزگارت بوو، ئەوكەسەی ئەو كارەی كرد تۆی ڕزگار كرد وەك نموونەیە وەحییە كە دەستی مرۆڤایەتی دەگرێت لە تەنها و خەمۆكی و ناڕەحەتی ژیان بەرەو خۆشی و شادی و كامەرانی ژیانی هەردوو دوونیا دەیانگوزەرێنێت كە كۆتاییەكەی بەهەشتە. پەروەدگارمان لە سوورەتی طه دا دەفەرمووێت:

﴿... فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴾ [طه].

هەر كاتێك هیدایەت و ڕێنمویی من بۆ ئێوە هات، ئەوەی شوێنی بەرنامەكەم بكەوێت، نە گومڕا دەبێت نە ناخۆشی و ناڕەحەتی و ناسۆری دێتە ڕێی.

مرۆڤ دەتوانێت چارەنووسی خۆی هەڵبژێرێت و دەست نیشانی بكات، بێگومان بە وەحی، هەركەس شوێنكەوتووی وەحی بوو ئەوە سەربەرزە لە هەردوو ژیاندا، بەڵام ئەگەر گوێ بۆ سرووش نەگرێت و شوێنكەوتووی نەبوو لە هەردوو ژیاندا سەرگەردانە.

سەروەرمان پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت: لە خەوندا بینیم حەزرەتی جوبریل لای سەرمەوە وەستاو میكائیل لای قاچمەوە، یەكێكیان بە هاوڕێكەی وت لەو دوو فریشتەیە: نموونەیەكی بۆ بهێنەرەوە، وتی: گوێكانت ئاوەڵا بكەو جوان هەڵیانبخە بۆ بیستن، دڵ و هۆشت واڵابكە، بەڕاستی نموونەی تۆ (ئەی محمد) لەگەڵ نموونەی ئوممەتەكەت، هەروەك نموونەی پادشایەك وایە كە باڵاخانەیەك درووست بكات، پاشانماڵێكی لێ دابمەزرێنێت، پاشان لەناو ئەو ماڵەدا خوانێكی تێدا برازێنێتەوە، پاشان كەسێك بنێرێت هاوار لەخەڵكی بكات بۆ ئەو خوانە، هەر كەس وەڵامی ئەو كەسەی داوە بۆ خوانەكە دێتە سەر سفرە و خوانی خواردنەكە، ئەوەشی وەڵامی نەدایەوە و تێپەڕی و وازی لێهێنا، دەی محمد بزانە ئەو پادشایە ئەو خوای كردگارەیە، ئەو باڵەخانەیە ئیسلامە، ئەو ماڵەیش بەهەشتە، تۆش ئەی محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم

---

[٣٧] ـ مشتێ ئاو.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەو نێردراوەی، هەرکەس وەڵامی دایەوە ئەوا هاتۆتە ناو ئیسلام، ئەوەی بێتە ناو ئیسلام دەچێتە بەهەشت، ئەوەی هاتە بەهەشت لە خواردنی بەهەشت هەرچی تێدایە دەخوات[٣٨].

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە بوخاری دەگێڕێتەوە: هەرکەس گوێرایەڵی محمدی کرد ئەوا گوێرایەڵی لە خوا کردووە، یاخوود هەرکەس سەرپێچی لە محمد کرد ئەوە سەرپێچی لە خوا کردووە[٣٩].

هەروەها لەڕیوایەتی ئیمام ئەحمەد دا هاتووە: هەرکەس شوێنکەوتووی محمد بێت دەڕواتە بەهەشت، هەرکەس شوێنی نەکەوت ئازار دەچێژێت لە قیامەتدا ئازارێکی زۆر بەسوێ و ناڕەحەت[٤٠].

وەحی بانگەوازێکە بۆ بەهەشت، ئەو کەسەی شوێن ئەو بانگەوازە نەکەوێت چارەنووسی لە ئازارێکی زۆر بە سوێدایە.

من سەرم سوڕ دەمێنێت کە خەڵکی بەمە دەزانن، بەڵام گەورەیی و ڕێزی وەحی وەک خۆی ناگرێت، دێمەوە سەر ئەو باسەی کە پێشتر ئاماژەم بۆکرد هۆکارەکەی ئەوەیە کە قەدری هێزو دەسەڵاتی خوای نازانن، خواناسی وەک پێویست ناکەن.

﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ۝﴾ [الزمر].

خوانەناسان قەدری خوایان وەک پێوست نەگرت و ڕێزیان بۆ دانەنا، بەمەرجێک لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو گۆی زەوی پڕمشتێکی قودرەتی ئەو زاتەیە، ئاسمانەکانیش بەدەستی قودرەتی

---

[٣٨] عَن جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيُّ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا فَقَالَ: "إِنِّي رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّ جِبْرِيلَ عِنْدَ رَأْسِي وَمِيكائِيلَ عِنْدَ رِجْلَيَّ، يَقُولُ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: اضْرِبْ لَهُ مَثَلاً. فَقَالَ: اسْمَعْ سَمِعَتْ أُذُنُک، وَاعْقِلْ عَقَلَ قَلْبُک، إِنَّمَا مَثَلُک وَمَثَلُ أُمَّتِک كَمَثَلِ مَلِک اتَّخَذَ دَارًا، ثُمَّ بَنَى فِيهَا بَيْتًا، ثُمَّ جَعَلَ فِيهَا مَائِدَةً، ثُمَّ بَعَثَ رَسُولاً يَدْعُو النَّاسَ إِلَى طَعَامِهِ، فَمِنْهُمْ مَنْ أَجَابَ الرَّسُولَ، وَمِنْهُمْ مَنْ تَرَكَهُ، فَاللَّهُ هُوَ الْمَلِک، وَالدَّارُ الإِسْلاَمُ، وَالْبَيْتُ الْجَنَّةُ، وَأَنْتَ يَا مُحَمَّدُ رَسُولٌ، فَمَنْ أَجَابَک دَخَلَ الإِسْلاَمَ، وَمَنْ دَخَلَ الإِسْلاَمَ دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ دَخَلَ الْجَنَّةَ أَكَلَ مَا فِيهَا."

[٣٩] وفي رواية البخاري يقول: "فَمَنْ أَطَاعَ مُحَمَّدًا فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَى مُحَمَّدًا فَقَدْ عَصَى اللَّهَ".

[٤٠] وفي رواية أحمد يقول: "فَمَنِ اتَّبَعَهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ لَمْ يَتَّبِعْهُ عُذِّبَ عَذَابًا شَدِيدًا





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ڕاست و درووستی خوا پێچراوەن (ئاماژەیە بۆ دەستەڵاتی بێ سنووری ئەو زاتە)، پاکی و بێگەردی و بڵندی بۆ ئەو پەروەردگارە مەزنەی شایستەی ئەو زاتە لە کاتێکدا نەفامان هاوەڵی بۆ بڕیار بدەن و قەدری نەزانن.

ئەگەر خەڵکی ئەم تواناو هێزەی خوای گەورە وەک سیفاتە پیرۆزەکانی بناسن هەرگیز بەو شێوەمان لێبەسەرنەدەهات، لە هەموو دوونیادا ئەوەی ئەرزشی نەبێت موسڵمانە لە ئێستادا، هۆکارەکەی ئەوەیە شوێن وەحی نەکەوتووین، بەڵکوو شوێن ئارەزوو ویستی خۆمان کەوتوین. ئەم سرووشەی کە باسم کرد پەیامی خوای هەموو جیهانەکانە، بۆیە سیرەی بۆن خۆشی پێغەمبەر ﷺ بنەمایەکی سەرەکییە تا لێی تێبگەین، یان جوانتر بڵێم ژیانی پێغەمبەرمان ﷺ هەمووی هەر وەحییە، هەروەک خوای گەورە بۆمان باس دەکات لە قورئان لە ژیانی سەروەرمان دەفەرموویێت:

﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝﴾ [النجم].

بە ئارەزووی خۆی قسە ناکات، (ئەمەی کە ڕایدەگەیەنێت) بەدەر نییە لە نیگا (وەحی خوایی).

تەنانەت هەموو کارە سوونەتاکانیش هەر بە وەحی بووە لە لایەن خوای پەروەردگارمانەوە، ڕۆژووی سوونەت لە دووشەممە و پێنج شەممان داو ڕۆژە تاکەکان..هتد، هەموو سووننەتەکان و فەرزەکان لە ژیانی پێغەمبەرماندا ﷺ بە وەحی بووە، هەموو هەڵسووکەوتێکی هەر بە سرووش بووە ئەگەر تەنانەت هەڵەی بکردایە خێرا خوای گەورە جوبریلی دەنارد بۆی ڕاست دەکردەوە بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی چاوی لێبکەن، مەبەست لەم کارانە وەحییە بۆ ئەوە بووە کەخەڵکی لاسایی بکاتەوە چاوی لێبکەن.

﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ۝﴾ [الأحزاب]

سووێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو ڕێک و پێک هەیە تا چاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە،



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بە زۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو.

باشترین خێر بۆ مرۆڤ فێربوونی سیرەی پێغەمبەرە صلى الله عليه وعلى آله وسلم، چوونکە خێری دوونیا و قیامەتی تێدایە، هەموو زانستەکانیش لە سیرەی پێغەمبەردا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەبینیتەوە، تەنانەت ئەگەر سیرە نەزانی لە قورئانیش تێناگەیت!





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## هاتنی وەحی و چوون بۆلای پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم

بەدەم ڕێگاوە تا گەیشتینە ماڵی باهیلە گفتوگۆیەکی باشمان لەگەڵ نومەیر کرد، کە گەیشتین لەدەرگا تەختەکەیانم دا، پێم وتن دووکەسین دەتوانین بێینە ماڵەوە؟

نەفیسە وەڵامی داینەوە ڕێگەمان پێدراو لەگەڵ کوڕێکدا هاتن بەرەو ڕوومان و بەخێرهاتنیان کردین، کە چووینە ژوورەوە پارچە ئاڵتوونەکەم داوە بە باهیلە و زۆر سووپاسم کرد، پارچە ئاڵتوونێکی ترم هەڵبژاردبوو بۆ نەفیسە دامە دەستی و پێم وت سووپاسی ئەو شەهامەتەت دەکەم کەهاتیت ئازادت کردم.

ئاگام لێ بوو براکەی کە لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو پێی ناخۆش بوو بەتووڕەییەکەوە سەیرێکی کردم، ناحەقی ناگرم لەبەرچاویدا کوڕێک پارچە ئاڵتوونێک بدات بە خوشکەکەی وەکوو دیاری! بۆیە دەستم کرد بە بەر پشتوێنەکەمدا کیسەیەک درهەمم دایە، پێم وتن کە ئێمە قەرزاری ئێوەین زۆر کاری چاکەتان هەیە بەسەرمانەوە، چووم بۆلای باهیلە لەبەرچاویاندا سەریم ماچ کرد زۆر ڕێزم لێگرت.

بەڵام هەستم کرد نەفیسە چووە دڵم لەبەر ئەوەی شێوەی بوسەینەی زۆر تێدابوو، لەدڵی خۆمدا هێشتمەوە وام دانابوو بە نومەیر بڵێم جارێکی تر لەم زەمەنەدا ژن دەهێنمەوە!

چوومە لای باهیلە و وتم بابچین بۆ ماڵی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم هیچ نەبێت بەخزمەتی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە بگەین، دوای ئەوەی بەخزمەتی گەیشتین دێینەوە لەلاتان ئیسراحەت دەکەین.

باهیلە هەڵساو بردینی بۆ ماڵی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەبەر ئەوەی پیربوو زۆر بە هێواشی دەڕۆشت، هەرچی وتم با سواری ئەسپەکەی خۆمت بکەم قبوڵی نەبوو، دیاربوو نەیدەوێرا.

چووینە بەردەرگای ماڵی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەدەرگا درا خزمەتکارێکی ماڵی خاتوو خەدیجە کردییەوە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

باهیلە: محمد لەماڵە؟

خزمەتکارەکە: نەخێر لە ئەشکەوتی حیرا لە خەڵوەتدایە!

باهیلە هاتەوە بۆلام وتی: مانگی ڕەمەزانە لەم مانگەدا پیاوانی قووڕەیش دەچنە خەڵوەتەوە، ماوەیەک دەمێننەوە تا ئەم مانگە تەواو دەبێت!

ماکوان: بپرسە با خاتوو خەدیجە بێتە دەرەوە ئەو ببینین.

باهیلە (ڕووەو خزمەتکارەکە): خەدیجە لەماڵە؟ بانگی بکە قسەی لەگەڵ دەکەم.

خزمەتکارەکە: نا چووە لەگەڵ منداڵەکانیدا بۆلای گەورە و سەردارمان محمد خواردنی بۆ بردووە منداڵەکانیشی لەگەڵ خۆی بردووە بۆ بینینی باوکیان.

کەوای وت بڕیارمان دا لەگەڵ نومەیر بڕۆین بەرەو شاخی نوور کە ئەشکەوتی حیرای لێیە، ئەوانمان بە جێهیشت هەرچەندە لە ڕێگادا مەیمونێکی زۆری لێبوو هەموو برسی بوون داوای خواردنیان دەکرد ڕێگەیان لێدەگرتین بۆچوونمان بۆ شاخەکە. ئەو شاخە یەک پارچە مەیمون بوو.

نزیکی ئەشکەوتەکە بووینەوە بەهیچ شێوەیەک ئەسپەکانمان نەدەهاتن و هەنگاویان هەڵنەدەهێنایەوە، تا ناچار ئەسپەکانمان بەستەوە ویستمان بە پێ سەربکەوین بۆ ناو ئەشکەوتەکە بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بگەین.

هەرچۆن بوو کەوتینە ڕێ لەسەر داخستنێکدا ئەشکەوتەکەمان لێ ون بوو هەر دەگەڕاین نەمان ئەدۆزیەوە هەر لە جێگای خۆماندا بووین، دوای ماندووبوونێکی زۆر هەستمان کرد کە ئەمە شتێکی سادە نییە ناتوانین بچینە ئەو جێگایە و بۆمان نادۆزرێتەوە! بەڵام هەر جەختم دەکردەوە کە هەر دەچینە ناوەوە قاچ و دەستی پێغەمبەر گیان ﷺ ماچ دەکەم، بەڵام هەر ئەنجامی نەبوو زۆر خەفەتم خوارد.

زۆر ماندووبووین ئەشکەوتەکەمان نەدۆزیەوە، دڵنیابووم کە لەو دەورووبەرەدایە لەناکاو خەو دایگرتین چووینە بن تاشە بەردێک خەومان لێکەوت.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەڵساین لە خەو لەبەردەم ئەشکەوتی حیرا دا بووین لە خۆشیدا خۆم کرد بەناو ئەشکەوتەکەدا، کەچی کەسی لێنەبوو هەرچی هاوارم کرد یا رسول الله یا نبي الله صلى الله عليه وعلى آله وسلم، هیچ دەنگێک نەبوو نومەیریش وەکوو من دەگەڕا هیچ کەسی لێ نەبوو.

ماکوان: وەحی بۆ هاتووە گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە! من و تۆش زیاتر لە ڕۆژ و شەوێک خەومان لێکەتووە لە بن ئەو تاشەبەردە!

نومەیر: چۆن دەزانیت؟

ماکوان: چوونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ماوەی مانگێک دەمێنێتەوە لەم جێگایەدا، لێرە نەماوە واتە وەحی بۆ هاتووە گەڕاوەتەوە ماڵەوە، بەوەشدا دەزانم کە زیاتر لە شەو و ڕۆژێک خەوتووین ئەوکاتەی هاتین خاتوو خەدیجە و منداڵەکانی دەهاتن بۆ لای خواردنیان بۆ هێنا بوو لەوانەیە دوێنێ شەو وەحی بۆ هاتبێت کە شەوی قەدر بووە و گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە.

نومەیر: ئێستا چی بکەین بگەڕێینەوە بۆ مەککە؟

ماکوان: زۆرم برسیە چەند ڕۆژە نان و ئاومان نەخواردووە، با شتێک بخۆین بەڵکوو تۆزێک هێزمان تێبێتەوە.

چووینەوە بۆ لای ئەسپەکانمان، خواردن و شتەکانمان مەیمونەکان خواردبوویان، بەناچاری گەڕاینەوە بۆ بادیەی خۆمان لە ژێر دەواری خۆمانداماینەوە و لەوێ پشووماندا، دوای پشوودان لەگەڵ نومەیر کەوتینە قسە و باسی ئەوەمان دەکرد کە ئێستا بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم سەردەمی هاتنی وەحییە.

نومەیر: خاتوو عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە لە باسی هاتنی وەحیدا دەفەرموێت: پێش هاتنی وەحی چەند نیشانەیەکی هەبوو لەوانە بینینی خەون کە هەموو خەونەکان وەک پرشنگی بەرەبەیان دەهاتنە دی، ئەم خەونە بە شەش مانگ پێشهاتنی وەحی بەردەوام بوو لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئەمە سەرەتا بوو بۆ ئەوەی بزانێت ئامادە دەکرێت بۆ کارێکی گرنگ ئەویش پێغەمبەرایەتییە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەرچەندە ئەمە یەکەم ئامادەباشی نەبوو، بەڵکوو زۆر شتی سەیرتر باس دەکات، خاتوو عائیشە دەفەرمووێت: هەموو بەردەکانی مەککە سڵاو و درورد و خۆشەوویستییان بۆ پێغەمبەر ﷺ دەنارد سەروەرمان ﷺ دەفەرمووێت: بەردێک نییە لەشاری مەککە و دەوروبەیدا بەلایدا ڕۆشتبێتم و سڵاوی لێنەکردبێتم، پێشهاتنی وەحی پیش بوون بە پێغەمبەر ﷺ سەروەرمان دەفەرمووێت هەموو ئەو بەردانە دەناسمەوە کە سڵاویان لێدەکردم.[٤١]

پێش بوونی بە پێغەمبەر ﷺ لەتکردنی سنگی مووبارەکییەتی کە ئەم ڕووداوە لە سەحیحی بوخاری و موسلیم و مەسنەدی ئیمان ئەحمەد و سەحیحی ئیبن حەبان و زۆرێکی تر لە گێڕەرەوانی فەرموودەکان هاتووە، لە تەمەنی منداڵیدا سینەی لەتکراوە ئەو خاڵە ڕەشەی کە بەشی شەیتانە لەسەر دڵی لابراوە، پاشان پاک شۆراوە بە ئاوی زەمزەم و لە ناو قاپێکی ئاڵتوونی دا، ئەنەسی کوڕی مالیک - ڕەزامەندی خوای لێبێت- دەفەرمووێت جێگای دوورینەوەکەی بە سینگی پێغەمبەرەوە ﷺ دیار بوون.

ماکوان: ڕاستە منیش لە کتێبەکەی فەرغەلی برات دا خوێندومەتەوە.

نومەیر: جا حیکمەتی ئەو شەقکردنە ئامادەکاری بووە بۆ وەرگرتنی وەحی بەدڵێکی پاک.

ئەم ڕووداوە باسێکی ئیمانییە بۆ خەڵکی بەگشتی بۆ خەڵکی شاری مەککەی ئەو سەردەمە و سەردەمی خۆشمان، جۆرێکە لە ئامادەکردنی خەڵکی و بەتایبەت پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی ئامادەیی ببێت کە لە داهاتوویەکی نزیکدا دەبێتە پێغەمبەر و وەحی بۆ دادەبەزێت.

ئەم هەواڵی سنگ لەتکردنی پێغەمبەر ﷺ لە ناو شاری مەککەدا بڵاو بوویەوە، تەنانەت لە ناو هەموو عەرەبدا دەنگی دایەوە زۆر جار محمدیان بەوە دەناسیەوە دەیانووت ئەو لاوەی کە سنگی شەقکراوە لە لایەن فریشتەیەکەوە، هەموو خەڵکی ئامادەکرا بۆ ئەوەی ئەم لاوە لە داهاتوودا کارێکی گەورەی پێدەسپێردرێت لە ڕووی ئیمانییەوە ئەو دەمە و ئێستا و داهاتووشمان، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە توانا و قودرەتی خوای پەروەردگارمان چەندە گەورەیە، ئێستا نەشتەرگەری دەکرێت بە دەستی مرۆڤ جێگای سەرسووڕمانی کەس نییە، بە

---

[٤١] "إِنِّي لَأَعْرِفُ حَجَرًا بِمَكَةَ كانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُبعَثَ إِنِّي لَأَعْرِفُهُ الْآنَ."، صحيح مسلم، رقم ٥٩٣٩



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پێشکەووتنی زانستی هەژمار دەکرێت، بەڵام خوای پەروەدگاری ئێمە لەوسەردەمەدا بە فەرمانی خۆی گەورەترین نەشتەرگەری سنگ کراوە کە قورسترین جۆری نەشتەرگەی بووە بە فریشتەکان کردوویەتی بۆ ئەوەی ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ مرۆڤایەتی و توانا و هێزو گەورەیی خۆی بۆ مرۆڤەکان نیشان بدات و بە خەڵکی ئەو سەردەمە بڵێت کە محمد کەسێکی تایبەتە.

هەرچەندە ئەم باسە بۆ خۆی باسکردنی قورسە لە ڕووی بڕواهێنان پێی هەڵبەت بۆ ئیمانداران نا، بەڵکوو بۆ بێباوەڕان. هەروەک ڕووداوی ئیسراو میعراج و لەتکردنی مانگ و زۆرێکی تر لەو ڕووداو و پەرجۆیانەی کە مرۆڤ لەبەردەمیدا دەستەوسانە لەسەردەمی پێغەمبەرماندا صلی الله علیه وعلی آله وسلم ڕوویداوە، هەمووی بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤ بە ئەنجام گەیەنراوە و بۆتە moوعجیزە.

ماکوان: ڕاستە منیش بەخزمەت فەرموودەیەک گەیشتووم لە بوخاری دا کە لە خاتوو عائیشە دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: سەرەتای دەستپێکی وەحی بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم بە خەونی باش و چاک دەستی پێکرد، هەموو خەونەکان وەک گزنگی بەرەبەیان دەهاتنە دی، پاشان حەزی بە تەنهای دەکرد، دەچوە ئەشکەوتی حیرا لەوێ بیری دەکردەوە بۆ ماوەیەک لەوێ دەمایەوە لە کەسووکاری دوور دەکەوتەوە، ئەم ڕەوشەی بەردەوام دەبوو جاری واهەبوو درێژەی دەخایاند، زۆر جار خاتوو خەدیجە لە ئەشکەوتەکە خۆراکی بۆ دەبرد، بەردەوام دەمایەوە بە تەنهایی تاکو خوای گەورە وەحی بۆنارد لە ئەشکەوتی حیرا[٤٢].

خوای گەورە وایکرد لە پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم کە ئەو ماوەیە هەست بە بیر کردنەوە و تێڕامان بکات لەم گەردوونە، بە تایبەت لە مانگی ڕەمەزاندا بیری دەکردەوە دەبێت ئەم گەردوونە هەروا بە بێهودەیی درووستکرا بێت؟ یاخوود خوایەک نەبێت کە سەرپەرشتی هەمووی بکات؟ هەرچەندە عەرەب بە شێوەیەکی گشتی خوایان دەپەرست، بەڵام لە ڕووی بەندایەتییەوە هاوبەشیان بۆدائەنا، بەڵام لە ڕووی کردگارییەوە بڕوای تەواویان هەبوو کە خوا درووستکاری ئەم گەردوون و بوونەیە، بەڵام نەیاندەزانی چۆن خوا بپەرستن بە ڕاست و

---

[٤٢] "يروي البخاري قصة بدء الوحي عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّهَا قَالَتْ:أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وعلى آله وسلم مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ.ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلاَءُ، وَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ - وَهُوَ التَّعَبُّدُ - اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَنْزِعَ إِلَى أَهْلِهِ، وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِک، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ، فَيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا، حَتَّى جَاءَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ".



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

درووستی، هەر بۆیە خوای مووتەعال لە سوورەتی لقمان دا ئەو ڕاستیانەمان بۆ دەردەخات دەفەرموویّت:

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ...﴾ [لقمان].

خۆ ئەگەر پرسیار (لە بێدین و کافران) بکەیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی درووست کردووە؟ زۆر بە دڵنیاییەوە دەڵێن: خوا، تۆش (ئەی محمد صلى الله عليه وسلم) بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوا (لەسەر وتنی ئەو ڕاستییە)، بەڵام زۆربەیان نەفام و نەزانن.

هەروەها لە سوورەتی الزخرف دا دەفەرموویّت:

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾ [الزخرف]

خۆ ئەگەر لەو (خوانەناسانە) بپرسیت: کێ درووستی کردوون، زۆر بە دڵنیاییەوە دەڵێن (الله) (باشە ئیتر بۆچی) لە ڕێبازی یەکتاناسین لادەدەن و شوێنی ناحەقیی دەکەون؟! بۆیە لەگەڵ خوای گەورەدا هاوبەشیان دادەنا بۆ ئەوەی لەخوای گەورە نزیک ببنەوە بەو هاوەڵ و هاوبەشانە.

خوای گەورە لەو بارەیەوە بۆمان باسدەکات لە سوورەتی یونس دا دەفەرموویّت:

﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ...﴾ [یونس].

(بێ باوەڕان وخوانەناسان) شتێک دەپەرستن لەجیاتی خوا کە نە زیانی بەدەستەو نە قازانج، بەمەرجێک دەشڵێن: ئا ئەم (بت وشتانە) (لە قیامەتدا) لای خوا شەفاعەت خوازمانن.

﴿... وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ ...﴾ [الزمر]

ئەو کەسانە جگە لەو زاتە کەسانی ترو شتی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان دەڵێن: ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فیترەتی پاک و بێگەرد چۆن ڕازی دەبێت بە بەندایەتی خوایەک، لەگەڵیدا سووجدە بۆ دارو بەرد ببرێت؟! لەکاتێکدا ئەم بەردو دارانە هیچ چاکەو خراپەیەک بە هیچ کەس ناگەیەنێت؟ پێغەمبەرمان لە هەموو تەمەنیدا یەک جاریش سووجدەی بۆهیچ بت و دارو پەیکەرێک نەبردووە، هەستێکی هەبوو کە خوای گەورە درووستکاری ئەم گەردوون و بوونەیە، چۆن کڕنوش بەرێت بۆ پەیکەرێک لە دارو بەرد تاشراوە.

ئەی سەرگەردان نەبوویت و نەت دەزانی چی بکەیت، هیدایەتی دایت و ڕێنموویی کردیت؟!

کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی مانای وانەبوو کە پێغەمبەر سەر لێشێواوە، چوونکە سووجدەو بەندایەتی بۆ بتەکانی قووڕەیش کردووە، نەخێر بەڵکوو زانایانی ڕاڤەی قورئان دەفەرمون نەیدەزانی بە چی شێوەیەک بەندایەتی خوا بکات، لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە سەروەرمان پێغەمبەر بەدوای ئەوەدا دەگەڕا چۆن خواپەرستی بکات، چوونکە هەموو عەرەب دەیانزانی کە خوای کردگاری بوون- بوونی هەیە.

نومەیر لێرەدا دەبێت ڕوونکردنەوەیەکی پێویست بدەم ئەویش ئەوەیە نازانم زۆرێک لە ژیاننامەی سەروەرماندا ئاماژەی پێنەکراوە، هەندێک لە بێباوەڕان بە هەلی دەزانن لەو ڕێگاوە ڕەخنە لە موسڵمان بگرن و گومانیان بۆ درووست بکەن، ئەویش بریتییە لەوەی کە پێغەمبەر خەڵوەتی کردووە نەک لە خەڵکی دابڕا بێت.

خەڵوەت و دابڕان دوو مانای جیاوازن، من نازانم کامیانی بۆ بەکار بهێنم باشترە؟

نومەیر: تێبینییەکی جوانە، بەڵام با بۆت شیبکەمەوە.

خەڵوەت لە زمانی عەرەبیدا واتە "خلوة" دابڕان لە زمانی عەرەبیدا واتە "اعتزال"

پێغەمبەرمان لە مانگی ڕەمەزان دا خەڵوەتی دەکرد واتە وەک ئیعتیکاف وابوو، بۆیە ناوم ناوە ئیعتیکاف، چوونکە ئەم بەندایەتییە لە سەردەمی مەدینەدا سەروەرمان کردوێتی، لە ڕەمەزان دا خەڵوەتی دەکرد، بەڵام لە خەڵکی دانەبڕاو بوو هەمیشە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە پێغەمبەر لە ناو خەڵکیدا بوو پەیوەندییەکی باشی هەبوو لەگەڵ هەموو چین و توێژەکانی ناو کۆمەڵگەی مەککە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەو کەسەی کە تێکەڵاوی خەڵکی دەکات لەسەر ئازارەکانیان ئارام دەگرێت خەریکی چاکەکارییە ئەوە پاداشتی لای خوای گەورە زۆر بڵندە، بە پێچەوانەوە ئەو ئیماندارەی کە ناتوانێت لە خەڵکیدا لەسەر ئازارەکانیان ئارام بگرێت، ئەوا هیچ پاداشتێک وەرناگرێت هەروەک لە فەرموودەیەکدا هاتووە دەفەرموێت:

عَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: "الْمُؤْمِنُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ، أَعْظَمُ أَجْرًا مِنَ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لاَ يُخَالِطُ النَّاسَ وَلاَ يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ"[٤٣]

زۆر گرنگە مرۆڤی ئیماندار بە ئاگا بێت لە چۆنیەتی تێکلاوبوونی و تێکەڵ نەبێت بە خراپەکانیان، پێغەمبەر ﷺ هەرگیز لە مەجلیسی گاڵتەو گەپ و قسەی بێ مانای بێباوەڕان دانەدەنیشت بەتایبەت ئەو جێگایەی کە پەرستنی بت و پەیکەرەکانیان بوو، بەڵام لە زۆر کاری تردا هاوکاری دەکردن کە گشتی بوو، پاشان هەندێکیان پەیوەندی هەبوو بەسەر موسڵمانانیشەوە هەروەها هاوکاری دەکردن وەک بیناکردنەوەی کەعبەو و حیلفی فزول ...هتد.

فەرموودەیەک دەگێڕنەوە لە ئیمامی حاکم و بەیهەقی کە گوایە پێغەمبەر ﷺ کاتێک لاو بووە گوێی لە دەنگی مۆسیقا بووە بە زلەیەک خوای گەورە خەوی لێخستووە، لە ڕاستیدا ئەم فەرموودەیە هەر زۆر لاوازە و ئیبن کەسیر و شێخ ئەلبانی بە لاوازیان داناوە.

چوونکە موسڵمانان ڕاستە تێکلاوی خەڵکی دەبێت، بەڵام لە هەست و سۆز و شعوردا جیاوازی هەیە هەروەک چۆن سەید قوتب لە کتێبە نایابەکەیدا بە ناونیشانی (معالم في الطريق) لەوێدا سەید -ڕەحمەتی خوای لێبێت- بەم شێوەیە ناوی لێناوە و دەڵێت: ڕاستە موسڵمان بە لاشە لەگەڵ جاهیلان و بێباوەڕان دا تێکەڵە، بەڵام جیاوازییان زۆرە هەمیشە یەکناگرنەوە لە دیدو ڕێ و مەنهەج، بەڵکوو تێکەڵاوی بۆ چاکسازییانە.

کەواتە ئەگەر پیاوچاکان دابڕێن لە فێرکردنی خەڵکی، کێ بێت بەربەست نەهێڵێت بێتە بەردەم موڵسمانان، یان کێ دەتوانێ هاوکاری خەڵکی بێت ئەم دینەو بانگەوازەیان بۆ ڕوون بکاتەوە، گومان نییە دەبێت خەڵکانێک هەبێت ئامادەی ئەوەی هەبێت کە لەناو خەڵکیدا بانگەوازی ئەم ئیسلامە بگەیەنێت.

---

[٤٣] رَوَاهُ أَحْمَدُ وَالْبُخَارِيُّ فِي الْأَدَبِ الْمُفْرَدِ، وَالتِّرْمِذِيُّ وَابْنُ مَاجَهْ عَنِ ابْنِ عُمَرَ



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: وەڵاهی قسەیەکی جوانە ڕەحمەتی خوا لە سەید بێت، من لە نەرویج بیستم کە بانگخوازێکی بەڕێزی خەڵکی تورکیا لە وڵاتی ئەڵمانیا دەچێتە ناو دیسکۆکانەوە بانگەوازی لاوە تورکەکان دەکات جاری وا هەیە بیست کەس بۆ پەنجا کەس لە ناو باڕو دیسکۆکاندا دەهێنێتە دەرەوە.

لەوڵاتی نەرویج کۆمەڵێک خەڵکی بەڕێز هەن بە ناوی مزگەوتی مەدەنی ئەوانیش لەسەر جادەکاندا بانگەواز دەکەن، هەروەها هاوشێوەی ئەمانە لە وڵاتانی وەک بەریتانیا و فەڕەنسا و ئەوروپا بە گشتی دووبارە دەبێتەوە.

نومەیر: ڕاستە زۆر کارێکی باشیان کردووە جا ئەگەر بە وردی سەرنجی ژیانی سەروەرمان بدەین و هەڵوەستەیەک بکەین، دەبینین ئامادەکردنی سەروەرمان بۆ پێغەمبەرایەتی ﷺ بە قۆناغ بووە لەسەرەتاوە سڵاو کردنی بەردو پاشان سنگ لەتکردنی، مەبەستم ئەوەیە ئامادەکراوە بۆ ئەوەی دوای ئەم کارە قورسە بانگەواز لەسەرشان هەڵبگرێت.

هەمو دەزانین لە تەمەنی چلساڵی دا دەبێتە پێغەمبەر ﷺ، کەواتە پرسیار ئەوەیە ئەم هەموو ماوەیە تەنها هەر ئامادەکردنی سەروەرمان بوو بۆ ئەم کارە بۆ هەڵگرتنی ئەم ئەمانەتە گەورە و قورسە، دەبێت بپرسین حیکمەت چییە ئەو ئامادەکارییە باشەی بۆ کراوە لە دوای تەمەنی چل ساڵییەوە بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکات، کەمترین تەمەنی پێغەمبەرایەتی بووە ئەوەی تر ئامادەکاری بووە هۆکاری چییە؟

ماکوان: دەتوانین بڵێین ئێمە بۆیە لێکۆڵینەوە لە ورد و درشتی ژیانی پێغەمبەرمان ﷺ دەکەین بۆ ئەوەی شوێن پێکانی هەڵبگرینەوە، بۆیە من و تۆش لێرەین نومەیر، خوای گەورە ئەوەمان فێر دەکات لە ژیانیدا لەسەر ئەو دیدو ڕێیە پەروەردەمان دەکات، ئەویش پلە کاری و قۆناغکارییە، مرۆڤ ناتوانێت هەموو کارێکی قورس بە یەکجار بخاتە سەر شانی، بەڵام کە پەروەردەکرا لەسەری بە پلە کاری بوو دوایی ئامادەباشی بۆکرا ئەوە هەموو کارێکی قورسی بەلاوە ئاسان دەبێت، بۆیە پەیامەکەی سەروەرمان محمد ﷺ هەمووی بە پلەکاری و قۆناغکاری بوو.

نومەیر: زۆر ڕاستە و زۆر جوان پەییت پێبردووە، پلەکاری سوونەتی خوای گەورەیە و ئەم سوونەتەش بۆ گۆڕانکارییە و چاکسازییە، چوونکە هەموو پەروەردەیەکی باش پێویستی بە



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پلەبەندی و قۆناغکارییە، فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە هەر پێویستی بە پلەبەندی و قۆناغکارییە.

تەمەنی سەروەرمان پێغەمبەر ﷺ (٦٣) ساڵ بوو، بەڵام ماکوان وەک پێم وتی (٢٣) ساڵی تەنها کاری پێغەمبەرایەتی کردووە، ئەوەی تری لە ئامادەباشیدا بووە بۆ هەڵگرتنی ئەم پەیامە، لێرەدا ئەوەم مەبەستە کە بیگەیەنم هەمیشە سەردەمی کۆکردنەوە وزە و هێز و دەسەڵات (ئیعداد) زۆر ترە لە سەردەمی سەرکەووتن!

خەڵکانێک لەوانەیە وابیر بکەنەوە بڵێن زۆرترین تەمەنی پێغەمبەر ﷺ بۆ پێغەمبەرایەتی بەکار بهاتایە سوودی زیاتر دەبوو بۆ ئوممەتەکە، بەڵام خوای گەورە هەمیشە لە هەموو دەستپێکی کارکردنێکدا دەیەوێت ئەوە بە موسڵمانان بگەیەنێت و کردوویتیە شەریعەت و مەنهەج و دید و ڕێیەک کە ئەم سوونەتە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، چوونکە سەردەمی کۆکردنەوەی وزەکان و دەستپێکی هەموو کارێک پێویستی بە هەوڵێکی باش هەیە بۆ پەروەردەکردنی خەڵکی بۆ ئەوەی نوخبەی باش درووست ببێت، بۆ ئەوەی دوایی بتوانن کارەکە بە ئەنجام بگەیەنن، هەر ئەوەشە لێرەدا بیری تۆی دەخەمەوە دەڵێم: ئەو ماوەیەی کە چل ساڵی ژیانی پێغەمبەر بۆ ئامادەکاری بوو بۆ ئەوەی (٢٣) ساڵ پێغەمبەرایەتی بکات. خوای گەورە خۆی پەروەردەی کرد بۆ ئەو مەبەستە، خۆ دەکرا لە کون فەیەکونێکدا هەموو شاری مەککە موسڵمان ببێت، بەڵام ئەمە سونەتی خوای گەورە نییە، چوونکە دوایی مرۆڤەکان توانای کارکردن و هەوڵ کۆششیان نامێنێت، وەکوو خەڵکانێکی تەمەڵ هەموو دادەنیشن و چاوەڕوانی مووعجیزە دەکەن خۆیان دەم دادەچەقێنن بۆ ئەوەی خواردن بکەن بەدەمیانەوە، بەڵام ئەمە سوونەتی ئیسلام نییەو خوای گەورە هەرگیز نەیویستووە پێغەمبەرانی وا بار بهێنێت، چوونکە دوایی گەلانی تر چاویان لێدەکەنەوە.

ئەم ئیسلامەش ئاخافتنە لەگەڵ ناخی مرۆڤدا، لەگەڵ هەست و بیرو هۆشیدا کار دەکات، پێویستە لەگەڵ ویستی مرۆڤ و ژیان و کاروباریان بێتەوە، هەربۆیە خوای گەورە بەوشێوەیە ناردوویەتییە خوارەوە کە پێغەمبەران بۆ گۆڕانکاری لە هەموو کەس نارەحەتتر بوون، پاشان ئەوانەی کە شوێنکەوتووی ئەوان بوون هەموو ئەو کردەوەیان لەگەڵدا دووبارەکراوەتەوە.

پێویستە پەندو ئامۆژگاری لەم شێوە پەروەردەییە وەربگرین، لەدوای چل ساڵ حەزرەتی جوبریل -سەلامی خوای لێبێت- لە خەڵوەتی دا لە ئەشکەوتی حیرا دێتە لای، ئەو ساتە وەختە





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئیتر بە خلودی لە مێژووی مرۆڤایەتی دا دەمێنێتەوە، ئەو ڕووداوە بۆ ماوەی شەش سەد ساڵە ڕووی نەداوە هیچ پێغەمبەرێک لەو ماوەیەدا بۆ سەر زەوی ڕەوانە نەکراوە، لە دوای وەفاتی پێغەمبەریش صلى الله عليه وعلى آله وسلم دووبارە نابێتەوە کۆتایی دێت بە سرووش تاڕۆژی قیامەت.

لەم ساتە وەختەدا حەزرەتی جوبریل - سەلامی خوای لێبێت- لەسەر شێوەی پیاوێکدا دەچێتە لای پێغەمبەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم.

ماکوان: بۆ لە شێوەی پیاوێک دا، ئەی بۆ لەشێوەی مەلائیەکەت نەچووە؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سەرەتای وەحی و کەڕان بەدوای پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وعلى آله وسلم

لەگەڵ نومەیردا لە ئەشکەوتی حیرادا مابووینەوە گفتوگۆمان دەکرد تا گەڕاینەوە بۆ ژێر دەوارەکەمان بۆ بادیە، باسی ئەوەمان دەکرد و بە دوای حیکمەتی ئەوە کەوتبووین و پرسیارم لە نومەیر کرد بۆچی لەسەر شێوەی مرۆڤ حەزرەتی جوبریل خۆی نیشانی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم نەداوە؟

نومەیر: بە هۆکاری ئەوەی مرۆڤ لە مرۆڤ ناترسێت، لەوساتە وەختەدا ئەگەر لەسەر شێوەی مرۆڤدا نەبێت شتێکی ترسناک دەبێت بۆ محمد، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەر ترسا، چوونکە کەسێکی نەناسراو بوو نەیدەناسی.

ماکوان: بۆ دەبێت لەو کاتەدا پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بترسێت؟

نومەیر: وەرە بزانین پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم خۆی بۆمان باس دەکات باش بیخوێنینەوە بۆچی ترساوە؟

خاتوو عائیشە دەگێڕێتەوە: لە ناکاو بێ هیچ پێشەکییەک بێ سڵاو بێ هیچ وتەیەکی تر بێ ئەوەی خۆی بناسێنیت، تەنانەت لە خودی پێغەمبەریش صلى الله عليه وعلى آله وسلم هیچ پرسیارێکی نەکرد، هەروەک بیناسێت ڕووی دەمی تێدەکات پێی دەڵێت: بخوێنە[٤٤].

پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئاگای لە هیچ نییە، نازانێت هیچ بخوێنێت، چوونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم نە خوێندەوارە، نە دەزانێت بنووسێت نە دەزانێت بخوێنێتەوە، بەڵام ئەو لە پڕ دەڵێت: بخوێنە!

سەروەرمان محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم زۆر بە ئەدەبەوە دەفەرمووێت: من خوێندەواریم نییە[٤٥].

---

[٤٤] تروي عائشة فتقول: فَدَخَلَ عَلَيْهِ الْمَلَک فَقَالَ: اقْرَأْ

[٤٥] قَالَ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ .





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پێغەمبەریش ﷺ هیچی لێ نەپرسی: نە فەرمووی تۆ کێیت؟ نە فەرمووی چیت دەوێت، چوونکە سەرسام بوو کە لەپڕ خۆی کرد بەناو ئەشکەوتەکەدا پێی دەڵێت بخوێنە! لەدوای ئەویش کە سەروەرمان پێیدەڵێت من خوێندەواریم نییە، لێرەدا ترسەکەی سەروەرمان دەست پێدەکات دەفەرمووێت: لێم نزیک بوویەوە باوەشی پێداکردم گوشیمی بەخۆیەوە، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێت: حەزرەتی جوبریل بە توندی سەروەرمانی گوشی بە خۆیەوە، چوونکە حەزرەتی جوبریل زۆر بە هێز بوو ، پێغەمبەریش خۆی بوونیادی لاشەی زۆر بەهێز بوو، بەڵام ئەو لە پێغەمبەر بەهێزتر بوو لە بەر ئەوەی لە ڕەگەزی مرۆڤ نەبوو، بەڵکوو فریشتە بوو.[٤٦]

پاشان دەفەرمووێ: لە گوشینەکە وازی لێهێنام.[٤٧]

بۆجاری دووەم دیسانەوە دەیگوشێتەوە بەخۆیەوە.

دیسان دەفەرمووێت: بخوێنە! گوشیمییەوە بەخۆیەوە ئەوەندە بە هێزبو وا هەستم دەکرد خەریک بوو پەراسووەکانم بشکێت، بەڵام بۆ جاری دووەم سەروەرمان پێی دەفەرمووێت: من خوێندەواریم نییە.[٤٨]

بۆ جاری سێیەم هەمانکردار دەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: من خوێندەواریم نییە، ئینجا واز لە گوشینی پێغەمبەرمان ﷺ دێنێت.

ماکوان: بۆ ئەم کارەی ئەنجامدا لەگەڵ سەروەرمان پێغەمبەر ﷺ؟

نومەیر: بۆ ئەوەی بگاتە ئەو هەستەی کە ئەو کەسە خەیاڵ نییە هاتۆتە لای یاخوود خەون نەبووە، بەڵکوو ڕاستییە، یان بە باری دەروونی تێنەگات. بەتەواوەتی دڵنیا بێت هەست بەوە بکات کە ڕاستییە واقیعە و ڕەوشەکە بەرجەستەیە، دیسانەوە دڵنیا بێت خەوی نەدیوە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٤٦] قَالَ: فَأَخَذَنِي، فَغَطَّنِي (يعني احتضنني)، حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ.
[٤٧] ثُمَّ أَرْسَلَنِي (تركني).
[٤٨] ثم قَالَ: اقْرَأْ (المرة الثانية). قُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي، فَقَالَ: اقْرَأْ (المرة الثالثة). فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ.
فقال: فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

حەزرەتی جوبریل دەفەرمووێت:

﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ۝ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ۝ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ۝ عَلَّمَ ٱلْإِنسَـٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ۝﴾ [العلق]

(ئەی محمد ﷺ) بخوێنە بەناوی پەروەردگارتەوە (کە هەموو شتێکی) درووست کردووە. ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی خۆهەڵواسەر (لەناو منداڵاندا) درووستکردووە. بخوێنە، پەروەردگاری تۆ خاوەنی ڕێزو بەخششی بێ سنوورە. ئەو زاتەیە کە بەهۆی قەڵەمەوە زانست و زانیاری فێر دەکات. ئادەمیزاد فێری ئەو شتانە دەکات کە نایزانێت، بێ ئاگایە لێیان.

ئەم پیاوە کێ بوو؟

چۆن پەیدا بوو؟

بۆچی لە دوای ئەو وتانە ون بوو؟

پێغەمبەر هیچ نازانێت تا ئەو ساتە وەختەیش، لە کاتێکدا خۆی زۆر لە ڕووی قسەکردنەوە لە ناو عەرەبدا جوانترین شێوەی دەربڕینی هەبوو بۆ زمانی عەرەبی، دەزانێت ئەم چەند وشەیە لە وشەی مرۆڤ ناچێت، هەموو مرۆڤایەتی لەبەردەم ئەم وشەنەدا دەستەوستانە.

ئەم کەسە کە پەیدابوو لە پڕنەما و باسی ئەو خوایە دەکات کە محمد بە شوێنیدا دەگەڕێت، سەردەمانێکە پێغەمبەرمان ﷺ ئیعتیکاف و بیر و هۆشی لای ئەو خوایەیە کە ئەو پیاوە باسی کردووە، باسی خوای گەردوونی کردووە، ئینجا ئەو پیاوە باسی خوایەک دەکات کە ڕێزی مرۆڤ دەگرێت و فێری زانستی دەکات.

ئەو کەسە هیچی پێنەوت، ئاگاداری نەکردەوە کە دەبێتە پێغەمبەری خوا.

ئەو کۆمەڵە وشەیە تائێستا لە سەر زەویدا کەس نەیبیستووە، لە پڕ ئەو پیاوە ون بوو، پاشان محمدی ﷺ بە هێزەوە گوشی بە خۆیەوە، لەم کاتەدا سەروەرمان دەفەرمووێت: لە گیانی خۆم ترسام کە شتێکم بەسەر بێت "لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي".





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سەروەرمان ﷺ لەدوای ئەو ڕووداوە لە خەڵوەتەکەیدا دەردەچێت بەرەو ماڵ دەکەوێتەوە ڕێ، لە ئەشکەوتەکەوە کە بە لوتکەی شاخێکەوەیە، ئێستا شاخەکە ناونراوە بە شاخی نور (جبل نور) دێتە دەرێ بۆ ئەوەی لە جێگا و مەڵبەند و زێدی خۆی بحەسێتەوە، ئەمانی دەست بکەوێت مەبەستم ماڵەکەی خۆیەتی لە شاری مەککەدا.

ماکوان: کەواتە نومەیر با سبەینێ بچینە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵەوەیە.

ئەو شەوە خەوتین بۆ بەیانی دەرچووین بۆ مەککە، خۆمان بۆن خۆش کرد بۆئەوەی بگەین بەخزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، لەڕێگادا تا شاری مەککە پێکەوە قسەمان کرد پرسیم لە نومەیر بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ ترسا؟ خاتوو عائیشە لە فەرموودەیەکدا دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: گەڕایەوە بۆ ماڵەوە پێغەمەبەرمان ﷺ چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو[٤٩].

پرسیار لێرەدا ئەوەیە بۆچی پێغەمبەرمان لەو دیمەن و ڕووداوە ترسا؟

نومەیر: سەرەتا چەند هۆکاریک وای کرد کە سەروەرمان بترسێت لەو ڕووداوە کە حیکمەت بە دوای خۆیدا دەهێنێت بۆ مرۆڤایەتی.

یەکەم: بۆمان دەردەکەوێت سەروەرمان محمد ﷺ مرۆڤە و سوونەتی مرۆڤیش وا هەڵکەوتوە لە شتێ سەر سوڕهێنەر و ترسناک دەترسێت، ئەم بارو گوزەرانەش لەگەڵ مووسا پێغەمبەر -سەلامی خوای لێبێت- دووبارە بۆتەوە، کەواتە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە محمد مرۆڤێکی ئاسایی بووە و وەک هەموو مرۆڤەکانی تر هەست و نەست و هۆشی هەبووە.

دووەم: لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت تا ئەم ساتە وەختەش محمد ﷺ نازانێت کە پێغەمبەرە و بانگەشەی بۆ ناکات، بەڵکوو بە دەرکەوتن و نەمانی ئەو پیاوەی لە ئەشکەوتەکەدا پەیدا بوو و نەما ترسی لێنیشت، کەواتە محمد خۆی ئامادە نەکردووە بۆ ئەوەی بڵێ من پێغەمبەرم و هەر نەیزانیوە.

---

[٤٩] فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْجُفُ فُؤَادُهُ، فتح الباري شرح صحيح البخاري

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سێیەم: ئەم کارە بۆ ئامادەکردنی محمده بۆ ئەوەی حەز بکات جارێکی تر ئەو کەسە ببینێتەوە، تەشویق ببێت بۆ کارەکەی، هاندانێکە بۆ ئەوەی حەز بە بینینی بکاتەوە.

چوونکە لەدوای ئەو ڕووداوە چەند جار پێغەمبەر ﷺ دەڕۆیشتەوە بۆ شاخی نوور بۆ هەمان جێگا لە ئەشکەوتەکەدا بۆ ئەوەی ئەو پیاوە ببینێت چاوەڕێی دەکرد، وای لێهاتبوو مووشتاق بوو بۆ بینینی حەزرەتی جوبریل -علیه السلام-

ماکوان: بەڕاستی خاتوو خەدیجەش دەورێکی جوان و ژیرانە و باشترین هاوسەری بینیوە کە لەپشتی وەستاوەتەوە، لە فەرموودەکەی خاتوو عائیشەدا پاش ئەوەی گەیشتە ماڵەوە ڕووداوەکەمان بۆ باس دەکات و دەفەرمووێت: فَدَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ بِنْتِ خُوَيْلِدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا.

خاتوو خەدیجە زۆر پێغەمبەری خوای ﷺ خۆش دەویست، خۆشەویستییەک کە بۆم پێناسە ناکرێت، لە هیچ جێگایەکی سیرەی مووبارەکی پێغەمبەرماندا ﷺ نەمدیوە و نەمبیستوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەمە بۆڵەیەک یان ئاژاوەیەکی خێزانیی لە نێوانی پێغەمبەر ﷺ و خاتوو خەدیجە - ڕەزامەندی خوای لێبێت- ڕووی دابێت.

هەموو ڕووداوەکە دەگێڕێتەوە بۆ خاتوو خەدیجە، باسی ئەو ڕووداوە سەرسووڕمانەی بۆ دەکات، هەموو وشەکانی حەزرەتی جوبریل فەرموو بووی بۆی دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت:

لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي

واتە: زۆر دەترسم شتێکم بەسەر بێت، یاخوود دەترسم لە گیانی خۆم.

نومەیر: زۆر ڕاستە خاتوو خەدیجە هەڵوێستێکی زۆر سەرسووڕمانی دەبێت، هەڵوێستەکەی زۆر سەیرە، چوونکە وەک ئافرەتانی تر خێرا دەنگی لێبەرز نەبووەوە بترسێت، وەک سرووشتی ئافرەتان کە بە گشتی ترسنۆکن ، بەڵکوو کەوتە پرسیارکردن لە سەروەرمان و ڕووداوەکەشی زۆر بە ئاسانی وەرگرت و دڵخۆشی پێغەمبەری ﷺ دایەوە، بەڵکوو زۆر بە دڵنیاییەوە بە هاوسەرەکەی فەرموو جەختی لەسەر کردەوە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

كلاً، وَاللَّهِ مَا يُخْزِيک اللَّهُ أَبَدًا، إِنَّک لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكلَّ، وَتَكسِبُ الْمَعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ.

نا سوێند بە خوا، خوای پەروەردگار هەرگیز شەرمەزارت ناکات، چوونکە تۆ سیلەی ڕەحم بەجێدەهێنیت و هەموو خزم و کەسووکار بەسەر دەکەیتەوە و هەستی بەرپرسیارێتیت لەسەر شانە، خۆشەوویستی بۆ هەمووان دەردەبڕیت. ئەوەی کە هەژارو بێدەرەتانە تۆ دەستگیرۆی دەکەیت، تۆ ڕێزی میوان زۆر دەگریت، ئەی محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم، هەمیشە بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێیت و حەقت خۆش دەوێت.

ماکوان: وەڵاهی، وایە خاتوو خەدیجە لە پێناسەی پێغەمبەرەوە وەسفی ڕەوشتە جوانەکانی کرد، باسی ئەوەی کرد کە هەرگیز کەسێک بەو باشییە بێت تووشی ناڕەحەتی و ئازار نابێت.

هەروەها باسی هەڵسوکەووتی لەگەڵ خەڵکی، خزمەتی خەڵکی، ئارامگری و ڕاستگۆیی لە ناو خەڵکیدا وای لێکردبوو کە ئەم دیدو بۆچوونە لای خاتوو خەدیجە درووست بکات.

گرنگیشە ئەو کەسەی شوێنکەوتووی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەبێت هەمان هەڵسوکەووتی هەبێت، خێزان و منداڵەکانی ئەو شاهێدیەی بۆ بدەن، چوونکە مرۆڤی موسڵمان ئەگەر لە ناو ماڵی خۆیدا باش نەبوو ڕاستبێژ نەبوو لەگەڵ درووشمە دینییەکانی ئیسلامدا، خۆئەگەر وا نەبوو ئیتر لە ناو خانەوادەکەی خۆیدا جێگای ئەرزش نابێت! چوونکە مامەڵە کردن لەگەڵ چواردەور و خەڵکیدا بەگشتی وەک کورد دەڵێت سەنگی مەحەکە و مرۆڤی پێ هەڵدەسەنگێنرێت.

نومەیر: بەڵێ ڕاستە خاتوو خەدیجە وەک هاوسەرێکی بە وەفا و ئافرەتێکی سالار و سەنگین بە تەواوەتی پێغەمبەرمانی صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئارام کردەوە، زیاتر خۆشەوویستی و هێمنی بۆ دەربڕی تا هەست بە ئاسایشی تەواوەتی بکات لە ماڵەکەیدا، ئەمەش نموونەی هاوسەری ڕێک و پێکە کە خوای مووتەعال لە سوورەتی الروم دا بۆمان باس دەکات:



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾﴾ [الروم]

یەکێک لە نیشانەو بەڵگەکانی تری ئەوەیە: کە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ درووست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایداو لە نێوانتاندا خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی فەراهەم هێناوە.
هەروەها ئەم ئافرەتە کە خێزانی سەروەرمانە ﷺ لەو باری دەروونی خراپدا هاوسەرەکەی بە جێنەهێشت، بەڵکوو بردیە لای ئەو کەسانەی کەشارەزان لەو بوارەدا چوونە لای کەسێک بەناوی وەرەقەی کوڕی نەوفەل.

خاتوو خەدیجە بۆ لە ناو ئەو هەموو خەڵکەدا کەسێکی هەڵبژارد بە ناوی وەرەقەی کوڕی نەوفەل؟

ئەم هەڵبژاردنە حیکمەت و فیترەتی پاکی خاتوو خەدیجەمان نیشان ئەدات، بەڵکوو نەیبردە لای ئەو هەموو کاهین و خزمەتکارەی بتەکانی کەعبە، بەڵکوو ڕۆیشت بۆلای ئەم پیاوە کە لەسەر ئایینی کۆنەکان بوو پاشان لەدوای جاهیلی چووە سەر ئایینی نەسرانی.

کەواتە پێویست و گرنگە ئەم پەیامە بدەین بەخەڵکی، ماکوان گیان بە هەموو لاوەکان بڵێین کە ژن دێنن ئافرەتی پابەند بە دینەوە هەڵبژێرن، چوونکە ئەوە خاڵی سەرەکییە لە ژیانی مرۆڤدا، لەگەڵ پڕۆژەکەی ئێمەدا دێتەوە کە بوونیادی کۆمەڵگای موسڵمان و ئوومەتی ئیسلامییە.

بەدەم ئەم قسانەوە گەیشتینە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەردووکمان لەبەردەم دەرگاکەیاندا وەستاین لەدەرگای ماڵی پێغەمبەرمان دا کەس دەرگای نەکردەوە بۆمان دیار بوو کەسیان لەماڵ نەبوون، دراوسێیەکیان لە کۆڵانەکەیاندا دەرگای کردەوە وتی: محمد و خەدیجە وتویانە دەچین بۆ ماڵی ئامۆزایەکی خاتوو خەدیجە ناوی وەرەقەی کوڕی نەوفەلە.

من و نومەیر تەماشایەکی یەکترمان کرد، سووپاسی ئەو دراوسێیەیمان کرد ڕەشمەی ئەسپەکانمان گرت و چووینەوە بۆ ناو بازاڕ، لەناو بازاڕدا دەسوڕاینەوە خەفەتبار بووین ئەمە دوو جارە بەخزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ نەگەیشتین. لە بازاڕی مەککەدا




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەندێک شتوومەکمان کڕی، لەیەکێک لە نادییەکانی قووڕەیش دانیشتین ئاو و شیریان بۆ هێناین لەگەڵ نومەیردا دەستم کردەوە بە قسە کردن، پێموت.

خۆزگە ماڵی وەرەقەی کوڕی نەوفەلم دەزانی دەچووم بۆ ئەوێ.

نومەیر: خۆ دەزانی وەرەقەی کوڕی نەوفەل کێیە؟

ماکوان: بەڵێ دەزانم بەخزمەتی فەرموودەیەکی خاتوو عائیشە گەیشتووم کە باسی دەکات و دەفەرمووێت:

تقول السيدة عائشة: فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ، حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نوفل بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى ابْنَ عَمِّ خَدِيجَةَ، وَكَانَ امْرَأً قَدْ تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ يَكْتُبُ الْكِتَابَ الْعِبْرَانِيَّ، فَيَكْتُبُ مِنَ الإِنْجِيلِ بِالْعِبْرَانِيَّةِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكْتُبَ، وَكَانَ شَيْخًا كبِيرًا قَدْ عَمِيَ.

ئەم پیاوە لە بنەڕەتدا بت پەرست بووە، پاشان لە تەمەنی لاویدا دەڕواتە نەجران، مێژوونووسان دەڵێن: هەموو ژیانی لاوی خۆی لە خوێندن و نووسینی عیبرانی و خوێندنەوەی ئینجیل بەسەر دەبات، ناوی: وەرەقەی کوڕی نەوفەلی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدولعززی کوڕی مامی خەدیجەیە، لەسەر ئایینی مەسیحییە، بەڵام تاکو پیری لەناو مەسیحییەکاندا دەمێنێتەوە، لەدوای ئەوەی کە چاوەکانی لە دەست ئەدا دەگەڕێتەوە بۆ شاری مەککە بۆ ناو خزم کەسووکارەکانی تەمەنێکی زۆری هەیە، هەموو گیانی لەرزۆک بووە، وەرەقە زۆر باش دەیزانی کە لەو سەردەمەی خۆیدا پێغەمبەرێک دێت، هەواڵی درابوویە لە لایەن پیاوە ئایینییەکانی دینی نەسرانی، باش ناونیشانی ئەو پێغەمبەرەیان دەزانی، چوونکە ناوی لە تەورات و ئینجیل دا هاتووە.

﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾﴾ [البقرة]

ئەوانەی کە کتێبمان پێ بەخشیون پێغەمبەر ﷺ دەناسن هەروەک چۆن نەوەکانی خۆیان دەناسن، بێگومان دەستەیەک لەوان ڕاستی دەشارنەوە، هەرچەندە دەشزانن (کە ئەوە ڕەوا نییە).

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کەواتە وەرەقەی کوڕی نەوفەل شارەزابوو لە بواری ئایینی، ئەو هەواڵانەی کە لە تەورات و ئینجیل دا هاتوو، بۆیە خاتوو خەدیجە سەروەرمان محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم ی بردە لای.

خاتوو خەدیجە دەفەرمووێت: بە ئامۆزاکەم وت: ئامۆزا گوێبگرە لە برازاکەت مەبەستی محمدە صلى الله عليه وعلى آله وسلم، وەرەقە وتی چیت دیوە کوڕی برام بۆم باس بکە، دیارە وەک ئەدەب و ڕێزێک ئەو وشانە بەکار هاتووە لە ناو عەرەب دا، وەک پەیوەندی خزم و خوێش هیچ پەیوەندی بە پێغەمبەرمانەوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم نەبووە، سەروەرمان محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەموو ڕووداوەکەی وەک خۆی بۆ گێڕایەوە چی دیوە، ئەو کەسە کە چۆن هاتۆتە لای لە ئەشکەوتەکەدا وشەکانیشی بۆ باسکرد.

وەرەقەی کوڕی نەوفەل وتی: ئەوەی کە بۆت هاتووە وەحییە، هەروەک سرووش کە بۆ مووسا هاتووە، وەرەقە کارێکی زۆر گەورە باس دەکات بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بە ڕاشکاوانە پێی دەڵێت: ئەوەی کە هاتووە بۆ لات ئەوە ناوی جوبریلە و بەڕێزترین فریشتەی خوای گەورەیە، ئەو فریشتە نایەتە سەر زەوەی تەنها بۆ لای پێغەمبەران نەبێت، زۆر بەڕاشکاوانە بێ پێچ و پەنا پێی دەڵێت: محمد تۆ دەبیتە پێغەمبەر![٥٠]

لێرەدا ئەوە لەبەرچاو بگرین داخۆ هەست و سۆزی پێغەمبەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم چۆن بێت؟

لەم کاتەدا ئەو وشانە لە دەمی وەرەقە دەبیستێت، ئیتر دەبێتە هەڵبژاردەی خوای پەروەردگار لە ناو ئەو هەموو مەخلوقە خوا محمد هەڵدەبژرێت، بۆ ئەوەی ببێتە پێغەمبەری ئاخر زەمان.

لای هەمووان ئاشکرایە پلەی پێغەمبەرایەتی بە زۆری عیبادەت و ئیجتیهادی خەڵکی نییە، بەڵکوو بە هەڵبژاردنی خوای پەروەردگارە خوای گەورە لە سوورەتی الحج دا دەفەرمووێت:

---

٥٠ فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: يَابْنَ عَمِّ، اسْمَعْ مِنْ ابْنِ أَخِيك. فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ (وكان يعرف أخلاق النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم وعرف صفاته): يَابْنَ أَخِي، مَاذَا تَرَى؟ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَبَرَ مَا رَأَى، فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي نَزَّلَ اللَّهُ عَلَى مُوسَى. فتح الباري شرح صحيح البخاري




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿ٱللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ٧٥﴾ [الحج]

**هەر خوا بە ویستی خۆی لە فریشتەکان و لەخەڵکیش نێردراو هەڵدەبژێرێت، بەڕاستی خوا بیسەرو بینایە (چاک دەزانێت کێ هەڵدەبژێرێت بۆ گەیاندنی پەیامەکەی).**

**ئەو کەسەی هاتە لای هیچ ئاگادارییەکی نەدایە پێغەمبەر** صلى الله عليه وعلى آله وسلم**، بەڵام وەرەقە زۆر بە دڵنیاییەوە دەڵێت: تۆ دەبیتە پێغەمبەر، سەروەمان محمد** صلى الله عليه وعلى آله وسلم **لەو کاتەدا تووشی شۆک دەبێت.**

**وەرەقە لەوە قورستر بە محمد** صلى الله عليه وعلى آله وسلم **دەڵێت: کە جێگای تێڕامانی سەروەرمان محمدە** صلى الله عليه وعلى آله وسلم**.**

**وەرەقە دەڵێت: خۆزگە لاو بوومایە، خۆزگە تا ئەو کاتە لەژیاندابام هاوکارت بوومایە کە گەلو هۆزەکەت لە مەڵبەند و زێدی خۆت دەتکەنە دەرەوە.[51]**

**پێغەمبەرمان** صلى الله عليه وعلى آله وسلم **فەرمووی: بە سەرسوڕمانێکەوە بۆ دەمکەنە دەرەوە؟!**

**ئەمە لێرەدا مووعجیزەیەکی ئاشکرایە کە سەروەرمان هەست بەوە ناکات گەلەکەی دەیکەنە دەرەوە، چوونکە ڕێگای پێغەمبەران وایە لە ناو گەل و هۆزی خۆیاندا دەردەکرێن، ئەم هەواڵە لە ناو ئاینەکانی پێشتر دراوە، لێرەدا ئەوە دەردەکەوێت کە سەروەرمان محمد** صلى الله عليه وعلى آله وسلم **هیچ دەربارەی گەلانی پێشوو تر نازانێت، مەگەر ئەوەی کە خوای گەورە دواتر لە ڕێگای وەحییەوە بۆی دەنێرێت، خوای گەورەیش لەوە ئاگادارمان دەکاتەوە لە سوورەتی هود دا دەفەرمووێت:**

---

**[51] فقال: يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا (شابًا) لَيْتَنِي أَكونُ حَيًّا إِذْ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ** صلى الله عليه وعلى آله وسلم**: "أَوَمُخْرِجِيَّ هُمْ؟"، صحيح البخاري و مسلم**



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿تِلْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا ۖ فَٱصْبِرْ ۖ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ۝﴾ [هود]

ئەم باسانە بۆمان کردی لە هەواڵە نادیارەکانە، نە تۆ دەتزانی و نە هۆزو نەتەوەکەشت پێش ئەم باسەی ئێمە، خۆگرو ئارامبە پاشەڕۆژ بۆ خواناسان و پارێزکارانە.

چوونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە هیچ شێوەیەک لە ماناو واتەی پێغەمبەرایەتی تێنەگیشتبوو، چوونکە هیچ کات گەل و هۆزەکەی بە درۆیان نەخستبووەوە، لە ناویاندا خاوەنی کەسایەتییەکی بە هێز بوو ، هەربۆیە بەسەر سوڕمانەوە دەفەرمووێت: بۆ دەمکەنە دەرەوە؟ ئینجا وەرەقە بە دڵنیایەوە بۆی دووبارە دەکاتەوە دەڵێت: بەڵێ، بە دڵنیاییەوە ڕاوەدوو دەنرێیت، هیچ پێغەمبەرێک نەهاتووە بەوپەیامەوە لای خوای پەروەردگار و دەربەدەر نەکرابێت.[٥٢]

نومەیر: زۆر ڕاستە ئەمە بنەمایەکی گەورەمان بۆ دەردەخات، ئەویش وەرەقەی کوڕی نەوفەل فێرمان دەکات هەموو بانگەوازخوازێک تووشی هەمان کرداری پێغەمبەران دەبێتەوە، چوونکە ئەم ململانێیە بەردەوامە لە نێوانی ڕاستی و درۆ دا، شەیتان و مرۆڤدا، حەق و باتڵ دا سوونەتێکی خوایە و تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت.

هەربۆیە بەردەوام وەرەقەی کوڕی نەوفەل دەڵێت: ئەگەر ئەو ڕۆژە من بوونم هەبوو بە دڵنیاییەوە سەرت دەخەم و پشتگیریت لێدەکەم بە هەموو توانای خۆم.

بەڵام زانایان و کۆمەڵێک لە مێژوونوسان دەڵێن: لە دوای یەک هەفتە لەو دیدارەی کە لەگەڵ سەروەرمان محمد صلى الله عليه وآله وسلم کردی وەرەقە وەفات دەکات - ڕەحمەتی خوای لێبێت- هەندێکی تر لە زانایان و مێژوونووسان دەڵێن: مانگێک دوای ئەو ڕووداوە وەفاتی کردووە، بۆیە پێغەمبەر صلى الله عليه وآله وسلم هەرکات باسی وەرەقە بکرایە یان باسی نەسرانی و خراپەی

---

[٥٢] نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ إلاَّ عُودِيَ.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نەسرانییەکان بکرایە دەیفەرموو ئاگاداربن قسە بە وەرەقە مەڵێن: چوونکە خوای گەورە یان بەهەشتێک یاخوود دوو بەهەشتی پێبەخشیوە بە وەرەقەی کوڕی نەوفەل[٥٣].

بەڵێ لەدوای ئەو ماوە کورتە وەرەقە وەفاتی کرد، بەڵام ململانێکەی بە پێغەمبەرمان صلى الله عليه وسلم ناساند، ڕێگاکەی خستە بەردەم سەروەرمان و پێی ڕاگەیاند ئەم ڕێگایە هەوراز و نشێوی زۆری تێدایە.

ئەم فەرموودەیەی وەرەقە پەیامێکە بۆ هەموو بانگخوازنی ئەم ئیسلامە کە ئەو ڕێگایەیان گرتووە.

لەدوای قسەکانی وەرەقە پێغەمبەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم باش وتەکانی هەڵسانگاند و ویستی بە دوای ڕاستی وتەکانی وەرەقەدا بگەڕێت، چوونکە ئەو وتانە زۆر قورس و گەورەن کە کردوێتی بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت کە کاری پێغەمبەران چییە؟ خۆیشی توانای هیچ بڕیارێک و هیچ بۆچوونێکی نییە، ناشزانێت چی لێ داوا دەکرێت، ئەو کەسەیشی کە لە ئەشکەوتەکەدا هاتە لای نەیدەزانی داوای چی لێ دەکات.

ماکوان: ئێستا لەماڵی وەرەقەین، خۆزگە لە خزمەتیاندا بوومایە لەو حیوارە مووبارەکەی دەیکەن، لەم قسانەدا بووین لەپڕ ئەوەندەمان زانی قەرەباڵغییەک درووست بوو لەدوورەوە نەفیسەم بەدی دەکرد دەگریا و هاواری دەکرد براکانیشی بەدەورییەوە بوون.

---

[٥٣] ثم يقول ورقة: وَإِنْ يُدْرِكنِي يَوْمُك أَنْصُرْك نَصْرًا مُؤَزَّرًا. ثُمَّ لَمْ يَنْشَبْ وَرَقَةُ أَنْ تُوُفِّيَ، وقد صدّق بالنبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم حتى قبل التصريح بالرسالة، روى الحاكم عن عائشة بسناد جيد أن رسول الله صلى الله عليه وعلى آله وسلم قال: "لاَ تَسُبُّوا وَرَقَةَ، فَإِنِّي رَأَيْتُ لَهُ جَنَّةً أَوْ جَنَّتَيْنِ.صحيح البخاري"



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سەرەتای بانگەواز و چوونمان بۆلای پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ

لەدوای ئەوەی کە قیژەو هاتوو هاوار بەرزبووەوە لە دوورەوە نەفیسەم بەدی دەکرد لەگەڵ براکانیدا کە نزیک بووینەوە لێیان بینیمان باهیلە کۆچی دوایی کردووە منداڵەکانی بەسەریەوە دەگرین.

لەگەڵ کەسەکانی ئەواندا چووین ناشتمان گەڕاینەوە بۆ ژێر دەواری خۆمان لەڕێگادا بە نومەیرم وت: ئەگەر پێت باشە داوای نەفیسەم بۆ بکە.

نومەیر دەستی کرد بەپێکەنین وتی لەدڵما بوو پێت بڵێم؟!

ماکوان: ئەی تۆ بۆ ژن ناهێنیت؟

نومەیر: بۆ نا بەڵام کەس شک دەبەیت؟

ماکوان: دەرمانی خۆم بە دەستی تۆ دەکەم، تۆ داوا لە من دەکەیت.

نومەیر: خوا ئاسانی بکات.

شەو بەسەردا هات جارێکی تر گەڕامەوە بۆ سەرەتا، خێزانم لە ماڵەوە ئاگاداری کردمەوە کات درەنگە هەستە خۆت ئامادە بکە بڕۆ بۆ کار، دوای ئەوەی بەلاشەیەکی شەکەتەوە هەڵسامەوە وەکوو ئەوەی هیچم نەکردبێت بە ئاخو ئۆفێکەوە هەڵسام چووم دەستنوێژم گرت چاوەڕێی نوێژی بەیانیم دەکرد تا بڕۆم بۆ کار.

لەسەر کارەکەم تەنها بیرم لەلای ژیانی رەسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بوو هەرچۆن بوو ئەو ڕۆژەم بردە سەرو گەڕامەوە بەتامەزرۆییەوە چوومەوە سەر کتێبەکەی فەرغەلی و لەتاواندا نەمدەزانی لەکوێوە دەست پێبکەم، چوومە سەر ئەو باسەی سەروەرمان وای لێهاتبوو ئاواتە خواز بوو بۆ ئەوەی جارێکی تر لەگەڵ حەزرەتی جوبریل دا یەک ببیننەوە، بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەوەی ئایا ئەو پەیامە چییە بۆی هێناوە؟




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەگەڵ ئەو هەموو چاوەڕوانییەدا ئارەزوومەندە بۆ ئەوەی حەزرەتی جوبریل ببینێتەوە جارێکی تر، بەڵام هەر دەبێت چاوەڕێ بکات لە دەسەڵاتی خۆیدا نییە.

چوومە سەر هەندێک سەرچاوەی مێژوویی و مێژوونووسان کۆک نین لەسەر ئەو ماوەیەی لە دوای هاتنی یەکەم جاری حەزرەتی جوبریل -سەلامی خوای لێبێت- بەڵام ئیتر لە سێ ڕۆژەوە ئاماژەی بۆ کراوە تا چل ڕۆژ کە بە شوێن حەزرەتی جوبریل دا گەڕاوە دەیوویست جارێکی تر بیبینێتەوە.

ئەو ماوەیە کە سرووش نەهاتووە بۆ پێغەمبەرمان ﷺ زۆر کاریگەری لەسەر سەروەرمان محمد ﷺ درووست کردبوو، جاری وا هەبوو دەگەڕاوە بۆ ئەشکەوتەکە بۆ ئەوەی حەزرەتی جوبریل لەوێدا ببینێت، بەڵام چارە نەبوو دیسان دەگەڕاوە بۆ ماڵ، یاخوود زۆر جار وا بیری دەکردەوە کە دەبێت لە کوێدا بیبینێت لە جێگایەکی جیاواز لەو جێگایەدا، زۆر گەڕا سەروەمان محمد ﷺ، بەڵام بێچارە بوو حەزرەتی جوبریل هەر نەهات.

دوا کەوتنی جوبریل- سەلامی خوای لێبێت- زیاتر تەشویقی بۆ پێغەمبەرمان ﷺ زیاد کرد بۆ بینینی، باشتر ئامادە بوو بۆ هەڵگرتنی ئەو پەیامە قورس و سەنگینەی کە بۆی دێت لە دوایدا، چوونکە خوای گەورە بانگەوازی ئیسلامی بە سەنگین و قورس ئاماژە پێکردوە:

﴿إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ۝﴾ [المزمل]

بەڵام لێردە جێگای خۆیەتی ئاماژە بە شتێکی گرنگ بکەم ئەویش ئەوەیە، بەندایەتی لە ئیسلامدا قورس نییە، بەڵکوو بانگەوازو هەڵگرتنی پەیامەکە ئەرکێکی قورسە، خەڵکێکی دەوێت بانگەواز بکات کە بە باشی بۆ ئەو کارە پەروەردە کرابێت.

جیاوازی هەیە لە نێوانی کەسێک کە بانگەوازەکە وەربگرێت بیگەیەنێتەوە، هەروەها ئاسان ترە بۆ کەسێکی تر کە تەنها ئەم پەیامە وەردەگرێت، هەستی بەرپرسیارێتی لە ئەستۆ ناگرێت. بۆیە زیاتر سرووش دواکەوت بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو کارە سەنگینە خۆی باشتر ئامادە بکات.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

وای لێهات سەروەرمان زۆر بێتاقەت بوو، خەفەتێکی زۆری دەخوارد بۆ ئەو ڕەوشەی کە بەسەریدا هاتووە، جوبریلیش دیار نییە.

دوای ماوەیەک لە پڕ دەنگێک دێت دەڵێت: محمد تۆ بەڕاستی نێردراوی خوای! لە کاتێکدا کە سەروەرمان محمد ﷺ گوێی لەم دەنگە دەبێت لە جێگای خۆیدا دەوەستێت، بۆ جاری دووەم دەڵێت: محمد تۆ بەڕاستی نێردراوی خوای!

پێغەمبەر ﷺ هەست دەکات کە ئەو دەنگە جوبریلە عليه السلام بەڵام هیچ پەیامێکی ناداتێ، هەر ئەوەندە دڵنیای دەکاتەوە، زیاتر پەروەردە و ئامادەی دەکەن بۆ هەڵگرتنی پەیامی ئیسلام.

فەرموودەکە بەم شێوەیە: دکتۆر راغب سرجانی لە زنجیرە باسێک بەناوی سەردەمی مەککی، ئاوا باسی دەکات ئەم ڕیوایەتەی هێناوە: "ولما كان يبلغ الحزن بالنبي ﷺ المبلغ، يأتيه جبريل، ويقول له: يا محمد، إنك رسول الله حقًّا. فيسكن النبي ﷺ، لكن ليست هناك تبليغات بالرسالة، لا يزيد عن قوله: يا محمد، إنك رسول الله حقًّا".

هەورەها لەدوای چەند ڕۆژێک ئیتر کاتی هاتنی پەیامە بۆ پێغەمبەرمان ﷺ لێرەوە مژدە دان و ترساندن و هۆشداری دەست پێدەکات ڕێگا بڕینی سەخت و دژوار دەست پێدەکات.

سەروەر و نووری چاومان ﷺ لەباسی سرووش دا خۆی بۆمان باس دەکات و دەفەرمووێت:

لە کاتێکدا دەڕۆیشتم لەپڕ گوێم لەدەنگێک بوو، لای ڕاست و چەپم و بەردەم و دواوەم سەیرکرد، هیچم نەدی، بۆ جارێکی تر بانگی کردەوە چاوەکانم بەرزکردەوە بۆ ئاسمان بینیم ئەو فریشتەیەیە کە لەئەشکەوتی حیرا بینیبووم (لێرەدا سەروەرمان بۆیە دەفەرمووێت فریشتە، پێدەچێت لەسەر وتەکەی وەرەقەی کوڕی نەوفەل بێت، کە ئەو بە فریشتە ناوزەدی دەکات بۆ محمد کە دەڵێت سرووشی بۆ مووسا هێناوە)، بەردەوام بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: حەزرەتی جوبریل لەسەر کورسییەک لە نێوانی زەوی و ئاسماندا دانیشت بوو، ( دیارە حەزرەتی جوبریل ئەوەندە گەورە بووە سەروەمان چاوی بۆ بەرز کردۆتەوە تا دەکەوێت بە پشتدا) بۆیە




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەفەرمووێت: ترسام و کەوتمە سەر زەوی، بە پەلە گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە تا گەیشتە لای هاوسەرە بەڕێزەکەی خاتوو خەدیجە - ڕەزامەندی خوای لێبێت- دەفەرمووێت: دامپۆشن، دامپۆشن، دامپۆشن، چوونکە سەروەرمان لەرزی لێهاتبوو ئەو دیمەنە تووشی لەرزو تای کردبوو، تا وای لێهاتبوو ئاوی ساردیان پێدا دەکرد، ئینجا ئەم ئایەتانەی بۆ دابەزی.[٥٤]

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ١﴾

ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە (ئەی محمد صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ).

﴿قُمْ فَأَنذِرْ ٢﴾

هەستەو (خەڵکی) بێداربکەرەوە (ڕاستەییەکان ڕوون بکەرەوە).

﴿وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ٣﴾

پەروەردگارت بە گەورە ناو ببەو (الله اکبر، با درووشمت بێت، مەزنیی ئەو زاتە ڕوون بکەرەوە).

﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ٤﴾

پۆشاکت (دڵ ودەروونت، ڕەفتارت، هەرهەمووی) خاوێن بکە (خۆت و شوێنکەوتووانت).

---

[٥٤] " بَيْنَا أَنَا أَمْشِي إِذْ سَمِعْتُ صَوْتًا، فَنَظَرْتُ عَنْ يَمِينِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، وَنَظَرْتُ عَنْ شِمَالِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، وَنَظَرْتُ أَمَامِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، وَنَظَرْتُ خَلْفِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، ثُمَّ نُودِيتُ، فَرَفَعْتُ بَصَرِي إلى السماء، فَإِذَا الْمَلَک الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كرسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَرُعِبْتُ مِنْهُ حَتَّى هَوِيتُ عَلَى الأَرْضِ، فَرَجَعْتُ حَتَّى أَتَيْتُ خَدِيجَةَ، فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي، زَمِّلُونِي، دَثِّرُونِي، دَثِّرُونِي، وَصُبُّوا عَلَيَّ ماءً باردًا. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنْذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّک فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَک فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ﴿٥﴾

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ۝﴾

هەرچی ناباشی و ناپوختەییەک هەیە وازی لێ بێنەو لێی دووربکەوە.

﴿وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ۝﴾

منەتیش مەکە (بەسەر کەسدا) چاکەو بەخشینەکانت بەزۆر مەزانە (هەمیشە با لە زیادی بێت).

﴿وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ ۝﴾ [المدثر]

هەوڵ بدە لەبەر خاترو ڕێزی پەروەردگارت خۆگرو ئارامگربە.

ئیتر لەدوای ئەم ڕووداوەوە کە جوبریلی بینییەوە ئەو ئایەتانەی خوای گەورەی بۆ هێنا، دڵنیا بوو لە پێغەمبەرایەتییەکەی لە هێزو توانایەکی بێوێنەدا لە چالاکییەکی زۆر ناوازەدا هەڵسایەوە لە ناو جێگاکەیدا بە خاتوو خەدیجەی فەرموو: ئیتر کاتی خەوتن و پشوودان کۆتای هات " مَضَى عَهْدُ النَّوْمُ يَا خَدِيجَةُ "، لێرەوە ڕاڤەی هەموو ئەو وێستگانەی بۆ ئاشکرا بوو کە سنگی شەقکراو بەردەکانی مەککە سڵاویان لێدەکرد ئەو کەسەش کە هاتە لای بۆ دواجار بۆی ڕوون بوویەوە هەمووی بەڵگەی پێغەمبەرایەتین.

سەید قوتب لە ڕاڤە نایابەکەی دا بە ناونیشانی (لە سێبەری قورئاندا) دەفەرمووێت: زیاد لە بیست ساڵ پشووی نەداو دانەنیشت لە ناو کەسوکاری دا نەژیا، بەڵکوو ڕاوەستاو بوو بە پێوە و چالاکانە تا بانگەوازەکەی گەیاند، ئەم ئەرکە قورسەی لەسەر شانی خۆی دانابوو، ئەمانەتەکەی خەڵکی ئەم زەویەی لەسەر شان بوو لە هەموو بووارەکاندا گەیاندی، لە ڕووی بیروباوەڕ، لە ڕووی ڕزگاری و خەبات و شۆڕش، یاخوود لە هەموو مەیدانە جیاوازەکان.[٥٥]

[٥٥] (قُمْ) وفي ذلك يقول الأستاذ سيد قطب: قيل لرسول الله صلى الله عليه وعلى آله وسلم (قُمْ). فقام، وظل قائمًا بعدها أكثر من عشرين عامًا، لم يسترح، ولم يسكن، ولم يعش لنفسه ولا لأهله، قام وظل قائمًا على دعوة الله، يحمل على عاتقه العبء الثقيل الباهظ ولا ينوء به. عبء الأمانة الكبرى في هذه الأرض، عبء كلها، وعبء العقيدة كلها، وعبء الكفاح والجهاد في ميادين شتى".، في الظلال القرآن


WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەڵێ بەڕاستی پێغەمبەرمان ﷺ، لەدوای ئەوەی ئەو چەند وشانەی پێگەیشت، ئیتر دانەنیشت و بە کوچە و کۆڵان و منداڵ و پیر و جوان و لاو و ئافرەت و بەندەکاندا بانگەوازی خوای گەیاندە هەمووان.

منیش حەزم دەکرد خۆم بکەمەوە بەناو کتێبەکەدا بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ ئەو سەردەمە، بەڵام چارم نەبوو هەر دەبوو بەردەوام بم لە سەر خوێندنەوەی، گەیشتمەوە سەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ زانی وەحی بۆ هاتووە و لەلایەن خوای گەورەوە هەڵبژێردراوە، بیرکردنەوەیەک دایگرتبووم ناڕاستەوخۆ شیکاریم دەکرد بۆ ڕەوشەکە و کارەکانی پێغەمبەر ﷺ، بەم شێوەیە کەوتبوومە بیرکردنەوە کە خوای گەورە ئاراستەی دەکات و بانگەوازەکەی بۆ هەموو خەڵکییە و دەبێت بیگەیەنێت، ئەمەش پێویستیی بەنووخبەیەک هەیە کە ئەم بانگەوازە بگەیەنێت، دەبێت لەسەرەتاوە چۆن بانگەواز بکات و ئەم نووخبەیە درووست بکات تا بتوانێت لەداهاتوویەکی نزیکدا کۆڵ و ئەرکی بانگەوازەکە بخاتە سەرشانی ئەوانیش و هاوکاری بن لەبانگەوازەکەیدا، تا لەدوای بانگەواز بتوانن ئەم بیروباوەڕە بکەنە ئایدۆلۆژیا و شۆڕش و بزاوتێکی گەورەی پێ درووست بکەن، ئەم شۆڕش و خەبات و گۆڕانکارییە پێویستی بە بەرنامە و نووخبە و خەڵک هەیە، ئەم سێ پێکهاتەیە دەبنە ئایدۆلۆژیا و گۆڕانکاری و خەباتەکەی پێدەسازێنرێت، ئەمەش ئاراستەی خوای گەورە بوو بۆ سەروەرمان ﷺ ئینجا تێگەیشتنی باشی هاوەڵاکانی پێغەمبەر ﷺ بوو، ڕەزامەندیی خوا لەوانیش بێت.

پێش ئەوەی دەست بکەمەوە بەخوێندنەوەی و بگەڕێمەوە بۆ ژیانی سەروەرمان ﷺ دەمەوێت وشەی ئایدۆلۆژیا و پێکهاتەکەیم بکەمەوە.

-ئایدۆلۆژیای ئیسلام چییە؟

سەرەتا بۆئەوەی سەلەفییەکانی دەق و مەدخەلیی لەق لێماننەکەن بەهۆسە! وتمان ئیسلام دینە، بەڵام "بیروباوەڕ و بانگەواز و خەڵکەکەی دەبنە ئایدۆلۆژیا" ئەمانەی باسمانکرد لەدینەوە سەرچاوەیان گرتووە کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامە.

بیروباوەڕەکانی تر لەسەر بنەمای فەلسەفە ئایدۆلۆژیا درووستدەکەن دەیکەنە ڕێباز، چوونکە فەلسەفە لەزانست باڵا بەرزترە ، بەو پێیەی زانست بۆخۆی دیارە و کۆمەڵێک هاوکێشە



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

و بیردۆز ئەنجامێکی زانستیت پێدەبەخشن، بەڵام فەلسەفە گەڕانە بەدوای ونبووەکانی ژیاندا و هەموو ئەو شتانەی زانست نەیسەلماندوون و وەڵامی نەداوەتەوە، ئەو لەناو خۆیدا جێگەی بۆ کردوونەتەوە.

ئایین لەهەموویان گەردن بەرزترە، چوونکە وەڵامی فەلسەفەی داوەتەوە، لەئەنجامی ئایینەکان فەیلەسوف دروستبووە، ئەستێرەی ئیسلام لەئاسمان دا بەدرەوشاوەیی ماوەتەوە و هەموویانی بەجێهێشت و وەڵامی هەموو پرسیارەکانی شوێنکەوتووانی ئەداتەوە، کۆتایی جیهانی دیاریکردووە، داهاتووی مرۆڤی ڕوونکردۆتەوە، ئیسلام وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی داوەتەوە کە باس لە: بوون، گەردوون، ژیان، دەسەڵات و مرۆڤ دەکەن.

کەواتە ڕۆژهەڵات و هەموو بیروباوەڕە مرۆڤ کردەکان لەوە دەترسن کە ئیسلام بە ئایدۆلۆژیا ڕووبەڕوویان بێتەوە، ئەو کاتە ئەوان دەبێت بەرانبەرەکەیان -کە ئیسلامە- خەولێبخەن، یان سەرخۆشی بکەن، وەک بۆ ماوەی دوو سەدە دەڕوات ئەو کارەیان کردووە و نەیان توانیوە ڕووبەڕووی ئایدۆلۆژیاکەی ببنەوە.

ئایدۆلۆژیای ئیسلامی پێکهاتووە لەباڵەخانەیەکی سێ نهۆمی، لەناو هەر نهۆمێکدا چەند پایەیەکی تێدایە:

یەکەم: مەنهەج.

دووەم: کۆمەڵسازی.

سێیەم: بزاوت.

مەنهەج: ڕۆحی ئایدۆلۆژیایە، بەمانای ئەو بەرنامە تۆکمەیەیە کە پایەکانی ئایینی ئیسلامی پێکهێناوە و بریتین لەقورئان و سووننەت، واتە: قورئان و سیرەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵان.

بۆئەوەی بنەمای ئایدۆلۆژیای ئیسلامی دابمەزرێنین پێویستیمان بەچەند پایەیەکە لەم مەنهەجەدا:


WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یەكەم: دیدی بیروباوەڕ واتە: بنەمای بیروباوەڕت لەسەر چی دادەمەزرێت؟ سەلەف، مووعتەزیلە، ماتووریدی، ئەشعەری، موورجیئە...هتد، هەروەها دەبێت بیروباوەڕی ڕوونت هەبێت، كە سووپاس بۆ خوا ئێمەی ئەهلی سوونەت و جەماعەت بیرووباوەڕمان ڕوون و ئاشكرایە.

دووەم: دید و هزری جیهانبینی: تێگەیشتنت بۆ گەردوون، مرۆڤ، دەسەڵاتو ژیان...هتد.

واتە: بۆچوونی دید و فیكری بۆ ئەم ژیانە دەگرێتەوە.

سێیەم: بەرنامەی سیاسی و گوتاری سیاسی -پەیڕەوو پرۆگرامی ناوخۆ-، بەواتەی پاراستنی مافی مرۆڤ و ژینگە، فرەدیدی، پڕۆژەی ئابووری، ئیدارەی سیاسی كە پێكهاتووە لە: خاك، خەڵك، دەسەڵات و سەربەخۆیی.

چوارەم: مەنهەجی پەروەردە (قییەم): ئەمە پێكهاتەی ڕەوشت (سلوك)ە لەبنەڕەتدا لەسەر سێ بنەما پێكدێت كە ئەمانەن: پاڵفتەی دڵ و دەرون (تەزكییەی نەفس)، ڕەفتار و ڕەوشت، ئادابی ناو كۆمەڵگەو نەریتی ڕەسەن

- كۆمەڵسازی چییە؟

كۆمەڵسازی جەستەو پەیكەری ئایدۆلۆژیایە بەو مانایەی كە ئایدیۆلۆژیاكە بەگەڕ دەخات و لەتیۆرییەوە دەیكاتە هێزێكی پراكتیكی و لەمەیداندا دەیجوڵێنێت.

كۆمەڵسازیی ئیسلامی، خاوەنی سێ پایەی تایبەتیی خۆیەتی و نە زیاد دەكات نەكەم، بێ یەكتریش ناگونجێت.

یەكەم: ڕەمز -سەركردە یان ڕێبەر یان كۆمەڵ: ئەوەی كە پیادەی ئایدیۆلۆژیاكە دەكات و بەرنامەو پلانی بۆ دەكێشێت، دەستنیشانی تەوەرەكانی دەكات و ئاراستەی نووخبە دەكات، وەك لەم باسەی ژیاننامەی پێغەمبەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم زیاتر بۆمان ڕووندەبێتەوە.

دووەم: نووخبەی هەڵبژێردراو یان بژاركراو: ئەم كۆمەڵە بەجوانی و بەچاكی لەبنەماكانی ئەم ئایدۆلۆژیا یان ئەم ڕێبازە تێگەیشتوون و لەنێوانی ڕێبەر و جەماوەردان، هەموو

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

جەماوەرەکە پۆلێنو پەروەردە دەکەن، تواناو وزەکانیان بەگەڕ دەخەن و کەسایەتییەکان دەناسن و لەجێگەی شیاودا بەکاریان دەهێنن، وەک هاوەڵاکانی پێغەمبەر ﷺ کە هەریەکەیان کارێکیان پێ سپێردرابوو، وەک یەک جەستە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کاریان دەکرد.

سێیەم: جەماوەر: ئەو توانا و وزەیەن کە دەبنە هەوێنی شۆڕش و دامەزراندنی سیستەم، دەسەڵات، ژیار، شارستانییەت.

-بزاوت چییە؟

بزاوت خۆراکی هەموو ئایدۆلۆژیایەکە تاکو کۆمەڵ پەروەردە دەکات لەسەری بۆ بڵاوکردنەوەی ئایدۆلۆژیاکە و ڕێکخستن و ئیدارە و چاودێری و پلاندانان لەسەری.

بزاوت خاوەنی دوو پایەی سەرەکییە:

یەکەم: بانگەواز و هەڵوێست (بەلاغ و شاهیدیدان): هەڵوێستیش بەواتەی هەڵوێستمان لە: فرەدیدی، مافی مرۆڤ، گوتاری سیاسیی بەرانبەر لەهەموو ڕەهەندەکانی ژیاندا.

دووەم: ستراتیژییەت و قۆناغکاری: بەمانای دەست نیشانکردنی ئامانج بەگوێرەی قۆناغەکانی ئەو زەمینەیەی کە ئامانجی دارولئیسلامە و پێکهاتەکەی بنەمای سیستەم و دەسەڵاتی ئیسلامییە و بریتییە لە: حاکمیەت، دادگەری، گوێڕایەڵی، شورا.

ئەمەیە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی.

چۆن بانگەواز دەستی پێکرد؟

کەواتە پرسیار ئەوەیە چۆن ئەم ئیدارە و ڕێکخستنە درووستکراو سەرەتا کێ بانگهێشتکرا، پێغەمبەر ﷺ لەکێوە دەستی پێکرد؟

بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ هەروا بەهەڕەمەکی نەبوو، بەڵکوو لەسەر بنەمای مەنهەجێکی ڕێک و تەندرووست بوو، پێش ئەوەی بێمە سەر باسی مەنهەجی بانگەوازەکەی



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پێغەمبەر ﷺ پێوویستە بپرسین ئایا مرۆڤ کاتێک ئیمان دەهێنێت، بەدڵ دەبێتە باوەڕدار یان بەئەقڵ و ژیریی؟ یان دەبێت ئەو کەسەی بانگەواز دەکات خۆشەوویست بێت لەدڵی خەڵکیدا ئینجا دوای ئەوە بەڵگەی ئەقڵی بخاتە بەردەم ئەو خەڵکەی بانگەوازیان دەکات؟

کەواتە لەدەستپێکی هەموو ئیدارە و ڕێکخستنێکدا پێوویستە ئەم دوو چەمکە ڕەنگدانەوەیان لەبانگخوازەکەدا هەبێت، چوونکە مەنهەجی پێغەمبەرە ﷺ گرنگترین شت بۆ بانگەواز خۆشەوویستی و بەڵگەیە، چوونکە زۆرجار ئەو کەسەی کە بانگەواز دەکات، ئەگەرچی خاوەنی بەڵگەی بەهێزیش بێت، بەڵام ئەگەر خۆشەوویست نەبوو ئەوا ئەو بیرووباوەڕە هەرگیز وەرناگیرێ، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر هات و بیروباوەڕێک بوو کەس لێی تێنەگات و لەسەر بنەمای نازانستی دامەزرێت، با بانگخوازەکەش خۆشەویست بێت، بەڵام خەڵکی هەمیشە بیروباوەڕی مەعقول و شتی لۆژیکی وەردەگرێت کە گونجاو بێت لەگەڵ سرووشتی مرۆڤ و بیر و دڵ و دەروونیدا.

ئەم بیرکردنەوەیەی سەروەرمان زۆر تەندرووست بوو، چوونکە بۆ ماوەی (٦٠٠) ساڵ هیچ پێغەمبەرێک نە نێردرا بوو.

لەو سەردەمەدا بۆ کۆمەڵگەکان بانگەوازەکە لای خەڵکی شازو نامۆ بوو، هەرچەندە لەهەموو سەردەمێکدا هەروا بووە کە ژیری زوو لەبەردەمیدا چۆک دائەدات، بەڵام کێشە لەشەهوەتبازەکاندایە کە بۆیان قبوڵناکرێت، چوونکە ئەو سەردەمە کە سەروەرمان بانگەوازی بۆ یەکخواپەرستی دەکرد لای ئەو خەڵکە زۆر سەرسووڕهێنەر بوو، ئایا واز لەو هەموو خوایە بهێنن بۆ بانگەشەکەی محمد ﷺ کە بانگیان دەکات بۆ یەکخواپەرستی!

یاخوود دەیانووت: ئایا دەشێت مرۆڤ پێغەمبەر بێت؟ یاخوود واز لەمەی خواردنەوە و داوێنپیسی بهێنین؟!

هەموو ئەمانە نامۆ بوون بەکۆمەڵگەی ئەو سەردەمە، لەم سەردەمەی ئێستاشدا ئەگەر بەئافرەتێک بڵێیت: بۆچی خۆت ڕووتکردۆتەوە و دەچیتە سەر شاشەی تەلەفزیۆن و خۆت با ئەدەیت و جەستەت ئەلەرزێنیت؟ بەلایەوە سەیرەو پێت دەڵێت: ئەوە هونەرە!



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یاخوود بەکەسێکی تر دەڵێیت: واز لەعەلمانییەت بهێنە و دینی خوای گەورە پیادە بکە، کەچی ئەو تۆ بەکۆنەپەرست و دواکەوتوو تەماشا دەکات!

بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : ئایینی ئیسلام بەنامۆیی هاتووە، هەر بەنامۆیش دەگەڕێتەوە ناو خەڵکی و کۆمەڵگەکان، ئەوانەشی بانگەوازی بۆ دەکەن بەنامۆ تەماشا دەکرێن، وەک دەفەرمووێت: "بَدَأَ الإِسْلاَمُ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ غَرِيبًا، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ."

ئەو سەردەمە بانگەوازەکە بۆ قووڕەیش و هەموو خەڵکی بگرە جیهانیش بوو، بەڵام پێغەمبەرمان ﷺ لەو کەسانەوە دەستی پێکرد کە بەزوویی بیروباوەڕ وەردەگرن و بەرپرسیارێتی دەخەنە سەرشانیان، دەبێت لەوانەوە دەست پێبکات کە زۆر پێغەمبەریان ﷺ خۆشدەوێت و بەزوویی بیروباوەڕەکە وەردەگرن.

لەباسی ئیدارەو ڕێکخستن دا هەموو خەڵکی سەرزەوی ئەم مەنهەجە پیادە دەکەن، ئێمەش ئەمە وانەیەکە و لەپێغەمبەری سەروەرمانەوە ﷺ وەریدەگرین و بانگەوازەکەمانی پێدەگەیەنین تا ئیدارە و ڕێکخستنێکی بەهێز بۆ ئەم ئیسلامە دابمەزرێنین.

لەسەر ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم شیکاریانەم دەکرد، ماندوویەتی ئیشوکار هەراسانی کردم و ناچار کتێبەکەم داخست و چاوم نا بەیەکدا بۆ ئەوەی زیاتر بتوانم شیکارییەکەم سەرکەتووبێت و بە ماندوویی شیکاری بۆ ئەو ڕەوشەی پێغەمبەر ﷺ نەکەم، بەتایبەت کە سەرەتای دامەزراندنی ڕێکخستنە سەرەتاییەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

لەبەر چاومدا بوو کە خۆم لە تەنزیمێکی عەلمانی و ئیسلامیدا کارم کردووە، بەڵام نەمدیوە جوانتر و پاکتر و تەندرووست تر لە ڕێکخستنە سەرەتاییەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ڕێکخستنە سەرەتاییەکان و نهێنییەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ

ڕێکخستنە سەرەتاییەکان کێ بوون؟

هەموو کۆمەڵ و دەستە و تاقمێک بەم شێوەیە دەستیانپێکردووە، ئیسلامیش کە لەسەرەتاوە هاتووە هەروا پێغەمبەرمان ﷺ فێری کردووین، چوونکە مرۆڤەکان بەسرووشتی خۆیان ئەو شتانە دەکەن کە بەدەرنییە لەدەروون و هەست و نەست و سۆزیان، بۆیە سەید قوتب دەڵێت: "ئەم قورئانە قسەکردنە لەگەڵ ناخی خەڵکی و پێغەمبەریش ﷺ کە هاتووە شتێکی نەهێناوە بەدەربێت لەتوانای مرۆڤەکان."

بانگکردنی خاتوو خەدیجە -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- بۆ موسڵمان بوون:

پێغەمبەرمان ﷺ گەڕا بەشوێن ئەو کەسانەدا کە زۆر خۆشیان دەویست و ئەویش ئەوانی خۆشدەویست، یەکەمجار چووە لای خێزانە سالار و سەنگینەکەی خاتوو خەدیجە -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- گومانیشی تێدانییە لەسەر ئەم هەسارەیەی ئێمەدا یەکەم کەس کە ئیمانی هێناوە خاتوو خەدیجە بوو، ئەوەشمان زانی کە چۆن بەشوێنی پێغەمبەرەوە ﷺ بوو بۆ شیکارکردنی ڕووداوەکان و زۆر بەوردی توێژینەوەی دەکرد و ئاگاداری سەرەتای وەحی بوو کە هاتووە بۆ پێغەمبەرمان ﷺ هەر ئەو بوو کە سەروەرمانی بردە لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل، دەیزانی ئەوەی کە هاتووە بۆ لای سەروەرمان محمد ﷺ ئەوە جیبریلە -سەلامی خوای لێبێت- ئەو ئایەتەی بۆ هێناوە کە خوای گەورە دەفەرمووێت : (قُمْ فَأَنْذِرْ...) (المدَّثر: ٢)

واتە: ئیتر کاتی هەڵسان و بێدارکردنەوەی خەڵکییە لەنەزانی و تاریکی.

دەستبەجێ خاتوو خەدیجە بڕوای بەبانگەوازەکەی محمد ﷺ هێناو شەرەفی ئەوەی پێبەخشرا کە یەکەم کەس بێت لەسەر ئەم زەوییەدا موسڵمان بێت لەگەڵ ئەوەیشدا ئافرەتە، جێگەی شانازیی ئێمەیە یەکەم کەس کە بڕوای بەم ئیسلامە هێناوە ئافرەتە، تەنانەت ئەتوانم بڵێم: پێش ئەوەی سەروەرمان بانگی بکات، خاتوو خەدیجە موسڵمان ببوو، ئەوەبو




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەرمووی: "كلاَّ وَاللَّهِ لاَ يُخْزِيک اللَّهُ أَبَدًا". واتە: نا محمد ﷺ سووێند بەخوا، خوای گەورە هەرگیز تۆ تووشی سەرشۆڕیت ناکات.

خاتوو خەدیجە خۆشەویستییەکی زۆر بێوێنەی هەبوو لەدڵی پێغەمبەرماندا ﷺ کە بەهیچ پێناسە و وەسفێک ناتوانێت بیهۆنیتەوە یاخوود کام تەعبیر جوانترە بۆی بەکار بهێنرێت، خاتوو خەدیجەیش خۆشەویستیی بۆ سەروەرمان زۆر خەیاڵی بوو، ئەوبوو فەرمووی: تۆ سیلەی ڕەحم بەجێدەهێنیت هەموو خزم و کەسووکارت بەسەردەکەیتەوە و هەستی بەرپرسیارێتیت لەسەرشانە، خۆشەویستیی بۆ هەمووان دەردەبڕیت ئەوەی کە هەژار و بێدەرەتانە تۆ دەستگیرۆیی دەکەیت، زۆر ڕێزی میوان دەگریت و پشتیوانی لە لێقەوماوان دەکەیت و لەسەر بەلاو نەگبەتییەکان ئارامگریت.[٥٦]

هەر ئەو خۆشەویستییە بوو وایلێکرد بیباتە لای وەرەقەی ئامۆزای دەیزانی ئەم سەروەرەمان هەرگیز درۆ لەدەمی دەرنایەت، لەتەواوی ئەو ژیانەی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بردوویەتیە سەر پڕبووە لە ڕەوشتی جوان، خۆشەوویستی، ڕێز و وەفا بۆیە هەر زوو بڕوای پێ هێنا دەشیزانی ئەم وتانەی هاوسەرە بەڕێزەکەی کە پێغەمبەرە ﷺ هەروا وتەی ئاسایی نین، بەڵکوو دەیزانی ئەمە لەلایەن خوای گەورەوەیە، کەواتە هەردوو هۆکارەکە بەکارهاتووە لەئیدارە و ڕێکخستن دا کە بریتین لە: خۆشەوویستی و بەهێزیی بەڵگەو قسەکردن لەگەڵ ئەقڵی خەڵکیدا.

گرنگە لێرەدا ئەوە بیری بانگخوازان و کادێرانی ناوەندی ئیسلامی بخەینەوە تا بتوانن هاوسەرەکانیان یاخوود کەسە نزیکەکانیان وا لێبکەن وەک یەک بیربکەنەوە بۆئەوەی بتوانن پەرە بدەن بەکارەکانیان و کەسە نزیکەکانیان بۆیان ببنە پاڵپشت.

- بانگکردنی ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- بۆ موسڵمان بوون: دوای خاتوو خەدیجە پێغەمبەرمان ﷺ چووە لای پیاوێک کە لەدڵی دا زۆر شیرین و خۆشەویست بوو، پرسیاریان لەپێغەمبەری سەروەرمان ﷺ کرد، خۆشەویسترین کەس لەپیاوان لەدڵی جەنابتاندا کێیە؟ فەرمووی: ئەبوو بەکر، هەرگیز دڵەڕاوکێی نەبووە لەبانگکردنی بۆ ئەم دینە و دوودڵ نەبووە لەوەڵامدانەوەی بۆ ئیسلام. وەک دەفەرمووێت :

---

[٥٦] "إِنَّک لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكلَّ، وَتَكسِبُ الْمَعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ".





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەرکەسێکم بانگ کردبێت بۆ ئیسلام تووشی دوو دڵی و پرسیار و دڵەڕاوکێ بووە، بۆچوون و قسەی تایبەتی هەبووە، بەڵام تەنها ئەبوو بەکر نەبێت کە بانگم کرد بۆ ئیسلام، هیچ پرسیار و وەڵامێکی نەبوو، بێ دوودڵی ئیسلامی وەرگرت. لەهاتنە ناو ئیسلام هیچ کەسێکی تر وەک خاتوو خەدیجە و پێشەوا ئەبوو بەکر نەبووە -ڕەزامەندی خوایان لەسەر بێت-.[٥٧]

لەڕاستیدا پێویستە لێکۆڵینەوە بکرێت لەموسڵمان بوونی ئەبوو بەکر بەو خێراییە، ئەبوو بەکر نزیکترین کەس بووە لەپێغەمبەرەوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەڕووی ڕەوشت و قسەو گوفتارەوە، چوونکە دیارە پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەسەرەتاوە ئەوانەی بانگ کردووە کە بۆچوون و دیدوبۆچوونیان وەک یەک بووە.

لەڕاستیدا ڕەوشتی ئەبوو بەکر هەروەک پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بووە، لەدوای پێغەمبەران -سەلامی خوایان لێ بێت- ئەبوو بەکر باشترین پیاوی سەر ڕووی زەوییە -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- لەڕووی ڕەوشتەوە زۆر هاوبەشی هەبووە لەنێوانی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم و پێشەوا ئەبوو بەکری سدیق دا. ئەو بەسدیق ناسراوە سەروەریشمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەسادقولئەمین بانگ کراوە، هەردووکیان بەڕێز و هێمن و داوێنپاک بوون، دووربوون لەجێگەی خراپ و مەیخواردنەوە، هەروەها خزمەتی خەڵکیان کردووە و بەدەم هەژارانەوە بوون، لەپێش هاتنی ئیسلامیشدا خاوەنی کەسایەتیی تایبەتی بوون، هەربۆیە ئەبوو بەکر بێ دوودڵی خێرا ئیسلامی وەرگرت -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت-.

- بانگکردنی زەیدی کوڕی حاریس -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- بۆ موسڵمان بوون:

لەدوای موسڵمان بوونی خاتوو خەدیجە و پێشەوا ئەبوو بەکر -ڕەزامەندی خوایان لەسەر بێت- پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەستیکرد بەبانگەوازی بەندەکەی بەناوی زەیدی کوڕی حاریس، ئەم هاوەڵە بەڕێزەی پێغەمبەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم خۆشەوویستییەکی زۆری هەبوو بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەپێچەوانەشەوە سەروەرمان زۆر ئەوی خۆشدەوویست تا ئەو ڕادەیەی ناونرا بەزەیدی کوڕی محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم، واتە: کرا بەکوڕی -تەبەنی- پێغەمبەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم.

---

[٥٧] "مَا دَعَوْتُ أَحَدًا إِلَى الإِسْلَامِ إِلاَّ كَانَتْ لَهُ عَنْهُ كَبْوَةٌ وَتَرَدُّدٌ وَنَظَرٌ، إِلاَّ أَبَا بَكْرٍ، مَا عَتَّمَ حِينَ ذَكَرْتُهُ لَهُ وَمَا تَرَدَّدَ فِيهِ".



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

چیرۆکی ئەم هاوەڵە بەڕێزەی سەروەرمان چیرۆکێکی زۆر تراژیدییە، ئەم منداڵە لەبنەچەدا خەڵکی سەبائن بوو لەوڵاتی یەمەن، دایکی لەسەردەمی جاهیلیدا بەمیوانی دەڕوات بۆ ناو هۆزیک بەناوی (معن)، ئەو هۆزە لەجەنگدا بوون لەگەڵ هۆزێکیتر بەناوی (قینکوری جسر)، لەجەنگێکدا زەید دەکەوێتە بەردەستی هۆزی بەرانبەر و لەتەمەنی هەشت ساڵیدا لەبازاڕی عوکازی مەککە دەفرۆشرێت بەپیاوێک بەناوی حەکیمی کوڕی حازم، ئەویش بەخاتوو خەدیجەی کچە مامی پێشکەشی دەکات ، خاتوو خەدیجەش پێشکەشی دەکات بەپێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم ، بەڵام ئەم ڕووداوە پێش هاتنی وەحی بووە بۆ پێغەمبەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم ، سەروەریشمان کە لێی وەرگرت دەستبەجێ ئازادی کردو کردییە کوڕی خۆی بەشێوازی (تەبەنی). هەروەک لەم فەرموودەیەدا هاتووە:

خەڵکانێک زەیدیان ناسییەوە و زانییان ئەمە ئەو کوڕەیە کە لەو کارەساتەدا لە کەسووکاری دابڕاوە، پاشان گەڕانەوە بۆ ناو هۆزەکەی کە ناوی هۆزی (کلب) بوو، بەکەسووکارەکەی: باوک، برا، مامەکەی بەناوی کەعب، زۆرێک لەئامۆزاکانی لەکوڕانی شەراحیل، هەواڵی جێگەو شوێنی زەید-یان ڕاگەیاند، ئەوانیش کەوتنە ڕێ بۆ ئەوەی ئازادی بکەن و بیگەڕێننەوە، گەیشتنە شاری مەککە و هەواڵی ئەویان زانی کە لەلای محمدە صلى الله عليه وعلى آله وسلم چونە لای و پێیان وت: "ئەی کوڕی عەبدولموتەڵیب لەگەورەی هاشم، گەورەی گەل و هۆزەکەی خۆی، کوڕێکمان لەلاتە بەڵکوو بۆمان بگەڕێنیتەوە، فیدییەکەی چەندە تا بتدەینێ، سەروەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی: ئەو کەسە کێیە؟

وتیان: زەیدی کوڕی حاریس، پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی: دەی خاوەنی کەسانێکی تریشە کە کەسووکاری ئەون. ئەوانیش وتیان کێیە؟ سەروەرمان فەرمووی: وازی لێبهێنن با خۆی هەڵیبژێرێت، ئەگەر ئێوەی هەڵبژارد ئەوا دەتوانن بیبەنەوە بەبێ هیچ فیدیەیەک، منداڵی خۆتانە، ئەگەر منیشی هەڵبژارد، سوێند بەخوا من کەسێک نادەمەوە دەستی کاسانێکی تر کە خۆی نایەوێت و من هەڵدەبژێرێت.

ئەوانیش وتیان: قسەیەکی دادپەروەرانەیە و باشترین هەڵبژاردنە، پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی بە زەید: ئەم کەسانە دەناسیت؟ زەید فەرمووی: بەڵێ ئەو باوکمە، ئەویش ماممە.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: منت ناسیوە ڕەفتار و کردارم بەرانبەرت چۆن بووە، من هەڵدەبژێریت یاخوود کەسووکار و باوک و مامەکەت؟ زەید فەرمووی: من تۆ هەڵدەبژێرم، تۆ باوک و مام و هەموو کەسووکاری من بوویت، ئەوا لە جەنابیشت زیاتر هیچکەس هەڵنابژێرم. باوک و مامەکەی وتیان: ئەی خاک بەسەرت زەید، بەندایەتی هەڵدەبژێریت و ئازادی واز لێدەهێنیت و ناگەڕێیتەوە ناو ماڵی باوک و کەسووکارەکەت؟!

زەید فەرمووی: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە هیچ خراپەیەکم لەم پیاوە -محمد ﷺ- نەبینیووە، ئیتر بۆ وەفای ئەم پیاوە لەیاد بکەم ئەو کاتەی کە من کۆیلە بووم کاتێک بەخشرامە محمد ﷺ بەئاشکرا لەناو قووڕەیشدا بانگی خەڵکی کردو فەرمووی زەید لەمنە و منیش لەوم، ئەو کوڕی منەو میرات لەمن دەگرێت و منیش میرات لەو دەگرم. ئیتر باوک و مامەکەی بە نائومێدی گەڕانەوە و زانیان خۆشەویستیی بۆ پێغەمبەر ﷺ بێوێنەیە[٥٨].

ئەو کاتەی کە سرووش بۆ پێغەمبەر ﷺ نێررا، تەمەنی زەیدی کوڕی حارث -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- (٣٠) ساڵ بوو، ئایا کە سەروەرمان بانگی بکات بۆ ئیسلام چۆن نایەتە ناو ئەم نوور و ڕووناکییەوە، لەکاتێکدا ئەو هەموو خۆشەویستییەی بۆ پێغەمبەر ﷺ هەبوو، ئیمانی زەیدی کوڕی حارس تەنها لەڕووی درووشم و خۆشەوویستی و هەست و سۆزەوە نەبوو، بەڵکوو خاوەنی هزرو تێگەیشتنێکی ورد بووە و لەتەمەنێکدا بووە توانای ئەوەی هەبووە کە چاک و خراپ لەیەکتری جیابکاتەوە، چوونکە

---

[٥٨] "إن ناسًا من كلب حجوا فرأوا زيدًا، فعرفهم وعرفوه، فانطلق الكلبيون فأعلموا أباه ووصفوا له موضعه، وعند من هو، فخرج حارثة وأخوه كعب إبنا شراحيل لفدائه، فقدما مكة، فدخلا على النبي ﷺ، فقالا: يابن عبد المطلب، يابن هاشم، يابن سيد قومه، جئناك في إبننا عندك فأمنن علينا، وأحسن إلينا في فدائه. فقال: مَنْ هُوَ؟ قالوا: زيد بن حارثة. فقال رسول الله ﷺ: فَهَلَّا غَيْرَ ذَلِك. قالوا: ما هو؟ قال: أَدْعُوهُ وَخَيِّرُوهُ، فَإِنِ اخْتَارَكُمْ فَهُوَ لَكُمْ، وَإِنِ اخْتَارَنِي فَوَاللَّهِ مَا أَنَا بِالَّذِي أَخْتَارُ عَلَى مَنِ اخْتَارَنِي أَحَدًا. قالا: قد زدتنا على النصف وأحسنت. فدعاه رسول الله ﷺ فقال: هَلْ تَعْرِفُ هَؤُلَاءِ؟ قال: نعم، هذا أبي وهذا عمي. قال: أَنَا مَنْ قَدْ عَرَفْتَ، وَرَأَيْتَ صُحْبَتِي لَك، فَاخْتَرْنِي أَوِ اخْتَرْهُمَا. قال: ما أريدهما، وما أنا بالذي أختار عليك أحدًا، أنت مني مكان الأب والعم. فقالا: ويحك يا زيد! أتختار العبودية على الحرية وعلى أبيك وأهل بيتك؟! قال: نعم، قد رأيت من هذا الرجل شيئًا، ما أنا بالذي أختار عليه أحدًا أبدًا. فلما رأى رسول الله ﷺ ذلك أخرجه إلى الحجر، فقال: يَا مَنْ حَضَرَ، أَشْهَدُوا أَنَّ زَيْدًا إِبْنِي، يَرِثُنِي وَأَرِثُهُ. فلما رأى ذلك أبوه وعمه، طابت نفوسهما وانصرفا."

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

وازهێنان لەئایینی باووباپیران و چوون بۆ ناو ئایینێکی تر هەروا ئاسان نییە. خۆ ئەگەر بێت و تۆزیک بیربکەینەوە لەگەڵ زەیدی کوڕی حارس دا لەماوەی پێکەوە ژیانی لەگەڵ پێغەمبەرماندا ﷺ درۆیەکی لێنەبینیووە، ئایا دەکرێت کەسێک لەژیانیدا درۆی لەگەڵ خەڵکیدا نەکردبێت لەگەڵ خوادا بیکات؟ بێگومان نەخێر، دەبینین ئەو هەموو تەمەنی خۆی لەخزمەتی خەڵکیدا دابەشکردبوو گەیشتبووە تەمەنی (٤٠) ساڵی بەدوای بەرژەوەندیی کەسێتیی خۆیدا نەدەگەڕا، دەبینین لەتەمەنی لاوێتیدا پیاوێکی داوێن پاک و سەر ڕاست و ڕاستگۆ بوو، کەواتە لەتەمەنی (٤٠) ساڵیدا هەرگیز یارییاکات بەبیروباوەڕی خەڵکی.

ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بەدوای ماڵ و سامان و پاشایەتیدا بگەڕایە شاری مەککە خەڵکێکی دینداربوون، باشترین و نزیکترین ڕێگە بۆ ئەو مەبەستە لەڕێگەی (لات و عوزا)وە بوو بۆ بانگەواز، چوونکە خەڵکی ئەو جێگایانە زۆر ڕێزی لات و عوزایان دەگرت، ئەویش زوو دەگەیشتە ئامانجی خۆی.

گومانی تێدانییە ئەم بیرو تێڕوانینانە بەزیهنی زەیدی کوڕی حارس دا هاتووە ئینجا ئەو ئیمانە گەورەیەی بۆ درووستبووە.

ئەمەش لەئەنجامی ئەو پرسیارانەی کە لەمێشکی زەیدی کوڕی حارس دا درووستبووە و لەڕێگەی ڕاستگۆیی سەروەرمانەوە هەموو وەڵامەکانی بۆ ڕوون بۆتەوە، کەواتە ئیمان هێنانی زەیدی کوڕی حارس تەنها لەڕێگەی خۆشەویستییەوە نەبووە، بەڵکوو لەڕێگەی عەقڵیشەوە بووە.

## - بانگەوازی نهێنی و ڕێکخستنی تۆکمە

گومان لەوەدانییە کە پێغەمبەر ﷺ دەیویست بانگەوازەکەی بگاتە هەموو مرۆڤێک لەشاری مەککەدا، ئەمەش هەروا شتێکی ئاسان نەبوو کە لەجێگەیەکی بەرزدا بووەستایەتەوە و بانگەوازی بکردایە بەئاشکراو باسی ئایینەکەی بکردایە، چوونکە ئەم بانگەوازە پێویستیی بەئامادە باشی و خۆپاراستن هەیە، لەبەرئەوەی سرووشتی مرۆڤ وایە -ئەوەی کە بەسەدان ساڵ لەباوو باپیرانەوە بۆیان بەجێماوە- کە وازهێنان لەئایین زۆر ئاسان نییە و خەڵکی لەچەند ساتێکی کەمدا بەزوویی بەدەمییەوە ناچن.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەندێکیش پێیان وایە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتاوە بانگەوازەکەی ئاشکرا بکردایە ئەوا زۆرێک لەخەڵکی شوێنی دەکەووتن و پێوویستی بەو هەموو ساڵە نەدەبوو کە بەنهێنی هاوەڵەکانی خۆی پەروەردە دەکردا!

هۆکاری ئەنجام نەدانی ئەم کارە ئەوەبوو پێغەمبەرمان ﷺ دەیزانی کە خەڵکی هەروا بەئاسانی پەیامەکەی وەرناگرن، ئەگەرچی ئایینی ئیسلام قسەکردنە لەگەڵ ناخی هەموو کەسێکدا، بەڵام خاوەن بەرژەوەندی و دەسەڵاتدارەکان ڕێگرییان دەکرد، نەیدەتوانی خەڵکی پەروەردە بکات بۆ ئەم کارە گرنگە، نەک لەناو قووڕەیشدا دژی موسڵمانان جەنگ دەستی پێدەکرد، بەڵکوو لەهەموو جیهانەوە دژی موسڵمانان دەوەستانەوە.

لەبەرئەوەی دوو بنەمای سەرەکی هەیە بۆ بانگەوازی ئەو کەسانەی کە دێنە ناو ئیسلامەوەو دەبنە نووخبە، ئەوانیش بریتین لە: ڕەوشتبەرزەکان و لاوەکان.

ئەوانەی خاوەنی ڕەوشتن ئەم خەسڵەتانەیان تێدایە: ڕاستگۆیی، دەستپاکی، ئازایی و دادپەروەری...هتد.

لاوەکانیش خاوەنی: تواناو هێز، گیانی گۆڕانکاری، تێکەڵ نەبوونی بیروباوەڕی خورافی و بتپەرستی بوون، چوونکە ئەو کەسانەی کە تەمەنیان (٥٠) ساڵ بوو، ئەزموونی پەرستنی بتیان زۆرتربوو لەکەسێک کە بەخورافی دەزانێت، ئەو پەرستنە بۆی نەبۆتە بیرووباوەڕ، هەروەها زووتر و بەئاسانی بیرووباوەڕی ئیسلام وەردەگرێت چوونکە بۆی نەبووە بەسومعە.

ئەو سێ کەسەی کە باسمان کردن -خاتوو خەدیجە، پێشەوا ئەبوو بەکر، زەیدی کوڕی حارس- تەنها لە ڕۆژی یەکەمی بانگەوازی ئیسلامی دا تەنزیم کران و هاتنە ناو ئایینی ئیسلامەوە.

بۆ ڕۆژی دووەم سەروەرمان ﷺ دەستیکردەوە بەبانگەواز و ڕێکخستنی ڕێکخستنەکانی ئیسلام، ئینجا دەستیکرد بەوەی کە نموونە و خەڵکی نوێ بهێنێتە ناو ئیسلامەوە و توانا و هێزی نوێی تێدا دەربکەوێت.

ئەبوو بەکر هەستی باشی هەبوو بۆ بانگەوازەکە بۆیە دڵی پڕبوو لەئیمان دەستیکرد بەکۆکردنەوەی خەڵکی بۆ ئیسلام و ڕێکخستنی باڵێکی تر یان دەستەیەکی ڕێکخستنی تر، بۆئەوەی بتوانن لەو باڵ و دەستەیە ناوچە و مەڵبەندێکی پێ زیاد بکەن، ئەبوو بەکر هەروەک



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پێغەمبەر ﷺ ئەویش هەڵسا و دەستیکرد بەدامەزراندنی ڕێکخستنەکان و بانگەواز کردنی خەڵکی بۆ ئیسلام.

ئەبوو بەکر بەسرووشتی خۆی لەدڵی خەڵکی دا پیاوێکی خۆشەویست و شیرین بوو، واجیهەیەکی زۆر باشبوو بۆ بانگەوازە پیرۆزەکە. ئەم باسەشمان بۆیە کردۆتەوە بۆ ئەوە نییە وەک چیرۆک تەماشای بکەن و بیخوێننەوە، بەڵکوو ئەوە واقیعە و دەمەوێت خوێنەری موسڵمان بیکاتە مەنەفێستێکی تەفخیمی و بتوانێت گۆڕانکاری پێبکات، ئێمەش پێوویستە وردبینەوە لەژیانی ئەم پیاوە بەڕێزە کە دوای پێغەمبەران گەورەترین پیاوی سەرزەوییە، ئینجا تەماشای ڕەفتارەکانی سەروەرمان ﷺ بکەین، کە چۆن ئەو ڕێکخستنەی دامەزراندووە؟

گرنگە ئەوەش بزانین بەچی سەروەرمان ئەو ڕێکخستنەی ئاراستە کردووە؟! دوایی چۆن پەروەردەی کردوون؟ لەچ جێگایەکدا کۆیکردوونەتەوە؟ لەسەر بنەمای چ جۆرە ڕێکخراوێک ڕێکیخستوون؟ لەهەر قۆناغێکدا چۆن پەروەردەی دەست پێکردووە؟ چۆن دەستی بەگۆڕانکاری کردووە؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە پێویستیی بەشیکاری و لێووردبوونەوە هەیە، تا بزانین چۆن گەیشتوونەتە قۆناغی ئەنجامدانی نوێژ و ڕۆژو و بەخشینی ماڵ و سامان و ئەو پیاوانەیان لێدەرچووە کە خوای گەورە پێناسەیان دەکات بە پیاوانێکی ڕاستگۆ لەگەڵ ئەو پەیمان و بەڵێنانەی کە دابوویان بەپێغەمبەری سەروەرمان ﷺ.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

شیکارییەک لەسەر ڕێکخستنەکان و شێوەی بانگەوازەکە

پێغەمبەر ﷺ نایەوێت بەبانگەوازەکەی بگاتە هەموو مرۆڤێک لەمەککەدا، بەڵکوو هەموو مرۆڤێک لەسەر ڕووی زەویدا! سەرەتای بانگەوازەکە بەنهێنی بوو، هەروەک پێشتر باسمان کرد کە ئەو دەیتوانی لەناو کەعبەدا بەدەنگی بەرز بانگی خەڵکەکەی بکردایەو ئیسلامەکەی ئاشکرا بکردایە، بەڵام ئەمە ڕوویندەدا و خەڵکی بەگشتی ئاگاداری ئەم بانگەوازە نەبوون، تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە هەواڵەکەیان لەڕێگەی پێغەمبەر ﷺ، یاخوود هاوەڵەکانەوە پێبگەیشتایە زۆر بە نهێنی کاریان دەکرد.

ئەم بانگەوازە نهێنییە ڕۆژێک و دوو ڕۆژ نەبوو، بەڵکوو نزیکەی سێ ساڵ بەردەوام بوو.

ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ کە لەناو خەڵکیدا زۆر بڵاوە کاتێک لەسەر (سەفا) وەستاو فەرمووی:ئەگەر پێتان ڕابگەیەنم لەپشتی ئەو شاخەوە کۆمەڵێک سوار دەیانەوێت بدەن بەسەرتان دا بڕوام پێدەکەن؟[٥٩]

خەڵکانێک وا پەیدەبن لەدوای هاتنی وەحییەوە ئەم فەرمایشتەی فەرمووە، بەڵام لەڕاستیدا دوای سێ ساڵ لەهاتنی سرووش ئەم ڕووداوە ڕویداوە.

لەسەر باسی ئەو سێ هاوەڵە بەڕێزە وەستاین و کورتەیەکمان لەژیانیان باسکرد، ئێستا پێویستە لەسەر ژیانی کەسێکیتر بوەستین ئەویش ژیانی پێشەوای بەڕێزمان عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیبە.

-بانگەوازی عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب - ڕەزامەندی خوای لێ بێت - بۆ ئیسلام:

پێویستە زیاتر لەسەر ئەم وێستگانە بوەستین، چوونکە گەنجێکی تەمەن دە ساڵان موسڵمان دەبێت، لەوپەڕی سەرسووڕماندایە.

---

٥٩ "أَرَأَيْتُكُمْ لَوْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ خَيْلًا بِالْوَادِي تُرِيدُ أَنْ تُغِيرَ عَلَيْكُمْ أَكُنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەم لاوە تەمەنی لە دە ساڵ تێپەڕی نەدەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم بڕوای تەواوی پێی هەبوو تا بتوانن ئەم کۆڵە قورسە لەقۆناغی مەککەدا -کە ئەوپەڕی نهێنی بوو- لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانی تردا هەڵگرن، لەلای من لەوە سەرسووڕهێنەرتر ئەوەیە کە لەو تەمەنە منداڵییەدا، نهێنی دەپاراست و نەیدەهێشت گەورە پیاوانی قووڕەیش بەو نهێنییە بزانن.

ئەم کارەی پێغەمبەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەرانبەر بەعەلی -ڕەزامەندی خوای لێ بێت- پێویستی بەهەڵوێستە لەسەرکردن هەیە:

یەکەم: لەڕاستیدا عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب وەک کوڕی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم وابوو، چوونکە هەمیشە لەماڵیدا بوو لەماڵی ئەودا گەورە بووە، بەهۆکاری ئەوەی ماوەیەک قووڕەیش تووشی کارەساتێکی ناخۆشی وشکە ساڵی و ئابووری هاتبوون و ئەزمەیەک (تەنگوچەڵەمە) ڕوویکردبووە ئەو وڵاتە، ئەبوو تاڵیب-یش خاوەنی منداڵی زۆربوو. ڕۆژێک پێغەمبەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەعەباسی مامی فەرموو: "مامە، ئەبوو تاڵیب منداڵی زۆری هەیە، با هەریەک لەئێمە منداڵێکی بگرینە خۆمان تا ئەو نارەحەتی و ناهەمواریيەی لەسەر کەمبێتەوە". هەردووکیان چوونە خزمەتی ئەبوو تاڵیب و باسەکەیان بۆ کرد، ئەویش ڕەزامەندی دەربڕی و منداڵێکی دا بەعەباس بەناوی جەعفەر، عەلی بەخشی بەپێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم.

ئەبوو تاڵیب وتی: تەنها عوقەیلم بۆ بەجێبهێڵن. عەلی - ڕەزامەندی خوای لێ بێت - بەردەوام لەلای پێغەمبەر مایەوە تا کاتی هاتنی وەحی، دوای ئەوەش لەلای سەروەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم مایەوە و شوێن پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەوت و بڕوای بەبانگەوازەکەی هێنا.

ئیبنوو ئیسحاق دەفەرموویت: "یەکێک لەو نیعمەتانەی کە بەسەر پێشەوا عەلییەوە بوو ئەوەبو کە سەروەرمان خۆی پەروەردەی کردووە."

عەلی زۆر گوێگر بوو خۆشەویستیی بۆ سەروەرمان دەردەبڕی، هەمیشە چاوی لەدەمی سەروەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم بوو، دەیزانی ئەوەی دەیفەرمووێت ڕاستییە و دەبێت بەهەستێکی زیندووەوە گوێیان بۆ بگرێت، لەبەرئەوە هەمیشە مێشک و بیری گۆشکرابوو بە پەروەردەی محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم. لەمنداڵییەوە پێغەمبەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەسەر





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

مەنهەج و ڕەوشتی خۆی پەروەردەی کرد، واتە: پەروەردەکردنی لەسەر خۆشەویستیی پێغەمبەر ﷺ و مەنهەجی بانگەوازەکەی و بنەمای بەڵگە دامەزرابوو.

دووەم: پێغەمبەرمان ﷺ هەستی دەکرد کە عەلی کەسێکی هەڵکەوتووە، چوونکە لەتەمەنی منداڵییەوە توانایەکی زۆرباشی هەبوو، بۆیە ئاگاداری کردۆتەوە لەباسوخواسەکانی بانگەوازو کارکردنی لەناو ئیسلام دا، کە لەڕاستییدا کارێکی زۆر گرنگ و ترسناک بوو، کەسیش نەیدەزانی هەتا کەی ئەم بانگەوازە نهێنی دەبێت.

خەڵکانێک پێیان وابوو کە زوو بوو بۆئەوەی عەلی ئاگاداربکرێتەوە لەکاروباری بانگەوازەکە، بەڵام دوایی بەگوێرەی قۆناغەکانی بانگەوازی ئیسلام، خەڵکی ڕاستیی پێغەمبەرێتی پێغەمبەریان ﷺ بۆ دەرکەوت، کە پێشەوا عەلی چەندە بەتوانا بووە و یەکێک بوو لەزانا بەرزەکان و توانیوویەتی حوکمەکان لەئیسلام و قورئان دەربهێنێت، جگە لەوەی کە خاوەنی فەراسەتێکی زۆر گەورە بوو زانستێکی بێشوماری هەبووە.

سێیەم: شێوەی بانگەوازەکەی پێغەمبەرمان ﷺ هەمەجۆر بوو، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە لەئیسلام دا هەموو کەسێک جێگەی دەبێتەوە، ئەو چوار کەسەی کە لەسەرەتادا بانگ کرابوون لەهەموو چین و توێژەکانی ناو کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە و ئەم سەردەمەیشن، وەک: ئافرەتان، پیاوان، هەژار، بەندە و کۆیلەکان، منداڵان، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت لەبانگەوازی ئیسلام دا بانگکردنی خەڵکی بێسنوورە و هەموو چین و توێژەکانی وەک: پیر، گەنج، دەوڵەمەند، هەژار و...هتد. لەخۆدەگریت بەبێ جیاوازی.

سەرەتای بانگەوازەکە بریتی بوون لە منداڵان: عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب، پاشان لە پیاوان: ئەبوو بەکری سدیق، لەئافرەتان: خاتوو خەدیجە، لەکۆیلەکان: زەیدی کوڕی حاریس - ڕەزامەندی خوای گەورە لە هەموویان بێت -.

پێغەمبەر ﷺ کچە بەڕێزەکانی خۆی بانگکرد بۆ ئیسلام، خاتوو زەینەب تەمەنی دە ساڵ بوو، خاتوو ڕوقیە تەمەنی ٧حەوت ساڵ بوو، خاتوو ئوم کەلسوم تەمەنی شەش ساڵ بوو، هەموویان هەر لەتەمەنی منداڵییەوە ئیسلامیان وەرگرت، خاتوو فاتیمە ئەو کاتە منداڵ بوو، تەمەنی تەنها یەک ساڵ بووە، لەو ئاستەدا نەبووە بزانێت ئیسلام چییە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەمە ڕەوشی ماڵی پێغەمبەرمان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوو.

بانگەوازی نهێنی، سێ ساڵی خایاند بەتەواوی لەسەر بنەماکانی: پەروەردە، پاککردنەوەی دڵ و دەرون، خۆپێگەیاندن بنیات نرابوو.

بۆچی ئەم کارە بەنهێنی مایەوە تا سێ ساڵ؟ ئایا پێغەمبەرمان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەقووڕەیش دەترسا؟

لەڕاستیدا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەرگیز نەترساوە، بەڵکوو ئاراستە دەکرا بەوەحی، ئەوەش حیکمەتی ئەو قۆناغە بووە بۆ بانگەوازەکەی سەروەرمان بۆیە بەنهێنی کاریکردووە.

ئەتوانین بڵێین: ئەم قۆناغە بەویستی سەروەرمان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نەبووە، بەڵکوو فەرمانێکی ڕاستەخۆی پەروەردگار بوو، چوونکە خوای گەورە دەیەوێت ئوممەتەکەی فێر بکات کە چۆن گۆڕانگاری بکەن و ڕەوەند لەدوای ڕەوەند ببێتە مەنهەجی گۆڕانکاری لەدوای نەمانی پێغەمبەری خوادا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆئەوەی لەقۆناغێکی هاوشێوەدا بتوانن دووبارەی بکەنەوە.

خوای گەورە دەیتوانی پێغەمبەرەکەی بپارێزێت و بەیەکجار سەری بخات، بەڵام ئەمە سوونەتی خوای گەورە نییە، چوونکە ڕێوشوێن هەڵگرتنی پێغەمبەرمان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەبێتە هۆکاری گۆڕانکاری، ئەو لەمپەڕانەی هاتوونەتە ڕێی سەروەرمان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چۆن چارسەری کردوون، ئێمەش لەئێستادا دەتوانین چاو لەوبکەین.

هەر لەبەر ئەو هۆکارانە بوو خوای گەورە پێغەمبەرەکەی بەو ناڕەحەتییانەدا بردووە، بۆئەوەی لەدوارۆژدا ئوممەتەکەی چاوی لێبکەن، هەروەک چۆن پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەوکات و ساتانەدا مامەڵەی لەگەڵ کێشەکاندا کردووە و ئێمەش ڕەچاویان بکەین، هەروەها بۆئەوەی سەروەرمان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چۆن بانگەوازەکەی بەخەڵکی گەیاندووە، ئێمەش بەهەمان شێوە کاربکەین.

بەم پێیە سنووری مەنهەج و کاری موسڵمانان دیار و ڕۆشنە و هیچ نادیارییەکی تێدا نەماوە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەروەک بانگەوازی نهێنی لەسەرەتای هاتنی ئایینی ئیسلامدا قۆناغێک بوو بۆ ئەوەی موسڵمانان ئەو شێواز و جۆری کارکردنە لەژیانیاندا پیادە بکەن، دەشێت لەقۆناغێک لەقۆناغەکانی تری ژیانی ئەم ئوممەتەدا ئەوە دووبارە بێتەوە -هەروەک چۆن پێغەمبەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم کاریکردوە- تا موسڵمانان چاوی لێبکەن.

لەدوای ئەم شیکارییانە ئەوەندە کاریگەری کردە سەرم کارو چالاکی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەدەم خۆمەوە شیعرم بۆ دەوت، ئاواتە خواز بووم بۆ گەڕانەوەم بۆ خزمەتی بزانم چۆن کار دەکات و هەڵسووکەوتی کاری ڕێکخراوەیی و تەنزیمی چۆنە.

چەند هۆنراوەیەکم بۆ بچڕی لە تاو کارە سەنگینەکانی کە بەوەحی ئاراستە دەکرا منیش وەکوو کۆچەرێکی ئەو حەزم دەکرد بۆلای ئەو گەرمیان و کوێستان و زستان و پاییز بکەم.

کۆچەرییەکان خواتان لەگەڵ من لێرەوە یادێ دەکەم..

من هەر لێرەوە حەزرەتم وتەکانی تۆ زیارەت دەکەم ..

حەزرەتی من فەرموو دڵمماڵی تۆیە..

هۆشمەند بووە هەرکەس شێت و دێوانەی تۆیە..

دڵی من ئەگەر لە عیشق نسیبی هەبێت..

حەزرەتی ئەڤین لوتفێکی عەجیبی لەگەڵ من هەیە

بهێڵن بهێڵن تا ئەم دڵەی من بە بیماری بمێنێتەوە..

لەگەڵ تای ئەوین دڵم حاڵێکی غەریبی هەیە

کات ئەمرێت و منیش لە کۆتاییدا دەڕزێم

مەنێ ڕۆحم ئەی ڕزگارکەر من دەستی تۆ ماچ دەکەم

بێ وجودی تۆ هیچ خۆشییەک حاسڵ ناکەم



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

تا هەناسە هەیە ئەی ئەڤین بمێنەرەوە لە دڵم

لەم کۆتایی تەمەنەم دا بەسمە تۆ هەڵبژێرم..

لەخزمەت کتێبەکەی فەرغەلی دا بە خۆشەوویستی پێغەمبەری خوای گەورە ﷺ دانیشتبووم کە ماندوو دەبووم دەمنا بەسنگی خۆمەوە زۆر جار کە ماندوو دەبووم پشتم دەیەشا ئیتر لەگەڵ کتێبەکە کە نابووم بە سنگمەوە بەیەکەوە دەخولاینەوە و وەکوو سەما سەمامان دەکرد، لە پڕ کتێبکە لە دەستم کەتە خوارەوە و زۆرم پێناخۆش بوو بە پەلە هەڵمگرتەوە، چووە سەر ئایەتێک دەفەرمووێت:

﴿تِلْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَـٰذَا ۖ فَٱصْبِرْ ۖ إِنَّ ٱلْعَـٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾﴾ [هود]

ئەم باسانە بۆمان کردی لە هەواڵە نادیارەکانە، نە تۆ دەتزانی و نە هۆز و نەتەوەکەشت پێش ئەم باسەی ئێمە، خۆگر و بە ئارامبە پاشەڕۆژ بۆ خواناسان و پارێزکارانە.

ئەم ئایەتە وای لێکردم بیرێک لە ژیانی پێش پێغەمبەرایەتی ﷺ بکەمەوە، پاشان چوومە ناو زانستەکانی ئینترۆپۆلجیا و سایکۆلۆژیا...هتد، هەندێک لەو زانستە مرۆیانە کە لە ناخ و سرووشتی مرۆڤ گفتوگۆ دەکەن تێڕامان و گوزەرێکی خێرام کرد بەناویدا.

زانایانی کۆمەڵناسی دەڵێن: مرۆڤ لە تەمەنی (٢٠) بۆ (٣٥) ساڵی حەزی بە زۆرترین قسە و چالاکییە. حەز دەکات لە هەموو شتێک زانیاری هەبێت و قسە بکات، بەڵام کە تەمەنی گەیشتە (٤٠) ساڵ هەست بە ویقار و هێمن بوونەوەی چالاکییەکانی دەکات، ئیتر لەو ساتەوە زۆر بە وریایی ئاخافتن دەکات و ڕەفتار و ئاکارەکانی خۆی ئەمسەرا ئەوسەر دەکات و حساب بۆ زۆر شت دەکات کە پێشتر نەیکردووە.

مرۆڤ لە تەمەنی (٢٠-٣٠)ساڵیش گوێ بە زۆر شت نادات، ئەگەر هەڵەشی کرد کاتی لەبەردەمدایە بۆ بوونیادنانەوەی خۆی، بەڵام (٣٠-٤٠) ساڵی ئاستەمە ئەگەر مرۆڤێک ڕووخا لە ڕووی کەسایەتییەوە زۆر قورسە بتوانێت بوونیادی کەسایەتی بکاتەوە، چوونکە کاتی تەمەن کورتە.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لێوردبوونەوەکەی من لێرەوە دەست پێدەکات:

محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەموو تەمەنی چەند سەفەرێکی کردووە تەنها یەک سەفەری بۆ جێگای دوورکردووە هیچ کاتێکیش بە تەنها نەبووە.

لە تەمەنی پانزە ساڵییەوە کە لەڕووداوەکانی قووڕەیشدا بوونی هەبووە تاکو تەمەنی چل ساڵی لە هیچ مێژوویەک یان سەرچاوەیەک یاخوود دیکۆمێنتێک یان یەکێک لە قووڕەیش نەیوتوە محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ باسی چیرۆکێک یاخوود شیعرێک یان باسێکی سەرسووڕمانی بۆ خەڵکی گێڕابێتەوە لەو ڕەوشەدا!

ژیانیکی زۆر سادەی هەبووە، بێجگە ئەوەی کە ئەم کەسایەتییە لە ناوشاری مەککەدا تەنها لە ڕووی ڕەوشتەوە سەرنجی خەڵکی مەککەی ڕاکێشاوە، پێشتر لە هیچ بووارێکدا ناوی نەبووە هیچکام لە قووڕەیش، بە دۆست و یارونەیاریەوە نەیوتوە محمد خوێندەوار بووە یان شاعیر بووە یاخوود توانایەکی هەبوو لە زانستی ئەنساب (ڕەچەڵەکناسی) یان هەر باسێک یاخوود حەکیم بووە، ئەم کەسایەتییە کە پێغەمبەرە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە تەمەنی چل ساڵییەوە دەکەوێتە کۆمەڵێک باس کە عەرەب و تەنانەت خەڵکانی ئەو سەردەمەش نەیانزانیوە، بەڵکوو محمد بۆی ئاشکرا کردوون پاشان زانستی نوێ پەی پێ بردووە.

ئەوەی کە زۆر گرنگە بیزانین شاری مەککە دە هەزارکەسی تێدا ژیاوە سێ هەزار ماڵ بوون، یەک تاکە خێزانی جوولەکە و مەسیحی تێدا نەبووە، چوونکە قووڕەیش بتپەرست بوون. ئەو ئایینانەی تر تێکەڵ نەدەبوون لەگەڵ قووڕەیش بەو پێیەی ئەوان ئایینی ئاسمانین ئەمانیش بتپەرستن.

مووعجیزە گەورەکە:

هەرچی ئایەتێک کە چیرۆک و باسی بەنی ئیسرائیل و مووسا، فیرعەون هامان و قاوونە لە شاری مەککە هاتۆتە خوارەوە، هەرچی باسی ژیانی پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلە بە فەرموودەکانیشەوە هەمووی لە شاری مەککە هاتۆتە خوارەوە، تەنها ئەحکامی ئەهلی زیمە و جوولەکە نەبێت لە مەدینە هاتووە باقی هەمووی مەککی یە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئیسحاق، یەعقوب، یوسف، مووسا، داود و سولەیمان، یونس و عیسا - سەلامی خوا لە هەموویان بێت - ئەوانی تریش وەک فەرموودە یوشعی کوڕی نون، دانیاڵ ...هتد، یاخوود شارستانێتی فیرعەون لە ڕووی سەربازی کە هامانە، لە ڕووی ئابووری کە قاروونە.

پرسیار ئەوەیە لە کام مێژوو لە کام کتێب لەسەردەمی محمدا ﷺ یەک تاکە عەرەب لەم باسانەی کردبێت یان کتێبکی عەرەبی ئەم باسانەی یاداشت کردبێت؟ ئەم پرسیارە بۆ مولحیدو نەیارەکانی ئیسلام تا ڕۆژی قیامەت بەجێدێڵم بە تەحەداوە، بۆ ئەوەی ئەو ڕێگایەش بگرین و بڵێین لە تەورات و ئینجیل دا باس کراوە، ڕاستە باس کراوە بەڵام وەک وتمان لە مەککەدا بوونی ئەو دوو ئایینە نەبووە لەگەڵ ئەوەشدا بەزمانی عەرەبی نەبووە، بەڵکوو ئەو دوو ئایینە بە زمانی سریانی و عیبری بووە کە عەرەب شارەزای ئەو دوو زمانە نەبوون، بە پێچەوانەوە ئەو نەتەوانەی تر شارەزای زمانی عەرەبی بوون.

لەڕووی شارستانێتی عەرەبەوە: عەرەب شارستانێتێکی بچوکیان هەبوو لە دوای نوح - سەلامی خوای لێبێت - کە شارستانیەتی عاد و سەمودە و هیچ کتێبێکی مێژووی باسی نەکردووە، هەرچەندە لە ماوەی ڕابورد دا لەساڵەکانی شەست، شیعرێکیان درووست کردبوو بەناوی (ئەمروقەیس) دوای لێکۆڵینەوە دەرچوو تەزویرە گوایە ئەو باسی عادو سەمودی کردووە، محمد لەکوێ زانی گەلانێک هەبوون بەناوی عاد و سەمود؟! لە کام سەرچاوەی مێژووی و شیعریدا باسکراوە کە گەلانێک هەبوون بەناوی عاد و سەمود؟ چۆن محمد ﷺ زانی ئەمانە ئەسڵیان عەرەب بووە یان لافاوی نوح، لەکاتێکدا عەرەب شتێکی نەزانیوە بەناوی لافاوی نوح تا هاتنی ئیسلام.

باسی عوزەیر یان هاوەڵانی ئەشکەوت، یاخوود شارستانێتی سەبە...هتد

ئاخر لە هەمووی مووعجیزە تر ئەوەیە لە ژینگەیەکدا ئەم ئایینە هاتووە ساڵانی خۆیان ناوناوە بە جاهیلی، کەچی قورئانی ئەم پێغەمبەرە ﷺ باس لە تەقینەوەی ئاسمان دەکات کە لەم ساڵانەی دوایدا ناونراوە بە بیگبانگ!

وەک نموونەی سوورەتی الأنبياء دەفەرمووێت:





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ۝﴾ [الأنبياء]

**بۆ تەماشای ئاسمان و زەوی ناکەن لە کاتێکدا یەک پارچە بوون تەقاندمانەوە، ژیانی زیندەوەران پەیوەستە بە ئاوەوە.**

**کێ محمدی ﷺ فێری بیردۆزی بیگبانگ (تەقینەوە مەزنەکە) کرد، کام تلیسکۆب و زانکۆ محمدی ﷺ فێر کرد؟**

**هەموو ئەم بیرو شیکاریانە ئەوەندەی تر مووشتاقی دەکردم بۆچونم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، هاوارم دەکرد لە ژوورەکەمدا دیسانەوە کتێبکەم گرتەوە بە سنگمەوە دەمووت:**

**هێندە خۆشم دەوێیت کە نازانم پێناسەی کەم**

**هێندە بیرت دەکەم کەناتوانم بۆ ساتێکیش لە بیرتکەم**

**ئەی خۆشەوویست ڕازی دڵ و دەروونی هەڵقرچاوی من**

**ئەی شا جوان و شا خۆشەوویستی ناو ئاسۆی بیری من**

**فرمێسکم وەک شەونم بەسەر سوورە گوڵی ڕومەتمەوە سەما دەکات**

**بۆ دیدارت گیانم شنە شنی وەرزی کۆچەران دەکات**

**کە خامەکەم ئەڕژێنێت ئەوین و ئاورینگ بۆ تۆ**

**سەراپا سۆفیەکی دەرگاکەتم وەری دەگرم تەنها تەریقەت من لە تۆ**

**نییە وشە پێناسەت کات پڕ بەدڵێ بۆ ئاسوودەی دڵی من**

**شاهی شاهان بەسرووشت بیرازێنیتەوە چنینی وشەی ڕازی هزری من**

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەی خۆشەوویست گەورەترین ئەستێرە

ئەی درەخشان پڕشنگە جاڕ و سەروەر و سەرداری ئەم بوونە

ئەم شەو بە باهۆزێک سڵاوم دەنێرم بۆ مەدینە

تاکوو بێتە لات بڵێت ئەم ماکوانە دیوانەیە عاشقی بینینتە

ئەوەندە کتیبەکە بەسنگمەوە بوو و هەڵخولام بە دەوری خۆمدا سەرم گیژی خوارد و بۆ چەند سائێک خەوم لێکەوت.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هاتنەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ون بوونمان!

خەوێکی ئارامم لێکەوت لەدوای ئەوەی ماندوو بووم بە کتێبەکەی فەرغەلیەوە، دیسان گەڕامەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو جێگایە گەڕامەوە سەرەتا ئەویش دەوارەکەی خۆمان بوو جێمان هێشت و کە هەڵسامەوە لەگەڵ نومەیردا بووم زۆر ئاسایی ڕۆژمان کردەوە، بەڵام کێشەی ئەوەمان هەبوو کە سواری ئەسپەکانمان بووین بەهیچ جۆرێک ئەسپەکان نەدەجوڵان، واتە هەرچی سەردەکەوتین ئەسپەکانمان (نەلەخشا) جوولەیان نەبوو، لەگەڵ نومەیردا تەماشایەکی یەکمان کرد هەستمان کرد کە خۆمان یەکتر دەبینین، بەڵام وجودمان لەو سەردەمەدا نییە واتە تەنها من و نومەیر یەکترمان دەبینی، چوونکە چووینە لای ئەو کەسانەی لەگەڵماندا بوون لە دەوارەکەدا بەلایاندا دەڕۆشتین بانگمان دەکردن هیچ وەڵامیکیان نەبوو، ئێمە وەکوو شەبەحێک (تارماییەک) و کەسانێکی نادیار وابووین، ئێمە ئەوانمان دەبینی بەڵام ئەوان ئێمەیان نەدەبینی.

لەگەڵ نومەیردا ویستمان شیکاری بۆ ئەو ڕەوشە بکەین کەتێیدا دەژین.

نومەیر پێی وابوو کە تەنها دەتوانین ڕووداوەکان ببینین و خۆمان هیچ وجودێکمان لەم سەردەمەدا نییە، بەڵام وەکوو نیعمەتێک کە دەتوانین ڕووداوی ئەم سەردەمە بە چاوی خۆمان ببینین و بزانین چی ڕوونەدات.

لە ڕێگادا بیرم لەوە دەکردەوە چۆن ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم بدۆزینەوە، بچینە خزمەت ئەو هەموو هاوەڵە بەڕێزە، خۆمان گەیاندە ماڵی ئەرقەم، نومەیر شارەزابوو لە دەرەوەی شاری مەککە بوو، کە چوینە ناو ماڵەکە ئەو هەموو هاوەڵە بەڕێزەکان لەوێ بوون، هەریەکەو خەریکی خوێندنی قورئان و چۆنیەتی وەرگرتنی زانستە ئیسلامییەکان بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ هەر سوورەتێکی بۆ دەهاتە خوارەوە لەوێ دەیان نووسییەوە و دەست بەجێ بەسەر یەکتردا دابەشیان دەکرد وەکوو بڵاوکراوەیەکی ڕێکخستن دەیان ناردە ناوشاری مەککە بۆ ئەوەی ئەو ماڵ و خێزانانەی کە موسڵمان بوون بە نهێنی ئەوانیش سوودی لێ وەربگرن.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەبوو بەکری سدیق لەتەنیشت ماڵەکەی خۆی لەشاری مەککە مزگەوتێکی بچوکی درووست کرد.

ئێمەش لەناو هاوەڵەکاندا دەهاتین و دەچووین بێئەوەی کەس بمان بینێت، ئارەزووم بوو دەست و قاچ و ناوچەوانی هەموویان ماچ بکەم، بەڵام وەک هێزێکی کارەبایی بۆم نەبوو بە هیچ شێوەیەک لێیان نزیک ببمەوە.

لەگەڵ نومەیر بڕیارماندا بەرەو شاری مەککە بڕۆین، چوونکە لەماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم بیستمان کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەککەدا بە ئاشکرا خۆی بانگەواز دەکات.

پێغەمبەر ﷺ هەر لە یەکەمین دیداری ئەشکەوتەکە گوێی لێ بوو جوبرەئیل تا تەشریفیشی برد هەر دەیفەرموو: من جوبرەئیلم و تۆش بوویت بە نێرراوی خوا، ئیدی دواتر سوورەتی (المدثر)ی بۆ هاتە خوارەوە کە سەرەتاکەی دەفەرمووێت:[٦٠]

تا ماوەی سێ ساڵ بە نهێنی خەڵکی بۆ دینەکەی بانگهێشت دەکرد، تا خوای گەورە فەرمانی پێدا کە بانگەوازەکەی ئاشکرا کات و لە سوورەتی الحجر پێی فەرموو:

﴿فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ [الحجر]

ئەوی بۆت هاتووە ئاشکرای کەو گوێ مەدە مووشریکەکان.

ئەویش بە ماڵ و کەس و کارە نزیکەکانی خۆی دەستی پێ کرد و هەموویانی ئاگادار کردەوە، چوونکە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا پێی فەرموو:

﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾ [الشعراء]

خزمە نزیکەکانی خۆت ئاگادار کەرەوە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٠] لە لاپەڕەکانی پێشووتردا ئاماژەی پێدراوە





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

تا دەهات بەرهەڵستکاری زیاتری لە گەورەکانی قوورەیشەوە بۆ درووست دەبوو، بە تایبەتی لە مامی خۆیەوە ئەبوو لەهەب! بەڵام کۆمەڵێک کەس باوەڕیان پێی هێناو بوونە شوێنکەوتووی گیانی بە گیانی، وەکوو خەدیجەی خێزانی، ئەبوو بەکری سدیق، عەلی کوڕی ئەبوو تالیبی ئامۆزای کە لە سایەی سەرپەرشتی ئەودا گەورە ببوو، هەروەها زەیدی کوڕی حارس کە خزمەتکاری خۆی بوو.

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم شانی لە بانگەوازی خوای خۆی قایم کرد، بە هەموو تیرە و هۆزەکانی گەیاند! تا سەرئەنجام لە سنووری عەرەبەکانیشی بردە دەرەوە گەیاندییە نەتەوە و میللەتانی تر، چوونکە پەیامی ئیسلامەتی گشتییە و تا ڕۆژی دوایی بۆ هەموو خەڵکی سەر زەمینە، لە هەر کات و شوێنێکدا بژین بانگەوازی پێغەمبەرانی پێشوو هەر یەکەیان بۆ قەومێکی تایبەت بوو، بەڵام پەیامێکی تر بە دوای پەیامەکەی پێغەمبەری محمدی پێشەوادا صلى الله عليه وسلم نایەت، هەر دەبوو ئەوەی ئەم ببێتە جیهانی و بۆ هەموو مرۆڤی سەر زەمین بێت.

پێکەوە بەرەو شاری مەککە ڕۆشتین، شار ئاڵۆزاوە لەولا دەبینم موسڵمانان لەبەر قامچی ئەبوو جەهل و ئووبەی کوڕی خەلەف و هەموو لووتبەرزانی قوورەیش ئازارو ئەشکەنجە ئەدرێن، خەبابی کوڕی ئەرەت بەردی گەرم لەسەر پشتی دانراوە و پێستەکەی پشتی دەبرژێنێت، بیلال کوڕی ڕەباح چوار پەلی بەستراوەتەوە.

هەندیک لە موسڵمانان ئاشکرا بوون ئازار ئەدران لەناو شاردا، ئەبوو بەکرم بینی بە ماندوویەتییەوە بە کیسە پارەوە موسڵمانانی ئازاد دەکرد، بینیم چۆن بیلالی حەبەشی ئازاد کرد و چووە لای ئووبەی کوڕی خەلەف و پێیوت ئەو بەندەیەتم پێ بفرۆشە، ئەویش بۆ گاڵتە پێکردن وتی: بەچەند ئۆقەیەک لە ئاڵتوون، ئەبوو بەکر دەست بەجێ وتی ڕازیم و لێی کڕی و بیلال و خەبابی ئازاد کرد، بەڵام بەداخەوە نەیتوانی دایک و باوکی عەمار ئازاد بکات، بۆیە ئەبوو جەهل بەوپەڕی پیسی و دڕندانە یاسر(باوکی عەمار) لە ژێر ئەشکەنجە دا کوشت و ڕمحی کرد بە سکی سوممەیەدا (دایکی عەممار) چوونکە کۆیلەی ئەبوو جەهل بوون، تا بەزۆر عەمماری کوڕیانی لە دین پەشیمان کردەوە، بەڵام بەزۆر پەشیمان کرایەوە لەترسی گیانی خۆی بوو.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دیمەنێکی زۆر ترسناک و ئازار بەخش بوو، تا لە کۆتاییدا ماندوو بووین لەناو ئەو هەموو گەرمایەدا چوومە نزیک ئەبوو بەکر دەمبینی ئوبەی کوڕی خەلەف بۆ ئازاردانی ئەبوو بەکر دەیووت ئەگەر پەلەت نەکردایە بۆ کڕینی بیلال زۆر بە هەرزانتر پێم دەفرۆشتیت، ئەبوو بەکریش بۆ لووت شکاندی ئوبەی کوڕی خەلەف دەڵێت ئەگەر تۆش داوای (١٠٠) ئۆقیە ئاڵتوونت بکردایە پێم دەبەخشیت، چوونکە دەیزانی قیمەتی بیلال بە ئاڵتوون پێوانە ناکرێت!

بەم شێوەیە لە هەموو لاکانەوە موسڵمانان ئازار ئەدران، بینیم لە ناو بازاڕی مەککەدا کوڕێکی گەنجی باڵا بەرز دەگەڕاو قورئانی دەخوێند، کەسێکی خاوەن شان و شەوکەت بوو هەموو گوێیان بۆ دەگرت و بەدوایدا دەڕۆشتن و ئامۆژگاری دەکردن، تا لە جێگایەکدا وەستا قورئانی بۆ گەل و هۆزەکەی دەخوێندەوە ئەویش پێغەمبەری خوا بوو ﷺ مووعجیزە بوو بۆ ئەو سەردەمە.

کارێکی نائاساییە خوای گەورە لەسەر دەستی نێردراوانی خۆی ئەنجامی دەدات، کە بە هەموو مرۆڤی تر ئەنجام نادرێت هەموویان دەستەوسان لەبەر دەمیدا دەوەستن، ئەمەش پشتگیرییەکی خواییە وەکو ئەوەی بفەرموێ: (ئەو نێردراوەم ڕاست دەکات پێغەمبەری منەو هەرچی دەیڵێت بە ڕەزامەندی منە)، وەکوو مووعجیزەکەی حەزرەتی مووسا کە دار عەساکەی دەبووە ئەژدیها یان کە دەستی دەخستە بن باڵی و دەری دەهێنایەوە بێ ئەوەی هیچی لێ هاتبێت سپی دەبوو دەدرەوشایەوە یان وەک مووعجیزەکانی حەزرەتی عیسا کە بە ئیزنی خوا کوێری زگماک و گەڕو گولی چاک دەکردەوە و مردووی زیندوو دەکردەوە، ئەم قورئانەی پێغەمبەری ئازیز ﷺ هەمان مووعجیزەی ئەوان و بەهێزتر لەوانیش.

لەبەر ئەوەی هەموو مووعجیزەیەک کە پێغەمبەران هێناویانە لەو شتانەدا بووە کە ئەو قەومانە پێی بەناوبانگ بوون و تێیدا سەرکەوتوو بوون، دەبوو مووعجیزەکەی پێغەمبەریش ﷺ هەر لەو مەیدانەدا بێت کە عەرەبەکانی ئەو سەردەمە تێیدا سەرکەوتوو بەناوبانگ بوون، بریتی بوو لە ڕەوانبێژی و زمانپاراوی بۆیە قورئانەکە بووە مووعجیزەی پێغەمبەر ﷺ، جگە لەو مووعجیزانەی تر کە لەسەر دەستی ڕوویان دەداو لە کاتی خۆیاندا دەبینران، چوونکە ئیسلام بۆ هەموو مرۆڤایەتی (لە هەموو کات و شوێنێکیان)دا هاتووە هەر دەبوو مووعجیزەیەکی ژیریانەی واش بخاتە ڕوو کە لە ڕووی هەموو مرۆڤایەتی دا و هەتا هەتایە لە مەیدانی زۆرانبازی دا بێت و بفەرمووێت: فەرموو وەرنە مەیدانی ڕووبەڕوو





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بوونەوەم، ئەم مووعجیزەیەش قورئانەکەیە بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: هەموو پێغەمبەرێک چەندەها بەڵگەو نیشانە (مووعجیزە)ی دراوەتێ، تا ئەوەی خوا حەز بکات لە مرۆڤ باوەڕی پێ بهێنێت، منیش ئەوەی خوا داومیەتێ ئەو وەحییەیە کە بۆی ناردووم، ئومێدم هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا شوێن کەوتووم لە هەموویان زیاتر بێت.[٦١]

پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو عەرەب هاتە مەیدانی بەربەرەکانێوە، داوای لە هەموویان کرد کە ئەگەر ڕاست دەکەن و نکۆڵی لەوە دەکەن کە ئەم قورئانە لە لایەن خوای گەورەوە هاتووە: فەرموون ئێوەش قورئانێکی وا بهێنن یان هەندێک سوورەتی وا بهێنن، بەڵام هەموو دەستەوسان دەوەستان! ئەمەش بووە بەڵگەیەکی ڕۆشن کە ئەو قورئانە لە لایەن خوای گەورەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتووە و هیچ کەسێکیش ناتوانێت وەک ئەو بهێنێت، هەموو عەرەبە کافرەکانی ئەو سەردەمە لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم قورئانەدا مات و مەلول و بێ دەسەڵات کەوتن! هەموو دەیانزانی کە پێغەمبەر ﷺ نەخوێندەوارە و مومکین نییە خۆی قورئانێکی ئاوا ڕەوانبێژ بۆ بەربەرەکانێی ئەوان بهێنێتە مەیدان، دەشیانزانی کەسی وای لێوە نزیک نییە فێری شتی وای بکات، فێربوونیش کاتی تەواوی دەوێت! بۆیە کە هەر تەسلیمی نەبوون کەوتنە درۆودەلەسە و پاڵاتەی بێ سەروبەر دژی:

﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ۝ فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ۝﴾ [هود]

دەیانووت: ئەمە هەر قسەی هەڵبەستراوە، بڵێ: باشە ئێوەش ـ ئەگەر ڕاست دەکەن ـ دە سوورەتی وەک ئەو هەڵبەستراو بهێنن، کێ هەیە ببێتە هاوکارتان ـجگە لە خوا ـ هاواری ببەنە لاو داوای یارمەتی لێ بکەن. گەر بەدەم بانگەوازەکەتەوە نەهاتن، ئەوە بزانن کە ئەم قورئانە بە زانیاری خوای گەورە دابەزێنراوەتە خوارەوە، بشزانن کە هیچ خوایەک نییە شایانی پەرستن بێت جگە لە خوای پەروەردگار، کەواتە ئێوە موسڵمان دەبن؟ یان دەفەرمووێت:

---

[٦١] (مَا مِنْ نَبِيٍّ إِلَّا وَقَدْ أُعْطِيَ مِنْ الاياتِ مَا مِثْلُه آمَنَ عَلَيهِ البَشَر وإنمَّا كانَ الذي أُتِيتُهُ وَحْياً أوحَاهُ اللّهُ تَعالى إِلَيَّ فَأرجُو أنْ أكونَ أكثَرُهم تَابِعاً يومَ القِيامَةِ ) البخاري ومسلم



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ ...﴾ [البقرة]

ئەگەر ئێوە لەوەی ئێمە بۆ بەندەکەی خۆمان ناردۆتە خوارەوە لە گوماندان، دەی سا سوورەتێک وەک ئەو بهێنن.

هەروەها دەفەرمووێت:

﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰ أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾﴾ [الإسراء]

بڵێ: ئەگەر هەر هەموو مرۆڤ و پەرییان بۆ ئەوە کۆوەبن کە نموونەیەک وەک ئەم قورئانە بهێننەوە، ناتوانن وەکو ئەو بهێنن با هەر هەمووشیان پشتیوانی یەکتری بن.

مووعجیزەیێتیەکەی قورئان ڕەوانبێژی و داڕشتنەکەیەتی، کە هەر هەموو عەرەبی دەستەوسان خستە کەنار، بێگومان غەیری عەرەب دەستەوسانتر دەکەونە لاوە، لایەنێکی تری مووعجیزەیێتیەکەی وردەکاری ئەحکامەکانێتی بەرزی و پارسەنگی تەعلیماتەکانێتی کە هاوشان لەگەڵ هەموو گۆڕانکاریەکانی نەوە بە نەوەی مرۆڤایەتیدا پێ هەڵدەگرێت، لە هەموو زەمانێکدا و بۆ نەوەی مرۆڤایەتی هەموو ناوچەیەک ئاراستەی گونجاوی خۆی دەکات، ئاراستەکانی هەموو بوارەکانی ژیانی هەموو کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی دەگرنەوە، لایەنێکی تری مووعجیزەیێتیەکەی ڕاستی ئەو هەواڵانەیە کە دەربارەی نادیار داوێتی لە زەمانێکدا کە پێغەمبەر ﷺ هیچ هۆکارێکی زانستیانەی پێشکەوتووی لەبەر دەستدا نەبووە، ئەمانە و دەیان لایەنی تری مووعجیزەیێتی: کە لەگەڵ قۆناغەکانی پێشکەووتنی زانستدا زیاتر ئەمانیش دەردەکەون، بۆیە خوای گەورە لە سوورەتی فصلت دا دەفەرمووێت:

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ...﴾ [فصلت]

لە داهاتوودا بەردەوام نیشانەو بەڵگەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین چ ئەوانەی لە ئاسۆی گەردووندان چ ئەوانەی لە ناو خۆیاندان، تا بۆیان دەرکەوێت کە خوا هەقە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

قورئان هەتا دنیا دنیایە، هەتا مرۆڤ توانای توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی هەبێت و تا زیاتری لێی کەشف کەن و لەسەری بنووسن، هەر بە نوێیی دەمێنێتەوە وەکو لە فەرموودەدا هاتووە : بوارەکانی سەرسوڕهێنانی قەت تەواو نابن.

تەنانەت نەتوانرا کەس ڕووبەڕوی بووەستێتەوە، یەکێک لە گەورەپیاوانی قووڕەیش بەناوی نەزری کوڕی حارس بە ئاشکرا لە ناو کۆبوونەی دارونەدوەی مەککەدا وتی: لەڕاستیدا ئەم قورئانە کارێکی وا ئاسان نییە ڕووبەڕوی ببینەوە، من ناچارم پەنا بەرمە دەرەوەی وڵات و بڕۆم بۆ ناو فارس بزانم کارێک ناکەم کە بەرهەڵستی قورئان ببینەوە، بڕیاریدا بچێت بۆ ناو فارس لەوێ ئافرەتی سەماکەرو دەف و تەمبووری هێنا، چیرۆکی ئەسفەندیار و ڕۆستەمی زاڵی کڕی و هێنایەوە بۆ شاری مەککە، کاتێک پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ قورئانی دەخوێندەوە ئەویش ئافرەتەکانی دەخستە سەماو گۆرانی و موسیقای لێ ئەداو دەیووت کەس گوێ بۆ محمد نەگرێت وەرن من باشترم لایە لە محمد.

قووڕەیش لە هەموو لاکانەوە سەرکردەکانی و ئابووریناسەکانی واتە بازرگانەکان و سەرۆک عەشیرەت و تیرەو هۆزەکانی کۆبونەوە دژی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

لەگەڵ ئەوەشدا کە قووڕەیش لە بەرهەڵستی قورئانەکە و ڕووبەڕوو بوونەوەیدا دەستەوسان کەوت، کە دڵنیا بوون لە ڕاستگۆیی و دەستپاکی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەر سەرسەختانەو کەلە ڕەقانە بەرەنگاری بوونەوە، بەغیلی ئەوەیان پێ دەبرد کە چۆن ئەم هەڵبژاردنە خۆییە، ئەم پلەو ڕێزە بە نرخە چۆن بۆ دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارانی ئەوان نەبوو، خوای گەورە دەربارەی ئەم هەڵوێستەیان دەفەرمووێت:

﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ...﴾ [النمل]

لە ناخی دڵ و دەروونیاندا قەناعەتیان پێی هەبوو، دەیانزانی پێغەمبەرایەتییە و ڕاستە کەچی لەبەر زاڵمێتی و لووتبەرزی خۆیان هەر نکووڵییان سەرزارەکی لێ دەکرد.

یاخوود دەفەرمووێت:

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿وَقَالُواْ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ٣١﴾ [الزخرف]

ئەرێ با ئەم قورئانە بۆ پیاوماقوڵێکی گەورەی ئەم دوو شارە بهاتایەتە خوارەوە.

بەرەنگاربوونەوەکەی قووڕەیش چەندین شێوازی لە نێوان تەماع و هەڕەشەو گوڕەشەدا گرتە بەر، لە لایەکەوە گاڵتە پێ کردن و جنێودان و ئەشکەنجەدانی بێ دەسەڵاتەکان زیادی دەکرد، لە لایەکی تریشەوە تین و فشاری قووڕەیش لەسەر پێغەمبەر ﷺ زیادی دەکرد، موسڵمانانی دەرووبەریشی زۆر لاوازانە دەوەستان و نەیاندەتوانی هیچ بکەن! بەڵام خۆگری و دلێری و نەبەزییەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموویان دەبووە ورەبەرزی و یەقین و گیانی خۆنەویستی تا ئەو زەمانەی هەلی کۆچ کردن بۆ حەبەشە ڕەخسا، ئەوی کۆچی کرد کردی و قووڕەیش هەرچەندی کرد نەیتوانی بیانهێنێتەوە! ئەوانی تر کە مابوونەوە دەبوو بە دزییەوە لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەڕقەمی مەخزومی کۆببنەوە، کە عومەری کوڕی خەتاب و حەمزەی مامی پێغەمبەر ﷺ موسڵمان بوون پارسەنگی هاوکێشەی بانگەوازەکەی ڕاگرت، ساڵانی تولانی[٦٢] گەمارۆدان دەستی پێ کرد پێغەمبەر ﷺ و یاوەرانی سێ ساڵی ڕەبەق لە شیو و دۆڵەکانی ئەبوو تاڵیب دا گەمارۆدران لە ساڵێکیان دا بوو کە پاڵپشتانی پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان خەدیجە خاتوون و ئەبوو تاڵیبی مامی کۆچی دواییان کرد، ئیتر ئەوەندەی تر ئەشکەنجە و ئازار لەسەر موسڵمانان زیادی کرد تا پێغەمبەر ﷺ بە هیوای لایەنگر پەیدا کردن بە بانگەوازەکەیەوە ڕووی کردە تائف.

ساڵانە لە کاتی حەجی عەرەبەکاندا بۆ مەککە هەوڵی دەدا دیداریان لەگەڵدا بکات و بۆ بانگەوازی دینەکەی ڕاستەوخۆ بانگیان بکات، ئاوا تا ماوەیەکی دوور هەر بەو ئارامییەی خۆیەوە ئەم بانگەوازەی لەو بارودۆخە قورسەدا هەر بڵاو دەکردەوە، کەسی وا بەدەنگییەوە نەهاتن لەو ئان و ساتانەیدا بوو لە ئاخر و ئۆخری ڕۆژانی پڕ کوێرەوەری مەککەدا بوو کە ئەوەندەی تر خوای گەورە ڕێزی لێنا بەوەی بانگهێشتی کرد بۆ ئاسمانەکان بۆ میعراج تا نیشانەی گەورەیی خۆی و بەڵگەی پێغەمبەرێتی ترو ڕێز و پلەو پایەی لای خۆیی نیشاندا تا ئارامی زیاتر شەحن کاتەوە و تین و تەوژمی بداتەوە بەرو لە هیواو ئامانجی دڵنیاتر بێت. لەگەرمەی ڕاپەڕاندنی پلانی ئەم و پیلانی دوژمنانیدا قووڕەیش هەوڵی تیرۆر کردنی پێغەمبەریاندا و

---

[٦٢] ـ دوورودرێژ.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەوڵیان دا لە تاریکی شەو و لە گەرمەی خەودا بە دەستەیەک لە سوارچاکانی هەموو خێڵ و هۆزەکانیان بیکوژن، بەڵام (الحمد لله) سەرکەوتوو نەبوون و ئەو ساتە فەرمانی کۆچکردنی بۆ مەدینە لە خوای گەورەوە بۆ هاتبوو، بۆیە لەگەڵ ئەبوو بەکری سدیقی یارویاوەری گیانی بە گیانی دا کۆچی کرد بۆ مەدینە و لەوێ کۆمەڵگەی نوێی ئیسلامی پێکهێنا. لەوێ کیانی سیاسی و دەسەڵاتی بۆ درووست بوو، ئیتر هەر دەبوو ڕووبەڕوو بوونەوەکانی قوورەیش بە جۆرێکی تر پەرە بسێنێت، بۆیە غەزاکان دەستی پێ کرد و هەشت ساڵیان خایاند تا پێغەمبەری پێشەوا ﷺ بە یارمەتی خوای گەورە بە سەرکەوتوویی نەک هەرهاتەوە شارە خۆشەویستەکەی خۆی مەککە، بەڵکوو کردیە مایەی ڕزگار کردن و دیندارکردنی هەموو نیوە دوورگەی عەرەب، ئیدی خەڵکی پۆل بە پۆل موسڵمان دەبوون و دەهاتنە ڕیزی ئەهلی ئیسلامەوە، تا ئەو کاتەی خوای پەروەردگار پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی ﷺ دوای حەجیماڵئاوایی و بیست و سێ ساڵ لە گەیاندنی تەواوی پەیامەکەی خوا بۆ خزمەت خۆی بردیەوە و کۆچی دوایی پێ کرد، تەمەنی پیرۆزی شەست و سێ ساڵەی پڕ ڕەنج و جیهادی بەو شێوەیە کۆتایی پێ هێنا کە لە لاپەڕەکانی مێژوو تۆماری کردووە و ئێمەش ئێستا دەمانەوێت کەمێکی لێ باس بکەین .

قوورەیش هەرچەندی دەکرد ئەوەی پێ قبوڵ نەدەکرا کە یەکێک لە پیاوانی لێی هەڵگەڕێتەوە و باس لە عەیب و عاری خواکانیان بکات خۆشیان بە گەلۆر و گەمژە بناسێنێت! بۆیە هەموو کۆبوونەوە و دەستەیەک لە پیاوماقوڵانیان هەڵبژارد کە بچنە لای ئەبوو تاڵیبی مامی پێغەمبەر ﷺ و قسە و باس و دانووستانی لەگەڵدا بکەن، بەو هیوایەی لەسەر شتێک ڕێکەون! چوونە لای پێیان وت: محمدی برازات لەو بانگەوازەی مەنع کە، ئەویش ناردی بە شوێن پێغەمبەردا ﷺ داوای لێ کرد ئەو داوایەی قوورەیش قبوڵ بکات! بەڵام پێغەمبەر ﷺ بە توندی خوودی عەقیدەکە خۆی بە عەزمی پێغەمبەرانە بە فەرمایشتێکی شیرین وەڵامی دایەوە پێی فەرموو: مامە گیان، بە خوا قەسەم گەر خۆرم بۆ داگرن بیخەنە سەر شانی ڕاستم، مانگیشم بۆ داگرن و بیخەنە سەر شانی چەپم تا واز لەم دینە بهێنم، وازی لێ ناهێنم تا یان خوای پەروەردگار سەری دەخات یان لە ڕێیدا سەرم دادەنێم. [٦٣]

---

[٦٣] (يَا عَمّ وَاَللّهِ لَوْ وَضَعُوا الشّمْسَ فِي يَمِينِي، وَالْقَمَرَ فِي يَسَارِي عَلَى أَنْ أَتْرُك هَذَا الْأَمْرَ حَتّى يُظْهِرَهُ اللّهُ أَوْ أَهْلِك فِيهِ مَا تَرَكته)، سيرة ابن هشام، ج١، ص٢٦٦



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەگەڵ ئەم هەڵوێستە ڕەسەن و عەقائیدییەشدا قووڕەیش هەر لە ئەبوو تاڵیب هیوابڕاو نەبوو ئەمجارەیان عەماری کوڕی موغیرەیان ـ کە قۆزترین لاوی مەککە بوو ـ لەگەڵ خۆیان هێنایە لای ئەبوو تاڵیب و پێیان وت: ئەمە عەمارە کە جوانترین لاوی قووڕەیشە بۆمان هێناویت بیکەرە کوڕی خۆت و برازاکەتمان بدەرێ، پیاوێک بە پیاوێک، ئەبوو تاڵیب وەڵامی دانەوە: (هەی نەفرین لە مامەڵەی وا، کوڕەکەی خۆتانم دەدەنێ بۆتان بە خێو بکەم و منیش کوڕەکەی خۆمتان بدەمێ بیکوژن! بە خوا قەسەم ئەمە هەر نابێ).

کە دانووستانەکەی قووڕەیش سەرکەوتوو نەبوو هێندەی تر بە خەشم و قیندا چوون، کەوتنەوە وێزەی موسڵمانان ئەشکەنجە و ناسۆریان زیاتر کردن، هەر تیرە و هۆزێک سزادانی کوڕە موسڵمانەکانی خۆی پێ سپێردرا! دەبوو هەر تیرەیەک ئەو ئەندامانەی خۆی کە موسڵمان بوون بە هەر شێوەیەک بە کاریگەری دەزانێت وا ئەشکەنجە دات تا لە ئیسلام ژێوانیان دەکاتەوەو لە پێغەمبەریان دادەبڕن لەولاشەوە ئەبوو بەکری سدیق یەک یەک کۆیلە موسڵمانەکانی لە خاوەنەکانیان دەکڕییەوە و ئازادی دەکردنەوە، بە تایبەتی ئەوانەیان کە زۆرتر خرابوونە ژێر ناسۆری ئەشکەنجەوە، وەکو بیلالی کوڕی ڕەباحی حەبەشی، خەبابی کوڕی ئەرەت، سوهەیبی ڕۆمی، عەماری کوڕی یاسرو خانەوادەکەی بەناوبانگترین و دڵڕەقترین کەسانێکیش کە بەرپرسی مەیدانیی ئەشکەنجەکەیان بوو ئەبوو جەهل (ئەبولحەکەمی کوڕی هیشام )، ئەبوو لەهەب ( عەبدول عیزا )، وەلیدی کوڕی موغیرە، نەزریی کوڕی حارس و عوقبەی کوڕی ئەبوو موعەیت بوون.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەدوای ئەوەی چەندین شیکاری کرا لە نێوان من و نومەیردا و زۆرێک لە لایەنەکانمان باس کرد، بە نومەیرم وت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک کە خوای گەورە هەڵیبژارد بۆ پەیامبەرێتی بۆ هەموو مرۆڤایەتی و جنۆکەش بێگومان کەسێک بووە ڕەوشتی لە هەموو کەسێک بەرزتر و مەزنتربووە، لەگەڵ ئەوەشدا بەهەڵبژاردنی ئەو پێغەمبەرە گەورەترین نیعمەت ڕوویکردە مرۆڤایەتی و جنۆکەش لەگەڵیدا بێبەش نەبوون چوونکە خوای گەورە لە سوورەتی الأنبياء دا دەفەرمووێت: وما ارسلناک الا رحمة للعالمين﴾

ناردنی تۆ ئەی محمد تەنها بەتەواوی ڕەحمەتێک بوو بۆ هەموو جیهانیان.

کاتێک بەناردنی ئەو ڕەحمەت بووبێت، بێگومان وەکوو زانایان فەرموویانە گەورەترین نیعمەتی خوای گەورە ئیمانە، لەهەمانکاتدا ئەگەر ئەو پیغەمبەرە ﷺ ڕەحمەت نەبووایە ئیمانیشمان نەدەدۆزیەوە، هەربۆیە لە ئیمان باشتر پێغەمبەرەکەمانە کە محمدە ﷺ، لەبەر ئەوەشە دوژمنانی دینی ئیسلام و موسڵمانان لەڕۆژهەڵات و بەهەموو جۆرێک دژایەتی دەکەن و دەیانەوێت ڕێگری لە ئیمانهێنانی خەڵکی بکەن و باوەڕ بەو پێغەمبەرە نەکەن، کەچی بە پێچەوانەوە ڕۆژبەدوای ڕۆژ خەڵکی زیاتر ئیمان دەهێنن و دەبن بەموسڵمان و موسڵمانێتی خۆیان ئاشکرادەکەن، بێگومان ئەوەش مووعجزەیەکی پێغەمبەرەکەمانە و کە لەفەرموودەیەکدا هاتووە:

عن تميم الداري رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: " ليبلغن هذا الأمر ما بلغ الليل والنهار ولا يترک الله بيت مدر ولا وبر إلا أدخله الله هذا الدين بعز عزيز أو بذل ذليل عزاً يعز الله به الإسلام وذلاً يذل الله به الكفر " وكان تميم الداري يقول:" قد عرفت ذلک في أهل بيتي لقد أصاب من أسلم منهم الخير والشرف والعز ولقد أصاب من كان منهم كافراً الذل والصغار والجزية. [٦٤]

ئەم ئایینە دەگاتە هەرشوێنێک کە شەو و ڕۆژی تیابکرێتەوە.

[٦٤] صحيح، رواه أحمد



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سووپاس بۆ خوا لەم سەردەمەدا ئەم ئایینە پاکە گەیشتۆتە هەموو شوێنێکی دوونیا و هەموو شار و گوندێک موسڵمانی تێدا هەڵکەوتووە و موسڵمانی تێدا درووستبووە، هەرچەندە ئێستا لە سەردەمێک داین دوونیای جیهانگیرییە زانیاری هەموو شتێک گەشەی سەندووە، زۆر بەئاسانی دەگاتە هەموو شوێنێک بەهۆی ئینتەرنێت، تەلەفۆن، کەناڵە ئاسمانیەکان، دەزگای ڕاگەیاندن، لەکاتێکدا هەموو دوونیا زۆر بەئاشکرا دژایەتی ئایینی ئیسلام دەکەن و بەرپەرچی دەدەنەوە و ڕێگری لێدەکەن لەگەڵ ئەوەشدا هەربەرەو گەشەکردن و زیادبوون دەڕوات!

ماکوان: سەرم لە شتێک دەرناچێت نومەیر لە ئێستادا باسی ئەوە دەکەن کە گوایە ئووممەیەی کوڕی ئەبی سەڵتیش لە تائیف داوای پێغەمبەرایەتی کردووە، دەڵێن شیعرەکانی ئەشووبهێنن بە ئوسوولبی قورئان.

نومەیر: بەپێی ئەوەی قورئانی پیرۆز تەنها دەقێکە لەڕووی شێوەزاری دەربڕین (لفظ) و ماناوە جێگیر بووە کە قسەی خودایە و پێغەمبەری خودا ﷺ خۆی لە ژیانی خۆیدا کۆیکردۆتەوەو ڕێکیخستووە بە ئاراستەی ئەو وەحییە کە لەڕێگای جوبریلەوە -سەلامی خوای لێبێت- خوای پەروەردگار دایبەزاندوەتە سەر زەوی، هیچ گومانێک لەسەر هیچ جۆرە دەقێک یاخوود هیچ جۆرە پێش و پاش خستنێکی قورئانی پیرۆز نیيە، کۆڕای هەموو ئووممەتی ئیسلامیشی لەسەرە.

قورئان تەنها سەرچاوەیەکە لەهەموو ڕوویەکەوە (مێژوویی، بیروباوەڕیی، دەروونی و پەروەردەییەوە...هتد) دەتوانین پشتی پێ ببەستین و بیکەین بەسەرچاوەی سەرەکی.

بۆیە قورئان دەقێک نیيە هێندە بە سادەیی سەیری بکەین، بەڵکوو دەقێکی پیرۆزە وەک دەق، لە لێکدانەوە و شیکردنەوەی ماناکانییەوە پیرۆز نیيە، چوونکە مرۆڤ شیکردنەوەی بۆ کردووە و لەکۆتاییدا ئێمەی مرۆڤ بڕیار دەدەین چ جۆرە مانایەک ببەخشێت، بەڵام بەڕەچاوکردنی ئەوەی دەقەکە نزیک بێت لە ڕۆحی قورئان و کەشوهەوای کاتی دابەزینی دەقەکە و لێکدانەوە و لێکەوتەی زمانی بۆ دەق و ئەو بنەما گشتییانەی کە بۆ دەق دیاریکراون، هەروەها لەنێو موفەسیرەکانیش لەسەر لێکدانەوە و شیکردنەوەی قورئان زۆر قسە و ڕای جیاوازیان هەبووە.

ماکوان: ئەمە چ پەیوەندی هەیە بە پرسیارەکەی منەوە؟





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نومەیر: ئەگەر پەلە نەکەیت هەیەتی، چوونکە پێش ئەوەی باسی ئووممەیەی کوڕی ئەبی سەڵت و پێغەمبەری خوا ﷺ بکەین دەبێت بزانین کە ژیانی پیغەمبەر ﷺ لە ناو قورئانەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەگەر بێت و قورئان نەبێت هەموو ڕاستییەکان دەشێوێت، دەمەوێت ئەوە بە تۆ بڵێم.

ماکوان: ئەم قسەیە زۆر جوانە و زۆر قوڵیشە، ئەی فەرموودە هەمان حوکمی نییە؟

نومەیر: هەر دەستەواژەیەک لە قورئان کە خودای گەورە بەکاریدەهێنێ لە هەر وشەیەک یاخوود لە هەر ڕستەیەک کە ئاماژە بێت بۆ هەر شتێک لەقورئان دا مەبەستدارە، بەڵام لەوانەیە ئێمە نەتوانین بەو پێوەرە سەبارەت بە دەقێکی فەرموودەیی بدوێین، هەرچەندە دەقی فەرموودەش پیرۆزیی و جوانی خۆی هەیە، بەڵام دەقی قورئان لە ناوەرۆک دا جگە لە لێکدانەوە و شیکردنەوەی مرۆڤ پیرۆزی خۆی هەیە، دەکرێت بەدوای ئەوەدا بگەڕێین هەر وشەیەک چی مەبەستێکی لەدواوەیە، بەتایبەت ئەو دەقانەی کە پەیوەندییان بە بابەتێکی مێژوویی گرنگەوە هەیە، بۆ نموونە لە سوورەتی التین دا خودای گەورە دەفەرموویت:

﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ۝ وَطُورِ سِينِينَ ۝ وَهَٰذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ ۝﴾ [التين]
سووێند بە هەنجیرو زەیتوون (کە دوو میوەی بەسوودو بەکەڵکن، سووێند خواردنی خوا بە درووستکراوانی بۆ سەرنج ڕاکێشانمانە، بەڵام سوێند خواردنی ئێمە گەورەیی و گرنگی سوێند پێ خۆراوەکە دەگەیەنێت).

بەکێوی طوری سینا (کە خوا گفتوگۆی لەگەڵ حەزرەتی مووسا، لەوێدا کرد).

سووێند بەم شارە ئەمینە، کە (مەککە)یە.

زۆر لە موفەسیرەکان ئاماژە بەوە دەکەن (وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ) مەبەست لە شام-ە کە شوێنی دابەزینی وەحییە بۆ پێغەمبەر عیسا -سەلامی خودای لەسەر بێت-، هەروەها مەبەست لە (وَطُورِ سِينِينَ) کێوی سینایە کە ئەو شوێنە بووە پێغەمبەر مووسا -سەلامی خودای لەسەر بێت- قسەی لەگەڵ خودا کردووە، هەروەها (وَهَٰذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ) مەبەست لە مەککەیە.

ئەم سوورەتە لە ساڵی یەکەمی پێغەمبەرێتیدا دابەزیوە، ئاماژەیە بۆ یەکخستنی هەر سێ ئایینە ئاسمانییەکە لە مووسا وە بۆ عیسا، لە عیساوە بۆ محمد ﷺ بۆ تەواوکردنی




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پەیامی یەکتاپەرستی، ئەم ئاماژانە خاڵێکی گرنگ و بنەڕەتین پێویستە ئەو کەسەی قورئان تەفسیر دەکات یاخوود قورئان دەخوێنێتەوە بۆ ئەوەی لێی تێبگات ڕەچاوی ئەو ئاماژانە بکات لەژێر ڕۆشنایی ئەو هەل و مەرجانەوە.

لە زۆربەی ئەو دەقانەی کە خودا بەشێوازێکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەدوێت، ئەگەر تێبینی بکەین ئەوا دەبینین جۆرە ئاراستەکردنێکی تێدایە بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ، جگە لەوەی ئەو ئاراستانە پەیامێکی خوداییی، بەڵام دەبینین ئاراستەی پێغەمبەری خودا دەکات بۆ ئەوەی کارێک بکات یان نەیکات.

ماکوان: واتە مەبەستت ئەوەیە بڵێیت کە ئوسلووبی شیعری ئوممەیەی ئەبی سەڵت زۆر جیاوازترە لە گوتاری قورئانی، وەکوو ئاراستەی بۆ هەردوو کەسایەتییەکە، ئەمیان دیارە کە خۆی نووسیویەتی و ئەویش دیارە کە بانگ کراوە؟

نومەیر: ئەگەر پەلەم لێ نەکەیت جوان تێت دەگەیەنم ماکوان، جا کارەکە کارێکی پەرستشی بێت و پەیوەندی بە ئاسمانەوە هەبێت یاخوود بۆ کاری بانگخوازی بێت یان هەر جۆرە کارێک بێت، لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە قورئان ڕەچاوی باری دەروونی و کەسێتی، یاخوود ڕەچاوی ئەو هەڵوێستە دەکات کە پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا بینیوویەتی. بۆ نموونە لە سوورەتی (عبس) کە لە سێ ساڵی یەکەمی پێغەمبەرایەتیدا دابەزیوە، تایبەتە بە ژیانی پیاوێکی نابیناوە کە دێتە لای پێغەمبەر ﷺ داوا دەکات فێری ئەو ئایەتانەی بکات کە بۆی دابەزیون، پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ئەوەی لەو کاتەدا سەرقاڵی قسەکردن و گفتوگۆیە لەگەڵ سەرانی قووڕەیشدا و دەیەوێ قسە بکات لەگەڵ سەرۆکی خێڵەکان دا، بەهۆی ئەوەی بەپێی یاسای ئەو سەردەمە گەر سەرۆکی خێڵ موسڵمان ببوایە یان شوێنکەووتەی هەر ئایینێک بووایە، ئەوا تاکی خێڵەکە ژمارەیان هەرچەندێک بووایە، دەبوو لەدوای ئەودابن و پەیڕەوی ئەو ئایینەیان کردبایە، چوونکە ئەوکاتە سەرۆکی خێڵ بڕیاردەربووە و لەجیاتی تاکەکان بیریکردۆتەوە و بڕیاریداوە، بەرگری کردووە، نان و ڕۆزیی بەخشیوە، بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ لە دە ساڵی سەرەتای پێغەمبەریدا زۆر هەوڵی دەدا لەگەڵ سەرۆک خێڵەکان قسە و گفتوگۆ بکات بۆ ئەوەی ڕایانبکێشێتە نێو ئیسلام، بەڵام بەداخەوە ئەوان هەریەکێکیان هەڵوێستێکی وەردەگرت کە پێغەمبەر هەڵوێستەکەیانی دەبینی نەدەڕۆشت تا لەگەڵ تاک بە تاکی خێڵەکەدا گفتوگۆ بکات، چوونکە دەیزانی تاک بە تاکی خێڵەکە شوێن هەڵوێستی سەرۆک




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

خێڵەکەیان دەکەون، بۆیە چاوبڕینە باوەڕی سەرۆک خێڵێک لەجێی خۆیەتی کاتێک ئەم گوتارە بەپێی سەردەمی مێژوویی خۆیدا ڕەچاو دەکەیت، لەوکاتەی پێغەمبەری خودا ﷺ سەرقاڵە و دەیەوێ قسە لەگەڵ سەرۆکی خێڵەکان بکات، عەبدوڵلای کوڕی ئوم مەکتوم کە پیاوێکی نابینایە دێت و لەوکاتەدا داوا لەپێغەمبەری خودا ﷺ دەکات فێری ئەو ئایەتانەی بکات، هێندە داوای لێدەکات تاوەکوو پێغەمبەری خودا ﷺ پشتی تێدەکات، ئینجا خودای گەورەی لەسورەتی (عبس) ڕەخنە ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ دەکات بەشێوازێکی توند، کە بە خیتابی غائب قسەی لەگەڵ دەکات، بەم شێوەیەش ڕەخنەکە مانایەکی قوڵتر و تووندتر دەگەیەنێت، لێرەدا خودای گەورە پەیامێک ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ دەکات، پێی دەڵێت خەریکە لەسەر هێڵەکە لادەدەیت و پێویستە بگەڕێیتەوە، چوونکە ئەو پیاوە دڵی کردۆتەوە بۆ قورئان و ئەو بانگەوازەی دەستت پێیکردوە، بۆیە گەر بتەوێ بانگەوازەکەت بگاتە شوێنی مەبەست، پێویستت بەو کەسانە دەبێت کە بەدڵەوە بەدەم پەیامەکەوە دێن نەک ئەوانەی قووڕەیش کە هەریەکێکیان بەدوای بەرژەوەندی و سوودمەند بوونی خۆیەوەیەتی، بۆیە ئەو کەسانە نابن بەو کەسە سەرەکییانەی بنەمای دەوڵەت و فیکر و شارستانێتیان لەسەر درووست بکرێت.

ماکوان: ڕاستە، بۆیە زۆربەی شوێنکەوتەکانی پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتادا کەسانی هەژار بوون، وەک لە سیرەی ئیبن ئیسحاق دا ناوی چل و حەوت هاوەڵ هاتووە کە لەسەرەتای سێساڵی پێغەمبەرێتیدا شوێنکەووتەی پێغەمبەر ﷺ بوون، کەسانی ناسراو تیایاندا زۆر کەم بووە، کە سێ بۆ چوار کەسێک بوون، بەڵکوو زۆربەی شوێنکەووتەکانی خەڵکی هەژار و کۆیلە بوون، بۆیە لێرەدا قورئانی پیرۆز ئەوەمان پێ دەڵێت کە ئەم خەڵکە هەژار و ڕەش و ڕووتە هەڵگری ڕاستەقینەی ئەم پەیامەن و کەسانی دڵسۆزن، نەک ئەم سەرۆک خێڵە بەرژەوەندی خوازانە.

نومەیر: وایە، بەڵام ئەگەر سەرنج بدەینە سوورەتی (الفاتحة) پێنجەم سوورەتە کە دابەزیوە، ناوەرۆکی هەموو پەیامی ئیسلام ڕوون دەکاتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتادا بە سووپاس و ستایشی خوداوەند دەست پێدەکات، ئینجا پەیامی یەکتاپەرستی و پاڕانەوە لەخودا بۆ ئەوەی شوێنکەووتەی گومڕاکان نەبین، خودا ڕێنمویمان بکات بۆ ڕێگای ڕاست، لەو ساتەوە پێغەمبەری خودا ﷺ ناوەرۆکی پەیامی ئیسلامی بۆ ڕوون دەبێتەوە، لە چوارچێوەیەکی گشتی مەعریفی، ئایینی، عەقائیدی، پەرستشی، ئایینی، مێژوویی و هتد...

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەروەها لەکاتی دابەزینی سوورەتی (الفاتحة)دا ئیبن هیشام باسێک دەهێنێ، کە باس لەوە دەکا لە نیوەڕۆیەک دا جوبرەئیل -سەلامی خوای لێبێت- هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو کە ئەمە کاتی نوێژی نیوەڕۆیە و ئینجا لەکاتی نوێژی عەسر و مەغریب و عیشا و بەیانیش دا دێت و شێواز و چۆنیەتییەکەی فێر دەکات، بۆیە ئیبن هیشام پێداگری دەکات لەسەر ئەوەی هەر لەکاتی دابەزینی سوورەتی-الفاتحة-دا نوێژ فەرز کرابێت، هەر بۆیەش پێویستە لەهەموو نوێژێکدا سوورەتی الفاتحة بخوێنین.

ماکوان: مەبەستت چی بوو لە هاتنی سوورەتی فاتیحە و ئەم باسە؟ هەست دەکەم پەیوەندییان بەیەکەوە نییە، قسەکانت ڕوون نین، پرسیارەکەی من ئەوەیە خەڵکی لە شاری مەککەدا باسی ئوممەیە کوڕی ئەبی سەڵت دەکەن کە ئەویش هەمان شێوەی محمد بەدوای پێغەمبەرایەتییەوە بووە؟

نومەیر (بە پێکەنینەوە): ئەگەر قسەکانم پێنەبڕیت لە کۆتاییدا تێدەگەیت چ پەیوەندییەک هەیە لە نێوانی ئوممەی کوڕی سەڵت و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، با قسەکەمت بۆ تەواو بکەم لەدوونیای ئەمڕۆدا بەشێک لەو نووسەرانەی لە ئەوروپا ژیان دەکەن، لە کورد و فارس و عەرەب، بەتایبەتتر عەرەب خەریکی نووسینەوەی کۆمەڵێ بابەتن لە پەڕاوەکانی ئیسلامی، هەر لە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ و حەدیس و ئایەتەکانی قورئان، مەبەستیانە ئەوە لەخەڵک بگەیەنن، پەیامی پێغەمبەران پەیامێکی ئاسمانی نەبووە و پێغەمبەری خوداش کەسێکی ئاسایی بووە و خۆی نووسەری ئەم بابەتانە بووە، گوایە هیچ پەیامێکی ئاسمانی بوونی نییە، بەڵکوو پەیامی مرۆیین.

بۆیە دەمەوێت لێرەدا سەرنجت بگەڕێنمەوە بۆ سەردەمی ژیانی پێغەمبەر محمد ﷺ پێش سێ ساڵ لە هاتنی پێغەمبەرایەتی.

دەگەڕێینەوە بۆ دوو ساڵ پێش هاتنی پەیام بۆ پێغەمبەر ﷺ، لەو سەردەمەدا دوو کەس هەبوون، لەچاوەڕوانیدا بوون و خەمی کۆمەڵگە و خەڵکیان گرتبووە ئەستۆ، بە عادەتی حاڵ ئەو کەسانەی زیاتر تێدەفکرن و ڕادەمێنن زیاتر خەم دەخۆن و نارەحەتتر دەبن و زیاتر ئازار دەکێشن بە دەست گیروگرفتەکانی خەڵک و کۆمەڵگە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەم دوو کەسە یەکێکیان لە مەککە ئەوەی تریان لە تائیف، بەدوو ئاراستەی جیاواز چاوەڕانی شتێک بوون.

یەکێکیان سێ ساڵە بە بەردەوامی دەچێتە سەر کێوی نوور، لەوێ دەچێتە نێو ئەشکەوتێکەوە کە پرسیاری لێ دەکەن ئەم ئەشکەوتە چی دەگەیەنێت بۆ تۆ؟ دەڵێت لەنێویدا ئاسوودە دەبم، لەکاتێکدا سەرنج بدەین پانی ئەشکەوتەکە یەک مەترە و درێژییەکەی چوار مەترە، بەهەموو پێوەرێکی ئەندازەیی مرۆڤ لەشوێنێکی لەم جۆرەدا ئاسوودە نابێت، بەڵام کە ڕۆح ئاسودە بوو ئیتر هەموو شتێکە بۆ مرۆڤ، ئاسوودەیی مرۆڤیش لە ئاسوودە بوونی ڕۆحدایە.

ئەو کەسەی کە باسی دەکەین دەچێتە ناو ئەشکەوتەکە تا ئەم کاتە پاکترین مرۆڤ و بەڕێزترین و متمانە پێکراوترین کەسی مەککەیە، خەڵک بەوپەڕی ڕێزەوە سەیری دەکەن، وەکوو وێنەیەک و سومبولێکی جوان سەیری دەکەن. لەبەرامبەردا ئەوەی تریان لەباشووری ڕۆژهەڵاتی مەککە، لەشاری تائیف کە خێڵی سەقیف لەو شارەدا باڵادەستن، پیاوێک بە ناوی ئوممەیەی کوڕی سەڵت، کەسێکی زانا، شاعیر و ڕۆشنبیرە، لە شیعردا پێشەنگە لەو خێڵ و ناوچەیەدا. هەروەها کۆمەڵێک زانیاری باشی هەیە لەسەر تەورات و ئینجیل وە هاوڕێیەتی هەندێ لە زاناکانی بەنی ئیسرائیل و نەسرانییەکانی کردووە.

ئوممەیەی کوڕی سەڵت هەستی کردووە کاتی هاتنی پەیامبەرێکە، لەم ماوەیەدا تێدەفکرێ و گۆشەگیر دەبێت، هەندێ جار شیعر دەڵێت دەربارەی تەوحید و یەکتاپەرستی، لەو ڕێگەیەوە دەیەوێت پەیامێک بداتە بەر گوێی خەڵک بۆ ئەوەی بزانن کاتی هاتنی پەیامبەرێکە تا ئەگەرێک بدات بە خەڵک کە لەوانەیە خۆی ئەو پەیامبەرە بێت، بەڵام لە ڕاستیدا نوور دەڕواتە شوێنێکی دیکە، نووری سرووشی خودای پەروەردگار دێت بۆ لای ئەو کەسەی بۆ ئاسوودەبوون و ئارامی خۆی سەردانی ئەشکەوتەکە دەکات.

لەگەڵ ئەوەی ئوممەیەی کوڕی سەڵت چاوەڕوانی ئەوە دەکات ببێت بە پێغەمبەر، بەپێچەوانەی پێغەمبەر محمد ﷺ کە هەر بەخەیاڵیشیا نەهاتووە ڕۆژێک لە ڕۆژان ببێت بە پێغەمبەر، بەڵام ویستی خودای گەورە وادەبێت کە ئوممەیە نابێت بە پێغەمبەر و محمد ﷺ، دەبێت بە پێغەمبەر.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەر بۆیە ئوومەیە وازدەهێنێت لەبانگەشەی پێغەمبەرایەتی، بەڵام ئارادەیەک حەسادەت و بێتاقەتی و بێزاری دڵی دەگرێت لەبەرامبەر پێغەمبەری خودا ﷺ ، بەڵام دەری نابڕێت.

ئەم پیاوە تا ساڵی حەوتی کۆچی لەژیان دەمێنێت، ئەگەرێک هەبوو ئەگەر شەڕی بەدر ڕووی نەدابا ئوومەیە موسڵمان ببوایە، لەشەڕی بەدردا عوتبە و شەیبە کە کوڕی پوری ئوومەیە بوون کوژران، هەر لەداخی ئەمە باوەڕ بە ئیسلام ناکات و سەرهەڵدەگرێت و بەرەو یەمەن دەڕوات.

ئەم پێشەکییەم بۆ ئەوە باسکرد کە تێتبگەیەنم، بەڵام دەمویست لە ڕێگای کەسایەتییە قورئانییەکانەوە بۆت ڕوونبکەمەوە دوایی بۆت باس دەکەم، چوونکە بەشێک لەو کەسانەی کە دەیانەوێت تانە لە پێغەمبەری خودا ﷺ بدەن لەڕێگەی ئوومەییەوە تانە ئەدەن، گوایە پێغەمبەری خودا ﷺ لاسایی ئەوی کردۆتەوە یاخوود شیعرەکانی ئەو دەڵێت.

بۆیە ئەگەر سەیری دیوانەکەی ئوومەییەی کوڕی سەڵت بکەیت کە لە هەموو جێگایەکدا دەست دەکەوێت و تەنانەت لە ئینتەرنێتیش هەیە کە نزیکەی چوار سەد لاپەڕەیە، شیعرەکانی باس لەمەسەلەی خێڵەکی و دڵداری دەکات بەچەند دێڕێکیش باسی یەکتاپەرستی کردووە.

لەو سەردەمەشدا زۆر کەس هەبوون لەسەر دینی حەنیف بوون یەکتا پەرست بوون، ئەویش یەکێک بووە لەو کەسانەی لەسەر ئەو ڕێبازە بووە، یەکتا پەرست بووە، بەڵام لەگەڵ هاتنی ئیسلام خۆری ئەوانیش ئاوا دەبێ، لەو کاتەوەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ لەو ئەشکەوتەدا لەتەمەنی چل ساڵیدا، لەشەوی قەدردا کە ١٧ی ڕەمەزان بووە یاخوود ٢٧ی ڕەمەزان، لەلایەن پەروەردگارەوە سرووشی بۆ دێت، پەشۆکاو دەبێت نازانێت ئەوەی کە بۆی هات سرووشی خودای پەروەردگارە یاخوود نا!؟

وەک ئیبن هیشام دەیگێڕێتەوە دەڵێت: (کاتێک خەوی لێ دەکەوێت، لەخەوەکەیدا جبریل - سەلامی خوای لێبێت - پارچە قوماشێکی ئاوریشمی بەدەستەوە بوو، لەنێو ئەو پارچە ئاوریشمەدا کتێبێکی تیابوو، جبریل بەرەو ڕووی پێغەمبەری خودا ﷺ دێت بەتووندی دەیگوشێت بۆ چوار جار پێی دەڵێت: (اقرأ)، ئەویش دەڵێت چی بڵێم؟ لە جاری





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

چوارەم و کۆتاییدا دەیگوشێت و بەریدەدات، پێی دەفەرموویت: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١﴾، لەگێڕانەوەکەی بوخاریدا بۆ سێ جار دەیگوشێت ئینجا پێی دەفەرموویت: ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٢﴾ [العلق]

ئەوەی جێگای سەرنجە لەم بابەتەدا لە ڕیواتەکەی ئیبن هیشام دا بەڕوونی هەست بەوە دەکەیت کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە چ ڕەوشێکی دەروونی و عەقڵی و مەعریفیدایە، کە جبریل - سەلامی خوای لێبێت - پێی دەڵێت بخوێنە، لەوکاتەدا پێغەمبەری خودا ﷺ دەڵێت: چی بخوێنم؟ پێغەمبەری خودا لەحاڵەتی شۆکبوندایە، چوونکە هیچ دوونیا بینییەکی بۆ خودا و ژیان و گەردوون نەبووە، بەهۆی ئەوەی هیچ تێکەڵبوونێکی بەدوونیای ئەدیب و شاعیر و کاهین و جوولەکەکان نەبووە، ئەمەش شۆکێکی ڕاستەقینەیە بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ.

کاتێک پێغەمبەری خودا ﷺ هەڵدەستێ لەم خەوە، بەڵام خەونێکی ڕاستەقینە و زنجیرە ڕووداوەکانی یەک لەدوای یەک لەبیرە، هەروەها پێنج ئایەتی بۆ دابەزیوە هەر پێنج ئایەتەکەی وەک خۆی لەبیرە، ئینجا لە ئەشکەوتەکە دێتە خوار و دەچێتە لای خەدیجەی خێزانی کە هێشتا لەحاڵەتی شۆکبووندایە، بۆ خێزانەکەی باس دەکات، بۆیە ئەم حاڵەتی شۆکبونەی پێغەمبەر ﷺ دەرخەری ئەوەیە کە پێغەمبەری خودا نە بەنیازی وەحی بووە نە بەنیازی پێغەمبەرایەتی بووە.

لەوکاتەدا لەنێو عەرەبدا شتێک باو بووە کە لەکتێبی (الجن واختلاق الأرباب)-دا باسکراوە، هەروەها لەدیوانەکەی ئوومەیەی کوڕی سەڵت و کتێبی (الحیوان للجاحظ) کۆمەڵێک دیاردە باس دەکات کە لەو کاتەدا باو بووە، قورئانی پیرۆزیش بەشێکی تەرخانکراوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو دیاردەیە، کە ئەو کاتە عەرەب پێی وابووە شاعیر کەسێکی داهێنەر و بەتوانایە، تواناکەی لەوەدایە کە ئەو کەسەی دەبێتە شاعیر پەیوەندی دەبێت لەگەڵ یەکێک لە شەیتانەکاندا، دەبێت ئەو شەیتانە وەحی پێ بدات، یاخوود ئیلهامی پێ بدات کە چۆن قسە بکات چۆن شیعر بڵێت، بۆیە ئەو کاتەی وەرەقەی کوڕی نەوفەل دەبینێت و هەر لەو ڕۆژەدا هەواڵەکە بڵاودەبێتەوە بەنێو خەڵکدا ڕاستەوخۆ تۆمەتباری دەکەن بەوەی تێکچووبێت یاخوود شەیتانەکان فێری ئەم شتانەیان کردبێ، باکگراوندی ئەم قسەیەش لەسەر ئەو بنەمایە بووە کە



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەسەردەمی جاهیلیدا هەر کەسێک داهێنەر بووبێ پێیان وابووە لە شەیتانەوە شتی بۆ هاتووە، بۆیە ئەم تۆمەتەیان خستۆتە پاڵ پێغەمبەری خودا ﷺ، لەکاتێکدا پێغەمبەری خودا لەهەموو ژیانیدا یەک دێڕە شیعری نەبووە، هەروەها هیچ جۆرە مامەڵەیەکی لەگەڵ هیچ دیوانێکی شیعریدا نەبووە، هەرچەندە عائیشەی خێزانی، فاتیمەی کچی، ئەبوو بەکری سدیق، عومەری کوڕی خەتاب و عەبدوڵەتەڵیب شیعریان وتووە، هەروەها ئەبوو تاڵیبی مامیشی یەکێک بووە لە شاعیرە گەورەکانی مەککە، ئەوەش بۆ ئەوەی کەس نەتوانێ ئەم تۆمەتەی بداتە پاڵ.

ماکوان ئەگەر تەماشا بکەیت لەدوای سوورەتی (العلق) کە سوورەتی یەکەمە، سوورەتێکی تر دادەبەزێ ئەویش سوورەتی (قلم) -ە کە بەجۆرێکی تر ئاماژە بە پێغەمبەر ﷺ دەکات، لەسەرەتادا لەسوورەتی یەکەم پێغەمبەری خودا ﷺ وەک گوێگرێک دەردەکەوێ، کە پەیامی زانست و خەلقی پێ دەدەن، بەڵام لەدووەم جاردا پێغەمبەر ﷺ ئامادە دەکرێت بۆ هەڵگرتنی ئەو پەیامە، کە دەبێت مرۆڤێک بیگەیەنێت بە پێوەرەکانی مرۆڤ، نەک بە سیحر و جادوو و مووعجیزە و ئەم جۆرە شتانە، بۆ ئەوەی مرۆڤەکان توانای هەڵگرتنی ئەو پەیامەیان هەبێت لە ناخ و لە عەقڵ و ئاکار و پەروەردەیانەوە، تا پەیامەکە بەجوانترین شێوە بگاتە شوێنی خۆی، هەروەها ئاماژە دەبێت بۆ ئەوەی بەم وەحییەی کە بۆی هاتووە بە هیچ جۆرێک لە مرۆڤ بوون دەرناچێت هەر وەکوو مرۆڤێکی ئاسایی دەبێت.

لەکاتی دابەزینی سوورەتی دووەمدا پێغەمبەری خودا ﷺ دەشڵەژێت هەر خۆی بە خەدیجە دەڵێت تۆ بڵێی شتێکم بەسەر نەهاتبێ؟ ئاشکرایە ئەمەش لەبیروباوەڕی کۆنی عەرەبدا هەبووە کە جن دەست بووەشێنێ لەخەڵک و ئەم قسانە لەناویان زۆر باو بووە، هەر لە کتێبی (الحیوان للجاحظ) بەشێک تایبەتکراوە بە ناوی جنۆکەکان، کە هەریەکەیان تایبەت کردبوو بە کارێک، بۆ نموونە ئەو جنۆکەی دێتە لەشی مرۆڤەوە ناویان نابوو (عامر)، بۆیە کاتێکی زۆری ویستوە تا ئەم حاڵەتانە لەنێوعەرەب دا چارەسەر بکرێت، بۆیەش ئەم هەموو ئایەتە لەقورئانی پیرۆزدا دابەزیون بۆ چارەسەرکردنی ئەو حاڵەتە دەروونییانەی عەرەب هەیبووە.

ماکوان: ڕاستە هەرچەندە لەسەرەتادا ئیسلام چارەسەری ئەم حاڵەتانەی کرد، بەڵام بەداخەوە دووبارە سەریهەڵدایەوە و ئێستاش هەندێک خەڵک پێیان وایە جن دەچێتە لەشی مرۆڤەوە، کە



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەمە پەیوەندی نییە بە ڕۆشنبیری ئیسلامییەوە، لەبیروباوەڕی کۆنی عەرەبەوەیە کە تێکهەڵکێشی ئیسلام بووە، گەرچی لە سوورەتی (طارق) و سوورەتی (الجن) دا ئەم بابەتە بەتەواوی یەکلا کراوەتەوە.

نومەیر: لە سوورەتی سێیەمدا (سورة المدثر) کە بە واتەی ئەوە دێت کەسێک خۆی داپۆشێت جا بە هەر شتێک بێت، ئەمەش لەوەوە هاتووە کاتێک پێغەمبەری خودا وەحی بۆ دێت و لە ئەشکەوتەکە دێتە خوارەوە هەموو گیانی دەلەرزێ، تووشی شڵەژان و حاڵەتێکی دەروونی نەخوازراو دەبێت، بۆیە خودای گەورە ئەم سوورەتەی بۆ دادەبەزێنێت بۆ ئەوەی بەخۆیدا بچێتەوە.

ئەم حاڵەتی شڵەژانی پێغەمبەری خودا ﷺ لەدوای هاتنی وەحیدا دەرخەری ئەو ڕاستییەن کە پێغەمبەری خودا چاوەڕوانی شتێکی لەم جۆرە نەبووە هیچ جۆرە ئامادەکارییەکی بۆ ئەم بابەتە نەبووە، هەروەها تا هاتنە خوارەوەی سوورەتی (المدثر و المزمل) لەوە تێنەگەشتووە کە ئەم پەیامە وەحی بووە و لای خودای پەروەردگارەوە بەدەستی گەیشتووە، گەرچی وەرەقەی کوڕی نەوفەل پێی ڕاگەیاندووە. تەنانەت تا کۆتاییەکانی سوورەتە مەککییەکان خودای گەورە پێغەمبەر ﷺ دڵنیا دەکاتەوە لەوەی کە پێغەمبەرە ﷺ، بۆیە ئەم دڵنیاکردنەوە بەردەوامە هیچ گومانێک لەسەر ئەم ڕووداوە ناهێڵێت.

هەر بۆیە ئەو کەسانەشی تا ئێستا بەگومانەوە سەیری ئەم بابەتە دەکەن با ئەدەبیاتی جاهیلی بخوێننەوە، ئەوان کێشەیان لەگەڵ ئەوەدا نەبووکە ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەیڵێ ناچێتە عەقڵیانەوە، بەڵکوو کێشەیان ئەوەبوو ئەو دەقە باڵاترین دەقە لەنێو عەرەب دا، بەڵام ئەوان باوەڕیان وابووە باڵاترین دەقی شیعری بێت لەلایەن شەیتانەکانەوە بۆی هاتبێ نەک وەحی، چوونکە کۆمەڵگەی عەرەبی ئەوکاتە گەورەترین کۆمەڵگەی شیعری بووە، هەر بۆیە قورئانی پیرۆزیش تەحەدای ئەوان دەکات بە (کلمات)، بۆیە هاتنی دەقێکی لەم جۆرە لەلایەن مرۆڤێکەوە کە ڕۆژێک لەڕۆژان دەقێکی شیعری نەبووە мووعجیزەیەکی گەورە و سەرسووڕهێنەر بووە.

ماکوان: جا لە قورئان دا بە ئاشکرا و بە جوانی باسی هۆنەر و هۆنراوە کراوە پێمان دەڵێت کە شیعر واتای چییە؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەڕاستیدا بە کەمترین وشە زۆرترین مانا بدەیت بە دەستەوە، ئەمە پێناسەیە بۆ شیعر، خوای گەورە شاعیران بەوە باس دەکات کەسەر دەکەن بە هەموو دۆڵێکدا واتە سەر لێشێواون، ئەگەر پابەند نەبن بە ئیسلامەوە.

ئەمەش دەقی ئایەتەکانە لە سوورەتی الشعراء

﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ۝﴾

سەرگەردان و سەرلێشێواوەکانیش شوێنی شاعیران دەکەون.

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ۝﴾

ئایا نابینی کە ئەوانە لە هەموو دۆڵێکدا سەرهەڵدەدەن و لەهەموو شتێک دەدوێن.

﴿وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ۝﴾

ئەوانە شتێک دەڵێن و بەکردەوە نایکەن (کردارو گوفتاریان دوورە لە یەکەوە).

﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ۝﴾ [الشعراء]

جگە لەوانەیان کە باوەڕیان هێناوەو کاروکردەوەی چاک ئەنجام دەدەن و یادی خوا زۆر دەکەن، (وە بەو توانایەی کە هەیانە) پشتیوانی لە ئیمانداران دەکەن کاتێک کە ستەمێکیان لێبکرێت واتە بە هونەرو ئەدەب شیعر، سەرئەنجام ئەوانەی ستەمکارن دەزانن کە چۆن ژێرەو ژوور دەبن و تیادەچن.

ئەم ئیسلامە لەسەردەمی بازاڕی شیعردا هاتە خوارەوە شاعیران لەبەردەمیدا دەستەوسان بوون، دوو نموونەت بۆ باس دەکەم.

لەسەرەتای بانگەوازی مەککەدا خوای مووتەعال ئایەتی دابەزاند لە سوورەتی (هود) دا دەفەرموویت: ئەگەر ڕاست دەکەن دە سوورەت وەک ئەم قورئانە بێنن، ڕۆژێک لە ڕۆژان





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

قوورەیش کە بازاڕو دوکانی وشەیان هەبوو بیریان لەوە نەکردەوە کە وەک قورئان بێنن، چوونکە هەموویان دەستەوسان بوون لەبەردەمیدا تەنانەت بازاری (عوکاظ) شاعیرەکانی خۆیان بە دەقەکانی قورئان سەرسام ببوون، دەقی ئایەتەکە دەفەرمووێت:

﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ١٣﴾ [هود]

(بێ باوەڕان) دەڵێن: (ئەم قورئانە) خۆی هەڵی بەستووە، پێیان بڵێ: دە ئێوەش دە سوورەت وێنەی ئەم قورئانە بێنن وەهەرکەس لە خوای گەورە بەدەر، دەتوانن بانگی بکەن (بۆ هاوکاریتان پەنای بۆ بەرن) ئەگەر ڕاست دەکەن.

ڕۆژێک لە ڕۆژان خەڵکی شاری مەککە نەیانتوانی کۆببنەوە هاوشێوەی قورئان شتێک بنووسن.

هەروەها لەسەرەتای چوونی بۆ شاری مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێشدا ئایەتێکی هاوشێوەی ئەو ئایەتە لەسەرەتای سوورەتی "البقرة" دابەزی، بەڵام لە مەدینە تەحەدا کە بەهێز تربوو داوای لێکردن کە تەنها یەک سوورەت بنووسن، دەقی ئایەتەکە دەفەرمووێت:

﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ٢٣﴾ [البقرة]

ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم (قورئانە پیرۆزە) هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمد ﷺ، ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوورەتێکی وەک ئەو بهێنن، هاوپەیمان و هاوکارەکارەکانیشتان جگە لە خوا (بۆ ئەو مەبەستە) بانگ بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن.

مووعجیزەکە لێرەدایە هیچ کاتێک بیریان لەوە نەکردەوە بڵێن وەرە محمد: ئێمەش لەو وشە، بەلاغەت، نحو، ڕێکخستن و تانەنەت ماناو تێگەیشتنەوە هاوشێوەی قورئانمان لایە، سەرسام بوون پێی چوونکە قورئان خاوەنی کەرەستەی وشە بوو، شیعریش هەر وشەیە جیاوازییەکە ئەوەیە کە قورئان وەحییە ئەوەی دەیخوێنێت و بەکاری دێنیتەوە، وەک خەیاڵ دنیایەکی

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

فەنتازیای شیعرییە خەیاڵ فراوان دەکات. واقیعەکەش ئەوەندەی تر هەموو لاکانی سەرسام کردبوو لە ئێستاو لەو سەردەمەیشدا، چوونکە هەموو چیرۆک و مێژووی بەنی ئیسرائیلە، بۆ نموونە لە مەککە هاتووە، بێجگە ئەحکام ئەهلی کیتاب زیاتر لە مەدینە دابەزیوە، بەڵام ئەوەی مێژووی بەنی ئیسرائیل و تەنانەت مێژووی گەلانی تر، زۆربەی لە مەککە دابەزیوە، مووعجیزەکە لێرەدایە: لە ناوشاری مەککەدا یەک تاکە ماڵ مەسیحی و یەهوودی تێدا نەژیاوە، بۆیە جوولەکەکانی خەیبەر و ناوچەکانی تر سەرسام بوون، هەروەها مەسیحییەکانی نەجرانیش هەر سەرسام بوون بە باس و زانیارییەکانی ناو قورئان، ئەو زانیارانەیشی قورئان ئەیدا بە خەڵکی بە گشتی تەنها زاناو ڕاهیب و کەسە دیارەکانی ئەو گەل و هۆزانە دەیانزانی، کەواتە قورئان بە هەموو پێوەرێک مووعجیزە بوو بۆیە نەیانتوانی ڕووبەڕووی بووەستنەوە.

کاتێک قورئان هاتەناو ئەو گەلە دواکەوتووە بە خێرایی هەموویانی گۆڕی بۆ باشترین خەڵک، ئەویش مووعجیزەیەکی تر بوو، چوونکە ئەو ناوچەیە لە جەهالەتدا دەژیان. دوایی کە قورئان بووە مەنهەج و دینیان ئیتر وڵات لە دوای وڵات فەتحیان دەکرد، ئیتر ئەوان ڕەوشت و دادپەروەری و بیروباوەڕیان بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکرد.

نومەیر: ماکوان سەرنجت بۆ شتێکی تر ڕادەکێشم یەکێکی دیکە لەو سوورەتانە سوورەتی (المسد)ە کە تایبەتە بە باسێک، زۆر جار بەشێک لەو ڕەخنەگرانە تانە لەم سوورەتە دەدەن و دەڵێن چۆن خودا بەم گەورەییەی خۆی سوورەتێک لەسەر ئەبولەهەب دێنێتە خوارەوە، لەکاتێکدا خودا هەر لە قورئاندا باس لە زۆرێک لە درووستکراوەکانی دەکات، باس لە مێشولە و باڵندە و گویدرێژ دەکات، هەروەها سوێند دەخوات بە درووستکراوەکانی، سووێند بە ئەستێرە و مانگ دەخوات، بۆیە ئەوە شتێکی ئاساییە خودا بیەوێ باسی هەر کەسێک بکات کە درووستکراوی خۆیەتی، کە باس لە ئەبولەهەبیش دەکات وەک نموونەی بوونەوەر و درووستکراوێکی شەڕەنگێزی دەخاتە ڕوو، هەروەها پەیامێکیشە بۆ ئەو کەسانەی کە پێیان وایە پەیامی محمد ﷺ بە خێڵ سەردەکەوێ و خێڵ دەبێتە بنەچەی سەرەکی ئەم پەیامە، ئەمەش بۆچوونێکی هەڵەیە، چوونکە ئەبوو لەهەب کە مامی پێغەمبەرە ﷺ و دراوسێشیەتی، هەروەها لە دوو مانگی یەکەمی دابەزینی وەحی دوای باوەڕهێنانی خەدیجە و عەلی و ئەبو بەکر، پێغەمبەری خودا ﷺ بیر لەوە دەکاتەوە لەگەڵ مامی قسە بکات دەربارەی بوونی بە پێغەمبەر، چوونکە مامی لەگەڵی زۆر باش بووە و دۆستایەتییان زۆر باش بووە، بەڵام ئەوکاتەی پێغەمبەری خودا ﷺ





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەچێتە ماڵی ئەبوو لەهەبەوە و پێی ڕادەگەیەنێ کە پێغەمبەرە و نێردراوی خودایە ڕاستەوخۆ ئەبوو لەهەب لە کەسێکی بەسۆز و میهرەبانەوە دەگۆڕێت بۆ کەسێکی شەڕەنگێز و جنێودەر، پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا چاوەڕێی ئەوە دەکات ئوم جەمیل کە خێزانی ئەبوو لەهەبە و خوشکی ئەبوو سووفیانە بیرکردنەوەیەکی دیکەی هەبێت، چوونکە میوان لای عەرەب ڕێزدارە، بەڵام بەهەمان شێوەی ئەبوو لەهەب هەردووکیان بە پاڵ و جنێو پێغەمبەری خودا ﷺ دەکەنە دەرەوە و دەیان ناو و ناتۆرەی وەک شێت و درۆزن و جادووگەری دەخەنە پاڵ، خەڵکی مەککەش هەموو ئەم ناو و ناتۆرانە لە ئەبوو لەهەبەوە فێردەبن و دەیڵێنەوە.

ماکوان: کەواتە ئەم کەسایەتییانەی ناو قورئان خوای گەورە بۆمان باس دەکات هەموویان دووبارە دەبنەوە لەم سەردەمیشدا، هەڵبەت مەبەستم سەردەمی خۆمانە؟!

نومەیر: بەڵێ بەدڵنیاییەوە ئەو وتەیەت ڕاستە؛ ئەبوو لەهەب پیاوێکی دەوڵەمەند بوو و پەیوەندیدار نەبوو بەکاری فکرییەوە، لەکۆبونەوەکانی دارونەدوەشدا زۆر بەشداری نەدەکرد، هەروەها کەسایەتییەکی هێندە بەرزی نەبوو لەنێو خەڵکدا، کەسێکی جنێو فرۆش و شەڕەنگێز و دەنگ بەرز بووە، هەمیشە خەریکی خواردنەوە و ڕابواردن بووە، تەنانەت لە سەرچاوە مێژووییەکانی قووڕەیشدا ئاماژە بەوە دەکات کە دزی لە نێو کەعبەشدا کردووە، خۆی داوا لە کۆمەڵێک دز دەکات و پێیان دەڵێت ئاسکێک هەیە لە نێو کەعبەدا لەنێو کەلەسەری ئاسکەکە کە هینی عەبدولمەتەلیبە ئاڵتوونی تێدایە، بڕۆن بیدزن و بیهێنن بەشی دەکەین، بۆیە ئەو جۆرە کەسانە لەنێو هەموو کۆمەڵگەیەکدا بوونیان هەیە، بەڵام بە بەرگی جیاوازتر و شێوازی جیاوازتر، کەسی مەشروب خۆر و گاڵتەجار و جنێو فرۆش و ئەم جۆرە کەسانە زۆرن لەنێو زۆربەی کۆمەڵگەکاندا، بۆیە لە قورئاندا ئەبوو لەهەب وەک نموونەی ئەم جۆرە کەسانە نیشاندراوە، پاشان ئەبوو لەهەب دوای دە ساڵ لە دابەزینی سوورەتی (المسد) دەمرێت و موسڵمان نابێت، لەکاتێکدا دەیتوانی بۆ تەحەداکردنی پێغەمبەری خودا ﷺ موسڵمان ببوایە!

هەروەها سوورەتی (الضحى) یەکێکە لەو سوورەتانەی باسی چێشتەنگاو دەکات، بەڵام لە ڕاستیدا بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەری خودایە، کاتێک ئوم جەمیل کە دەکاتە ماموژنی پێغەمبەری خودا و خێزانی ئەبوو لەهەب، بە پێغەمبەری خودا ﷺ دەڵێت: چی بووە محمد دەمێکە شەیتانەکەت سەردانت ناکات یان زویر بووە لێت!؟ ئینجا سوورەتی (الضحى) دێتە



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

خوار کە هەمووی دڵنەوایيە بۆ پێغەمبەری خودا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، جەخت لەوە دەکاتەوە خودا جێی نەهێشتوە و دەستبەرداری نابێت، ئەمەش هەر بۆ خۆی پەیامێکە، کە ئەگەر ئەمانە قسەی خودی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بن و پەیامی خودایی نەبێت، لەپێناو چیدا پێغەمبەری خودا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەم شێوەیە خۆی تووشی ئەم هەموو ناڕەحەتی و ئازارە دەکات، وەک لە پێشووتریشدا باسم بۆ کردی لە ساڵەکانی سەرەتای پێغەمبەرێتیدا بەشێکی زۆر لە سوورەتەکان تەرخانکراوە بۆ دڵنەوایی پێغەمبەری خودا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ئەوەی لەسەر ڕێبازەکەی خۆی بێت و قسەی هیچ کەسێک کاریگەری بەسەرییەوە نەبێت، هەروەک لە سوورەتی (التكوير)یشدا خودا دڵنەوایی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەکات دوای ئەوەی خەڵک بە شێت و کەم عەقڵ و دەیان ناو و ناتۆرەی تر بەدوای دەکەون پێی دەڵێت کە کەسێکی ژیر و عاقڵە و شێت نییە، هەروەها پەیامەکە لەلایەن خودای گەورەوە بۆی ڕەوانە کراوە.

نموونەی سوورەتی (الضحى)

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿وَٱلضُّحَىٰ ۝١﴾

سووێند بە چێشتەنگاو کاتێ کە خۆر بەرزدەبێتەوە و دنیا گەرم دادێت و کاتی جووڵە و چالاکییە.

﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ۝٢﴾

سووێند بەشەو کاتێک بە تاریکییەکەی زەوی دادەپۆشێت.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ٣﴾

پەروەردگاری تۆ دەست بەرداری تۆ نەبووە و وازی لەتۆ نەهێناوە (ماوەیەک وەحی نەهات بۆ پێغەمبەر ﷺ كافرانی قوورەیش وتیان، پەروەردگاری محمد وازی لێهێناوە، ئیتر خوای گەورە بەدرۆی خستنەوە).

﴿وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَىٰ ٤﴾

بێگومان قیامەت و دوارِۆژ چاكترە بۆ تۆ لە دنیا.

﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ ٥﴾

لە ئاییندەدا پەروەردگارت نازو نیعمەتت پێدەبەخشێت كە زۆر پێی ڕازیی و خۆشنوود دەبیت.

﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ٦﴾

مەگەر پەروەردگارت نەیبینیت بەهەتیویی و خێرا دەرووی لێ كردیتەوە و لانەی بۆ سازاندیت؟!

﴿وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَىٰ ٧﴾

ئەی سەرلێ شێواو نەبوویت و نەتدەزانی چی بكەیت، هیدایەتی دایت و ڕێنموونی كردیت؟!

﴿وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَىٰ ٨﴾

ئەی نەیبینیت كە هەژار و نەداریت، پاشان ماڵ و سامانی پێ بەخشیت و دەوڵەمەندی كردیت؟!



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿فَأَمَّا ٱلۡيَتِيمَ فَلَا تَقۡهَرۡ ٩﴾

كەواتە تۆش (ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئەی ئیماندار) هەتیوان مەچەوسێنەرەوەو ستەمیان لێ مەكەو ماڵ و سامانیان مەخۆ، لەسەر چاكەو چاكەكاریی لەگەڵیاندا بەردەوام بە.

﴿وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنۡهَرۡ ١٠﴾

هەرگیز هەڵمەشاخێ بە هەژارو داماو و سواڵكەراندا.

﴿وَأَمَّا بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثۡ ١١﴾ [الضحى]

(بەڵكوو) دەربارەی نازو نیعمەتەكانی پەروەردگارت هەمیشە بدوێ و باسیان بكە (خەڵكی لێ بە ئاگا بكە).

## نموونەی سوورەتی (التكوير)

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان.

﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ١﴾

كاتێك كە خۆر بچوك بووەوە و ڕووناكیی نەما.

﴿وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ٢﴾

كاتێك كە ئەستێرەكان (لە خولگەی خۆیان) ترازان و دایان بە یەكدا.

﴿وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ ٣﴾

كاتێك كە كێوەكان لە شوێنی خۆیان هەڵدەكەندرێن و بەملاولادا بران.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿وَإِذَا ٱلْعِشَارُ عُطِّلَتْ ﴾

کاتێک کە حوشترانی ئاوس کە تەمەنی بارداریيان دە مانگە گوێیان پێ نەدرا (بێگومان ئەو وشترانە لای عەرەب نازدارن).

﴿وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ﴾

کاتێک کە گیانلەبەرانی کێوی و وەحشی و دڕندە بەدەوری یەکدا کۆکرانەوە (ئەوانیش دڕندایەتی خۆیانیان لەبیر چۆوە لە سامناکیی ئەو ڕۆژە).

﴿وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ﴾

کاتێک کە دەریاکان گڕدران (دیارە کە تەقینەوەی ناوکیی ڕوودەدات و ئاوی دەریاکان دەبنەوە بە هایدرۆجین و ئۆکسجین).

﴿وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ ﴾

کاتێک کە گیانی هەرکەس دەگەڕێتەوە بۆ لاشەی و لەگەڵیدا جووت دەبێتەوە.

﴿وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ﴾

کاتێک کە کچی زیندە بەچاڵ پرسیاری لێ کرا.

﴿بِأَيِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴾

بە چ گوناحێک، بە چ تۆمەتێک کوژرا؟!

﴿وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتْ ﴾

کاتێک کە نامەی کردەوەکان واڵا کرا.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ ﴾

کاتێک کە ئاسمان لابراو داماڵرا.

﴿وَإِذَا ٱلۡجَحِيمُ سُعِّرَتۡ ﴾

کاتێک کە دۆزەخ داگیرسێنراو تاودرا.

﴿وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ ﴾

کاتێک کە بەهەشت نزیکخرایەوە (لەخواناسان).

﴿عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ ﴾

ئیتر ئەو کاتە هەرکەس دەزانێت چی ئامادەکردووە و چ توێشوویەکی پێیە.

﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ ﴾

سووێند بەو ئەستێرانەی کە پەنها دەبن و ون دەبن لە چاو، یاخوود بەهۆی سوڕانەوەی زەوی و خۆیانەوە (بەهۆی هەڵهاتنی خۆرەوە) ون دەبن.

﴿ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ ﴾

بەو هەسارانەی کە پەنا دەگرن و دیارنامێنن.

﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ﴾

بەشەو کە دادێت وەکوو زیندەوەرێک خەو دایدەگرێت.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ١٨﴾

بە بەرەبەیان کە پشووی تێدێت، وەکوو زیندەوەرێک ئاهی تێ دێتەوە و دەست دەکات بە هەناسەدان و ژیان.

﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ١٩﴾

(سووێند بەوانەی هەمووی) بەڕاستی، بێ دوودڵی ئەم قورئانە لە زاری نێردراوێکی بەڕێزەوەیە (کە جوبرەئیلە).

﴿ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ٢٠﴾

خاوەنی هێزو دەسەڵاتە و لای خاوەنی عەرش، فریشتەیەکی پایەدارە.

﴿مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ ٢١﴾

فەرمانڕەوایە، هەروەها ئەمین و دڵسۆزە لە کارەکانیدا.

﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجۡنُونٖ ٢٢﴾

دڵنیا بن کە هاوڕێ کەتان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ شێت نییە و (لە کەماڵی ژیریدایە).

﴿وَلَقَدۡ رَءَاهُ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡمُبِينِ ٢٣﴾

بێگومان (محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ جوبرەئیلی) بینی بە ئاشکرا لە ئاسۆی نومایاندا.

﴿وَمَا هُوَ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ بِضَنِينٖ ٢٤﴾

ئەو هەواڵ (وحی)و ئایات و زانیارییانەی پێی دەگات، لە جیهانی نهێنی و شاراوەکانەوە، لێتان ناشارێتەوەو ڕاستیتان پێ ڕادەگەیەنێت چوونکە هەرگیز لە گەیاندنی پەیامەکەیدا ڕژدو ڕەزیل نییە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ۝﴾

ئەم قورئانە وە نەبێت گوفتاری شەیتانی نەفرینلێکراو بێت.

﴿فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ ۝﴾

ئیتر بۆ کوێ دەچن؟ ڕوو دەکەنە کوێ؟ ڕوو دەکەنە کێ؟

﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ۝﴾

بەڕاستی ئەم قورئانە هەر یادخەرەوەیە بۆ جیهانییان، بۆ هەمووان، بۆ هەموو خەڵکی (بۆ ئادەمیزاد و پەرییان).

﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ۝﴾

بۆ ئەوانەتان کە دەیانەوێت ڕێبازی ڕاست و درووست بگرنە بەر.

﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝﴾ [التكوير]

ویستی ئێوەش کاتێک دێتە دی کە ویستی خوا، پەروەردگاری جیهانەکانی لەسەر بێت، (هەرکەس ویستی خێری هەبێت خوای گەورە سەربەستیی لێ زەوت ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەوە پێش دێت کە ویستی خوای لەسەرە، توانای تێگەیشتنمان لە نهێنی و شاراوەکان زۆر سنوور دارە).



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سیرەی پێغەمبەر لەزەمەنی پێغەمبەردا ﷺ و چەند مووعجیزەیەک

لەگەڵ نومەیردا باسی ئەوەمان کرد بەڵگەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەرەتاوە چۆن بزانین ئەگەر بێدینێک یا کەسێکی دوور لەدین و ئەقڵانی ئەو پرسیارە بکات؟ گرنگە سەرەتای هاتنی پێغەمبەرایەتی خوا بەڵگەی ئەوەمان نیشان بدات کە بەڵێ ئەو بەڕاستی پێغەمبەرە ﷺ، بۆ ئەوەی بتوانین بە ئاسانی بانگەوازەکەی بگەیەنین بەهەموو کەلێن و کەلەبەرێکدا، پێم وابێت ئەمە خاڵی جەوهەرییە زۆر جار بێدین و مولحیدەکان لەوە دەپرسن کە محمد خۆی ئەم قورئانەی نووسیوە خۆیشی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کردووە! نومەیر خۆشت باش دەزانی گەڕۆک و ڕۆژهەڵاتناس و بیریارانی ڕۆژاوا، دەمیان نەپاراستووە لەم گومانانە، بۆیە گرنگە ئەو کۆدە و شفرانە بکەینەوە پێکەوە.

نومەیر: دەبێت منیش و جەنابیشت و خەڵکانێکی تر ئەوە باش بزانین کە لە کون فەیکونێکدا ئەمە ناچێتە مێشکی خەڵکی پێویستی بە ڕوونکردنەوەیە. پێویستە خەڵکی ژیری و هزریان بەکار بهێنن ڕێک پێچەوانەی جەهلە، کێشەی ئەوانەی بەو شێوەیە قسە لەسەر (رسول الله) ﷺ دەکەن ئەوەیە کە جاهیلن، نەک ژیر و ئاقڵ!

ماکوان: لەوانەیە ئەوانەی من و تۆ وایان پێبلێێن خۆیان ئەو دیدو تێڕوانینەیان نەبێت، بەڵکوو بە ماددی و ڕاڤەی جەدەلی قسە و باسەکانیان بکەن.

نومەیر: باشە وەرە بیکەوە تەماشایەک بکەین و بزانین ئەگەینە کام ئەنجام، ململانێی نێوان هەق و ناهەق لە سەرزەویدا کۆنە و ڕیشەی بە مێژووی مرۆڤایەتیدا داکوتیوە، هەر لەو کاتەوە ئیبلیس بەپێی سوونەتێک کە خوا لەم سەر زەوییەدا لە مەڕ دوژمنایەتی هەق و ناهەق دایناوە لە ڕەحمەت و بەزەیی خوا وەدەرنرا، ئیتر کەوتە پیلان گێڕان و لادانی مرۆڤ لە ڕێی ڕاست، سوێندی خوارد بە دەسەڵات و عیزەتی پەروەردگار کە گشت مرۆڤەکان گومڕا بکات و بەرەو هەڵدرێر و ملشکانی یەکجارەکییان بەرێ: "قال فبعزتک لأغوینهم أجمعین"، بەڵام خۆ مرۆڤەکان هەموو یەک سرووشت نین. خۆ ئەو ناتوانێ هەموویان لە خشتە بەرێ، هەرچەندە زۆرینەی خەڵکی شوێنی هەواو ئارەزووەکانی خۆیان دەکەون و گوێ لە مشتی شەیتانن، بەڵام لە ناویاندا چینێکی پاک و بێگەرد هەیە کە بڕیاری بەندایەتیان بۆ خوا داوە و هەمیشە دوژمنن بە ناهەق



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

و دۆستی هەقن، شەیتانیش هەستی بەمە کردووە کە هەموو بەندەکانی پێ هەڵناخەڵەتێ، بەڵکوو تەنها ئەوانی پێ لە خشتە ئەبرێت و ئەبنە قوتابی دڵسۆزی کە بێ مەبەست و بێ وردبوونەوە شوێنی نەخشەکانی ئەکەون و بەردەوام لە خزمەت ئارەزووەکانی خۆیاندان، بۆیە کۆمەڵێکی جیا کردەوە و کردنیە حیزب و بەشی خۆی، "أولئک حزب الشیطان". بەڵام ئەوانەی کە بە دڵسۆزی و لێبڕانەوە بەندایەتی بۆ خوای گەورە دەکەن و ژیانیان تەرخان کردووە لە پێناوی تێگەشتن و بەرگری لە هەق و ڕاستی کە لە گوێڕایەڵی و ملکەچ بوونیاندا بۆ بەرنامەی خوا بە دییان کردووە، دەسەڵاتی بەسەریاندا نییە "إلا عبادک منهم المخلصین".

واتە مەگەر بەندە چاک و دڵسۆزەکانی تۆ نەبێت ئەی پەروەردگار من نەتوانم لە خشتەیان بەرم.

داناترین و ژیرترینی مرۆڤەکان ئەو کەسانە بوون کە خوای گەورە ئەرکی گەیاندنی بەرنامە و پەیامەکەی خۆی پێ سپاردوون ئەوانیش کە پێغەمبەرانن -سەلامی خوایان لێ بێت-، لە ناو هەر گەل و نەتەوە و تیرە و هۆزێکدا خوا یەکێکی لە خۆیان هەڵبژاردووە تاکو ڕێی ڕاستیان بۆ ڕوون بکاتەوە لە ڕێی چەوت و نالەباریش دووریان بخاتەوە، بەختەوەری دنیا و دواڕۆژیان پێ ئاشنا بکات.

لەوەتەی مرۆڤ لەم سەرزەوییەدا ئەژی بەرنامەی خوای گەورە هەماهەنگی بووە و لەگەڵیدا ژیاوە، هەر لە ئادەمەوە کە یەکەم پێغەمبەری ئەم سەرزەوییە بوو تاکو ئێستە و داهاتووش، هیچ گەل و نەتەوەیەک نەبووە خوا پێغەمبەری بۆ نەناردبێت، بەڵام ئایا مرۆڤەکان هەموو گوێڕایەڵی بەرنامەی خوان و بە پەیامی پێغەمبەران ڕازین؟ ئایا هەموویان دەتوانن کە هەواو ئارەزوو بیرو بینشی خۆیان پاماڵ و بخەنە ژێر ڕکێفی پێغەمبەران؟

ماکوان: جا ئەمە پەیوەندی بە باسەکەمانەوە چییە؟ من باسی جەدەل و بیر و ماددە دەکەم، تۆ باسی شەیتان و ئیمانیاتم بۆ دەکەیت!

نومەیر: من نازانم بۆ ئەوندە پەلەیت لە تێگەیشتن، لەڕاستیدا نەوە تۆ و دوای تۆش لەڕێگای تەکنەلۆجیاوە کە بە خێراترین کات زانیاریتان دەست دەکەوێت فێری ئەوەی کردوون ئەم تەکنەلۆجیایە کە وەک لەفە و پارووییەکی ئامادە کراو ئەوەی ویستتان بێتە بەردەستان! ئاخر هەموو زانستێک وانییە، بەڵکوو پێوویستی بە لێورد بوونەوە و ژیری هەیە، جا ئەمجارە کە



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ڕوونم کردەوە پەلە مەکە تا دەگەیتە ئەنجام قسەکانم پێمەبڕە خۆ من تۆ دیبەیت ناکەین، بەڵکوو دەمەوێت فێرت بکەم جەوهەرەکە چییە کە دەمانەوێت باسی بکەین.

ماکوان: زۆر ببوورە ئیتر واناکەم، تۆ لەسەر حەقی و ڕاستت کرد.

نومەیر: دان نان بە هەڵەدا گەورەییە، دە گوێگرە! مێژووی پێغەمبەران لەگەڵ گەل و نەتەوەکانیان بەڵگەی ئەوەن کە بەشێک لە مرۆڤ هەمیشە ویستوویانە پاساوی جۆرا و جۆر بێنێتەوە تاکو لە بەرپرسیاری ڕابکەن، نەک هەر ئەوە بەڵکوو بە هەموو هێز و توانایەکیان بەرەنگاریان بوونەتەوە و بە توندترین شێوە دوژمنایەتیان کردوون و تۆمەتی جۆراو جۆریان خستۆتە پاڵیان.

ڕەنگە جێی پرسیار بێ کە بۆچی ئەو گشت خەڵکە بەرەنگاری پێغەمبەران بوونەتەوە و باوەڕیان پێ نەهێناون، وەڵامی ئەم پرسیارە ئەتوانین لە بانگەشەی پێغەمبەراندا بە بەراورد لەگەڵ ئەو کەسانەی کە زیاتر لە دەسەڵاتداران و دەست ڕۆیشتووان بوون بە دی بکەین، هیچ خێر و چاکە و ڕزگار بوونێک نەماوە کە بانگەشەیان بۆ نەکردبێ، بەڵام پاداشتەکەیان قسەی بریندارکەر و تۆمەت و لە کەدار کردن و دەربەدەری و بووختان بووە، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە مرۆڤ ئەگەر بە ناخی خراپەکاری و بێ باوەڕیدا ڕۆیشتە خوارێ، ئیتر هیچ دیاردەیەکی ئیمان کاریگەری نامێنێ لە سەری و دەبێتە شەیتانێکی دژ بە حەق، هیچ جۆرە ئامۆژگارییەک کاریگەی لە دڵی ڕەقبووی ناکات "لا ينفعكم نصحى إن أردت أن أنصح لكم" مەگەر بزانین پێغەمبەران جگە لە بەختەوەری و خۆشی بۆ گرۆهی بەشەرییەت چیتریان پێ بووە؟ ئەو ڕاستییەی پێی هاتوون وەک ڕۆژی ڕووناک ئاشکرا و بەڵگە نەویست بووە، بەڵام دڵ و دەروون کە کوێر بۆوە توانای بیستی ڕاستی نامێنێت و چاوەکان جگە لە تاریکە شەو ناتوانن گزنگی بەرەبەیان ببینن، شاعیر دەڵێ: شەمشەمەکوێرە بە ڕۆژ نابینێ، خەتای ڕۆژ نییە، ئەو خۆی نابینێ.

کەسانێکیش کەوا سرووشتیان وەک شەمشەمە کوێرە وایە حەزیان بە ستەم و تاریکی و ڕێگەی چەوتە، پەیامی ڕاستی پێغەمبەرانیان پێ قبوڵ نییە، تەنها گلەیی لە خۆیان بکەن و لەو دنیادا هاواری ئای لە بەین چووین و ماڵمان وێران بوو بە خۆیان بڵێن.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کاتێک پێغەمبەری ئیسلام صلى الله عليه وعلى آله وسلم پەیامی ئیسلامی ڕاگەیاند، سەرەتا قووڕەیشەکان وایان ئەزانی کە زیانێکی ئەوتۆی لە سەریان نییە وەک کەسانی پێشتری خۆی بانگەوازێکە و پاش ماوەیەک خامۆش ئەبێت.

بەڵام لەگەڵ پەرەسەندنی بانگەوازەکەیدا سەرانی قووڕەیش بەرژەوەندییەکانیان کەوتە مەترسییەوە، بۆیە هەر زوو ویستیان سنوورێکی بۆ دانێن، ئەبوو تاڵیبی مامی هەرچەندە بێ باوەڕیش بوو، بەڵام بەرگری لێ ئەکرد و تا ئەو مابوو قووڕەیشییەکان بووێری ئەوەیان نەبوو هەڕەشەی ڕاستەوخۆی لێ بکەن، بۆیە زۆر جار سکاڵای خۆیان ئەبردە لای و ئەیانووت ئەی ئەبوو تاڵیب ئێمە لە بەرتۆ نەبێ ڕێ نادەین بەو شێوەیە محمد خواکانمان لەکەدار بکات، لە بەر ئەوە دەبێ یان واز بێنێت یان ئێمە دەستەوسان دانانیشین، ئەوەبوو لە یەکێک لە هەرە دانیشتنە چارەنووس سازەکانی نێوان پێغەمبەرو قووڕەیشدا، قووڕەیشییەکان وتیان: ئەی محمد بەم قسانەت هەرچییەکەت ئەوێت بۆت ئەکەین ئەگەر مەبەستت هەر کارێکە بە مەرجێ واز بێنی و خواکانمان لەکەدار نەکەیت، پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی: من هیچیم ناوێت لە ئێوە تەنها وتنی یەک وشە نەبێت: وتیان: دە وشەشت بۆ دەڵێین فەرموو، وتی بڵێن: لا اله الا الله، ئیتر کە گوێیان لەوە بوو ڕاچڵەکین و وتیان: تەنها ئەو وشەیە ناڵێین هەموو شتێکی ترت بە گوێ دەکەین، ئەیانزانی ئەو وشەیە مانای ڕزگاری مرۆڤە، مانای ئەوەیە کە هیچ کەسێک نابێ لە کەسی تر بەرزتر و پیرۆزتر بێت، لە ژێر پێوەری ئەو وشەیەدا نەبێت، ئەیانزانی ئەبێ هەموو بەندەی خوا بن و مرۆڤەکان هەموو لە یەک ئاستدابن و کەس بەندە و کۆیلەی کەس نەبێت، ئەیانزانی ئەوە پەیامی ڕزگاربوونی مرۆڤەو ئیتر ستەم و چەوسانەوە و داپڵۆسین ناهێڵێت، ئەیانزانی مانای لا اله الا الله واتە وازهێنان لە هەرچی خوو و نەریت و بیرۆبۆچوونی نەفامی هەیە و چوونە ناو ئیسلامە بە تەواوی، بەڵێ ڕازی نەبوون ئەو وشەیە بڵێن و داکۆکیان لە پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم کرد کە واز بێنێ و هیچ نەبێت باسی خواکانیان نەکات، ئەبوو تاڵیب وتی: ئەی برازای خۆم ئەوە گەورە و سەرانی مەککە هاتوونە لای من و داوات لێ دەکەن کە واز بێنیت و چیت ئەوێت پێت ئەدەن، جا تۆ دەڵێی چی و چۆن وەڵامیان دەدەیەوە؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم ڕووی کردە مامەی و فەرمووی: "سوێند بە خوا ئەی مامە، ئەگەر خۆر بخەنە لای ڕاستم و مانگیش بخەنە لای چەپم تا واز لەم کارە بێنم وازی لێ ناهێنم، یا خوا سەری ئەخات و یان لە پێناویدا تێدا ئەچم".





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئای لە دڵێکی چەند بە هێز و دڵنیا و پڕ متمانەوە، ئەم وەڵامە درا بە گوێی بێباوەڕانداو وەک چەخماخە دای لە سەر دڵیان و تووشی لەرزی کردن!

بەڵێ ئیتر لەو کاتەوە سەرانی بێباوەڕی کەوتنە هەڵبەستنی تۆمەت و بووختان، هیچ شتێک نەمایەوە لە ئازاری دەروونی و لاشەیی بەسەریدا نەدەن و لەکەداری نەکەن، ئەگەڕان تاکوو بچوکترین تۆمەت و ناتەواوی بدۆزنەوە، بەڵام دەسەوسان هیچیان پێ نەدەکرا، ناچار شتانێکیان ئەوت کە خۆشیان باوەڕیان پێی نەبوو، پێیان ئەوت: محمد شێتە! بەڵام باش ئەیانزانی کە هیچ کەسێک لە مەککەدا بە ئەندازەی ئەو ژیر و هۆشمەند نییە، دەیانووت جادووگەرە، بەڵام جادووگەرەکان هەموو ناسراو بوون و کەسێک کە دووربووبێت لە جادووگەری لە ژیانیدا پێغەمبەر بووە صلى الله عليه وعلى آله وسلم، دەیانووت: درۆزنە، بەڵام هەر لە سەر دەمی پێش پێغەمبەرایەتیشدا بە ڕاستگۆ و دەستپاک بە ناوبانگ بوو، تەنانەت لە کاتێکدا کە سەرسەختترین دوژمنی بوون، ئەگەر ئەمانەتێک یان پارچە شتێکی بە نرخیان هەبووایە دەیانهێنایە لای ئەو، چوونکە لە کەسی دیکە بە ئەندازەی ئەو ئەمین نەبوون، پێیان دەوت: شاعیر و هۆنەرە، بەڵام ئەیانزانی کە پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم لە هیچ کام لەو شاعیرانەی عەرەب نەبووە، کە لەو کاتەدا یان لە پێش ئەودا ژیاون و تاکە دێڕێک شیعریشی نەوتووە لە ژیانیدا، پێیان ئەوت: ئەم قورئانەی لە شانامە و ئەفسانەکانی کۆنەوە وەری گرتووە، بەڵام ئەوان کە ڕەوانبێژترین کەسانی سەردەمی خۆیان بوون و گاڵتەیان بە ئەفسانەکان دەهات، دەسەوسان بوون لەوەی کە تاکە سوورەتێکیش وەک ئەو ئەفسانەیە بێنن کە ئەیاندایە پاڵ پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم، خوای گەورە داوای لێکردن لە ڕێگای قورئان و پێغەمبەرەکەیەوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم، نەک ئەوان بە تەنها بەڵکوو هەموو مرۆڤایەتی بە گشتی هەتا ڕۆژی دوایی کە ئەگەر ڕاست ئەکەن ئەم قورئانە لە لایەن خواوە نییە و محمد خۆی هەڵیبەستووە، فەرموون نموونەی ئەم قورئانە بێنن، نەخێر بەڵکوو نموونەی دە سوورەتی بێنن، نەخێر بەڵکوو تەنها یەک سوورەت! ئەوە بۆ هەزار و چوار سەد ساڵ ئەچێت ئەم تەحەددایەی قورئان بەردەوامە و کەسێک لەوانەی باوەڕیان پێی نییە نەیانتوانی بەرپەرچی بدەنەوە، زۆر ئاسانە نموونەیەک وەک قورئان بێنن و ئیتر کارەکە تەواو ئەبێت، بەڵام هێنانی نموونەیەکی وەها لە درووستکردنی ئاسمانەکان گرانترە! بۆیە مرۆڤەکان تا ئێستە دەستەوسانن لەوەی کە بتوانن وەڵامی قورئان بدەنەوە.

ماکوان: ڕاستە لێکۆڵینەوە کراوە لەسەر قورئان کە چۆن دەتوانێت لە ماوەیەکی کەمدا گۆڕانکاری لە ناخ و ڕۆحی مرۆڤدا بکات، سەرلەنوێ دایبڕێژێتەوە بە ئاراستەیەکی نوێ، پاشان



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نهێنی مووعجیزەکانی قورئانمان بۆ دەردەکەوێت لەم باسەدا کە دەشێت هەندێکمان پەیمان پێ نەبردبێت.

زۆرم بەلاوە گرنگە کە بتوانین لەگەڵ ئەم باسەدا ئاوێتە بین، چوونکە سەراپا هەموو هەڵسوکەووت و ڕەفتار و کرداری دەگۆڕێت بۆ مرۆڤێکی تر.

ئەم باسەی کە تۆ کردووتەوە لەسەر گرنگی دەقەکانی ناو قورئانە، کە قورئان بۆ خۆی پێکهاتووە لە چوار بەشی سەرەکی، ئەو چوار تەوەرەیە کار لەسەر بوونیادی تاک و کۆمەڵگا و دەسەڵاتیش دەکات.

یەکەم: بیروباوەڕ (العقیدة).

دووەم: ڕەوشت و دادپەروەری (الاخلاق، العدالة).

سێیەم: مێژوو (التاریخ).

چوارەم: یاسا یاخوود شەریعەت (القانون).

ئیعجازی قورئان لەوەدایە هەموو سوورەتێک لە قورئاندا پێکهاتووە لەم چواربەشە، زیادەڕۆییم نەکردووە ئەگەر بڵێم: هەموو ئایەتێکی قورئانی پێکهاتووە لەو چوار بەشە؛ ئەم چوار بنەمایە بۆ بوونیادی تاک وکۆمەڵگا و دەسەڵاتیش پێکهاتەی سەرەکین.

قورئان خەڵکی خاوەن هەست و ژیری دەتوانێت لێی تێبگات، تێگەیشتن لە قورئان ئینسافی دەوێت و بە ڕقەوە هەر کەس تەماشای بکات خۆی بچوک دەکاتەوە سووکیش دەبێت، هەر کەس قورئان گەورە ڕابگرێت خۆی لەناو خەڵکیدا گەورە دەبێت و خوا گەورە پلەشی لای بەرز دەبێتەوە!

نموونەی ئەبوو لەهەب دێنمە بەرچاو مامی پێغەمبەر بوو ﷺ، چوونکە بە ڕقەوە تەماشای قورئانی دەکرد لە ئاست قورئان دا کوێر بوو، لە دوایشدا ئەوەندە سووک بوو ماڵ و منداڵەکەی خۆی چاڵێکیان بۆ هەڵکەند و فرێیان دایە ناوی، لە سەرەتای بانگەوازی مەککەدا ئایەت لەسەر ئەبوو لەهەب هاتە خوارەوەو زەمی خۆی و خێزانەکەی دەکرد، باسی ئەوەی دەکرد کە ئەم خانەوادەیە لە جەهەنەمدا دەسووتێن!





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

گرنگی و نهێنی قورئان ئا لێرەدایە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەبوو لەهەب توانای ئەوەی نەبوو بڵێت: من قورئان بە درۆدا دەخەمەوە ئەوا موسڵمان بووم، سیانزە ساڵ توانای وتنی ئەم وشەیەی نەبوو، خۆ ئەگەر ئەبوو لەهەب یان خێزانی موسڵمان بوونایە ئەوە قورئان بە درۆ دەکەوتەوە! بەڵام ئەمە کەلامی خوای مووتەعالە هەموو کەس دەستەوسانە لە بەردەمیدا، دەقی ئەو سوورەتەی لەسەر ئەبوو لەهەب هاتەوە.

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

بەناوی خوای بەخشندی میهرەبان.

﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾

دەستەکانی بشکێت ئەبوولەهەب و ڕیسوا ببێت، ئاشکرایە کە هەر ڕیسواش دەبێت و (لە ناو دەچێت).

﴿مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ﴾

ماڵ و دارایی و ئەو شتانەی کە بە دەستی هێناوە، فریای ناکەوێت.

﴿سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ﴾

چوونکە دەگەیەنرێتە ناو ئاگرێکی بڵێسەدارەوە (دەخرێتە ناوی).

﴿وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ﴾

هەروەها ژنەکەشی کە هەمیشە کۆڵەداری بە کۆڵەوەیە (ئازاری پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەدات).

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ﴾ [المسد]

هەمیشە گوریسێکی چنراو لە پووشی خورما لە گەردنیایەتی (لە قیامەتیشدا زنجیری ئاسن دەکرێتە گەردنی).

(کاتێک پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم تیرو تایەفەکانی کۆکردەوەو پەیامی خوای پێ ڕاگەیاندن ئەبوو لەهەب وتی: "تبا لک ألهذا دعوتنا" ئیتر ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە، کە هێرشێکی بەردەوامە بۆ سەر ئەبوو لەهەب و هاوسەرەکەی و ئەوانەی لەو دەچن! نموونە گەلێکی زۆر هەن لەو بارەیەوە هەرچۆنێک بووە لەناو بابەتەکەدا ئاماژەی پێدەکەم، کە هەموو ئیعجازی مێژووی و بەلاغی و زانستیی و بنەماکانی قەواعیدی(نحو)ە.

لەهەمووشی گرنگتر بنەمایەکانی قەواعیدی (نحو) بەسەر قورئان دا ناسەپێت، بەڵکوو قورئان دەیسپەنێت بەسەر زانستەکانی تردا تەنانەت هەموو زانستەکانی تر شوێنکەووتی قورئانن، کە ئەمە گەورەترین مووعجیزەی قورئانە، پێناچێت ئەم وشانە هەروا بە ئاسانی بۆ خەڵکانێکی دوور لە ئیسلام و قورئان کاریگەرییەکی ئەوتۆی هەبێت، بەڵام کاریگەری تەواوەتی درووست دەکات لەسەر دڵ و دەروونی مرۆڤی موسڵمان.

لەسەرەتای بانگەوازی مەککەدا خوای مووتەعال ئایەتی دابەزاند لە سوورەتی (هود) فەرمووی ئەگەر ڕاست دەکەن دە سوورەت وەک ئەم قورئانە بێنن، ڕۆژێک لە ڕۆژان قووڕەیش کە بازاڕ و دوکانی وشەیان هەبوو بیریان لەوە نەکردوە کە وەک قورئان بێنن، چوونکە هەموویان دەستەوسان بوون لەبەردەمیدا تەنانەت بازاری (عوکاظ) شاعیرەکانی خۆیان بە دەقەکانی قورئان سەرسام بوون، دەقی ئایەتەکە دەفەرمووێت:

﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ [هود]

(بێ باوەڕان) دەڵێن: (ئەم قورئانە) خۆی هەڵی بەستووە، پێیان بڵێ: دە ئێوەش دە سوورەت وێنەی ئەم قورئانە بێنن و هەرکەس لە خوای گەورە بەدەر، دەتوانن بانگی بکەن (بۆ هاوکاریتان پەنای بۆ بەرن) ئەگەر ڕاست دەکەن؟




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ڕۆژێک لە ڕۆژان خەڵکی شاری مەککە نەیانتوانی کۆببنەوە هاوشێوەی قورئان شتێک بنووسن.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەرەتای چوونی بۆ شاری مەدینە لەوێشدا ئایەتێکی هاوشێوەی ئەو ئایەتە لەسەرەتای سوورەتی (البقرة) دابەزی، بەڵام لە مەدینە تەحەددا کە بەهێزتر بوو داوای لێکردن کە تەنها یەک سوورەت بنووسن. دەقی ئایەتەکە دەفەرمووێت:

﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ [البقرة]

ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم (قورئانە پیرۆزە) هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمد ﷺ، ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوورەتێکی وەک ئەو بهێنن، هاوپەیمان و هاوکارەکارەکانیشتان جگە لە خوا (بۆ ئەو مەبەستە) بانگ بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن؟

مووعجیزەکە لێرەدایە هیچ کاتێک بیریان لەوە نەکردەوە بڵێن وەرە محمد ئێمەش لەو وشەو بەلاغەت و نحو و ڕێکخستن و تانەنەت مانا و تێگەیشتنەوە هاوشێوەی قورئانمان لایە، بەڵکوو سەرسام بوون! واقیعەکەش ئەوەندەی تر هەموو لاکانی سەرسام کردبوو، چوونکە هەموو چیرۆک و مێژووی بەنی ئیسرائیل بۆ نموونە لە مەککە هاتووە، بێجگە ئەحکام ئەهلی کیتاب زیاتر لە مەدینە دابەزیوە، بەڵام ئەوەی مێژووی بەنی ئیسرائیل و تەنانەت مێژووی گەلانی ترە زۆربەی لە مەککە دابەزیوە، مووعجیزەکە لێرەدایە لە ناوشاری مەککەدا یەک تاکە ماڵ مەسیحی و یەهوودی تێدا نەژیاوە، بۆیە جوولەکەکانی خەیبەر و ناوچەکانی تر سەرسام بوون، هەروەها مەسیحییەکانی نەجرانیش سەرسامبوون بە باس و زانیارییەکانی ناو قورئان، ئەو زانیارییانەشی قورئان ئەیدا بە خەڵکی بە گشتی تەنها زانا و ڕاهیب و کەسە دیارەکانی ئەو گەل و هۆزانە دەیانزانی، کەواتە قورئان بە هەموو پێوەرێک مووعجیزە بوو، بۆیە نەیانتوانی ڕووبەڕوی بووەستنەوە.

قورئانیش هاتە ناو ئەو گەلە دواکەوتووە بە خێرایی هەموویانی گۆڕی بۆ باشترین خەڵک، ئەویش مووعجیزەیەکی تر بوو، چوونکە ئەو ناوچەیە لە جەهالەت دا دەژیان، بەڵام دوایی کە

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

قورئان بووە مەنهەج و دینیان ئیتر وڵات لە دوای وڵات فەتحیان دەکرد، ئیتر ئەمان ڕەوشت و دادپەروەری و بیروباوەڕیان بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکرد، ئەمە نهێنیەکی گەورەیە کە دەمەوێت ئەو نهێنییە بۆ ئێوەی خوێنەر ئاشکرا بکەم.

نومەیر: دەمخۆش قسەکانت ڕاستە، کاتێک سەرانی قووڕەیش نەیانتوانی بە بەڵگەوە بەرەنگاری پەیامی هەق ببنەوە، کەوتنە تۆمەت هەڵبەستن بۆ خاوەنەکەی، سەیرە ئەو محمدەی کە تا دوێنی لە هەموو کەسێک خۆشەویستر بوو لایان، کەس بە ئەندازەی ئەو ڕاستگۆ و دەستپاک نەبوو، بەڵکوو لە ناویاندا کەسی تر هەڵگری سیفەتی (ڕاستگۆیی و دەستپاک) نەبوو جگە لەو یەکسەر بووە درۆزن، جادووگەر، فاڵچی و شاعیر! حاشا لەو پێغەمبەرە خۆشەویستە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ، بەڵام کاتێک دڵ نەخۆش کەوت و کرمێ بوو لە جیاتی بەزەیی پڕ ئەبێت لە ڕق و کین، نەگبەتی و دڵتەنگی هێلانەی تێدا ئەکات و مەلی بەختەوەری ئەفڕێنێ، ڕۆژی ڕووناکی لێ ئەبێتە شەوەزەنگی ئەنگوستەچاو ڕاستییەکان بە پێچەوانەوە ئەبینێت، ئەوانە ئەیانوویست بە باوەشی خۆیان بەر لە شەپۆلی بە هێزی ئیمان بگرن، ئەیانویست بە فووی دەمیان بڵێسەی گڕی ئیمان بکوژێێنەوە، ئەیانوویست بە چیلکەدار بەربەستی کاروانی ڕزگاری مرۆڤایەتی بگرن، ئەیانوویست کە بە ڕق و قین و ستەمکاری خۆیان زاڵ بن بەسەر دادپەروەری و میهرەبانی و دڵسۆزیدا، بەڵام ئایا بۆیان کراو توانیان شتێک سەوز بکەن؟

ماکوان: بەدڵنیاییەوە نەخێر، قورئان کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر دڵ و دەروونی عەرەب و ئاقڵەکانی عەرەب بەگشتی زوو دەیگۆڕین، ئەگەر تەماشایەکی ڕەوشی ئەو سەردەمە بکەین دەزانین قورئان بەمووعجیزەکەی خۆی چ گۆڕانکارییەکی گەورەی کردووە.

نموونەی ئەبو ڕەجائی عەتاردی - ڕەحمەتی خوای لێبێت- دێنمەوە کە یەکێکە لە شوێنکەوتووانی هاوەڵانی سەروەمان و خۆی پێغەمبەری صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ بینیوە، بەڵام دوای وەفاتی موسڵمان بووە بە شوێنکەوتووی هاوەڵان هەژمارد دەکرێت.

دەڵێت: لە سەردەمی جەهالەتماندا کە دەچووینە سەفەر بەردێکمان دەدۆزیەوە دەمانپەرست، ئەگەر بەردێکی باشترمان دەست بکەوتایە ئەومان فڕێئەداو دەستمان دەکرد بە پەرستنی بەردە نوێیەکەی دۆزیومانەتەوە.

ئەگەر بەرد نەبووایە چییان دەکرد؟ وازیان لە خواپەرستییەکەیان دەهێنا؟





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بێگومان نەخێر!

- بەڵکوو بەردەوام بۆماندەگێڕێتەوە دەڵێت: خۆڵمان دەهێنا و بەشیری حەیوان دەمانکردە سیرامیک، یاخوود بتێکمان لێدرووست دەکرد و دەمان پەرست.

ئەوە بارو گوزەرانی ئەو سەردەمە بوو قورئان هات چۆن ئەو خەڵکەی گۆڕی، ئینجا ئەمان یەکتاپەرستییان بڵاو دەکردەوە بەناو هەموو جیهاندا.

جەعفەری کوڕی ئەبوو تاڵیب - ڕەزامەندی خوای لێبێت- کە دەچێتە لای نەجاشی پاشای حەبەشە چۆن وێنای جاهیلیەتمان بۆ دەکات، پاشان چۆن بە زووترین کات گۆڕانکاری بەسەر ئەو کۆمەڵگایە دێت، بە هەموو پێوەرێکی دوونیایی لەو ماوە کەمەدا ناتوانرێت ئەو گۆڕانکارییە بنەڕەتیە گەورەیە لە ناو عەرەب و تەنانەت دوو ئیمپراتۆریەتی گەورەدا بکات، ئەگەر قورئان مووعجیزە نەبێت.

نەجاشی - ڕەحمەتی خوای لێبێت- پرسیار لە جەعفەر دەکات دەڵێت: ئەمە چ جۆرە ئایینێکە بۆتان هاتووە نە لەسەر ئایینی منن و نە لەسەر ئایینی گەلەکەی خۆتانن؟

لەوەڵامدا جەعفەر دەڵێت: ئەی پاشا؛ ئێمە گەلێکی زۆر دواکەوتوو و جاهیل بووین و بەردو بتمان دەپرست تەنانەت گۆشتی مردارەوەبووشمان دەخوارد، هەموو کارێکی فەسادی و خراپەکاریمان ئەنجام ئەدا! خۆشەوویستی و سیلەی ڕەحم لەناوماندا نەمابوو، ڕێزی یەکترمان نەدەگرت و هەمیشە لە گۆڵمەزنانەوەدا بووین، ئەوەی بەهێز بووایە لە ناو ئێمەدا لاوازەکانی دەچەوساندەوە.

تا کۆتایی وتەکانی کە زۆرە لێرەدا ئەوەندە بەسە کە ئاماژەی پێبکەم، ئەوە ڕەوشی ناو عەرەب بوو بەو شێوەیە ڕەفتاریان لەگەڵ یەکدا دەکرد، بەڵام قورئان هات هەموویانی گۆڕی.

تەنانەت خاتوو عائیشە دایکی ئیمانداران - ڕەزامەندی خوای لێبێت- باسی چوار جۆر هاوسەرگیری دەکات یەکێکیان ئەوەی خۆمانە کە ئێستا دەکرێت، ئەو سێ هاوسەرگیریەی تر لەو پەڕی بەدڕەوشتیدا بوو.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یەکێکیان زەواجی ئیستیبزاعی پێدەوترێت، کەسێک خێزانەکەی خۆی دەنێرێت لەگەڵ پیاوێکدا جووت بێت تا منداڵێکی لێبێت، بۆ ئەوەی منداڵەکەی خاوەن نەسەب و شەرەف دەربچێت، تەنانەت لە ڕووی فیترەتەوە ڕووخا بوون غیرەت و پیاوەتی زۆر کەم ببوو، لە نێوانیدا شەرەف ئەرزشی نەبوو لە ناویاندا.

هاوسەرگیرییەکی تر ئافرەتێک چەند پیاوێک دەچوونە لای دوایی ئەگەر منداڵی بووایە ئافرەتەکە دەستنیشانی دەکرد کامە باوکی منداڵەکەیە، جۆرێکی تر لە هاوسەرگیری ئاڵاسوورەکان بوون. لاشەیان دەفرۆشت دوای ئەوەی سەد پیاو بچووایەتە لایان ئەوا منداڵێکی بووایە کەسێک دەهات بەناوی نەسەبناس واتە ئەهلی قافەی پێ دەوترێت دەیووت ئەو منداڵە بە دەموچاو لە فڵانیان دەچێت، دەبوو بە باوکی و ئەبوایە بەخێوی بکات.

ئەوە گوزەرانی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەو سەردەمی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ بوو.

قورئان هات هەموو ئەمانەی گۆڕی ڕەوشتجوانی فێری ئەو خەڵکە کرد.

تەنانەت پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ باسی ئەو سەردمە دەکات دەفەرمووێت:

خوای گەورە سەیری ئەم زەوییەی کرد، ئەگەر سەیر بکەین شتێکی زۆر سەرسووڕماوی تێدایە! کەباس لە (مقت) دەکات لەوپەڕی ناڕەحەتی و ناهەمواری، چۆنیەتی بێزاربوون لەسەر زەویدا نیشان دەدات، خوای گەورە کەسەیری زەوی کرد بینی لەعەرەب و عەجەمەکان زۆر خراپەکاریی دەکەن بێزارییەک و ڕقێکی زۆری لەو سەردەمە بوو، پاشان دەفەرمووێت: (بقايا) لەزمانی عەرەبیدا بۆ شتی کەم دێ؛ واتە خەڵکی لە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان کەمابوونەوە، خەڵکی زۆر کەم مابوونەوە لەسەر زەویدا کە باشەکار بێت، پیاو چاک بێت.[٦٥]

جا نومەیری برام ڕامێنە و هەڵوەستەیەک بکە پێش ئیسلام دونیا چۆن بووە، بەڵام کە ئیسلام هات جیهان چۆن گۆڕانکاری بەسەرداهات.

نومەیر: دەپرسین چی گۆڕانکاری کرد ماکوان؟

---

[٦٥] إِنَّ اللَّهَ نَظَرَ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ، فَمَقَتَهُمْ عَرَبَهُمْ وَعَجَمَهُمْ إلا بَقَايَا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ. صحيح الجامع، رقم ٢٦٣٧



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: وەڵامەکە خۆی دەسەپێنێت بە قورئان ئەم گۆڕانکارییە بنەڕەتییانە کرا، چوونکە مرۆڤەکان باش لە ماناو چەمکەکانی قورئان دەگەیشتن بۆیە جاری وا هەبوو مرۆڤەکان بە چرکەسات دەگۆڕان و وازیان لەسەروەت و سامان و دەسەڵاتیان دەهێنا، چوونکە لە ناو تاریکیدا ژیاون، کە ئیسلام هات جیهانی ڕوناک کردەوە بۆیە چێژیان لەو ڕوناکییە وەرگرت و دەیانزانی پێشینان چەندە لە تەنگژە و جاهیلیدا ژیاون.

نموونەی دوو سەرکردەی (ئەوس)یت بۆ دێنمەوە ئوسێدی کوڕی حەزیر و سەعدی کوڕی موعاز -ڕەزامەندی خوا لە هەردووکیان بێت- کە چۆن قورئان لە چرکەسات دا ژیانی ئەو خەڵکەی گۆڕی، ئەو دوو هاوەڵە بەڕێزە موسڵمان نەبوون، پێغەمبەری خوا ﷺ موسعەبی کوڕی عومەیری ناردبوو بۆ مەدینە تاکو دینداری بڵاو بکاتەوە، ئیسلامەکە وەک بزاڤ و گۆڕانکاری بە خەڵکی بناسێنن لەگەڵ کەسێکی خەزرەجی بە ناوی سەعدی کوڕی زوراره چووبونە باخێکی ئەوسییەکان.

سەعدی کوڕی موعاز و ئوسێدی کوڕی حەزیر دەنێرت بۆ ئەوەی لە باخەکەدا دەریان بکات و شەڕیان پێبفرۆشێت و دەریان بکات.

کاتێک ئوسێد دەڕوات بە تورەییەوە بە قسەی ناشیرین دەریان بکات دەڵێت: ئەگەر دەتانەوێت ژیانتان پارێزراوبێت بڕۆنە دەرەوە لەم باخەدا، موسعەب قووڕەیشییە نایەڵێت کە سەعدی کوڕی زوراره قسە بکات بۆ ئەوەی ڕەوشەکە هێور بکاتەوە، خۆی دەست بەجێ قسە دەکات و دەڵێت، دانیشە لامان ئەگەر قسەکانمانت بە دڵ بوو ئەوە باشە خۆ ئەگەر بەدڵیشت نەبوو ئێرە بە جێدەهێڵین.

لەوەڵامدا ئوسێد وتی: بەڕاستی قسەکەت جێگای ڕاستیە و ئینسافی پێوە دیارە.

موسعەب هەندێک ئایەتی بۆ خوێندەوە.

پاشان دەست بەجێ وتی: بەڕاستی ئەم وتانە شیرنن! ئەمە چ جۆرە ئایینێکە، چی دەکەن بۆ ئەوەی خەڵکی بێتە ناوی؟

موسعەب وتی خۆت پاک دەکەیتەوە، جلەکانت پاک دەکەیتەوە، پاشان شایەتوومان دێنیت و دوو ڕکعەت نوێژ دەکەیت.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەست بەجێ هەڵسا ئەو کارەی ئەنجامداو موسڵمان بوو، ئەمە نهێنی قورئانە کە چۆن لەجەنگەوە گۆڕی بۆ برایەتی لە سەربازگەی کوفر و بێباوەڕییەوە گواستییەوە بۆ سەربازگەی ئیمان و باوەڕ.

لەدوایدا چووە بۆلای سەعدی کوڕی موعاز، لە دوورەوە سەعد وتی دەموچاوی ئوسێد گۆڕاوە لای ئێمە شێوە و شکڵێکی هەبوو کەهاتۆتەوە شێوەی گۆڕاوە!

لەڕاستیشدا وایە سیما و ڕووخساری مرۆڤی ئیماندار جیاوازە لە سیما و ڕووخساری بێباوەڕ:

﴿... سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ...﴾ [الفتح]
...دەیانبینیت سەرگەرمی نوێژ و خواپەرستین، کڕنووش و سوژدەدەبەن...

ئوسێد کە گەڕاوە نەیوێرا خۆی باس و خواسەکە بۆ سەعدی کوڕی موعاز باس بکات، بەڵکوو وتی: دەتوانی خۆت بڕۆی بۆ لایان، پاشان ئوسێد وا نیشانی دا کە خۆی ناتوانێت، بۆ ئەوەی ئەویش بنێرێت گوێ لە قورئان بگرێت.

بە تووڕەییەوە دەرچوو بۆلای موسعەبی کوڕی عومەیر و لەگەڵ سەعدی کوڕی زورارە، بە توندی و هەڕەشەوە وتی: دەرچن لەم جێگایەدا، پاشان هەڕەشەی کوشتنی کرد زۆر بە توندو زبری قسەی ئاراستەی ئەو دووهاوەڵە بەڕێزە کرد، بەڵام بەهۆی ئەوەی کارەکەیان بانگەواز بوو دیسانەوە موسعەب نەیهێشت بە هیچ شێوەیەک سەعدی کوڕی زورارە قسە بکات خۆی بە هێمنی و ئاسپایی پێیوت، بۆ دانانیشی لەگەڵماندا هەندێک قورئان لە دینەکەمانت بۆ بخوێنمەوە؟

لەوەڵامدا ئەویش هەمان قسەی ئوسێدی کردو وتی: بەڕاستی بە ئینسافەوە قسەت کرد گوێت بۆ دەگرم.

موسعەب دەستی کرد بە خوێندنی قورئان بۆی و چەند ئایەتێکی بۆ خوێند دەست بەجێ وتی: بەڕاستی ئەم دینە جوانە، چۆن موسڵمان دەبن تا منیش موسڵمان ببم!

موسعەب هەمان وتەی بۆ دووبارە کردووە ئەویش دەستبەجێ کردی و موسڵمان بوو بەوشێوەیە گۆڕانکاری خێرا هات بەسەر ئەو گەل و هۆزەدا.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لە هەمووی سەرسامتر ئەوە بوو سەعدی کوری موعاز گەورەی ئەوس بوو، هەموو ئەوسییەکان گوێیان بۆ دەگرت!

چووە ناو گەلەکەی و هاواری کرد: ئەی گەل و هۆزەکەم ئەوا من موسڵمان بووم ئەگەر ئێوە موسڵمان دەبن باشە، هەتاکو ئێوەش هەموو موسڵمان نەبن! ئەگەر نا ئەوا من نە قسەتان لەگەڵ دەکەم نە نان دەخۆم.

نەترسا لەوەی کە ئەگەر بەقسەیان نەکرد ئەوا هەموو دەسەڵات و نفوز و توانایەی لە کیس دەچێت، چوونکە بە هەیبەتی قورئان و بۆ خوا کاری کرد، بۆیە گەلەکەشی دەست بەجێ وەڵامیان دایەوە ئەوانەی لە گەلی ئەوس لە نەوەی (بني عبد الأشهل) بوون هەموو موسڵمان بوون!

لەڕاستیدا قورئان ئەو مووعجیزیە کە دەبێت هەموو کەس تێرامێنێت بۆ بینا کردنی مرۆڤ و گۆڕانکاری لە ناخ و دەروون و ڕۆح دا، ئەوە ئەو بزاڤەیە کە باسی دەکەینەوە قورئان مووعجیزەکەیەتی و داینەمۆی وزەکەیەتی.[٦٦]

نموونەی توفەیلی کوڕی عەمری دەوسی.[٦٧]

بەرەو مەککە کەوتەڕێ بۆ حەج یاخوود عومەرە، لە ڕێگادا خەڵکانێک وتیان: ئاگاداری خۆت بە پیاوێک هەیە لەمەککە جادوو لەخەڵکی دەکات گوی بۆ مەگرە، ئەویش هەردوو گوێی خۆی بە لۆکە خنی. بە دەوری کەعبەدا دەسووڕایەوە، لە پڕ گوێ لەپێغەمبەری خوا بوو

---

[٦٦] هەندێک لەو باس وچیرۆکە دەقەکەی دەگوازمەوە کە چۆن لە سیرەدا هاتووە:
وكان سعد بن معاذ و أسيد بن حضير سيدي قومهما من بني عبد الأشهل، وهما مشركان، فأخذ أسيد بن حضير حربته ثم أقبل إلى مصعب وأسعد وهما جالسان في الحائط، فلما رآه أسعد بن زرارة قال لمصعب: هذا سيِّد قومه، قد جاءک فاصدق الله فيه. قال مصعب: إنْ يجلس أكلمه. قال: فوقف عليهما متشتمًا، فقال: ما جاء بكما إلينا تسفهان ضعفاءنا؟! اعتزلانا إن كانت لكما في أنفسكما حاجة. فقال له مصعب: أوَ تجلس فتسمع؟ فن رضيت أمرًا قبلته، وإن كرهته كفَّ عنك ما تكره. قال: أنصفت. ثم رَكز حربته وجلس إليهما، فكلمه مصعب بالإسلام وقرأ عليه القرآن، فقالا: والله لقد عرفنا في وجهه الإسلام قبل أن يتكلم به في إشراقه وتسهله، ثم قال: ما أحسن هذا الكلام وأجمله! كيف تصنعون إذا أردتم أن تدخلوا في هذا الدين؟ قالا له: تغتسل فتطهر وتطهر ثوبيک، ثم تشهد شهادة الحق ثم تصلي. فقام فاغتسل وطهر ثوبيه وتشهد شهادة الحق، ثم قام فركع ركعتين.

[٦٧] طفيل بن عمر الدوسي





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

صلى الله عليه وعلى آله وسلم قورئانی دەخوێند، ئەمیش سەرسام بوو، پاشان بەخزمەتی سەروەرمان گەیشت ئەویش فەرمووی: هەندێک قورئانت بۆ بخوێنمەوە، توفەیلیش وتی: ئەی برای قووڕەیش بۆچی بانگم دەکەیت؟

پێغەمبەرمان فەرمووی: بۆ ئیسلام، هەندێک قورئانی بۆخوێندەوە دەست بە جێ توفەیل موسڵمان بوو گەڕایەوە ناو گەل و هۆزەکەی هەموو گەلەکەی چەتە بوون زینا کاربوون لە دواییدا خوای گەورە ڕێنمایی کردن بەم قورئانە حەفتا ماڵی (دەوسی) هاتنە ناو ئیسلامەوە یەکێک لەو کەسانە کە هاتە ناو ئیسلام ئەبو هوڕیرە بوو -ڕەزامەندی خوا لە هەموو هاوەڵان بێت-.

ئەو نموونەی قورئانە کە بەو شێوەیە گەل و هۆزەکانی لە سفرەوە گۆڕی بۆ پلەی سەد.

تەنانەت نەیارەکانی ئیسلام و پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم لە ئاستی قورئان دا دەستەوسان بوون.

وەلیدی کوڕی موغیرە کە دوژمنی سەرسەختی ئیسلام بوو بزانن چۆن باسی قورئان دەکات وەک ئەوە وایە کە بانگخوازێکی ئیسلامی بانگەواز بۆ ئیسلام بکات دەڵێت: سووێند بەخوا قسەکانی محمد شیرینە خۆشی تێدایە ڕاستی و درووستی تێدایە و کەس ناتوانێت لێی لابدات، ئەم قورئانە خاوەنی بەرهەموو پێگەیاندانە، ئەوەی دەیەوێت بەسەریدا سەرکەوێت دەیخاتە ژێر، ڕۆژ بە ڕۆژ لەبەرزیداو هەر بەرز دەبێتەوە، ئەوەشی دەکەوێتە ژێری و دوژمنایەتی دەکات دەیشکێنێت. [٦٨]

هەڵبەت قسەکانی وەلید کوڕی موغیرە زۆرە هەرئەوەندە بەسە لێرەدا، کە چۆن پێناسەی قورئان دەکات.

بەهەمان شێوە عوتبەی کوڕی ڕەبیعە دەنێرنە لای بۆ ئەوەی موفاوەزات و سوڵحی و لەگەڵ پێغەمبەردا بکات صلى الله عليه وعلى آله وسلم کۆمەڵێک لە پلەو پایە و سەروەت و سامان دەخەتە بەردەم

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٨] والله إن لقوله الذي يقول حلاوة وإن عليه لطلاوة وإنه لمثمر أعلاه مغدق أسفله وإنه ليعلو وما يعلى، وإنه ليحطم ما تحته




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام سەروەرمان هەر گوێی بۆ دەگرێت، لە دوای ئەوەی کە لە قسەکانی لێبوویەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: گوێ بگرە با هەندێک قورئانت بۆ بخوێنمەوە، لە سەرەتای سوورەتی (فصلت) ی بۆ خوێندەوە تا ئایەتی ١٣.

﴿فَإِنْ أَعْرَضُواْ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ١٣﴾ [فصلت]

(جا ئەگەر لەگەڵ ئەم هەموو باسی دەسەڵات و توانا و زانایی خوای گەورەدا) پشتیان هەڵکردو گوێیان نەگرت، پێیان بڵێ: من ئاگادارتان دەکەم لەوەی کە شریخە و بروسکە و کارەساتێکتان بەسەر بێت، وەک ئەوەی کە بەسەر (عاد و ثەمود) هات.

ئیتر دەستی گرت بە دەمی سەروەرمانەوە ﷺ، تکای لێکرد کە ئیتر با بەسبێت قورئان نەخوێنێتەوە! چوونکە ترسا و بە پەلە گەڕایەوە بۆ لای سەرانی قووڕەیش ڕووخساری تێک چوو بوو، ئەوانەی لە دارونەدوەکەدا بوون وتیان ئەبو وەلید ماندوو دیارە!

دانیشت هەموو لەدەوری کۆبونەوە وتیان چی بووە بۆمان باس بکە.

ئەویش لەوەڵامدا ئەم وتانەی پێوتن: بەو پەڕی ڕاستگۆییەوە بۆیگێرانەوە.

هەروەک ئەوەی کە ئەو بانگەوازچی ئیسلامە بۆ ئەم دینە بانگیان دەکات!

وتی: سوێند بەخوا ئەوەی لە دەمی ئەوم بیستوە تا ئێستا لەکەسم نەبیستوە، سوێند بەخوا محمد نە شاعیرە و نە جادووبازیشە، پاشان نە کاهینە، ئەی گەل و هۆزی قووڕەیش؛ وازی لێبێنن و بیسپێرن بە من، واز لەم پیاوە بێنن ئەوەی کە دەیکات و دەیڵێت با ئازادبێت، سووێند بەخوا ئەو وتانەی کە باسی کرد هەواڵی زۆر گەورەی تێدایە، ئەگەر عەرەب پێی بزانێت و ئەقڵی پێشکێت پێی سەربەرز دەبێت، دە وازی لێبێنن با بانگەواز بکات، سەرکەوتنەکەشی بۆ ئێوەیە سەر دەکەوێت بەسەر عەرەب دا بەڵام خۆ موڵکەکەی هەر بۆ ئێوەیە، ئەگەر هاوکاری بن ئێوە دڵ خۆشترین و بەختەوەرترین کەس دەبن لەگەڵیدا.

زۆر بە بێ ئابڕووانە وتیان بەخوا ئەبو وەلید جادوویشی لە تۆ کردووە!




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لە ڕاستیدا جادوو نەبوو، بەڵکوو خۆشی و شادی قورئانەکە بوو چووە ناو دڵی بەڵام دەسەڵات و سەروەت و سامان و عەشیرەتگەرایی نەیهێشت عوتبەی کوڕی ڕەبیعە موسڵمان بێت، هەروەک مامی پێغەمبەرمان ئەو هەموو هاوکارییەی کرد، کەچی موسڵمان نەبوو.

بەشێک لە وتەکانی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە.[٦٩]

نموونەی ئەبو دەحداح.

ئەم هاوەڵە بەڕێزەی پێغەمبەرمان صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، کەسێکی دەوڵەمەندی شاری مەدینە بوو، گوێی لەو ئایەتە بوو کە سەروەرمان خوێندییەوە دەفەرمووێت:

﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ۚ وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾﴾ [البقرة]

کێ هەیە کە قەرز بدات بە خوا (بە مەرجێک) قەرزێکی چاک بێت (لە ماڵی حەڵاڵ و بێ منەت بێت، بەخشراوەکە نازدار بێت)، خواش چەندەها زۆر بۆی بەرانبەر دەکات (پاداشتی بێ سنووری پێ دەبەخشێت، بەڕاستی خوایەکی بەڕێزو ئازیزمان هەیە، جێگەی سەرسوڕمان و سەرنجە ئەو شێوازەی کە هانی ئیماندارانی پێ دەدات، بۆ بەخشین بەیەکتر و بۆ بەخشین بۆ ڕزگاریی گرۆی ئادەمیزاد)، خوا ڕزق و ڕۆزیی و دەرامەت کەم دەکاتەوە یا دەیبەخشێت (بە حیکمەت و ویستی خۆی) گەڕانەوەشتان بۆلای ئەو زاتەیە.

ئەبو دەحداح دەست بەجێ کە گوێی لەم ئایەتە بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەستم بدەرێ. ئەویش دەستی مووبارەکی خستە ناو دەستی، بە سەروەرمانی فەرموو من باخێکم هەیە (٦٠٠) داری تێدایە ئەوە بەخشیم بە قەرز بە خوای گەورە، پاشان

---

[٦٩] أني سمعتُ قولاً والله ما سمعت مثله قَطُّ، والله ما هو بالشعر ولا بالسحر، ولا بالكهانة. يا معشر قريش، أطيعوني واجعلوها بي، وخلوا بين هذا الرجل وبين ما هو فيه، فاعتزلوه، فوالله ليكونَنَّ لقوله الذي سمعت منه نبأٌ عظيمٌ، فن تصبه العرب فقد كفيتموه بغيركم، وإن يظهر على العرب فملكه ملككم وعزه عزكم، وكنتم أسعد الناس به.
وفي ذهول تام ردوا عليه وقالوا: سحرك والله يا أبا الوليد بلسانه.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەڵساو چووە لای خێزانی لە ناو باخەکەدا بوو بە دایکی دەحداحی فەرموو، وەرە دەرەوە لەو باخە بە خشیومە بە خوا، دەست بەجێ هاتە دەرەوە نەی پرسی بۆ؟ یاخوود بۆ وات کردووە!

قورئان بەو شێوەیە کۆمەڵگای پەروەردە کردبوو کە ئامادەییان هەبوو سەروەت و سامانی خۆیان ببەخشن، بۆیە بەزووترین کات فێربوون گیانی خۆشیان بەم ئیسلامە ببەخشن، قورئان وای فێرکردون مووعجیزەکەی ئەوەیە کە بەزووترین کات بینای مرۆڤ و خێزان و کۆمەڵگا دەکات.

لەڕاستیدا خەڵکی بە گشتی بەو شێوەیە بیر ناکاتەوە ماڵ و سەروەت و سامانی خۆی خۆش دەوێت، کەس نییە ماڵی خۆی خۆش نەوێت، بەڵام قورئانە وادەکات کە خۆشەوویسترین شتی خۆی ببەخشێت لە سەروەت و سامان و لە گیانی خۆشی.

نموونەی ئەبو تەڵحەی ئەنساری کە ئەویش کەسێکی دەوڵەمەندی شاری مەدینە بوو، باخ و زەوییەکی فراوانی هەبوو، لە نزیک مزگەوتی پێغەمبەرمان ﷺ زۆر هەوڵیدا کە لێی بکڕێت، بەڵام نەیدەفرۆشت کاتێک گوێی لەو ئایەتە بوو کە دەفەرمووێت:

﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ۝٩٢﴾ [آل عمران]

ئێوە هەرگیز ناگەنە پلەی چاکی و چاکەکاری هەتا لەو شتانەی کە خۆشتان دەوێن نەبەخشن، هەر شتێکیش ببەخشن خوا ئاگاو زانایە پێی، (لێی ون نابێت و بێ پاداشت نابێت).

ئەبوو تەڵحەی ئەنساری دەست بەجێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی ئەوە من ئەو باخەم بەخشیم بە خوا و خۆشەوویسترین سەروەت بوو لای من تۆ، ئازادی لەوەی چی لێدەکەیت.

ئەم قورئانە بە زووترین کات گۆڕانکاری لە ڕۆح وناخی خەڵکیدا دەکات و وای لێدەکات شۆڕشێک لە ژیان و هەڵسوکەووت و هەموو بونیادیدا بکات.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نموونەی عومەیری کوڕی حومام لە جەنگی بەدردا سەروەرمان ﷺ فەرمووی: هەڵسن بۆ ئەو بەهەشتەی کە پانتای و فراوانییەکەی ئەوەندەی زەوی و ئاسمانەکانە. [٧٠]

عومەیر هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە سەرسوڕمانەوە دوو جار وتی (بەخن، بەخن)! واتە جێگای تێڕامانی بوو فەرمووی ئەوەندەی زەوی و ئاسمانەکانە بەهەشت، سەرەوەرمان ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ترسا لەوەی بڕوا نەکات، دیسانەوە و بۆ بڕوا ناکەیت؟

عومەیر وتی: نەخێر پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵکوو من دەمەوێت لە خەڵکی ئەو بەهەشتە بمو بڕوای تەواوەتیم پێی هەیە!

سەروەری مرۆڤایەتی ﷺ فەرمووی: تۆ لە خەڵکی ئەو بەهەشتەی، چەند دەنکە خورمایەکی لە دەستدا بوو بیری لەوە کردەوە کە ئەو خورمایانە بخوات درەنگ دەکەوێت بۆ بەهەشت، بۆیە خێرا فڕێیدا و دەستی کرد بە جەنگ تا شەهید بوو.

قورئان وای کرد کە گیانی خۆی ببەخشێت بۆ ئیسلام، ئەو دیوارەی لە نێوانی عومەیر و بەهەشتدا هەبوو تەنها مردن بوو، بەمردنی چووە ناو بەهەشت.

ئەوە بزاڤی ڕۆحە کە مرۆڤ بتوانێت لە گەڵ قورئان بژی، کەسایەتی لەسەر قورئان بینا بکات.

نومەیر: ئەی ئافەرین ماکوان خۆت وەڵامی پرسیارەکانت دایەوە، جا ئیتر با سەرنجێکی خێرا بدەین، هەریەک لە ئەبوو جەهل، ئەبوو لەهەب، ئوومەییەی کوڕی خەلەف و سەرانی تری مەککەش کە سەری ڕم بوون لە کوفر و دوژمنایەتی پێغەمبەردا ﷺ، بەرەو کوێ چوون، ئێستا لە کوێدا ناوبانگییان هەیە، ئایا لەگەڵ خاوەنی پەیامەکەدا هەر شایەنی بەراورد کردنیشن؟!

ئەوانە و سەدانی تری وەک ئەوان کە لە کاروانی مێژووی مرۆڤایەتیدا بەربەستی ڕێی هەق و ڕاستی بوون، ناویان چووە چاڵە قوڵەکانی مێژووەوە بۆ هەمیشە نوقم بوون، ئەوانەی

---

[٧٠] (قوموا إلى جنة عرضها السموات والأرض).



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەربەرەکانێی پێغەمبەریان ئەکرد و بووختان و تۆمەتیان بۆ هەڵئەبەست ئێستا کوان خۆیان و شوێنکەوتووەکانیان؟ کوا ناو و هەواڵ و دەنگووباسیان؟ مەگەر جار جار ئەویش بۆ زیاتر ڕووڕەشبوون و ڕیسواییان باسیان لێوە ئەکرێت کە چەندێ خۆیان بەدبەخت کرد و شوێن ئەو نوور و ڕۆشناییە نەکەوتن کە محمد صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆی هێنابوون.

لەملاشەوە ئەوەی تۆمەتباریان ئەکرد و ئەشکەنجە و ئازاریان ئەدا ئێستە زیاتر لە یەک ملیارو چەند سەد ملیۆن شوێنکەوتووی هەیە و ڕۆژانە زیاتر سەدان ملیۆن جار ناوی ئەبرێت و درورد و سڵاوی بۆ ئەنێردرێت، ئەو کەسەی لە کۆڵانەکانی مەککەدا ڕێیان پێ ئەگرت و گاڵتەیان بە خۆی و شوێنکەوتۆوە چەوساوەکانی ئەکرد، ڕەوڕەوەی مرۆڤایەتی بە ئێجگاری گۆڕی، مرۆڤی بۆ هەتا هەتایی لە نەفامی و ستەم و داپڵۆسین ڕزگار کرد، جا سەیری ئەوانە بکەین کە پیشەیان تۆمەت و بووختان بوو بۆ پێغەمبەرە و بەراوردێک بکەین لە نێوانیان، ئەو کات ئاستی ئەو نەگبەتی و چارەڕشییەمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە کە بە دوژمنایەتی پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ تووشی خۆیان هێنابوو.

ئەوانە بوونە پەند و عیبرەتی نەوەکانی دوای خۆشیان، چەند سفرێکیان لای چەپەوە خستۆتە سەر یەک و هیچی تر، پێغەمبەری ئیسلامیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ شوێنکەووتەی زیاتر ئەبێت و لە دڵی خەڵکیدا خۆشەویستر ئەبێت، بەڵکوو لە ماوەی (٢٤) سەعاتی شەو و ڕۆژدا ناوی ئەو (اشهد ان محمدا رسول الله) لە ئاسۆی زەویەوە گوێچکەی ملیۆنەها کەس ئەلەرێنێتەوە.

زۆر بە دڵنیاییەوە دەڵێم: ئەوانەی ئەمڕۆش ڕێ و شوێنی ئەبوو لەهەبیان گرتووە لە دوژمنایەتیکردنی ئەم ئایینە و ئازار و ئەشکەنجەی شونێکەوتووانی با ورد سەرنجی ڕابردوو بدەن و بزانن کە ئاڵای بەرزی ئیمان هەمیشە شەکاوەیە، ئەوانیش لە دنیاو دوارۆژیش دا جگە لە میراتی ئەبوو لەهەب و ئەبوو جەهل هیچی کە بەشیان نابێت.

ماکوان: ڕاستە هەر بۆیە لەدوای ئەو هەموو نارەحەتییە مووعجیزەی مانگی نیشانی قووڕەیشییەکان دا.

نومەیر: با من پرسیاریک بکەم تۆ چی دەڵێیت لەبارەی شەقبوونی مانگەوە؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: ئەمە یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ کە بە ئاماژە کردنی پەنجەی مووبارەکی بۆ مانگ یەکسەر بووە بە دوو کەرتەوە لە مانگی ڕەمەزاندا ڕووی داوە، کە کۆمەڵێک لە مێژونووسان دەڵێن؛ پێنج یان شەشی پێغەمبەرایەتی بووە ﷺ.

لە شاری مەککە داوای موعجیزەیەیان لە پێغەمبەر کرد ﷺ.

جوولەکەکان هاتنە شاری مەککە بیستیان کە بانگەوازێک بڵاوبۆتەوە کە محمد بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات، جوولەکەکان هاتنە لای قووڕەیشییەکان وتیان ئەگەر محمد پێغەمبەر بێت هەموو پێغەمبەرەکان مووعجیزەیان هەیە، داوای شتێکی لێبکەن کە لە توانای مرۆڤدا نەبێت. هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتیان خۆتمان پێ بناسێنە محمد کە تۆ پێغەمبەری ئەبێ وەکو پێغەمبەرانی تر مووعجیزەت هەبێت.

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون چیتان ئەوێ؟ پاشان لە سەرکردەکانی قووڕەیش ئەبوو جەهل و وەلیدی کوڕی موغیرە، عوتبە و زۆرێکی تر و چەندانێکی تر داوای شتێکی تەعجیزی دەکەن کە لەتوانای کەسدا نییە، لەو ڕۆژەدا مانگ پڕە، داوای ئەوە دەکەن کە مانگ بکات بە دوو کەرتەوە ئەوانیش ببینن، ئەم کارە بە هەموو پێوەرێک لە توانای مرۆڤدا نییە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ داوا لە خوای گەورە دەکات و دەپاڕێتەوە و دەڵێت خوایە گیان نائومێدم نەکەی لەبەردەم خزمەکانم و قووڕەیشییەکاندا، خوای گەورە بە جوبرەئیل دا -سەلامی خوای لێبیت- جوابی بۆ دەنێرێت دەفەرمووێت : بە پەنجە ئاماژە بۆ بکە و هەر لە شێوەی پەنجەت دا کە ئیشارەتی بۆ دەکەیت دەبێت بە دوو کەرتەوە هەتا بەو شێوەیەی کە پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە بوو بە دوو کەرتەوە.

خوای گەورە ئایەتی دابەزاند لەسەر لەتبوون و قاش بوونی مانگ (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ) ڕۆژی قیامەت نزیک بۆتەوەو مانگیش لەت بووە (هەندێ گێڕانەوە هەیە کە ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە: خوانەناسان داوای (معجزة)یان لە پێغەمبەر کردبێت ئەویش پەنجەی مووبارەکی ڕووە و مانگ بزواند و بە ویستی خوا لەت بوو).

دوای ڕوودانی کارەکە مانگ دەبێت بە دوو کەرتەوە هەر بەشە لەسەر دوو شاخ لە مەککەدا دەبینرێت، هەموو هاوەڵان دەڵێن ئەو ڕۆژەی ئەو ڕووداوە بووە هیچ هەورێک لە ئاسماندا نەبوو و ڕووداوەکەمان بینی و پاش ماوەیەک مانگ وەک خۆی لێ هاتەوە، دوای ئەوە کە ئەم




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ڕەوشە ڕوویدا بێباوەڕەکانی مەککە دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ سحری کردووە، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةٗ يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ ٢﴾ [القمر]

جا ئەوانە هەر (معجزة) و بەڵگەیەک دەبینن دەڵێن: ئەمە جادوویەکی بەردەوامە (بەهیچ بەڵگەیەک بڕوا ناکەن)

بۆ ئەوەی بێباوەڕانی ئەم سەردەمە و سەردەمی خۆشی بزانین کە سحر نییە چوونکە مێژوونووسەکانی تریش تۆماریان کردووە وەکو مێژووی ئەورووپا، ئینگلتەرا، یۆنان، فرنجە، قوتییەکان، نەسارا و هیندۆسەکان، دوای ئەوەی کە وتیان پێغەمبەر ساحرە و سیحری لە چاوی ئێمە کردووە خەڵک دەنێرن بۆ یەمەن، شام، بەحرەین و ئەو شوێنانەی کە کاروانەکانیانی پێدا دێتەوە و بە خەڵکەکە دەڵێن؛ مانگتان دیوە لەت ببێت ببێتە دوو قاش، ئەوانیش وتویانە بینیومانە دوو کەرت بوو پاشان چووە ناویەک بەیەکەوە لکایەوە.

نومەیر: ماکوان ئەگەر کەسێکی بێدین یاخوود ئەقڵانی بڵێت چۆن ڕاستی ئەم ڕووداوە دەسەلمێنیت چی دەڵێیت؟

ماکوان: پێم وابێت ئاسانە، چوونکە ئەو کەسەی داوای بەڵگە دەکات دەبێت بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە بەو چاوە تەماشا بکرێت کە ڕوویداوە ئەوە مووعجیزەیە، ئایا کەس وتویەتی محمد ﷺ ئەو کارەی نەکردوە؟ بەڵکوو هەموو وتیان محمد جادووی کرد نەیانووت محمد درۆی کردووەو شتی وا ڕووی نەداوە.

نومەیر: ئەی بۆ سەردەمی خۆمان چۆن بیسەلمێنین باشە؟

ماکوان: نموونەیەکم لایە؛ یەکێک لە زانایانی ئیسلام کە ناوی دکتۆر زەغلول نەجارە ڕۆژێک وانەیەکی (موحازەرەیەک)ی دەبێت لە زانکۆی کاردیف لە بەریتانیا، کاتێک کە موحازەرە دەدات لەباسێکیدا باسی لەتبوونی مانگ دەکات، بەڵام نابێتە باسی سەرەکی لە دواییدا یەکێک لە گەنجەکان قسەکەی بەلاوە سەیر دەبێت و دەچێت قورئان دەکاتەوە و سەیر دەکات ڕاستە لە سوورەتی (قمر)دا نووسراوە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەم لاوە ئینگلیزە دەیەوێت لێکۆڵینەوە لەسەر ئیسلام بکات و شیکارییەکی زانستیانە بۆ ئەو باسە بکات خۆشی هیچ پەیوەندییەکی بە دینەوە نییە.

سەیری قورئان دەکات دەڵێت؛ شتێکی نا مەعقولە مانگ بووبێت بە دوو کەرتەوە باوەڕ ناکات کە شتێکی وا ڕوویدابێت بۆیە قورئانەکە دادەخاتەوە و لای دەبات لە دوای چەند مانگێکی پێ دەچێت، قەدەری خوا گەورە وا دەبێت ئەم گەنجە کە لە زانکۆی کاردیفە دانیشتووە بەدیار تەلەفزیۆنەوە بەرنامەیەک دەکرێت لە دیسکەڤەری، ئەو کەناڵەیە کە باس لە گەردوون و کەون دەکات کە لە ئەمریکاوە چوار زانای ئەمریکی لە ناسا بانگێشت کراون باس و خواسێکە لەسەر پرۆژەی ناسا زۆری بوودجەی ئەو دەزگایە، کە هیچ پەیوەندییان بە ئیسلامەوە نییە، ئەم بەرنامەی کە کراوە ڕەخنەیە لە ناسا کە ئەم هەموو پارە زۆرە سەرف دەکرێت ناسا چ ئیسفادەیەکیان کردووە سوودیان بە خەڵکی گەیاندووە، دوو کەس لە زاناکان کە دەکەونە قسە کردن ئەڵێن؛ ئێوە چۆن ئاوا بە ئێمە دەڵێن لە کاتێکدا ئێمە خەریکی لێکۆڵینەوەیەکین لەسەر مانگە لە شێوەی قایشدا بەدەوریدا کە جێگەی وەکو قایشێک کە توندی بکەیت لەسەر سکت جێگایەک بەجێ دەهێڵێت ئاوا شتێک بەسەر مانگەوەیە کە ئەو مانگە لەیەک بۆتەوە و پێکەوە لکێنراوەتەوە، ئێمە ئێستا لە لێکۆڵینەوەی ئەوەداین، ئەم گەنجەش کە دانیشتووە بە دیار بەرنامەکەوە یەکسەر هەڵدەستێت ئەچێ قورئانەکە دەخوێنێتەوە پاشان موسڵمان دەبێت و پەیوەندی دەکات بە د. زغلول نجارەوە کە لەبەریتانیا دەبێت.

ڕووداوەکە لە ساڵی ٢٠٠٣ ڕوویداوە واتە موسڵمان بوونی لاوەکە ئاشکرا کردنی دووکەرت بوونی مانگ لە لایەن ناساوە[٧١].

نومەیر: نموونە کە ڕاستە و جوانە لەدوای ئەوەی ناڕەحەتیان کرد خوای گەورە مەلەکوتی خۆی نیشان دا.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧١] فقد روى الشيخان وغيرهما من حديث ابن مسعود أنه قال: انشق القمر على عهد رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فرقتين: فرقة فوق الجبل، وفرقة دونه, فقال رسول الله "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ اشْهَدُوا"البخاري: كتاب المناقب، باب سؤال المشركين أن يريهم النبي صلى الله عليه وسلم آية فأراهم انشقاق القمر (١٣٣٠)، ومسلم: كتاب صفات المنافقين وأحكامهم، باب انشقاق القمر (٢٨٠٠)
نشرت وكالة الفضاء الأمريكية (ناسا) في موقعها على شبكة الإنترنت صورة للقمر وقد اخترطه خط طويل من أقصاه إلى أقصاه، مؤكدة أنه أثر لانشقاق حصل في القمر قديمًا.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: مەبەستت لە مەلەکوت چییە؟

نومەیر: مەبەستم ئیسراو میعراجە.

ماکوان: بەڕاست ئیسراو میعراج چییە و چۆن باسی بکەین بۆ خەڵکی باشە؟

نومەیر: ئیسراو میعراج لە ڕووی زمانەوانییەوە تاڕادەیەکی باش موسڵمانان دەزانن واتەی چییە، بە کورتی ئیسرا واتە کەسی کە بەشەودا ڕێ بکات. پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شەوە تەشریفی بردە قودس و ناونراوە بە ئیسرا، میعراج واتە بەرز بوونە بۆ ئاسمان هەر هەمان شەو خۆشەوسیتمان ﷺ تەشریفی بردووە بۆ ئاسمانەکان و چۆتە خزمەتی خوای مووتەعال لە سیدرە کە جێگایەکە هیچ کەس نەچۆتە ئەو شوێنە تەنها پێغەمبەرمان ڕۆشتووە ﷺ، بەڵام خوای نەبینیوە، بەڵکوو تەشریفات و ئیمتیازێک بوو لەو جێگایەدا درایە پێغەمبەری خوا ﷺ، لە گەڕانەوەیدا خوای گەورە نوێژی فەرزکرد لەسەر موسڵمانان.

لەو جێگایەدا کە ناوی سیدرەی کۆتایە یان ناسراوە بە (سدرة المنتهى) لە (اثر)دا هاتووە لەوێدا گفتوگۆیەک لەگەڵ خوای مووتەعال دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی لەو جێگایەدا نەمزانی لە خزمەتی پەروەردگاردا چی بڵێم، خوای گەورە خستییە دڵم بڵێم: (التحيات المباركات الصلوات الطيبات لله) واتە سڵاوێک پڕبێت لە پیت و بەرەکەت و باشە کەشایستەی خوای گەورە بێت، خوای مووتەعال وەڵامی خۆشەوویستمانی دایەوە ﷺ فەرمووی: (السلام عليک أيها النبي ورحمة الله وبركاته) سڵاو لە پێغەمبەر بێت ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا بەسەرتەوە بێت ئەی محمد، پاشان فریشتەکان کە گوێیان لەم گفتوگۆیەی خوای مووتەعال و پێغەمبەر ﷺ بوو ئەوانیش فەرموویان (السلام علينا، وعلى عباد الله الصالحين) ئەو سڵاوی پڕپیت و بەرەکەتەش لە ئێمەی فریشتە و چاکاخوازن بێت لە چەکەخوازنی سەر زەوی بە پیاو و ژنەوە، ئیتر لەو کاتەوە سروودی نیشتیمانی و ئایینی و دینداری موسڵمانان بووبە بەم سرووده یەکتاپەرستییە بە یەک دەنگ لە ئاسمان و زەویدا ئەوەی موسڵمانە هاواریان کرد (أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمداً رسول الله) واتە: شاهیدی ئەدەین کە بێجگە لە الله هیچ خواو پەروەردگارێکی تر لەم بوونەدا وجودی نییە، هەروەها شاهیدی ئەدەین کە فرستادەی خوای مووتەعال محمدە نێراویەتی ﷺ.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەرچەندە ئەم گفتوگۆیە زۆرێک لە زانایان دەڵێن سەنەدێکی ڕاستی نییە، بەڵام ماناکەی تاڕادەیەک گونجاوە بۆ هاندان و ترسان (ترغيب و ترهيب).

ماکوان: بۆ ئیسرا و میعراج ڕوویدا لەو کاتەدا، بۆ دوانەخرا بۆکاتی مەدینە؟ یاخوود بۆ لەوکاتە لاوازی و بێهێزییەی موسڵمانان پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئیسرا و میعراجی بۆ کردن، کە لەماوەی پێنج ساڵدا تەنها چوار کەس موسڵمان بوون، ساڵی ماتەمی ڕوویدا بوو ئازارو ئەشکەنجەی پێغەمبەری خوا ﷺ تا دەهات زۆر تر دەبوو، سەرباری ئەم کارەساتانە کە ئەم هەواڵە بڵاو بوویەوە هەندێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە ئیسلام پاشگەز بوونەوە! کاریگەری کافرانی قووڕەیشیان لەسەر دانرا.

نومەیر: ئەوەی دەمەوێت باسی بکەم ئەوەیە کە هەندێک لە موسڵمان وا پەی دەبن یاخوود وا خۆیان دەخڵەتێنن کە گوایە پێغەمبەر ﷺ بە جەستەی نەچووە، بەڵکوو بە ڕۆحی تەشریفی بردووە، ئێمەی ئەهلی سوونەت و جەماعە پێمان وایە کە بە دڵنیاییەوە بە لاشەو جەستەی سەراپا تەشریفی بردووە بەرەو ئاسمان و بۆ قودسیش هەروەها.

ئەگەر وانەبێت مووعجیزەکە ئەوەندە گەورە نییە وەک کەدەڵێن مووعجیزە دەبێت هەموو مرۆڤ و کەون وتەنانەت کائیناتی خوای مووتەعال لەبەردەم ئەو مووعجیزەیەدا دەستەوسان بن، واتە هەموو مرۆڤایەتی لە کردنیدا عاجز بن . کەواتە لێرەدا ماوەتەوە کە بڵێین هەندێکیش لە بێباوەڕان دەڵێن: باشە ئەگەر محمد چووە بۆ ئاسمان بەڵگەیەکی ئەقڵیمان بدەنێ کە ئەم پێغەمبەرەی ئێوە چووەتە مەلەکوتی خوایەک بەڵگەی ئەوانیش ئەوەیە دەڵێن: ئەگەر کەسێک بێدین بوو خۆ دەبێت سەرنجی ڕاکێشن بۆ شتێک کە ئەقڵ لای مەعقول بێت، لە مەعقولیزمی ئەم سەردەمەدا جێگای بێتەوە بێجگە فەرموودەکەی حەزرەتی محمد کە لەو سەردەمی قووڕەیشەدا وەسف و پێناسەی کاروانێک و مزگەوتی قودسی کردووە ئەشێت بێباوەڕان بڵێن: بۆ محمد درووست کراوە ئەو وای نەفەرمووە.

وەک نووسەر منیش گرنگی و هۆکارەکانی ئیسرا و میعراج لە چەند خاڵێکدا بۆ موسڵمان و کافر دەخەمە ڕوو.

- یەکەم: لای هەمووان ئاشکرایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ چەندە نارەحەتی هات بەسەردا بە هۆکاری ئەم بانگەوازی ئیسلامە. لەوانە هەردوو کچە بەڕێزەکەی تەڵاق دران،




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پیسایی و ناوسکی وشتر کرا بەسەریدا، جنێو و قسەی ناشرینی پێوترا، بە شێت و جادووباز و شاعیر ناوزەدیانکرد، هاوەڵە بەڕێزەکانی بە بەرچاوییەوە ئازار و ئەشکەنجە وە تەنانەت شەهیدیان دەکردن، سەروەت و سامانی موسڵمانان بەهەدەر دەبرا، کۆیلە دەکران...هتد، ئەنجامی ئەم هەمووبارە ناهەموارە کە هات بەسەر پێغەمبەردا ﷺ خوای پەروەردگار ویستی وابوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاشنا بکات بە مەلەکوتی خۆی کە بێباوەڕان چەندە بچوکن، بانگەوازی ئیسلام چەندە گەورەیە.

- دووەم: لەماوەی چەند ساڵێکدا تەنها چوار بۆ پێنج کەس موسڵمان بوون دووانیان وەفاتیان کرد، لەو هاوەڵە بەڕێزانە و دووانیان مانەوە کە ناسراون بە عەداس - ڕەزامەندی خوای لێبێت- کە بنەچە نەسرانی بوو لە نینەواوە بە کۆیلە کرابوو لە تائیف دەژیا، دووەمیان هاوەڵێکی بوو لە دەوسەوە هات و موسڵمان بوو بەناوی توفەیل-ی کوڕی عەمری دەوسی -ڕەزامەندی خوای لێبێت- کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی بردە ئەو شارە لە شەقامەکانی ئەو شارە بەڕیز ئەمبەراوبەر کۆیلە و منداڵیان ڕیز کردبوو کە بەردیان دەکێشا بە پێغەمبەر ﷺ و زەیدی هاوەڵیدا، ئەوسەردەمە بە تەبەنی کردبووی بە کوڕی خۆی، تەنانەت ئەوەندە ئازاریاندا تا قاچی مووبارەکی پڕ خوێن بوو بە پەلە خۆی گەیاندە ڕەزو باخێک تەنانەت کافرەکانیش بەزەییان بە خۆشەوسیتماندا دەهاتەوە، هۆکاری چوونی بۆ ئیسرا و میعراج بۆ ئەوە بوو کە خوای گەورە دیسانەوە نیشانی محمد ﷺ بدات و پێیڕابگەیەنێت دڵگران مەبە خەفەت مەخۆ، چوونکە خوای تۆ ئەو خوایەیە کە ئەتباتە (سدرة المنتهى) کە نە دوای تۆ نە پێش تۆش محمد ﷺ کەس نەگەیشتۆتە ئەو جێگایە دیسانە و دڵنەوایی پێغەمبەر ﷺ بوو.

- سێیەم: دوو سەنەدی گەورەی پێغەمبەر ﷺ کە بریتی بوون لەمامی ئەبوو تاڵیب کە سەندێکی هێز و مەعنەوی بوو لە مەککەدا و پاشان سەنەدێکی مادی و سۆز ومیهرەبانی (عاطفی) بوو لە لایەن خاتوو خەدیجەی دایکی ئیمانداران -ڕەزامەندی خوای لێبێت- هەردووکیان لەماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا وەفاتیان کرد کە ماڵ و لایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ چۆڵ کرد، خوای پەروەردگار ویستی وابوو بە ئیسرا و میعراج ئەوە بگەیەنێتە پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئیسلام خوای گەورە سەری دەخات نەک پارەی مرۆڤ و هێزو تواناو عەشیرەت، بۆ ئەوەی خەڵکی ئوومەتەکەی بزانێت کە سەنەدی (پشتیوان) گەورە تەنها خوایە نەک سەنەدی ماددی ئەم وڵات و یاخوود هێز و توانای چەک و



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

عەشیرەت و هەروەها. کەواتە ئیسرا و میعراج نەهێشتنی ئەو بارە دەروونییەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە خوای مووتەعال فێری کرد. خوای گەورە محمدی پەروەردە کردووە بە هەتیوی (أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَى) کەواتە مەبەستەکە ئەوەیە دینی خوای گەورە سەر دەکەوێت، چوونکە خوایەک کە توانای هەبێت ئیسرا و میعراج بە پێغەمبەرەکەی بکات خەڵکی و پێغەمبەرەکەشی دڵنیا دەکاتەوە کە سەردەکەون.

- چوارەم: بۆ موسڵمانە بە گشتی کە نیەتی موسڵمانی پێ تاقی کرایەوە ئەوانەی ئیمانیان وەک ئەبوو بەکر -ڕەزامەندی خوای لێبێت- بوو یەکسەر پێغەمبەریان بە ڕاستگۆ زانی، ئەمەش لوتکەی بەندایەتییە لای خوای مووتەعال کە مرۆڤ لەبەردەم پەروەردگاریدا گەردن کەچ بێت، زۆر پرسیار و جیدال و مووناقەشە (دەمەقاڵێ) لە سەر ئەحکام و دەقەکانی دین نەکات، ئەوەی کە ئەقڵی نەیبڕی تەئویل و تەفسیری ئەقڵانی بۆ بکات، بەڵکوو ئەم ئیسرا و میعراجە وانەیەکە بۆ ئێستامان کە پێمان دەڵێت خوایەک خاوەنی ئەم بوونەیە بە هەموو درووستکراوەکانییەوە تۆ بڵێیت نەتوانێت بەندەیەکی خۆی بباتە ئەو جێگایەی کە خۆی ئەیەوێت، پێویست بە گۆڕینی سیستەمی ئاو و هەوا و ئەم کەونە نەکات، چوونکە نە کات لای خوا ئەرزش (نرخ و بەها)ی هەیە، نە زەمەن و نە سیستەمیش، سیفاتی پیرۆزی خوای موتەعال (الباسط، القابض، المعيد، الحفيظ، المهمين، المحيط). کەواتە خوای پەروەردگار خۆی خالقیەتی هەر خۆشی توانامەندە بەسەر درووستکراوەکانییەوە فیزیا و تیۆری ڕێژەیی ئەرزشی نییە لە کەونی خوادا بوونی نییە، ئیسرا و میعراج بۆ ئەوەیە کە بەندایەتی بە ڕاستگۆیانە بکرێت، زۆر جار شتگەلێک هەن کە حیکمەتی مرۆڤ و ژیرو توانایی مرۆڤ لەبەردەمیدا ئەوەستێت، لەگەڵ ئەوەشدا خوایەک کە سیفاتی (القادر) بێت تۆ بڵێی توانای ئەوەی نەبێت کە پێغەمبەرەکەی خۆی بباتە ئەو جێگایەی کە دەیەوێت بە جەستەوە؟ بەهەمان سیستەمی هەناسەدان و ژیانەی کە لەسەر زەوی پێی دەژی، هەمووی هەر خوا درووستی کردووە.

- پێنجەم: کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە لە ئیسرا و میعراج باسی شتێکی کرد کە تا سەدەی بیست هیچ کەس پەی پێ نەبردبوو، ئەویش ئەوە بوو فەرمووی هەندێک ڕەنگم لە ئاسمان دا بینیوە لەو کاتەی کە تەشریفی بردووە بەرەو میعراج، ئەویش کە ئەو ڕەنگانە لەسەر زەویدا بوونیان نییە، پاشان لە ساڵی (١٩٦٠) بۆیەکەم جار تلیسکۆبێک درووستکرا کە بە ملیۆن جار بە ئاوێزە گەورەی دەکردە وە بینییان هەندێک ڕەنگ لە ئاسماندا هەیە کە بوونیان لەسەر زەویدا نییە، ئەوەش لە ڕێگای عەبدولمەجید زەندانییەوە خوای گەورە



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

تەمەن درێژی بکات و شیفای بدات ئەو دەمە سەرۆکی زانکۆی نوور بوو ئەم باس و خواستە کرایەوە ئەوەیش دەقی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ[٧٢]

ئەوەش بۆ ئەوانەی کە ئەقڵیان لە چاویاندایە، ئیمان لە دڵ و دەروونیاندا نییە! ئیتر نازانم چۆن ئیمان فوارە ناکات لە ناخیانەوە؟ دەست بەجێ بە بیستنی ئەم فەرموودەیە سەری خۆیان بۆ خوا نەوی ناکەن سووجدەی یەکتاپەرستی بۆ خوا نابەن!؟

---

[٧٢] (ثُمَّ انْطَلَقَ بِي حَتَّى انْتَهَى بِي إِلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى، وَغَشِيَهَا أَلْوَانٌ لاَ أَدْرِي مَا هِيَ، ثُمَّ أُدْخِلْتُ الْجَنَّةَ، فَإِذَا فِيهَا حَبَايِلُ اللُّؤْلُؤِ، وَإِذَا تُرَابُهَا الْمِسْكُ) ئەم فەرموودەیە بوخاری و موسلم ڕیوایەتیان کردووە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## گوتاری سیاسی پێغەمبەر و گەڕان بەدوای مەئوادا

لەگەڵ نومەیردا بەردەوام بووین لە گفتوگۆکانمان و شیتەڵکردن و شیکاری، بۆ ڕەوشی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ، لەپرس و گۆڕینەوەی دید و تێڕوانینی ئەوەدا بووین چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ بیری لەوەکردەوە تەشریف بەرێت بۆ شاری مەدینە، پێش وەخت لەگەڵ نومەیردا باسی ئەوەمان کردبوو کە نەگەڕانەوەی موسڵمانان لە حەبەشە و هۆکاری چوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ تائیف، بەرد بارانکردنی لەلایەن بنەماڵەی عەبدول یالەیل-ەوە و کەماوەی سێ ڕۆژ مایەوە لە تائیف، بەڵام بەداخەوە بە ناشرینترین شێوە ڕووبەڕوی پێغەمبەری خوا ﷺ بوونەوە ، ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە پێغەمبەری خوا زیاتر بیر لە مەئوا و گوتاری سیاسی ئیسلامی بکاتەوە بۆ ئەوەی خەڵکەکەی و بانگەوازەکەی بپارێزێت ناچار بیری لەوە کردەوە کە هیجرەت بکات.

نومەیر: کە نەجاشی گێڕانەوەی موسڵمانە مووهاجیرەکانی لای خۆی بۆ مەککە ڕەت کردەوە، سەرانی قووڕەیش هەموو کۆبوونەوە و پەیماننامەیەکی گرنگیان لە نێو خۆیاندا مۆر کرد کە دەڵێت: نابێت کەس هیچ جۆرە مامەڵەیەک لەگەڵ بەنی هاشم، بەنی عبدولموتتەڵیب و بەنی عەبدومەناف دا بکات، نابێت کەس هیچیان پێ بفرۆشێت و هیچیان لێ بکڕێت، نابێت ژن و ژنخوازییان لەگەڵدا بکرێت، نابێت کەس هاتوچۆیان بکات، تا محمد تەسلیم بە قووڕەیش دەکەن.

ئینجا بۆ پیرۆز ڕاگرتن و زیاتر بایەخ پێدانی پەیماننامەکە، تابلۆکەییان برد و لەناو کەعبەدا هەڵیان واسی ئیتر هەموو ئەندامانی ئەو سێ بەرەبابە جگە لە ئەبوو لەهەبی مامی هەرچەندە هەمووشیان موسڵمان نەببوون، هەموو کە پێغەمبەریشیان ﷺ لەگەڵدا بوو چوونە دۆڵەکانی ئەبوو تاڵیبی مامییەوە لەوێدا ماوەی سێ دانە ساڵی ڕەبەق گەمارۆ دران! لە کۆتایی سێ ساڵەکەدا موسڵمانان زۆریان تین بۆ هات زۆر داماوو برسی و ڕووت و ڕەجاڵ کەوتبوون، تەنانەت ئەو کەسەی بە نزیک دۆڵەکەدا بڕۆیشتایە لە دوورەوە گوێی لە گریان و کڕوزانەوە و لاڵانەوەی زارۆک و ژنەکانیان دەبوو کە لە برساندا دەیاننالاند!





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: لەم زەمەنی ئێستاشماندا هەمان گەمارۆ و کار دژی ئوممەتی محمد ﷺ دووباره دەکرێتەوە، ببووره قسەکەتم پێبڕیت بەردەوام بە!

نومەیر: ئاساییە؛ ئەم حاڵەتە سەختە هەر وا بەردەوام مایەوە تا ئەو کاتەی کە دەستەیەک لە سەرانی قووڕەیش و هاوپەیمانانیان کە هەر لە سەرەتاوە گەمارۆدانەکەیان بە دڵ نەبوو، لەوانە زوهەیری کوڕی ئەبوو ئوممەییە، ئەبوو بەختەری کوڕی هیشام و موتعەمی کوڕی عەدی بڕیاریاندا بڕۆنە ناو کەعبە تابلۆکە لێ بکەنەوە، کە چوون دیتیان (مۆرانە) هەموو تابلۆکەی خواردووە تەنها ئەو دێڕەی پێوە ماوە کە دەڵێ: (بِاسْمِك اللهُمَّ ) واتە: خوایە بە ناوی تۆوە! بەم کارە جوامێرییەی ئەوان گەمارۆکە لەسەر ئەو سێ بەرەبابە و لەسەر موسڵمانان هەڵگیرا!

ماکوان: ئەی مەگەر خاتوو جەدیجە و ئەبوو تاڵیبی مامی هەر لەوێدا وەفاتیان نەکرد؟

نومەیر: دوای نەمان و لابردنی گەمارۆکە بە شەش مانگ ئەبوو تاڵیبی مامی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، سێ ڕۆژ دوای ئەویش خاتوو خەدیجەی خێزانی ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ کۆچی دوایی کرد. بە مردنی ئەم دوو پاڵپشتە ناسۆر و کوێرەوەری زۆر هاتە ڕێی موسڵمانان، ئەو هەموو ئازار و ژانەی دەمێک بوو قووڕەیش لە دڵیدا پەنگی پێ خواردبۆوە و لەبەر ئەبوو تاڵیب نەیدەتوانی بیخاتە سەر پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان، بە مردنی ئەبوو تاڵیب بوواری بۆ کرایەوە و وەک ئاگرپژێن بەسەر موسڵماناندا بە تایبەتی بەسەر لاوازەکانیاندا تەقییەوە پێغەمبەر ﷺ خۆی دەیفەرموو کە قووڕەیش تا ئەبوو تاڵیبی مامی لە ژیاندا مابوو نەیتوانی ئازاری پێ بگەیێنێت، کۆچی دوایی ئەم دوو پایە و پاڵپشتە سێ ساڵ پێش هیجرەت بوو.

ماکوان: ئەی هەڵوێستی قووڕەیش لە سەر پێغەمبەر ﷺ چی بوو؟

نومەیر : دوای ئەوەی قووڕەیش هەوڵێکی زۆری دا کۆڵی لە بانگەوازەکەی پێ بدات بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەشی زۆر پەناو پێچی هەمەجۆری بەرەنگاری گرتە بەر، سەرانی کاریگەری لە کەعبە کۆبوونەوە و وەفدێکیان نارد بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ قەناعەتپێکردنی کە واز لە بانگەوازەکەی بهێنێت، بەڵام محمد ﷺ هەر ڕەتی کردەوە، وەفدێکی تریان ناردەوە خزمەتی تا ئەمجارە بە پارە ڕازی کەن یان بە پلەوپایەیەک یان




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەگەر دەزانێت نەخۆشە با چارەسەری بکەن! بەڵام ئەو صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەر لای بەلای ئەمانەدا نەکردەوە، ئینجا کەوتنە تانەو تەشەر لێدانی ئاشکرای و جنێو پێدانی ڕاستەوخۆی نێو خەڵکی، ئینجا گاڵتە کردن بەو وەحییەی کە بۆی دێت، بەڵام ئەو صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەر گوێی نەدانێ و سوور بوو لەسەر بانگەوازی خۆی، ژن و پیاویان کەوتنە پەلاماردان و ئازاردانی جەستەیی، ئوم جەمیلی هاوسەری ئەبوو لەهەب بە کۆڵ دڕکەزی دەهێنا و دەیخستە سەر ڕێی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم، ئەبوو لەهەبی مێردیشی جارێک بە تاوێرە بەرد هەوڵی کوشتنی دا بەڵام سەری نەگرت و خوای گەورە پاراستی، جارێک لە کەعبە بوو لە ساتی سووجدە دا گەلۆرە ڕقنەکانی قوڕەیش چوون ڕیخۆڵە و پیسایی وشترێکی سەربڕاویان هێنا و خستبانە سەر شان و ملی پیرۆزی، بێ ئەوەی کەس هەبێت بوێرێت لەسەری لادا. جارێکی تریش یەکێک لە سەرە ڕقنەکانی قوڕەیش پەلاماری داو عەباکەی وا لە قوڕگی پیرۆزیدا توند کرد کە خەریک بوو بخنکێت. دەیان جۆر ئازاری جەستەیی تری ئاوا تەنانەت جاری وا هەبوو ئەو ئازار و ناڕەحەتییانەی بۆی دەهاتە پێش هەر لە دراوسێ نزیکەکانی خۆیەوە بوون، بەڵام محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم کە هەر ئارام و نەفەس درێژ بوو دڕک وداڵ و پیساییەکەی سەر ڕێی لادەبرد و لەوە زیاتری نەدەفەرموو: ئەرێ ئەی تیرەی بەنوو عەبدومەناف ئەمە کەی دراوسێیەتییە؟!

ماکوان: ئەی چوونی بۆ تائیف چۆن بوو؟

نومەیر: دوای ئەوەی ئەوەی ئەو نووسینە و گرێبەندەکەیان بۆ ئابلۆوقە خستنە سەر بەنی هاشم و بەنی موتتەلیب هەڵواسرا بوو هەڵوەشاندەوە ، خەدیجە -ڕەزامەندی خوای لێبێت- کۆچی دوایی کرد و ئەبوو تالیبیش کۆچی دوایی کرد کە نێوانیان سێ ڕۆژ بوو، خەم و ناخۆشی و بەڵا لەسەر پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم زیادی کرد ئازاردان تەشەنەی کرد لەلایەن کەسە هیچ و خراپەکانی قەومەکەی، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ڕۆشت بۆ تائیف بۆ ئەوەی لە خۆی بگرن و سەری بخەن لەبەرامبەر قەومەکەی، بانگەوازی خەڵکی تائیفی کرد بۆ ئەوەی ئیمان بێنن، بەڵام وەڵامیان نەدایەوە و ئیمانیان نەهێنا و وەڵامی هیچ داواکارییەکی پێغەمبەری خوایان نەداوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم زۆر ئازاریان دا، خەڵکی تائیف بە مناڵ و گەورە و کۆیلە و ژن و پیاو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم یان بەرد باران کرد.

تەنانەت لە سەری تا پێی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەر هەمووی بە خوێن بوو، ئەوەندەی خەڵکی تائیف پێغەمبەری خوایان ئازاردا خەڵکی مەککە ئەوەندە ئازاریان نەدابوو،




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بۆیەش گەڕایەوە بۆ مەککە هاتە پاڵ موتعەم کوڕی عدی کە هەڵوێستی زۆر جوانی هەبوو دەستێکی باڵای هەبوو لە هەڵوەشاندنەوەی ئابلۆقەی سەر بەنی هاشم و بەنی موتتەڵیب، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازی خەڵکی ئەکرد بۆ ئەوەی ئیمان بێنن توفەیل کوڕی عەمر دەوسی مسوڵمان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دووعای بۆ کرد خوای گەورە بیکات بە نیشانەیەک لە نیشانەکانی خۆی ئەوەش بوو دەم و چاوی توفەیل زۆر ڕووناک بوو و نووری خستە دەم و چاوی بۆیەش پێی ئەڵێن خاوەن ڕووناکی، ئەویش بانگەوازی کرد لە نێو قەومەکەی هەندێکیان موسڵمان بوون و دوایی لە نێو قەومەکەی نیشتەجێ بوو ئەوکاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی خەیبەری کرد، هاتن بۆ ئەوێ قەومەکەی نزیکەی هەشتا ماڵ ئەبوون.

ماکوان: ئەی پەیمانی عەقەبە چی بوو؟ ڕاستە دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ئەوەی بڕوات بۆ مەدینە بڕوات بۆ عێراق، گوتاری سیاسی و ئەوکاتەی چی بوو بۆ خەڵکی و بۆچی دەیویست مەئوا (پەناگە) پەیدا بکات بۆ دەوڵەت بوون یاخوود بۆ پاراستن، ئایا ئەمانە هۆکار بوون. چی لە پشتی بیرکردنەوە لە کۆچ بوو؟

نومەیر: بەدڵنیاییەوە بۆ دروستکردنی دەوڵەت بوو، ئەوەتا کاتێک کە لە ساڵی حەجدا لەگەڵ ئەبوو بەکری هاوڕێیدا دەگەڕێن بەسەر گەل وهۆزەکاندا کە هاتوون بۆ حەج ، لەناو ئەو تیرە و هۆزانە گەلی بەنی شەیبان لەعێراقەوە هاتبوون ئەدۆزنەوە بۆ قسەکردن لەگەڵیاندا و پێغەمبەری خوا ﷺ داوایان لێدەکات کە پاڵپشتی بکەن لە جەنگی عەرەب و عەجەم.

ماکوان: ئەی وەڵامی ئەوان چی بوو؟

نومەیر: ڕازی نەبوون، چوونکە دەیانزانی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازەکەی تەوحیدە، ئەمەش دەبێتە هۆکاری ئازادی خەڵکی!

بۆیە کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی تەشریف بەرێت بۆ عێراق بۆ ناو بەنی شەیبان یەکەم گوتاری سیاسی پێغەمبەر خۆی ئاشکرا کرد بۆ سەرانی ئەوان بریتی بوو لە ئازادی



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

مرۆڤەکان، موسەننای کوڕی حارسی شەیبانی[٧٣] خوێندنەوەی بۆ گوتاری سیاسی پێغەمبەر بریتی بوو لەوەی وەڵامی داوە:

(ئەمەی کە تۆ هێناوتە ئەی محمد هەرچی مەلیکەکانە ڕقیان لێیە، بە هۆکاری ئەوەی هەڵگرانی ئەم ئایینە تەنها سەر بۆ یەک خوا نەوی کەن سەر بۆ کەسی تر نەوەی ناکەن).

گوتار سیاسییەکەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوە بوو لەمەودوا مرۆڤەکان ئازادن بەندایەتی بۆ مرۆڤەکان ناکەن و دەبنە بەندەی خوای مووتەعال.[٧٤]

قسەکەی پێغەمبەریان بەدڵە، بەڵام دەڵێن ئێمە دەتپارێزین لە عەرەب، بەس ناتوانین بتپارێزین لە فارس و پاشاکەی کە کیسرایە، چوونکە ئەمان کەمینە بوون لە ژێر سایەی دەوڵەتی فارس دا بوون نەیاندەتوانی هیچ کارێک بکەن، چوونکە ئەوان زۆرینە بوون، بۆیە موسەننا و قەعقاع بە ئاشکرا وتیان ئێمە لە دەست عەرەب ئەتوانین بتپارێزین بەڵام لە عەجەم ناتوانین و توانای کیسرامان نییە.

ماکوان: ئەی دوای دانووستانەکەیان گەیشتە کوێ؟

نومەیر: هیچ؛ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی سووپاستان دەکەم کە ڕاستگۆ بوون ، بەڵام ئەم بەوە ساز دەبێتەوە کە تۆ بتوانی هەرچی هەیە وەکوو خۆی بیخەیتە پێش چاوی خەڵک، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێت: (هیچ کەسێک ناتوانێ دینی خوا سەر بخات مەگەر لەهەموو لایەکەوە نەبێ، هەموو چەمک و تێزەکان وەک خۆی پیادە نەکات).[٧٥]

ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا لەگەڵیانداو پێی فەرموون: ڕۆژێک دێت کە ئێوە عەرشی کیسرا دەڕوخێنن بە پێکەنینەوە، ئەوانیش وتیان ئەوکاتە هات هەموو لەگەڵت

---

[٧٣] مثنى بن حارثه شيباني

[٧٤] (وإني أرى أن هذا الأمر مما تكرهه الملوك. أي أن هذا الإسلام الذي يعبد الناس جميعًا لإله واحد، وينزع الحاكمية من أيدي الملوك ويعطيها لله الواحد الأحد، هذا أمر تكرهه الملوك، إلا من رحم اللهُ. وصدق).

[٧٥] فَإِنَّ دِينَ اللَّهِ لَنْ يَنْصُرَهُ إِلاَّ مَنْ حَاطَهُ مِنْ جَمِيعِ جَوَانِبِهِ.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەبین ئەمەش مووعجیزەیەکی ترە، هەر ئەم سەرکردە سیاسی و سەربازیانە بوون دەوڵەتی فارسیان ڕووخاند!

ماکوان: کەواتە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت لێرەدا کەسێکی موسڵمان ناتوانێ بڵێ من ئەمەوێ تەنها ئایینی ئیسلامی پیرۆز بە قەڵەم، نووسین، گۆڤار و ڕۆژنامە سەربخەم، یاخوود کەسێکی تر نایەت بڵێ من بە جیهاد و کلاشنکۆف و شۆڕش سەری بخەم، کەسێکی تر بڵێ تەنها بە ئیصلاح و چاکسازی قسە کردن لەناو خەڵک و تێکەڵ بوون لەگەڵ جەماوەر وە هەروەها؟

ئەمانە هەر هەمووی جوانن و پێکەوە ئەگونجێ کە ببێتە ڕێکخستنێکی تەواو، هەتا بتوانرێ گوتاری سیاسی پێ بەکاربهێنرێ یاخوود لەسەر ئەم بنەمایە گوتاری سیاسی درووست بکرێت، بەڵام پرسیار ئەوەیە کە ئەوان سەرەتا باسەکەی پێغەمبەریان پێ باش بوو بۆ قبوڵیان نەکرد، یان پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ قبوڵی نەکرد لەدەست قوورەیش ڕزگاری بێت؟

نومەیر: ڕاستە؛ بۆم باس کردیت پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک تەشریف دەبات بۆ ناو تیرە و هۆزەکانی عێراق لەگەڵ موسەننای کوڕی حارس دەکەونە گفتوگۆ، موسەننای کوڕی حارس دەڵێت:

ئێمە لەگەڵ کیسرا پەیوەندیەکمان هەیە کەنابێ لەژێر سیاسەت و سیستەم و ڕژێمەکەی بچێتە دەرەوە، ناشبێ هیچ کەس لە سیستەم و ڕژێمەکەی کیسرا عەهد و پەیمان بشکێنێ.[٧٦]

لێرەدا محدثات بیدعەی داهێنراوە کە ئەم سیستەم و ڕژێم و فەرمانڕەوایە دێت بەومانایەی کە ئێستا هەیە و گرنگە هەموو لایەکمان هەست بەوە بکەین کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێت: هەرشتێ هەر سیستەم و دەسەڵاتێک مەبەست پێی تەنها لە مەولودی پیغەمبەر ﷺ کۆنابێتەوە، تەنها لە شتێک وەکوو سەڵاواتدان کە بڵێین ئەمە محدثات و بدعەیە، بدعە و محدثات ئەم گوتاری سیاسیە کەهەر کەسێک لە دەسەڵات و سیستەمێکی تردا بیەوێ ئەو سیستەم و دەسەڵاتە بهێڵێتەوە ، ئەمە گوتاری ئیسلامی نییە بەڵکوو بەمە پێغەمبەر ﷺ دەری دەکاتە دەرەوە ( فهو رد).[٧٧]

---

[٧٦] ( انا قد عاهدنا کسری علی ان لانحدث حدثا ولا نؤوي محدثا)

[٧٧](من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد.رواه البخاري و مسلم



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: کەواتە گوتاری سیاسی ئیسلامی بریتییە لە ئازادکردنی مرۆڤەکان ئەگەرچی دیندار یاخوود بێ دین بن لەناو چوارچێوەی ئەم ئیسلامە کۆببێتەوە، ئازادی بۆ فەراهەم دێنێت جگە لەوەی سەر بە هەر ڕێکخراو و لایەنێک بێت کە لە خیتابی سیاسییەکە کۆبێتەوە ئازاد دەبێ.

ڕژێمی موسڵمان (توحید)ە، سیستەمی دەسەڵاتی ئیسلامییە، گۆڕینی هاتنەوە کایەی ئیسلام لە ڕووی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری و...هتد، لەهەموو ڕەهەندەکانی ژیانەوە ئەمە پێی دەوترێ گوتاری سیاسی و بەکورتی پێک هات لە ئوسوڵی سێ شت ( قورئان، سوونەت، خولەفای ڕاشدین).

نومەیر: تاڕادەیەک وایە؛ گوتاری سیاسی ئیسلامی چییە؟

بریتییە لە ئازادکردنی مرۆڤ لەو هەموو کۆت و پێوەندانەی کەبۆی دائەنرێت لە هەموو ڕەهەندەکانی ژیان، واتە لە ڕووی ئابوری، ڕامیاری، فیکری لە هەموو فەرهەنگەکانی دیکەی ژیاندا، مرۆڤ تیایدا ئازاد بێ وە واز لە بەندایەتی هەمووشتێک بهێنێ تا کەسێکی یەکتاپەرستی لێدەربچێت، ئەمەش پڕۆژەی گوتاری سیاسی ئیسلامییە کە دەکەوێتە بەردەم خەڵکی.

ئەم شەڕەی کە لە ئەم ئیسلامە هاتووەتە خوارێ، گوتاری سیاسییەکەی بەرامبەر هەموو پاشاو دەسەڵاتدارەکانە کە ئەیانەوێ خەڵکێک پێ بگەیەنن و عیبادەتی ئەوان نەکەن، بۆیە عومەر کوڕی خەتتاب -خوا لێی ڕازی بێت- لەباسی گوتاری سیاسی دەسەڵاتی خیلافەتی خۆیدا ئەیەوێ بیگەیەنێ بە عەمری کوڕی عاس لە میسر کە گوتاری سیاسی لەدەوڵەتی ئیسلامیدا ئەوەیە دەڵێ (منذ متى استبعدتم الناس وقد ولدتهم امهاتهم احرارا؟) واتە: لەچ کاتێکەوە (کەی) ئێوە خەڵکانێک دەکەن بە کۆیلە و بەندەی خۆتان، لەکاتێکدا کە لە دایکیانەوە بە ئازادی لە دایک دەبن؟

سەیری ئەم گوتارە سیاسییە جوانانە بکەن کە ئیسلام بەکاریان دەهێنێ بەرامبەر هەموو جیهان، لە سەدەی ڕابردوودا لە دەستووری ئەمریکادا نووسراوە مرۆڤ بەئازادی لەدایک بووە.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لێرەدا وتەیەکی ربیعە کوڕی عامر کە چوو لەگەڵ ڕۆستەم دا کەوتنە قسەکردن وتیان دەزانین کە دەوڵەتی ئیسلامیان هەیە، بەڵام گوتاری سیاسی ئیسلام چییە؟[78]

بەم شێوە باسی گوتاری سیاسی دەکات دەفەرمووێت: خوای گەورە ناردووینی بۆ ئەوەی خەڵکی لە کۆیلایەتی خەڵکی ترەوە (دەسەڵاتداران) دەربهێنین بۆ بەندایەتی خوای مووتەعال لە زەبر و زەنگی ئایینەکانی دەستکردی مرۆڤ بۆ دادپەروەری ئیسلام، لە بچوکی ئەم دنیا بەوە دیدفروانی و بەرەو ژیانێکی خۆشی ئەم دنیاو پاشان ڕۆژی دوایی.

ڕۆستەم یەکێکە لەو کەسانەی کە سیستەم و دەسەڵاتێکی کیسرای درووست کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووێت پێشتر ئومەتەکەتان لەژێر سایەی فارس و ڕۆما بوو، کە ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەر بووە لە صحیحی بوخاریدا هاتووە.

لەبەرئەوەی شوێن کەوتووی ئەوان بوون گوتاری سیاسی وائەکات دەسەڵاتدار درووست بکات، دەسەڵاتداریش لەدەسەڵاتەکەی خۆی بەرزبووەوە و زیادەڕەوی کرد دەبێتە فیرعەون، پاشان داوای خوایەتی دەکات، ئەمەش قوناغێکە دەبێت هەموو دەسەڵاتێکی بێ دین پێیدا تێپەڕێت.

سیستەمی فیرعەونییەتی هەرماون کاتێک کە ژیاری فیرعەونەکان هەبوون خەڵکانێک پێیان وایە کە حەزرەتی مووسا -سەلامی خوای لێبێت- داوای چاکسازی کرد وەک ئۆپۆزیسۆن پاشان بە وتەی ئەو نەکراو دژایەتی کرا و فیرعەونی تیا نوقمی ئاو بوو. ئیتر فیرعەون نەما! بەڵام لەڕاستیدا ماوە، پێغەمبەر ﷺ (لەکاتی کوشتنی ئەبوو جەهل دا ئەفەرمووێ: فیرعەونی ئەم ئوممەتە ئەبوو جەهلە) واتە فیرعەونەکان بەردەوامن، هەموو گەلێک فەیرعەونی تایبەتی خۆی هەیە.

فیرعەونیش بەمانای زاراوەی ئیسلامی کە هاتووە ماناکەی ئەوە دەگەیەنێت کە دەسەڵاتدارێک داوای خوایەتی بکا و خەڵک بیپەرستێ.

---

[78] لقد ابتعثنا الله لنخرج العباد من عبادة العباد إلى عبادة رب العباد، ومن جوْر الأديان إلى عدل الإسلام، ومن ضيق الدنيا إلى سَعة الدنيا والآخرة.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بۆیە لێرەدا گوتاری سیاسی ئیسلامی لەسەرەتاوە بۆ ئازادکردنی مرۆڤەکان ئەفەرموویت: هاتووین خەڵکی دەربکەینە دەرەوە لە بەندەی بەندەکان بۆ بەندەی الله.[٧٩]

ماکوان: گوتاری ئایینی شیاوە؟

نومەیر: گوتاری سیاسی ئایینی، ئەم ناوە هەرچەندە هەندێک زانا نایانەوێ ناوی بنێین گوتاری سیاسی ئایینی، دەڵێین گوتاری سوڵتانی ئیسلامی واتە گوتاری شێوەی دەسەڵاتی خەلیفە لە خیلافەتی ئیسلامی، بەڵام جوانترو شیاوتر ئەوەیە کە ئێستا مەفهومە کە (چەمک) گشتی بووەتەوە خەڵکی بە گشتی لەهەموو ئەدەبیاتەکان لێی تێدەگەن، گوتاری سیاسی ئیسلامی بەکاربهێنین، ئەگەر ناوی گوتاری ئایینی بێت دەبێت پێناسەی ئایینیش بکەین.

جۆری ئایین بۆ نموونە: پەرستشی بت نابێتە دین، چوونکە شتێکە خەڵک دای ئەتاشێ و شوێنکەوتنی ئەفکار نابێتە ئایین، پەرستش بەو مانایەی خەڵکێک ئەیناسێ و ئەیزانێ وەکوو دینی ئیسلامی، بەڵام مەفهومی دین بەگشتی هەرشتێک کە پەرستشی تیاکرد، هەرشتێک خۆشەوویستی لە خۆشەوویستی خوای مووتەعال زیاتر بوو پەنا بەخوای گەورە ئەمە دەبێتە دین.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک کە قوورەیشییەکان دێن بۆلای پێی دەڵێن تۆ ساڵێک خواکەی ئێمە بپەرستە و ئێمەش ساڵێک خواکەی تۆ دەپەرستین، کەخوای گەورە لە سوورەتی الکافرون دەفەرموویت:

﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ۝﴾ [الکافرون]

کەواتە دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆم بۆ خۆم.

خۆ ئایینی ئەوان ئەوە نییە ئیعترافی پێ بکرێ، بەڵام هەرشتێک پەرستراوی تیا بوو خۆشەوویستییەکەی چووە پەنای خۆشەوویستی خوای مووتەعالەوە ئەوا بەدین حساب دەکرێ و مرۆڤەکان لە ئیسلام دەچنە دەرەوە دەچنە خانەیەکی دیکەوە کە خانەی پەرستشی شتێکی کەیە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧٩] (لیخرج العباد من عبادة العباد الی عبادة رب العباد ومن جور الادیان الی عدل الاسلام )





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: ئەی کە ئەمان ڕازی نەبوون پێغەمبەر ﷺ بۆ کوێ چوو؟

نومەیر: سەبارەت بەم بەیعەتە یەک لەدوای یەکانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەستنی لەوکاتەدا بوو کەوا لەلایەن قووڕەیش و سەرانییەوە لەشاری مەککەدا تەواو تەنگیان هەڵچنی بوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی -خوا لە هەموویان ڕازی بێت- هەربۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ وەک نموونەی بێ وێنەی پێشەوای ڕاستگۆ کە بەردەوام لەخەمی ئووممەتەکەی دابوو، وەک زۆرێک لەپێشەواکانی ئەمڕۆی موسڵمانان دەستە و ئەژنۆ دانەنیشت و چاو دابخات لە ئاستی ئەو هەموو سووکایەتی و بێ ڕێزییەی کە بە موسڵمانان و پیرۆزییەکانمان دەکرێت نەوەک جێ پێی لەق بێت؟

بەڵکوو زۆر بەزوویی بەدوای چارەسەرێکی پربایەخ دا گەڕا تاکوو بە پشتیوانی خوای گەورە لەماوەی چەند ساڵێکی کەمدا هاوەڵانی بەڕێزی ڕزگار کرد لەو نەهامەتییانەی کە لە شاری مەککەدا بەسەریان دا دەهات لەلایەن سەرانی قورەیشەوە، ئەویش بەستنی پەیمانی عەقەبەی یەکەم و دووەم بوو.

ماکوان: بەیعەتی عەقەبەی یەکەم چۆن بوو؟

نومەیر: سەبارەت بەم بەیعەتە ئەوە بوو لەدوای ئەوەی بەنی شەیان موسڵمان نەبوون پێغەمبەری خوا ﷺ بینی شەش کەس لە خەڵکی (یثریب) دانیشتوون کەسەر بەهۆزی (خەزرەج) بوون لەوەرزی حەجی ساڵی یانزەی پێغەمبەرایەتی دا موسڵمان بوون، بەڵێنییان دا بە پێغەمبەر ﷺ کە پەیامەکەی بەکەسووکاریان بگەیەنن کە ئەمە ناوەکانیانە:

یەکەم: ئەسعەد ئیبن زرارە[80] لە خێڵی بەنی نەجار.

دووەم: عەوف کوڕی حارس کوڕی ڕەفاعە ئیبن عەفرا[81] لە خێڵی بەنی نەجار.

سێ یەم: ڕافیع کوڕی مالیک کوڕی عەجلان[82] لە خێڵی بەنی زریق.

---

[80] أسعد بن زرارة

[81] عوف بن الحارث بن رفاعة، إبن عفراء

[82] رافع بن مالک بن العجلان

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

چوارەم: قتبە کوڕی عامر کوڕی جەدیدە[٨٣] لە خێڵی بەنی سەلەمە.

پێنجەم: عەقەبە کوڕی عامر نابی[٨٤] لە خێڵی بەنی حەرام بن کعب.

شەشەم: جابری کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی ریئاب[٨٥] لە خێڵی بەنی عبید بن غنم.

لە ئاکامی ئەوەدا کە وەرزی داهاتووش هاتە پێشەوە، لەوەرزی حەجی ساڵی دوانزەی پێغەمبەرایەتی دا، بەرامبەر بەساڵی (٦٢١)ی زاینی ئەم جارەیان بوونە (١٢) پیاو، پێنج کەسیان لەو شەش کەسە بوون کە پێشتر پەیوەندییان کردبوو بە پێغەمبەرەوە ﷺ لەساڵی ڕابردوودا، شەشەمیان کە ئامادە نەبوو جابری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی رئاب بوو لەگەڵ حەوت کەسی تر کە بریتی بوون لە:

- موعازی کوڕی حارس ناسراو ئیبن عەفرا لە بەنی نەجاڕ بوو لە خەزرەج.

- زەکوانی کوڕی عەبدولقەیس[٨٦] لە بەنی زریق خەزرەجی.

- عەبادەی کوڕی سامت[٨٧] لە بەنی غەنم خەزرەجی.

- یەزیدی کوڕی سەعلەبە[٨٨] هاوپەیمانی بەنی غنم خەزرەجی.

- عەباسی کوڕی عەبادەی کوڕی حەنزەڵڵە[٨٩] لە بەنی سالم خەزرەجی.

- ئەبو هەیسەم کوڕی تەیهانیلە بەنی عەبدولئەشهەل ئەوسی[٩٠].

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٨٣] قطبة بن عامر بن جديدة

[٨٤] عقبة بن عامر نابی

[٨٥] جابر بن عبدالله بن رئاب

[٨٦] زکوانی کوڕی عبد القيس

[٨٧] عبادەی کوڕی صامت

[٨٨] یزیدی کوڕی ثعلبة

[٨٩] العباس بن عباده بن حنظله

[٩٠] أبوالهيثم-ی کوڕی التيهانيله بەنی عبدالاشهل الأوسی



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

- عەویمی کوڕی ساعده[٩١] له عمرو بن عوف ئەوسی.

دوانەکەی کۆتایی له (ئەوس)و ئەوانی تریش له خێڵی(خەزرەج) بوون.

ئەمانه له(عەقەبە)ی (مینا)دا وەک بەیعەتی ژنان که لەفەتحی مەککەدا دابەزی، بەیعەتیان دا به پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

ماکوان: بۆ ناونراوه به بەیعەتی ژنان؟

نومەیر: لەبەر ئەوه هیچ جۆره سەرکەوتنێک و داواکاردن و خەبات و جیهادکردنی تێدا نەبووه، تەنها موسڵمان بوونیان داوا لێکرابوو!

لەسەر ئەم بەیعەته ئیمامی بوخاری (بەڕەحمەت بێت) له( عەبادە)ی کوڕی(سامت)ەوه دەگێڕێتەوه له پێغەمبەری خواوه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: وەرن بەیعەتم بدەنێ که هاوەڵ بۆ خوا پەیدا نەکەن، دزی نەکەن، زینا نەکەن، ڕۆڵەکانتان نەکوژن، بووختانی دەست و داوێن هەڵنەبەستن، له هیچ چاکەیەکدا سەرپێچیم مەکەن هەرکەسێک له ئێوه وادەی خۆی بردە سەر ئەوه پاداشتی لەسەر خوایه، هەرکەسێکیش سنووری یەکێک لەوانه ببەزێنێت له دوونیادا سزا بدرێت دەبێته مایەی سڕینەوەی گوناهەکەی، هەرکەسێکیش سنووری بەزاند و خوا بۆی پۆشی ئەوا کاروبارو سەرەنجامی بۆ لای خوا دەبێت ئەگەر ویستی سزای دەدات، ئەگەر ویستیشی لەسەربوو لێی خۆش دەبێت، فەرمووی: بەیعەتییان پێدا، لەڕوونوسێکی تردا دەفەرمووێت: لەسەر ئەوه بەیعەتمان پێدا.

ماکوان : ئەی بەیعەتی عەقەبەی دووەم چۆنکرا؟

لەوەرزی حەجی ساڵی سیانزەیەمی پێغەمبەرایەتی دا که دەکاته (یۆنیۆی ساڵی٦٢٢)ی زایینی حەفتا و ئەوەنده کەس له موسڵمانەکانی (یثریب) هاتن بۆ حەج، لەگەڵ حاجییه مووشریکەکانی خێڵەکانیان دا هاتبوون. ئەو موسڵمانانه له نێو خۆیان دا پرسیاریان دەکرد؟ کاتێک له (یثریب) یان هێشتا لەڕێگەدا بوون: داخۆ تاکەی بێدەنگ بین لەوەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەناو شاخەکانی مەککەدا بگەڕێت و دەربکرێت و بترسێت؟

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٩١] عویم بن ساعده



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کە گەیشتنە مەککە لەنێوان ئەوان و پێغەمبەردا ﷺ چەند پەیوەندییەکی نهێنی ئەنجام درا، بووە هۆی ڕێککەوتنی هەردوولا لەسەر ئەوەی لە ڕۆژانی (تشریق)دا لەو شیوەدا کۆ ببنەوە، کە دەکەوێتە (عەقەبە) لای (حجرە)ی یەکەمی (مینا)، بەمەرجێک ئەو دانیشتنە لەتاریکی شەوداو بەنهێنییەکی تەواو ئەنجام بدرێت.

سەرکردەیەکی ئەنساری وەسفی ئەو کۆبوونەوە مێژووییەمان بۆ بکات، کەهەموو ڕەوشی خۆی لەڕۆژانی ململانێی نێوان بت پەرستی و ئیسلامی گۆڕی، کەعبی کوڕی مالیکی ئەنساری -خوای لێی ڕازیبێت- دەڵێت: چووین بۆ حەجکردن کاتمان دانا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە عەقەبەدا لە ناوەندی ڕۆژانی (تشریق)دا ئەو شەوە هاتە پێشەوە کە بەڵێنمان دابوو تیایدا بەپێغەمبەر ﷺ بگەین، عەبدوڵڵای کوڕی عەمروی کوڕی حەرامیمان لەگەڵ دا بوو، کەیەکێک بوو لەگەورە پیاو ماقوڵەکانمان لەگەڵ خۆمان دا بردمان، ئێمە ئەم مەسەلەیەمان لەهەموو مووشریکەکانی خێڵەکەمان شاردبووەوە، قسەمان لەگەڵیدا کردوو پێمان وت: (أبو جابر) تۆ یەکێکی لەگەورەکانی ئێمە، پیاو ماقوڵێکی ناومانی پێمان خۆش نییە بەو حاڵەتەیت و ببیتە سووتەمەنی دۆزەخ، پاشان بانگمان کرد بۆ ئایینی ئیسلام و هەواڵی پێگەیشتنمان دایە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە عەقەبە، دەست بەجێ موسڵمان بوو لەگەڵمان هات بۆ عەقەبە یەکێک بوو لە نەقیبەکان).

ماکوان: باشە چۆن ئاوا زوو موسڵمان بوون؟ ئەوەندە ئاسان بوو ئیسلامەتی لای ئەوان جێگای سەرنجە؟

نومەیر: بیرت چۆتەوە بۆم باس کردی؟ کە جوولەکە بڵاوی کردبووەوە لە ناو شاری یەسریب بەم نزیکانە پێغەمبەرێک دێت و ئێمەی جوولەکە ئێوە لە ناودەبەین، واتە مەبەستیان عەرەب بوو ئیتر ئەمە هۆکاری ئەوە بوو کە ئەوان دەیانزانی پێغەمبەرێک دێت کەزانیان لە عەرەبە بۆیە بە خۆشحاڵییەوە شوێنی کەوتن.

ماکوان: ئەی پەیماننامەکەی دووەم چی بەسەر هات؟

نومەیر: کەعب دەڵێت: ئەوشەوە لەگەڵ خێڵەکەمان دا لە ناو کاروانەکەمان نووستین، تا سێ یەکی شەو تێپەڕی لەکاروان دەرهاتین بەرەو ژووانەکەی پێغەمبەر ﷺ





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەڕێکەوتین بەدزییەوە وەک پشیلە دەرباز بووین، تاهەموومان لەشیوەکەی عەقەبە دا کۆبووینەوە، ئێمە حەفتا و سێ پیاو و دوو ژنیشمان لەگەڵ دا بوو، کە بریتی بوون لە:

یەکەم: نوسەیبەی کچی کەعب ناسراوە بە دایکی عەممارە لە خێڵی مازنی کوڕی نەجار.

دووەم: ئەسمائی کچی عەمرو دایکی مونیع لە خێڵی سەلەمە.

لەشیوەکەدا کۆبووینەوە و چاوەڕوانی پێغەمبەرمان دەکرد هەتا تەشریفی هێنا، عەباسی کوڕی عەبدولمطەلیبی مامی لەگەڵیدا بوو، کە هەتا ئەوکاتە لەسەر ئایینی شیرک بوو، بەڵام حەزی دەکرد کە ئامادە بێت بۆ کاری برازاکەی، لێی دڵنیا بێت و یەکەم کەسیش بوو قسەی کرد سەبارەت بە پشتگیریکردنی پێغەرمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە مەترسی بەرپرسیارێتی بەیعەتەکە، پاش گوێ گرتن لە وتەکانی عەباس داوایان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا بۆ خۆت و خوداکەت چیتان پێ خۆشە ئەوە بکە، پاش ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونکردنەوەی خۆی بۆدان و بەیعەت ئەنجام درا.

ماکوان: ئەی بۆ عەباسی لەگەڵدا بوو کە مووشریک بوو؟

نومەیر: لە دوای مردنی ئەبوو تاڵیب لەلایەنی ئەمن و ئاسایشی پێغەمبەر ﷺ عەباسی مامی زیاتر پشتگیری دەکرد.

ماکوان: ئەی بەندەکانی ئەو پەیماننامەیە چیبوون؟

نومەیر: بەندەکانی بەیعەتەکەش پێک هاتبوون لەم خاڵانە:

پێشەوا ئەحمەد لە (جابر)ەوە بەدوور و درێژی دەگێڕیتەوە، جابر دەڵێت: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر چی بەیعەتت پێ بدەین؟

فەرمووی:

- گوێڕایەلی کردن لەخۆشی و ناخۆشی دا.

- خەرجیکێشان لە بوون و نەبوونیدا.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

- فەرمان کردن بەچاکە و ڕێگرتن لە خراپە.

- کار بۆ خودابکەن و گوێ لە قسەی لۆمەکاران نەگرن.

- ئەگەر هاتمە لاتان پشتیوانیم لێ بکەن، بەرگریم لێ بکەن لەوەدا کەبەرگری دەکەن لە خۆتان و هاوسەرانتان و ڕۆڵەکانتان، لەپای ئەوەدا بەهەشت پاداشتە بۆ ئێوە .

لەگێڕانەوەکەی کەعب دا کە ئیبن ئیسحاق دەیگێڕێتەوە لە بەندی کۆتایی دا کەعب دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی کرد، قورئانی دەخوێندەوە و بانگەشەی کرد بۆ لای خوا، خەڵکی هاندا بۆ ئیسلامەتی، پاشان فەرمووی: لەسەر ئەوە بەیعەتتان لەگەڵ دەبەستم کەبەرگریم بکەن لەوەدا بەرگری لەماڵ و منداڵی خۆتان دەکەن، دەست بەجێ بەرائی کوڕی مەعرور دەستی هێناو وتی: بەڵێ سووێند بەوەی تۆی ناردووە بە حەق کە تۆی بەڕاستی کردووە بە پێغەمبەر ﷺ بەرگریت لێ دەکەین وەک چۆن بەرگری لەخۆمان دەکەین، ئەی پێغەمبەر ﷺ بەیعەتمان لەگەڵ ببەستە، سووێند بەخوا ئێمە پشتا و پشت کوڕانی جەنگ و شەڕ بووین.

ئەبوو هەیسەمی کوڕی تەیهان قسەکەی بە بەرا بڕی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان ئێمە و جولەکەدا بەڵێننامەیەک هەیە، ئەگەر ئەوان پچڕاندیان ئێمەش لەگەڵ تۆدابین، ئایا وازمان لێ ناهێنیت و بگەڕێیتەوە بۆ ناو خزمەکانت؟

پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد پاشان فەرمووی: خوێن بەخوێنە، وێرانکاری بە وێرانکارییە، من لە ئێوەم و ئێوەش لە منن، جەنگ دەکەم لەگەڵ ئەو کەسەدا کە ئێوە جەنگی لەگەڵ دەکەن، ئاشتی دەکەم لەگەڵ ئەو کەسەدا کە ئێوە ئاشتی لەگەڵ دەکەن.

پاش بەندەکانی بەیعەتەکە جەخت کرایەوە لەسەر مەترسیدارێتی بەیعەتەکە و هەمووان هەندێک بیروڕایان گۆڕییەوە و خۆیان یەکلایی کردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵێنی بەهەشتی پێدان ئەوانیش دەستییان هێناو هەموویان بەیعەتیان پێدا. یەکەم کەس ئەسعەدی کوڕی زرارە بەیعەتی دا دوای ئەوە بەیعەتە گشتییەکە دەستی پێکرد وەک جابر دەڵێت: (پیاو لە دوای پیاو هەڵدەستاین بەیعەتمان لێ وەردەگیرا، پێغەمبەری خواش ﷺ لە پای ئەوەدا بەڵێنی بەهەشتی پێدەداین.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەڵام بەیعەتی هەردوو ژنەکە کە ئەو ڕووداوەیان بینی تەنها بەگفت بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز تەوقەی لەگەڵ هیچ ژنێکی نامەحرەم نەکردووە.

دوانزە نەقیب هەڵبژێردران کە بریتیبوون لە نۆ کەسی خەزرەجی و سێ کەسی ئەووسی.

بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ توانی بەویستی خوای گەورە موسڵمانانی ژێر دەستە ڕزگار بکات و دواتریش هەریەکەیان ببێتە پێشەوایەکی هاوشێوەی خۆی بۆ سەرخستنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام کە بەسەر خوێنی ئەو بەڕێزانەدا ئەم پەیامە گەیشتە دەستی ئێمە.

ماکوان: واتە دوای ئەم پەیمانە کۆچکردن دەستیپێکرد؟

نومەیر: بەڵێ، ساڵێک دوای ئەم پەیمانە کۆچ دەستیپێکرد

ماکوان: کۆچ چۆن بوو؟



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## کۆچکردن بۆ شاری یەسریب و گۆڕینی ناوەکەی بۆ مەدینەی منەوەرە

**ماکوان: ڕاستە کۆچکردن بۆ حەبەشە دووجار بووە جاری یەکەم هەموویان گەڕاونەتەوە؟**

نومەیر: کاتێک ئەشکەنجە و ئازاری موسڵمانان زیادی کرد پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ نەیدەتوانی پارێزگارییان لێ بکات، ڕێی پێدان کۆچ بکەن بۆ حەبەشە و پێی فەرموون: حەبەشە پاشایەکیان هەیە کەس زوڵمی لای ئەو لێ ناکرێت، فەرمانیشی پێدان کە هەر لەوێ بمێننەوە تا خوای گەورە دەروویەکی خێرییان لێ دەکاتەوە. بۆیە دوازدە پیاو و چوار ژن بوون چوون، لەوانە عوسمانی کوڕی عەففان، خێزانەکەی کە ڕوقییەی کچی پێغەمبەر بوو صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، زوبەیری کوڕی عەوام، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، عوسمانی کوڕی مەزعون، عبدوڵلای کوڕی مەسعود، ئەبوو سەلەمەی مێردی ئوم سەلەمە.

ئەمە کۆچی یەکەمی موسڵمانان بوو بۆ حەبەشە، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرێتیدا بوو. ئەو کاتەی ئەمان لە حەبەشە بوون هەواڵیان پێ گەیشت کە خەڵکی مەککە موسڵمان بوون و قووڕەیش وازی لە ئازاردانی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و موسڵمانان هێناوە! ئەمانیش گەڕانەوە کەچی کە گەیشتنەوە مەککە دیتییان ئازار و ئەشکەنجەی قووڕەیش زۆر لەوسا توندتر بووە، دوژمنایەتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر لەوسا سەختتر دەکەن، بۆیە هەندێکیان دیسان بە ناچاری گەڕانەوە بۆ وڵاتی حەبەشە و هەندێکی تریان کەسانی خزم و ناسیاوی خۆیان دەسکەووت کە داڵدەیان بدات و بە سەلامەتی بیانباتەوە بۆ مەککە .

**ماکوان : هۆکارەکەی چی بوو کە گەڕانەوە، چۆن ئەو هەواڵەیان پێگەیشت؟**

نومەیر: ئەو هەواڵە سەرچاوەکەی لەوەوە دێت کاتێک کە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەناو شاری مەککەدا بە دەنگی بەرز قورئانی خوێند سوورەتی النجم دەست پێکرد تاگەیشتە کۆتاییەکەی کە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ﴾

ئەم (پێغەمبەر)ەش یەکێکە وەک پێغەمبەرانی پێشوو.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

﴿أَزِفَتِ ٱلۡأٓزِفَةُ ۝٥٧﴾

ئەوە چاک بزانن کە قیامەت و لێپرسینەوە نزیکە (نزیکە بە نیسبەت هەر ئادەمیزادێکەوە هەر کە مرد ئەوە قیامەت لەو بەرپا بووە، قیامەتی گەورەش کاتێک بەرپا دەبێت هەموان وا هەست دەکەن کە چەند سەعات لەوەوپێش دنیا بوو وا ئێستەش قیامەتە)!

﴿لَيۡسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ۝٥٨﴾

کەسیش ناتوانێت ئەو ڕۆژە بەرپا بکات جگە لەخوای بەدەسەڵات و باڵادەست.

﴿أَفَمِنۡ هَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ تَعۡجَبُونَ ۝٥٩﴾

ئایا ئێوە ئەم قسەو گوفتارانەتان پێ سەیرە؟!

﴿وَتَضۡحَكُونَ وَلَا تَبۡكُونَ ۝٦٠﴾

پێی پێدەکەنن و گریانتان نایەت (بۆ ئەو چارەنووسە ڕەشەی کە چاوەڕێتانە).

﴿وَأَنتُمۡ سَٰمِدُونَ ۝٦١﴾

بەردەوام سەرگەرمی ڕابواردن دەبن و خۆ گێل دەکەن؟! (لە ئەرک و بەرپرسیارێتی).

﴿فَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ وَٱعۡبُدُواْ۩ ۝٦٢﴾ [النجم]

(دەی کەواتە بێدار بنەوەو داچڵەکێن) سووجدە بۆ خوای (بەدیهێنەر ببەن)، هەر ئەویش بپەرستن.

لە خوێندنەوەی قورئانە کە تەواو بوو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سووجدەی برد، بەدوایدا هەموو خەڵکی ناو مەککە گوێیان لێبوو بە کافر و موسڵمانەوە لە ناو کەعبەدا سووجدەیان برد، ئیتر ئەم هەواڵە واگەیشتەوە ناو حەبەشە کە خەڵکی مەککە هەمووی موسڵمان بووە بۆیە گەڕانەوە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: ئەی دوایی چیان بەسەردا هات؟

نومەیر زۆری نەبرد ئەوانەی لە حەبەشە گەڕابوونەوە زیاتر کەوتنەوە ژێر ئەشکەنجە و ئیهانە و کوێرەوەرییەوە، بۆیە دیسان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدانەوە کە کۆچ بکەنەوە بۆ حەبەشە! ئەمجارەیان هەشتا و سێ پیاو و نۆزدە ژن بوون. ئەمجارە بیستیان پێغەمبەر ﷺ کۆچی کردووە بۆ مەدینە ئیدی سی و سێ پیاو و هەشت ژنیان لە حەبەشەوە یەکسەر کۆچیان کرد بۆ مەدینە و هەندێکیان فریای غەزای بەدر کەووتن، ئەوانی دی کە هەر لە حەبەشە مانەوە تا ساڵی حەوتەمی کۆچی کە خەیبەر ئازاد کرا گەڕانەوە مەدینە، کە جەعفەری کوڕی ئەبوو تاڵیب-یشیان لەگەڵ بوو.

پاشان قووڕەیش کە دەیبیست وا موسڵمانە ڕاکردووەکانی بەردەستی وا لە حەبەشە لە ئەماندان و حەساونەتەوە، زۆر ناڕەحەت دەبوون، بۆیە عەمری کوڕی عاس و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەبیعەیان بە دیاری و خەڵاتێکی زۆرەوە نارد بۆ لای نەجاشی بۆ حەبەشە، دیاری و خەڵاتەکانیان بۆ بەتریاک و قەشەکانی دەووری نەجاشی بوو، چوون و داوای گەڕانەوەی موسڵمانەکانیان کردەوە بە بیانووی ئەوە کە بە سەلامەتی و ئەمان دەیانگەیەننەوە دەست خزمەکانیان، بەڵام نەجاشی نەیدانەوە و پێی وتن: جارێ با گوێ لە قسەی خۆیان بگرم کە هێنایانن نەجاشی پرسیاری دینەکەیانی لێ کردن، جەعفەری کوڕی ئەبوو تاڵیبیش بۆی ڕوون کردەوە کە چۆن پێش پێغەمبەرێتی محمد ﷺ ئەهلی جاهیلییەت بوون و ئیسلامیان بۆ هاتووە و بەڕاستی ڕزگاری کردوون، وتی: ئێمە خەڵکێکی جاهیل بووین بتمان دەپەرست، ئاژەڵی تۆپیو و مردارەوە بوومان دەخوارد، داوێنپیسی و خراپەکاری پیشەمان بوو، سیلەی ڕەحمان دەپساند و خزمایەتیمان لەبەرچاو نەبوو، بۆ دراوسێ خراپ بووین تا خوای گەورە لە نێو خۆمان پێغەمبەرێکی بۆ هەڵبژاردین ڕەچەڵەکی باب و باپیرانی دەناسین، ڕاستگۆیی و دەستپاکییەکەیمان لا ئاشکرایە، ئیدی ئەو تەشریفی هێناو ئێمەی بۆ یەکخواپەرستی بانگ کرد فەرمانی نوێژی پێ کردین، ئێمەش بە ڕاستمان زانی و باوەڕمان پێی هێنا. لەبەر ئەمە زلهێزەکانی قەومەکەمان کەوتنە دەستدرێژی کردنە سەرمان ویستییان لە دینەکەمان پاشگەزمان بکەنەوە، کە ئازار و ئەشکەنجەیان زیادی کرد لەسەرمان هەڵهاتین بۆ وڵاتەکەی جەنابتان و پەنای کەسی تری غەیری جەنابتمان پێ قبوڵ نەبوو، ئومێدیشمان هەر ئەوە بوو کە لای جەنابتان زوڵممان لێ نەکرێت. چەند ئایەتێکی سوورەتی مەریەمی بۆ خوێندنەوە نەجاشی گریا و وتی: ( ئەم قسانە و ئەوەی کە عیسا هێنای هەر لە یەک جێوە سەرچاوەیان گرتوە)! هەموو دیاری و





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

خەڵاتەکانیشی کۆکردەوەو دایەوە بە دوو نێردراوەکەی قووڕەیش و پێی وتن: ( بگەڕێنەوە، بە خوا قەسەم هەتا هەتایە تەسلیمتانیان ناکەمەوە).

ماکوان: ڕاستە قسەکانی جەعفەر زۆر دبلۆماسییانە و کورتکراوەی نوبوەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دیارە بۆیە ئەویشیان هەڵبژارد بۆ قسەکردن، بەڵام ئەی کۆچ و سیمای کۆچ یان بڵێم مەودای هیجرەت بۆ مەدینە چۆن بوو؟

نومەیر: هیجرەت لە ئیسلامدا بریتییە لەو تێگەیشتن و مانایەی کە لە سیرەی بۆنخۆشی پێغەمبەری ئازیزماندا ﷺ هاتووە کە خوای پەروەردگار لە سوورەتی الحج دا دەفەرمووێت:

﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ۝٥٨ لَيُدۡخِلَنَّهُم مُّدۡخَلٗا يَرۡضَوۡنَهُۥۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٞ ۝٥٩﴾ [الحج]

ئەوانەش کە لەبەر ڕەزامەندی خواو لە پێناوی سەرخستنی ڕێبازەکەی ئەودا کۆچیان کرد لەوەودوا کوژران و شەهیدکران یاخوود مردن، سووێند بێت بێگومان خوا لە ڕزق و ڕۆزی چاک بەهرەوەریان دەکات، بەڕاستی خوا هەر خۆی چاکترین ڕزق و ڕۆزی بەخشە، سووێند بێت خوای گەورە ئەو جۆرە کەسانە دەخاتە شوێنێکەوە کە زۆر پێی ڕازی و خۆشنوود دەبن، بەڕاستی خوا زانایە (بەهەوڵ و کۆشش و نیەت و چاکەیان) و خۆگرە (لە تۆڵەسەندندا زۆر پەلە ناکات).

سەرەتا : لەدوای بەیعەی عەقەبەی دووەم ئەنسار توانیان ژمارەیەکی زۆر پێک بهێنن لە شاری مەدینەی منەوەرە، هەموو چاوەڕێی ئەوەیان ئەکرد کە پێشوازی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، پێغەمبەری خوا بگاتە لایان، بەڵام پێغەمبەر ﷺ کاتێک ئەیویست هیجرەت بکات تەنها بۆ شاری مەدینە نەبوو پێشتر چەند جارێک ویستوویەتی کە هیجرەت بکات، لە کاتێکدا کە دەرگای بانگەواز داخراوە لەسەر موسڵمانان، ئەوە بوو یەکەم هیجرەتی پیغەمبەر ﷺ بۆ تائیف بوو، پاشان کە گەڕایەوە پێغەمبەری نازدار ویستی بچێت بۆ بەحرەین بۆ ناو بەنی حەنیفە، پاشان بۆ یەمەن بۆ ناو قەبیلەکانی تر، ویستی بچێت بۆ عێراق بۆ ناو بەنی شەیبان کە ئەو کۆچەی سەری نەگرت و هیجرەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێگەسازی کرد بۆ شاری مەدینەی منەوەرە ئەنجامدا.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر گرنگە، ئەو گرنگییەی پێی داوە کە سیمای هیجرەتی پێغەمبەری خوایە، بریتی بووە لە نییەت چوونکە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدەویست هیچ کەسێک کۆچ بکات لەبەر دەستکەووتنی سەروەت و سامان، هەرچەندە ئەمە کارێکی خراپ نییە وەکوو دەستکەووتی حەڵاڵ و پێکەوە نانی سەروەت و سامان یاخوود بۆ خواستنی ژنێک...هتد. ئەمانە هیچیان حەرام نین ئەگەر مرۆڤ لەڕێگەیەکی مەشروع بیکات، هیجرەتی پێغەمبەر ﷺ لەپێناوی خوای گەورەدا بوو. ئەم هیجرەتە عەزەمەتی لەوەدایە کە پێغەمبەری خوا ویستی پرۆژەیەکی زۆر گەورە دابمەزرێنێ کە ئەویش بریتی بوو لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیهێشت کەسێک هیجرەت بکات ئەگەر نییەتی ساف و پاک و درووست نەبێت بۆ خوای پەروەدگار (إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى)، لەبەر ئەوەی هەموو کردەوەیەک ئەبێت نییەتەکە بۆ خوای پەروەردگار بێت، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیفەرموو بە موسڵمانان هەنگاو بنێن بۆ کۆچکردنتان.

- هیجرەتی موسڵمانان بۆ ئەوە نییە کە هەر موسڵمانێک زلەیەکی لێ درا ڕاستەوخۆ جێگاو مەوقیعی خۆی بەجێ بهێڵێ، چوونکە موسڵمان جێگاو مەڵبەندی خۆی زۆر باشترە، هیجرەت بۆ ئەو کەسانەیە کە لەجێگە و زێدی خۆیان هەڵئەکەنرێن و دەرگای بانگەواز دادەخرێت بە ڕوویاندا لەم کاتەدا هەوڵئەدات بەرەو هیجرەت بڕوات مەئوایەک بۆ خۆی بە دەست بهێنێت.

- هیجرەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەرەتاوە بۆ حەبەشە بوو، بۆ ئەوە بوو کە موسڵمانان بپارێزێت و لە زێدی خۆیان هەڵنەکەنرێن و بۆ ئەوەی لەسەر زەوی ئیسلام بمێننەوە، بۆیە موسڵمانانی بڵاو کردەوە کە دوو جار بۆ حەبەشە و جارێک بۆ یەمەن و جارێک بۆ ناو دەوسیەکان و شوێنەکانی تر، تەنها مەبەستی بڵاوبونەوەی ئیسلام و مانەوەی ئیسلامەکە بوو لەسەر زەوی.

- هیجرەتی ئەم جارەی پێغەمبەری خوا ﷺ جیاوازە لە گەڵ هیجرەتی بۆ حەبەشە هەروەک کە ئاماژەمان پێداوە بۆ جەنابتان کە مەبەستی درووستکردنی پرۆژەیەکی گەورەیە بۆ دامەزراندنی دەوڵەت، کە ئەڵێین هیجرەت مانای ئەوەنییە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها ڕۆشتبێ بۆ جێگەیەک تەواو، ئەمەش لەمێشکی خەڵکیدا بچەسپێ،



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەڵکوو لە مەککەوە بۆ مەدینە (٥٠٠)کیلۆمەتر، پێغەمبەری خوا ﷺ کەتەنها ڕێگەی نەبڕیوە، بەڵکوو هەوڵی دامەزراندنی ئەو پرۆژە مەزنە بوو کە باسمان کرد.

لەبەرەبەیانی ٢٦ی سەفەری ساڵی ١٤ی پێغەمبەرایەتی لەناو دارونەدوە کۆبوونەوەیەکی گەورە کرا، کە بە کۆبوونەوەیەکی زۆر خێرا ناودەبرێ، ڕاگەیەندرا کە بەزووترین کات هەرچی خەڵک و گەورە پیاوانی ناو شاری مەککە کۆببنەوە ئەم مەندووبانەی لەخۆ گرتبوو.

- ئەبوو جەهل کوڕی هیشام لە هۆزی بەنی مەخزوم
- شەیبە و عوتبە لە کوڕانی ڕەبیعە
- ئەبوو سووفیانی کوڕی حەرب لە بەنی عەبدوشەمس
- نەزری کوڕی حارس لە نەوەی عەبدودار
- ئەبوو بەختەر لەنەوەی هاشمی کوڕی بەنی ئەسەد
- ئوومەیەی کوڕی خەڵەف لەبەنی جەمع
- جوبەیر کوڕی موتعەم لە بەنی نەوفەل
- نەبیە و مونەبیە کە کوڕانی حەجاجی بەنی سەهم بوون

هەموو ئەمانە لە قەبیلە و گەورە پیاوان بوون و پێکهاتەی ناو شاری مەککە بوون کۆبوونەوە، بە بێئەوەی بەنی هاشم بەشداری بکات کە هۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کۆبوونەوە ئەنجام درا.

ئەم خەڵکە هەموو بەپەلە کۆبوونەوە و لە کۆبوونەوەکەدا داوای ئەوەیان کرد کە چی بکەن بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمانە شەیتان بوون هەندێ جار باس دەکرێ کەسێک لەناو ئەمانەدا بووە بەناوی (شێخ نەجدی ) هاتووەتە ناویان لەناو ئەم هۆزەدا بووە و بڕیاریان داوە کە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ بکوژن، بەڵام ئەو ڕیوایەتە لاوازە و لە هیچ جێگایەکی باوەڕ پێکراو نەهاتووە، بەڵام لەهەندێک کتێب و سەرچاوە ئاماژەی پێ




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کراوە خوای پەروەردگار دەفەرموویٚ کە زۆر جار شەیتانەکان و مرۆڤ و جنیش بەیەکەوە یارمەتی یەکتر دەدەن، هەروەک لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە لو سوورەتی الأنعام دا ئەفەرموویٚت: وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الإِنْسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَبي

هەر بەو شێوەیە (کێشمە کێشی ئیمانداران و خوانەناسان بەردەوامە) جا بۆ هەموو پێغەمبەرێک (بۆ ئیماندارانیش) دوژمنێکمان لە شەیتانەکانی ئادەمیزاد و پەری سازاندوە، کە بەردەوام قسەی زل و ڕازاوە دەدەن بەگوێی یەکداو (خۆیان و خەڵکی) پێ سەرگەردان و گومڕا دەکەن، خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیوویستایە (نەیاندەتوانی) شتی وابکەن، دە وازیان لێ بهێنە لەگەڵ ئەو درۆو دەلەسەیەی کە هەڵی دەبەستن (بۆ کوێ دەچن، لە دەست سزای خوایی ڕزگار نابن).

کۆبونەوە دەستی پێ کرد هەموو سەرکردەکانی قووڕەیش کۆبوونەوە هەندێکیان لەم مووشریکانە موسڵمان دەبن و موسڵمانێتی خۆیان ڕادەگەیەنن لەو کاتەدا مووشریکەکان بۆچوونی خۆیان دەگۆڕنەوە و دێنە سەر ئەوەی چی بکەن بۆ لەناو بردنی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام کەسیان جورئەتی ئەوەیان نەکرد کە چۆن ڕاستەوخۆ بڵێن با محمد بکوژرێ یان ئیغتیال بکرێ، بەڵکوو بە ئاشکرا وتیان با محمد ببەستنەوە بە حەبل بۆ ئەوەی هیجرەت نەکات، هەندێکی تر وتیان لێی ئەدەین و لەوکاتەدا قاچێکی بشکێنین بۆ ئەوەی ئیتر نەتوانی هەڵسووکەوت بکات، هەندێکی کەشیان وتیان زمانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبڕین بۆ ئەوەی نەتوانی قسە بکات و قورئانەکەی کاریگەری نەمێنێ لەسەر خەڵکی تر، بەڵام لەناو هەموویاندا کۆمەڵێکی زۆر توندڕە لە ئەحزاب دا پێیان دەوترێ (یمین متطرف) لەناویاندا کەسێکی زۆر پەڕگیر و دەمارگیر

(ئەبوو جەهل)ە وتی با محمد ﷺ بکوژین و ئیغتیالی بکەین، شێوەی کوشتنەکەی بۆ دانان کە هەریەکێک لەناو قەبیلەکانا هەڵسێ بەوەی ڕمێک یان خەنجەرێک بگرێ بەدەستیەوە بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، لەو حاڵەتەشدا کە بەنی هاشم بەتەنها ناتوانن هیچیان ڕوو بە ڕووی ئەوتیر و هۆزانەی ناو قووڕەیش ببێتەوە و خوێنەکەی بەسەر هۆزەکاندا دابەش بکرێ، ئەمەش نەخشەیەک بوو کە دایاننا و لەوێدا ئەبوو جەهل بە هەموو ئامادەبووانی وت: ڕازین لەسەر ئەم قسەیە هەموو وتیان: بەڵێ ڕازین.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەمەش هاوشێوەیەکی دیموکراسییە کە خەڵک شانازی پێوە دەکات و هیچ جیاوازییێکی نییە لەسەردەمی جاهلیەت دا کە لە دارنەدوەکەی ئەبوو جەهل و دارنەدوەکەی ئووممەیەی کوڕی خەلەف...هتد.

قووڕەیش ئەم پلانەیان داڕشت بەبێ ئەوەی هیچ کەسێکی تریان لەگەڵ بووبێ غەیری ئەو ناوانەی کە ناویان هاتووە لە سیرەی بۆنخۆشی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ کە ناویانم هێناوە، هیچ کەسێک ئاگاداری ئەم بارودۆخە نییە و لەم کۆبونەوە نییە کە کراوە.

مووعجیزەیەک لێرەدا ڕوونەدات کە پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ دەرئەخات کە بریتییە لەوەی خوای پەروەردگار ئەفەرموێت بە جبریل -سەلامی خوای لێبێت- هەواڵەکە بە پێغەمبەر ڕادەگەیەنی کە خوای گەورە لە سوورەتی الأنفال دا دەفەرموێت:

﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ﴾ [الأنفال]

ئەی محمد ﷺ یادی ئەو کاتە بکەرەوە کاتێک ئەوانەی بێ باوەڕ بوون پیلانیان دەگێڕا دژی تۆ بۆ ئەوەی بەندت بکەن یان بتکوژن یان دەرت بکەن، ئەوان پیلانی خۆیان دەگێڕن و خوایش پیلانی خۆی دەخاتەکار (بەپووچکردنەوەی کارەکانیان)، دڵنیابن خوای گەورە چاکترینی هەموو پیلانساز و نەخشە سازانە (نایەڵێ پیلانیان سەربگرێ).

بەڵام جبریل (سەلامی خوای لێ بێت)هاتە خوارەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەواڵەکەی بۆ هێنا کە ئەم شەو تاوانێک دەرحەق بە جەنابتان ڕوونەدات ئەویش ئیغتیال کردنی بەڕێزتە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەمشەو لە جێگەی خۆت مەمێنەرەوە و ئەمری کرد بە هیجرەتکردن واتە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی هیجرەتی پێ نەبوو هەتا ئەوکاتەی پەیامی بۆ هات، بە جبریلی فەرمووی: کێ هیجرەت بکات لەگەڵم؟ فەرمووی: ئەبوو بەکری سدیق.[٩٢]

---

[٩٢] نزل جبريل عليه السلام فورًا إلى رسول الله ﷺ يخبره بأمر الجريمة التي تدبر له، وقال له: لا تبت في فراشک الليلة. وأمره بالهجرة، فسأل رسول الله ﷺ جبريل: من يهاجر معي؟ قال: أبو بكر الصّدّيق. وذلک كما جاء في مستدرک الحاكم بسند صحيح.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەم پەیامەی بۆ هات پاشان ویستی نەخشەیەک دانێ.

وەرن با تێرامان و شیکارییەک بکەین یاخوود بەیەکەوە بژین لەگەڵ نەخشە و شوێن پێی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵگرین، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ چاو بنوقێنین و حاڵەتی سایکۆلۆژی پێغەمبەر بزانین، چۆن ڕەفتاری کردووە و چۆن ویستوویەتی بڕواتە دەرەوە بۆ ئەم هیجرەتە، با بزانین لەم بارو دۆخەدا پێغەمبەری خوا ﷺ چی کرد:

- پێوویستی بەوە هەیە خێرا بڕوات بۆ ماڵی ئەبوو بەکری سدیق و ئەمری هیجرەتی پێ بگەیەنێ و بڕوا بۆ ئەو جێگایە.

- پێغەمبەری خوا ﷺ بیر لەوە ئەکاتەوە ئایا ئەبوو بەکری سدیق ئامادەیە بۆ ئەم هیجرەتە یان ئامادە نییە؟

- ئەیزانی پێغەمبەری خوا ﷺ حاڵەتەکە لەبەرەبایاندایە واتە ١٠ی ڕۆژی شەممەی ٢٧ی مانگی سەفەری ساڵی ١٤ پێغەمبەرایەتی ئەم ڕەوشە ڕوویداوە بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیەوێ لە پێش وەختدا گەرمای نیوەڕۆیە هەموو حاڵەتەکان وەلابنێت، هەموو نەخشەکان ڕێک بخات و بڕواتە دەرەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ گرفتێکی تر هاتە بەردەمی ئەویش ئەیزانی گەمارۆ ئەخەنە سەر ماڵەکەی پێش ئەوەی گەمارۆکە بخەنە سەر ماڵەکەی ویستی ڕووداوەکان بقۆزێتەوەو کارەکان ئەنجام بدات، بڕوات بۆ لای ئەبوو بەکری سدیق بۆ ئەوەی بتوانێ بە زووترین کات گرفتەکان چارەسەر بکات، کاتێکیش کە دەرچوون و دوورکەوتنەوە لەناو مەککەی موکەرەمەدا بۆ ئەوەی زوو نەیان گرن.

- پێغەمبەری خوا ﷺ لەو حاڵەتەشدا کاتێک ئەو هەموو ناڕەحەتییەی تووشی هاتبوو هەموو شاری مەککە پێغەمبەری خوایان بە (صادق الامین) ناسی بوو زۆریان خۆش دەویست، لەگەڵ ئەوەشدا مووشریکەکان ئازاری پێغەمبەری خواو موسڵمانانیان ئەدا هەرچی سەروەت و سامانی خۆیان هەبوو لەلای پێغەمبەری خوا دایان نابوو! لەهەمان کاتدا ئەشیانزانی ڕاستگۆترین و دەست پاکترین پیاوی شاری مەککەیە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم حاڵەتەشدا بیری لەوە دەکردەوە چۆن ئەم ئەمانەتانە بپارێزێت با ماڵی مووشریکەکانیش بێت، بە بێ ئەوەی هیچ پەماننامەیەک لە نێوانیاندا هەبووبێت ئامانەتەکانیان ئەیپارێزێت و



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بۆیان ئەگەڕێنێتەوە، لەبەر ئەمە علی کوڕی ئەبوو تاڵیب دائەنێت پێی ئەڵێت ئاگاداری ئەم سەروەت و سامانە بەو بیگەڕێنەرەوە بۆ خاوەنەکانیان.

کەواتە پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم ئیشی هەڵئەستێ بەوەی بچێتە خزمەت ئەبوو بەکری سدیق و پێی بڵێ بۆ هیجرەت، لە کاتێکدا بڕوات گەرمای نیوەڕۆیە چوونکە گەرماکەی سووتێنەرەو بە نیوەڕۆکەی کەس ناچێتە دەرەوە و کوچەو کۆڵانەکان چۆڵن، هەروەها عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب دانا بۆ ئەو کارەی کە خێرا ئەمانەتە (ڕاسپاردە)کان بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، پێغەمبەری خوا ڕۆیشتنی خۆی گۆڕی سەرو سیمای خۆی گۆڕی کە جلی زۆری لەبەر کردو پەڕۆی زۆرتری بەست بە سەری مووبارەکییەوە، عەمامەکەی گەورەتر کرد بۆ ئەوەی خەڵک نەیناسنەوە و بچێتە ماڵی ئەبوو بەکر.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو نەخشانەی کە کێشای کردیە کاری مەیدانی بۆ ئەوەی لە مەیدان دا ئیشی پێ بکات، یەکسەر هەڵسا نیوەڕۆ خێرا چووە ماڵی ئەبوو بەکری سدیق لە دەرگای دا کە دەرگاکەی کردەوە عائیشە -ڕەزامەنی خوای لێبێت- لە سەحیحی بووخاری بۆمان ئەگێڕێتەوە ئەفەرمووێت: کاتێک کە بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێتە ماڵی ئەبوو بەکری سدیق، دەفەرمووێت: دایک و باوکم بەقوربانت بێ واللە کاتی وا هەرگیز نەهاتووی ئەگەر فرمانێکت پێ نەبێت کێشەیەک ڕوونەدابێت.[٩٣]

هەتا ئەو کاتەش ئەبوو بەکری سدیق نەیزانیبوو هیجرەت ئەکاو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەچێت بۆ شاری مەدینە.

عائیشە -ڕەزامەندی خوای لێبێت- ئەفەرمووێت: لە ڕیوایەتێکدا کە لە بووخاریدایە ئەفەرمووێت:

پێغەمبەری خوا ﷺ هات و مۆڵەتی وەرگرت و مۆڵەتی پێدرا و بە ئەبوو بەکری فەرموو:

ئەوەی لەلاتە بابچێتە دەرەوە، بۆ زیاتر وریایی خۆیان.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٩٣] فِدَاءٌ لَهُ أَبِي وَأُمِّي، وَاللَّهِ مَا جَاءَ بِهِ فِي هَذِهِ السَّاعَةِ إِلاَّ أَمْر.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەبوو بەکری سدیق بەدڵنیاییەوە فەرمووی: ئەوە کەس و کاری خۆتن باوکم بە قوربانت بێت پێغەمبەری خودا.

**پێغەمبەری خوا** صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ **فەرمووی:** من ڕێگەم پێدرا بۆ چوونەدەرەوە.

ئەبوو بەکر بە دڵێکی ساف و پڕ لە نوورەوە هاوڕێت ئەبم، باوکم بە قوربانت بێ ئەی **پێغەمبەری خودا** صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

یانی من هاوڕێت بم و لەگەڵت بم لەم گەشتەدا؟

**پێغەمبەری خوا** صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ **فەرمووی:** بەڵێ.

لەم کاتەدا ئەبوو بەکری سدیق نەیتوانی خۆی بگرێ و لە خۆشی دا دەستی کرد بە گریان.

سبحان الله! خاتوو عائیشە ئەفەرموویێت: هەتا ئێستا نەمئەزانی کەسێک هەیە لەتاو خۆشیدا بگری هەتا ئەبوو بەکرم بینی ئەگریا.[٩٤]

بێگومان گریانی ئەبوو بەکری سدیق -خوا لێی ڕازی بێت- گریانی خۆشی بووە کە لەگەڵ **پێغەمبەری خوا** صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ سەفەر دەکات کە سەفەرێکی ترسناک بووە، بەڵام زۆر ئامادەیی خۆی دەربڕیوە و خۆشەوویستی خۆی بۆ پێغەمبەری خوا وەک نموونەی دایک بۆ منداڵی، ئامادە بووە لە هەموو زەمان و مەکانێکدا بە گیان و ماڵ بۆ خۆشەوویستی پێغەمبەرەکەی بێ و چاودێری بکات لە هەموو ناڕەحەتییەک هەربۆیە خۆشەوویستی پێغەمبەر

---

[٩٤] تقول السيدة عائشة رضي الله عنها: فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَأْذَنَ، فَأُذِنَ لَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لأَبِي بَكْرٍ: "أَخْرِجْ مَنْ عِنْدَكَ". زيادةً في الحذر.
فقال الصّدّيق في اطمئنان: إِنَّمَا هُمْ أَهْلُكَ، بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ.
فقال الرسول صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ : "فَإِنِّي قَدْ أُذِنَ لِي فِي الْخُرُوجِ".
فقال أبو بكر، وقلبه يكاد ينخلع من اللهفة: الصُّحْبَةُ، بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟
يعني هل سأصحبك في هذه الرحلة؟
فقال الرسول صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ: "نَعَمْ".
هنا لم يستطع أبو بكر رضي الله عنه أن يتمالك نفسه من شدة الفرح، فبكى!!
سبحان الله! تقول السيدة عائشة رضي الله عنها: فَلَمْ أَكُنْ أَدْرِي أَنَّ أَحَدًا يَبْكِي مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ حَتَّى رَأَيْتُ أَبَا بَكْرٍ يَبْكِي




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لای ئەبوو بەکری سدیق بە شێوەیەک بوو توانای وەسف کردنی نەبوو زۆر ڕاستگۆ بوو دوور لە خۆشەوویستییەکی دروستکراو، لە ژیان دا لەدوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ هەر خۆشەوویستی لە دڵی ئەبوو بەکری سدیق مابوو هیچ کات نەیتوانیوە خۆشەوویستی کەم بکات، هەمیشە خۆشەوویستی پێغەمبەری خوای گەیاندوە، هەتا پێش ئەوەی بپرسێ پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئامادەیت هیجرەت بکەیت بۆ مەدینە. یەکسەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووێت: من دوو وشترم ئامادە کردووە یەکێکیان بۆ تۆ و ئەوی تریان بۆ من، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووێت: (فقال بالثمن) واتە: من قبوڵمە سەروەت و سامانەکەت بدەی بە من، بەڵام ئەبێ پارەکەیم لێ وەرگریتەوە، ڕاستە ئەبوو بەکر تۆ سەروەت و سامانی خۆت و لە پێناوی خوای گەورەدا دەدەی بە موسڵمانان ئەم کارە بۆ خۆتە و پێغەمبەری خوا ﷺ قبوڵی نەکردووە لە هیچ کەسێک کە شتێکی بدەنێ بۆ خۆی، ئەبوو بەکری سدیق لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بەم شێوەیە ئاخافتنیان کرد و کەوتنە قسە کردن بۆ ئەوەی کارەکانیان ئەنجام بدەن.

ماکوان: لێرەدا پێویستە وەستانێک بکەین لەگەڵ ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- چ پیاوێک هەیە بۆ ئیسلام بەم شێوەیە تێبکۆشێ و هەموو خەمێکی تەنها ئیسلامەکە بێت، لەکاتێکدا کە ئاگای لە هیچ شتێک نییە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووێت: با بچینە دەرەوە دەڵێ ئامادەم!

لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە بە بێئەوەی ئاگادار کرابێتەوە لەلایەن پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئامادە کردووە و دوو وشتری کڕیوە بۆ ئەوەی نەوەک ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ پێوویستی پێ بێت و هیجرەت بکەن پێکەوە! بەڕاستی ئەمە هەڵوێستەی دەوێت ئوستاز نومەیر.

نومەیر: خاڵێکی تر ئامادەیی خێزانەکەی کە دوایی باسی لێوە دەکەم کە چۆن خۆی و خێزانەکەی لە خزمەت ئەم ئیسلامەدان و چۆن (اسماء، عائیشە، کوڕەکەی، کەسووکاری و خزمەتکارەکانی) لە خزمەت ئەم ئیسلامەدا کار دەکەن. بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووێ کە (٣٥) هەزار درهەمم ئامادە کردووە، لەو زەمەنەدا ئەو پارە خەیاڵییەی کە ئامادەی کردووە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئا بەم شێوەیە ئامادەیی خۆی دێنێتە پێشەوە.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ماکوان: ئەی نەخشەکە چی بوو کە دایانڕشت؟

نومەیر: ئەو نەخشانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- دای دەڕێژن بریتین لە:

یەکەم: نەخشەی یەکەم پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووێت بە ئەبوو بەکری سدیق، کە لە سەرەتای ئەمشەو من دێمە ماڵەکەی بەڕێزتەوە، چوونکە دەیزانی کە مووشریکەکان گەمارۆ دەخەنە سەر ماڵەکەی و لە جێگای خۆی عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب لەناو پێخەفەکەی خۆی دائەنێت بۆ ئەوەی مووشریکەکان کە دێن بزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە جێگەی خۆی دایە، عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب ئەمانەتەکانیش بگەڕێنێتەوە دەست خاوەنەکانیان.

دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شەوە زۆرتر لە ماڵی ئەبوو بەکر دەمێنێتەوە تا جموجوڵی هاتوچۆ کردن لەناو شاری مەککە دا کۆتایی پێ دێت، ئەوکاتە خەڵکەکە هەمووی ئەخەوێت کەس لە کوچەو کۆڵانەکانا نامێنێت، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوڕێکەیدا هەردووکیان پێکەوە دەرئەچن بۆ ئەو سەفەرەی کە نەخشەیان بۆ کێشاوە.

سێیەم: پێغەمبەری خوا ﷺو ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- کەسیان لەدەرگاوە ناچنە دەرەوە، بەڵکوو لە پشت ماڵەکەیانەوە کونێک بکەنە دیواری ماڵەکەیان کە پیایدا بچنە ئەو دیویەوە بۆ ئەوەی نەیان بینن کە لەدەرگاوە هاتوونەتە دەرەوە نەک چاودێریش خرابێتە سەر ماڵی ئەبوو بەکری سدیق بەهەمان شێوە.

چوارەم: هیجرەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینەیە لە ڕێگای کەناری بیابانی دەریای سوورە وە تا ئێستا هیچ کەس پیایدا نەڕۆیشتوە، ڕێگایەک بووە کەس نەتوانیوە پیایدا بڕوات و کەسیش ئەو ڕێگەیەی نەزانیوە لەبەر ئەوەی موشریکەکان نەیان دۆزنەوە.

پێنجەم: پێغەمبەری خوا ﷺ داوا ئەکات کەسێک وەکوو ڕێبەرێک بگرن بە کرێ وەکوو ڕێنیشاندەر کە شارەزای ئەو ڕێگایە بێت و بتوانێت بیانگەیەنێت، ئەبێ ڕێنیشاندەرەکەش کەسێکی لێزان بێ و ئیشی تایبەتی خۆی بێت، بیابانیش ترسناکە، نابێت بەهەموو ڕێگەیەکدا بڕۆن و ئەم کەسەش نابێ نزیکی پێغەمبەری خوا و ئەبوو بەکر و




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

موسڵمانان بێ، بەڵکوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموویێت با مووشریک بێت، لەبەر ئەوەی کە پلانێکی زۆر گەورە بوو کە هیچ کەس شک ناکات ئەو کەسەش کە دانرا بۆ ئەم کارە (عبدوڵلای کوڕی ئورەیقیت ) بوو مووشریک بوو، بەڵام لە دواییدا موسڵمان دەبێت. ئەبوو بەکری سدیق بەو کارە هەڵدەستی و خێرا دەچێ بەو دەڵێت، عبدوڵلا کوڕی ئوڕەیقیت ئامادە دەکەن لەبەرامبەر پارەیەکی زۆر و کارەکەی پێ دەسپێرن ئەویش ئامادەیی خۆی دەردەبڕێت.

شەشەم: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەبوو بەکری سدیق دا یەکەم هیجرەتی بەرەو باشوور بوو بە ئاراستەی یەمەن کە ڕێگایەکی زۆر ئەبڕن، مەدینە ئەکەوێتە باکووری شاری مەککەوە نەک باشووریەوە ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە مووشریکەکان شک نەکەن کە بەرەو مەدینە دەڕۆن، پاشان دەگەنە جێگایەک پێی دەوترێ (ئەشکەوتی ثور) لەوێ ئەمێنێتەوە بۆ ئەوەی ڕێگاکە لە خەڵکی شاری مەککە چەواشە بکەن.

حەوتەم: ڕۆیشتن بۆ (ئەشکەوتی ثور) پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەبوو بەکری سدیق لە وێدا خۆیان حەشارداوە، شاخێکی زۆر بەرزە و بەدەگمەن مرۆڤ بەسەریدا ڕۆیشتوون کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئازایەتییەک و ڕاهێنانێک بووە کە کردوویانە بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبن. نەخشەکەیان وا داناوە کە لەوێدا سێ ڕۆژ بمێننەوە، ئەو دوو وشترەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوو بەکری سدیق کڕیبوویان لە ماڵی (عەبدوڵلای کوڕی ئوڕەیقیت) دای ئەنێن، دوای سێ ڕۆژ دێنە دەرەوە و دەڕۆن بۆ شاری مەدینە.

هەشتەم: عەبدوڵلا کوڕی ئەبوو بەکری سدیق هەڵدەستێ بەدەوری کاری هەواڵگری ئیسلامی، لەم کارە گرنگ و خەتەرناکەدا هەموو ڕۆژ هەواڵی ناو شاری مەککە و جموجوڵی قووڕەیش و کاردانەوی قووڕەیش بەرامبەر دەرچوونی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو شاری مەککە و گەیاندنی زانیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوو بەکری سدیق، وا کارەکەیان پێ سپارد بوو دەبێت لەبەرەبەیاندا بچێت بۆ ناو شاری مەککە و لە کۆتایی شەودا بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەس هەست نەکات بەم هاتوچۆکردنەی عەبدوڵلای کوڕی ئەبوو بەکر کە حەتمەن خەڵکێک ئەبێت چاودێری بکات!

نۆیەم: عامر کوڕی فەهیرە -خوا لێی ڕازی بێت- کە خزمەتکاری ئەبوو بەکری سدیق بوو -ڕەزامەندی خوای لێبێت- هەستا بە کێشانی نەخشەی ئەمنیەت و ئاسایش بۆ ئەم کارە، کارەکەشی ئەوە بوو کە شوێن پێی پێغەمبەری خواو ئەبوو بەکری سدیق و عەبدوڵلای کوڕی



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەبوو بەکری سدیق بسڕێتەوە، بەو هەموو مەڕوماڵاتانەی کە هەیبوو کە بەشوێن پێکانی ئەوان دا بڕۆن تا جێگەی پێی ئەوان دیار نەمێنێت و چاودێری ڕێگاکانیان بکات تا ئاشکرا نەبن.

دەیەم: ئافرەتێکی ئازاو بەجەرگ (ئەسماء کچی ئەبوو بەکری سدیق) - ڕەزای خوای لێبێت- هەستا بە دابین کردنی خواردن، هەموو ڕۆژێک خواردن و ئاوی شیرینی دەبرد بۆ ئەشکەوتی سەور بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و باوکی بەڕێزی کە ئەبوو بەکری سدیق بوو -خوا لێی ڕازی بێت- اسماء بە یەکێک لە ئافرەتە بەهێزەکان ناو دەبرێت کە لە کۆتا مانگی دووگیانی دا بوو بەرگەی ئەم هاتوچۆیەی ئەگرت لە بیابان وگەرمای ئەوناوچەیە و بەرزایی غاری سەور دەچووە سەرەوە بە درێژای سێ ڕۆژ بەردەوام خواردن و ئاوی دەگواستەوە بۆیان.

لە ڕاستیدا ئەمەش شتێکی سەرسووڕمانە لە ماڵی ئەبوو بەکری سدیق کە چۆن خۆی، کوڕی، کچی و خزمەتکارەکانی لە خزمەت ئەم ئیسلامەدا بوون و بەو شێوەیە خستیانە بەردەم خەڵکی بۆ ئەوەی لایان ڕوون بێت کە چۆن لە خزمەتی ئیسلام دان.

بەم شێوەیە ئەم دە خاڵەی نەخشەی گرنگی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوو بەکری سدیق بوو.

ماکوان: لێرەدا ئەگەر ورد بینەوە لەوەی کە ئەم نەخشە داڕێژراوە کەی پیادە دەکرێت و پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەم حاڵەتەی کە ڕوویداوە هێشتا لە بەیانیدا بووە، لە پەرلەمانی قووڕەیش بڕیار دەرچووە کە دەیانەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ تیرۆر بکەن، ئەمە خاڵی یەکەم بوو.

خاڵی دووەم لە نیوەڕۆ هاتووەتە دەرەوە و دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی، لەوکاتەدا کە نەخشەکە دائەنێ، نەخشەی پێغەمبەری خوا ئاشکرا دەبێت، چوونکە ئەبوو جەهل بڕیارەکەی دەگۆڕێت کە وا بڕیار بوو لە بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر بچوونایە بۆ سەر ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام ئاگاداریان دەکاتەوە لەوەی کە دەبێت لە ئێوارەوە بچنە بەردەم ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ و بەردەرگایان بگرن بۆ ئەوەی هەر کە پێغەمبەر دێتە دەرەوە بیکوژن، لەم کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بەمە دەزانێت پاشان خوای پەروەردگار ئایەتی بۆ دادەبەزێنێت کە ئەبێ بچێتە دەرەوە دەنا بۆ شەوەکەی یان بۆ ڕۆژی دوای لە کاتی هاتنە دەرەوەیدا دەیکوژن!



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پێغەمبەری خوا ﷺ لەشەوی ٢٧ی سەفەری ساڵی ١٤ی پێغەمبەرایەتی دا لەدوای ئێوارە دێتە دەرەوە بە مووعجزەیەک کە هیچ کامیان نابینن، ئەویش پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتە دەخوێنێ کەخوای گەورە بۆی دادەبەزێنێت و لەسوورەتی یس دا دەفەرموێت:

﴿وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ۝٩﴾ [يس]

(هەروەها بەربەستمان لە بەردەمیانەوە و لە پشتیانەوە داناوە، پەردەشمان هێناوە بەسەر چاویاندا (مەبەست ئەو بەربەستانەشە کە لە دەروونیاندا هەیە و نایەڵێت ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوە ئیتر ئەوانە و نابینن).

لەم کاتەدا بەناویاندا تێ دەپەڕێت و ئەم ئایەتە دەخوێنێ کەسیان نابینن هەموو کوێر دەبن، بۆ گاڵتە پێ کردن کە لە سیرەی مووبارەکی پێغەمبەری خوا ﷺ دا هاتووە کە بووخاری دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا بە زەردەخەنەیەکەوە خۆڵی دەکرد بەسەر ئەوانەی کە ئەیانوویست تیرۆری بکەن، سەری هەموویانی پڕ ئەکرد لە خۆڵ و پێی ئەوتن بەگاڵتەوە من خۆڵیش دەکەم بەسەرتانا و منیش نابینن! ئەمە عەزەمەت و گەورەیی خوای پەروەردگارە بۆیە ئەم کارەش ڕوویدا، چوونکە نەخشەی هەموو مرۆڤێک کە سیفاتی کامیل و جەمالی تێدا نییە، تەنها نەخشەی خوای گەورەیە کە ئەتوانێ سەرکەوێ بەسەر هەموو شتێکا. ڕاستە پێغەمبەری خوایە ﷺ، بەڵام نەخشە داڕشتن کەلێنێکی هەر تێئەکەوێت و نەخشەی مرۆڤ ناتوانێ بەتەواوەتی بەئەنجام بگەیەنرێ ئەگەر تەوەکوول بە خوای گەورە نەبێ، زۆر گرنگە مرۆڤ تەوەکوولی بە خوای گەورە هەبێ لە کارەکانیدا بۆ ئەوەی سەرکەوێت، لە جیاتی ئەوەی تەوەکوولی بە کەرەستەی ماددی هەبێت هەروەک خوای گەورە لە سوورەتی الحج دا دەفەرموێت:

﴿۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ ۝٣٨﴾ [الحج]

بێگومان خوا پشتگیری لەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە دەکات، چوونکە بەڕاستی خوا هەموو خیانەتکار و کافر و بێ باوەڕێکی خۆش ناوێت.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ژیان تێکۆشانە و نەفسی هەموو خەڵکێک بەدەست خوای گەورەیە، خوای گەورە بەو شێوەیە پێغەمبەرەکەی خۆی ڕزگار ئەکات، هەموو شتێکیش بە قەدەری خوای گەورەیە هەروەک خوای گەورە لە سوورەتی القمر دا دەفەرمووێت:

﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾ [القمر]

بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازە و نەخشەی دیاریکراو درووست کردووە.

نومەیر: زۆر ڕاستە ئەم بۆچوونەت زۆر جوانە، با منیش زانیارییەکی زیاتر بخەمە سەری بۆ جەنابتان، پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو ماڵی ئەبوو بەکری سدیق ڕۆیشت و لەماڵی ئەبوو بەکر مایەوە، بەهەمان شێوە هەمان کاریان ئەنجام دا و ڕۆیشتن بەرەو ئەشکەوتی سەور لەو ئەشکەوتەدا مانەوە کە ئەمە نەخشەی یەکەم بوو.

نەخشەی دووەم کە ئەیانەوێ بەیانی پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژن، مووشریکەکان بڵاوبونەتەوە بەدەوری ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم کاتەدا سەر بەرز ئەکەنەوە ئەبینن کەسێک لە دوورەوە دێ بە مووشریکەکان دەڵێ ئەوە چی دەکەن لێرە؟ ئەوانیش دەڵێن چاوەڕێی محمد دەکەین کە بێتە دەرەوە، ئالەم کاتەشدا ئەم پیاوە ئاگاداری ئەوە نییە کە ئەیانەوێ پێغەمبەری خوا بکەن تیرۆری. کابراش شتێکی خراپ دەڵێت. دەڵێت: لەڕێگادا پێغەمبەری خوام ﷺ دیوە! هەندێکیان دەڵێن هێشتا لە ژوورەوە خەوتوە کە پێشتر چاودێری ماڵەکەیان کردبوو کە بینیویانە لەناو جێگەی خەوتنیدا ئیمامی عەلی خەوتوە وادەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ خۆیەتی، هەر بۆیە کاتێک خۆڵەکە ئەبینن بەسەریانەوە کە پێشتر بەسەریانەوە نەبووە ئەوەندەی تر شکست دێنن و زەلیل دەبن ئالێرەدا ئەم نەخشەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاشکرا دەبێت.

ماکوان: لێرەدا خاڵێکمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لە زەمەنی جاهیلییەت دا لەناو شاری مەککەدا یاسایەک هەبووە هەموو کەس بەپێی ئەو یاسایە حورووماتی پارێزراو بووە کەس نەیتوانیوە بچێتە سەر ماڵی خەڵک و تەعدا بکات، هەر بۆیە مووشریکەکان لەو کاتەدا لەدەرەوەی ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەڕێ بوون تا بێتە دەرەوە.




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کاتێک کە دەچنە ژوورەوە سەیر دەکەن کە عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب -خوا لێی ڕازی بێت- لە شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ خەوتوە عەزێتی زۆری دەدەن، ئەویش بەرامبەریان هیچ ناڵێت لەکاتێکدا بە یەکێک لە پیاوە ئازاکان دادەنرێت، مووشریکەکان دەزانن کە لەکاتی شەڕی بەدری گەورەدا چ تواناو شکۆمەندی یەکی هەبووە و چ شەڕێکی کردووە دژی مووشریکەکان، لەبەر ئەوەی کە هیچ ئەمرێکی پێ نییە بۆ وەڵام دانەوەی بەرامبەر ئەو مووشریکانە هەر بۆیە بێ دەنگ دەبێت و دەشزانێت تەنها دوو ئەرکی پێ سپێردرابوو کە لە پێشتر بۆت باس کردم، دەشزانیت ئەرکەکان چی بوون؟ بەڵام ئێستا لە دنیای پێشکەوتوو مافی مرۆڤ دا ئەو حوورمەتەی جاهیلییەتیش نەماوە تا سەروەری ماڵەکان بپارێزرێت! بەهەر حاڵ ویستم ئەو خاڵە باس بکەم فەرموو بەبەرەوە ناو باسەکە ئووستاز نومەیر.

نومەیر: کاتێک کە مووشریکەکان ئەم هەلومەرجە دەبینن ڕاستەوخۆ دەگەڕێنەوە بۆ لای قووڕەیش و قووڕەیش بڕیاری تازە ڕادەگەیەنێت کە ئەمەی لای خوارەوەیە:

بڕیاری یەکەم: چوار دەوری ماڵی ئەبوو بەکری سدیق بگرن و بچنە ماڵەکەی بیپشکنن، چوونکە سەرکردەی موسڵمانان پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزای خوای لێبێت- پێکەوە هەڵهاتوون، قووڕەیش بە تاقمێکی گەورەوە بە سەرۆکایەتی ئەبوو جەهل ئەم کارە بەئەنجام دەگەیەنن کە دەچێنە ناو ماڵی ئەبوو بەکری سدیق لەوکاتەدا ئەبوو جەهل (ئەسمای کچی ئەبوو بەکر سدیق) دەبینێ و زلەیەکی لێ دەدا، ئەبوو جەهل پێی دەڵی کوا باوکت: ئەسما دەڵێت: نازانم!

ئەبووجەهل و تاقمەکەی لەدوای گەڕانێکی زۆر لە ناو ماڵەکەی ئەبوو بەکری سدیق نایدۆزنەوە.

بڕیاری دووەم: هێزی سەربازی چاودێری لە هەموو ناوەوەو دەرەوەی شاری مەککەدا بڵاو دەکەنەوە، بۆ ئەوەی نەکا هێشتا پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو ماڵێک لەماڵەکانی مەککە خۆی حەشار دابێت.

بڕیاری سێیەم: قووڕەیش ڕایگەیاند کە خەڵاتێکی گەورە دەدرێت بە هەرکەسێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ بگری، بەمردوویی یاخوود بە زیندوویی هەر کەسێک بیگرێ



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سەد وشتری خەڵات دەکرێت، ئەمەش ژمارەیەکی بی شومار بوو لەوسەردەمەدا و لەم سەردەمەی ئێستاشماندا!

بڕیاری چوارەم: هەرکەسێک بتوانێ ڕێوشوێن پێی ئەوانمان بۆ بهێنێ لە هەموو ڕێگایەکی دەرەوەی مەککە لە هەواڵی ئەوان ئاگادارمان بکاتەوە ئەوا ئێمە خەڵاتێکی ئەدەینێ.

ئەو پیاوەی کە باسمان کرد لە ڕێگادا پێغەمبەری خوا ﷺ دیبوو پێیان دەڵێت: لە ئەشکەووتی سەورە، بەمەش نەخشەی دووەمیان ئاشکرا دەبێت و قووڕەیش بەرەو ڕێگای ئەشکەووتی سەور دەڕۆن، کاتێک قووڕەیش دەچنە سەر شاخەکە هەندێکیان سەریان دائەنەواند بۆ ناو ئەشکەوتەکە بۆ ئەوەی بیان بینن، لەوکاتەدا ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- دەڵێت: یا رسول الله چاوەکانیان ئەمان بینن؟ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: بێ دەنگبە ئەبوو بەکر! گومانت چۆنە ئەبوو بەکر کە دوو کەسین و خوای گەورە سێیەمییانە؟![95]

ماکوان: ئوستاز چەند جوانە الله، الله ئەمەیە شان و شکۆمەندی پێغەمبەری خوا ﷺ کە چۆن لەم هەلومەرجە ناخۆش و دژوارەدا تووشی نائومێدی نەبووە کە خوای گەورە هەمیشە لەگەڵ بەندەی خۆیدایە، ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- لە ترسی گیانی پێغەمبەری خوا ﷺ ترس دای دەگرێت، خۆشەوویستی خۆی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوە سەرسووڕمانە بووە کە دەیبینین چۆن پارێزگاری دەکات.

لە ڕیوایەتی تردا هاتووە کە ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- دەڵێت: ئەگەر من بکوژرێم تەنها پیاوێکم دەکوژرێم، بەڵام ئەگەر تۆ بکوژرێیت ئەوا هەموو ئوممەتەکەت ئەکوژرێ.

ئایا مووشریکەکان چییان کرد لەبەردەم دەرگای ئەشکەوتی سەور؟ ئایا شوێن پێی ئەوانیان زانی یاخوود دەرگای ئەشکەوتی سەوریان بۆ کرایەوە؟

---

[95] اسْكُتْ يَا أَبَا بَكْرٍ، مَا ظَنُّكَ يَا أَبَا بَكْرٍ بِاثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا، صحيح البخاري، رقم ٣٩٢٢





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە ئیمام ئەحمد و تەبەرانی و عەبدورەزاق و خەتیب دەڵێن: جاڵجاڵۆکەیەک بەردەمی دەرگای ئەشکەوتەکەی بە تەون گرتبوو کە ئەمەش مووعجزەیەکی خوای گەورەی دەرخست، لەو کاتەدا مووشریکەکان دەڵێن: ئەگەر کەسێک بچێتە ناو ئەم ئەشکەوتەوە ئەوا تەونی ئەم جاڵجاڵۆکەیە لە بەردەم دەرگای ئەشکەوتەکەوە نە ئەبوو.

ئەم ڕیوایەتە لاوازە کە لە هەندێک شوێنی تر باسکراوە چیرۆکی دوو کۆتر و درەختەکە لە بەردەم دەرگای غارەکەدا ئەمەش زۆر لاوازە و ڕاستی نییە، بەڵام چیرۆکی تەونی جاڵجاڵۆکەکە لەبەردەم غارەکەدا ئەگەر ڕاستیش نەبێت، بەڵام ئیعجازێکی زۆر گرنگە کە خوای گەورە چۆن پارێزگاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە، لەبەر زۆر گێڕانەوەی ئەو ڕیوایەتەش بەرز کراوەتەوە و بووە بە سەنەدێکی حەسەن.

ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندیی خوای لێبێت- دەڵێت: شەوێک لەو سێ شەوەی کەلە ئەشکەوتی سەوردا بوون، هەرچی پەنجەی قاچ و دەستی هەیە دەیخاتە ناو کون و کەلەبەری ناو ئەشکەوتەکە بۆ ئەوەی نەوەک مارو جرِوجانەوەری ناو ئەشکەوتەکە بدات بە شوێنێکی پێغەمبەری خواوە ﷺ، لەو کاتەدا مارێک ئەدات بە پێی ئەبوو بەکری سدیق-ەوە -ڕەزامەندی خوای لێبێت- لە هەمان کاتیشدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ڕانی ئەبوو بەکری سدیق خەوی لێ کەوتبوو، ئازارەکەی هێندە ئەبوو بەکری سدیق ناڕەحەت دەکات ناتوانی هیچ هاوارێک بکات لە تاو ئەوەی نەوەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ بەخەبەر بێتەوە، بەڵام ئازار زۆر دێنێت بۆ ئەبوو بەکری سدیق لە تاواندا فرمێسک لە چاوی دێت، لەم کاتەدا دڵۆپێک فرمێسک دەکەوێتە سەر ڕوومەتی پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەری خوا ﷺ بەئاگا دێتەوە و دەفەرمووێت: ئەی ئەبوو بەکر بۆچی دەگریت؟

ئەبوو بەکر دەڵێت: مارێک پێوەی دام و لەتاو ئازارەکەی خۆمم پی ڕانەگیرا، بەڵام ئەو فرمێسکە تۆی بەخەبەر هێنایەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لیکی موبارەی ئەدا لەو شوێنەی کە مارەکە داویەتی بە ئەبوو بەکری سدیق-ەوە، پاش ئەوە ئەبوو بەکری سدیق دەڵێت: وام هەست کرد کە هیچ شتێک ڕووی نەداوە هەروەک ئەوەی کە نە مار پێوەی دابم نە ئازاریشم هەبووبێت.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەمەش سیمایەکی تری خۆشەوسیتی ئەبوو بەکری سدیق بوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

نومەیر: لە شەوێک لە شەوەکانی مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١٤ی پێغەمبەرایەتیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- ئەم بڕیارانە دەرئەکەن:

- بەشەو دەربچن لە ئەشکەوتی سەوردا.

- بە ئاراستەی ناوچەی یەمەن بڕۆن.

- بە ئاراستەی ڕۆژاوای کەناری دەریای سوور بگەڕێنەوەو ڕووە و باشوور و باکوور سەرچاوە بگرنەوە.

- ئەم خاڵەش کە خاڵی پاراستنە کە ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- وەک دەزگایەکی پاراستنی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت لە کاتی ڕۆشتندا چاودێرێکی باش بێت هەندێکجار ڕێڕەوی ڕۆشتنی بگۆڕێ. هەندێک جار لە دەستی ڕاستی یاخوود چەپی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕوات و پاشان بیگۆڕێ بۆ پێش و دوای، بە درێژایی ڕێگا بەم شێوەیە ئەبوو بەکری سدیق پارێزگاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری کرد لە ئەبوو بەکری سدیق لەسەر ئەم شێوە ڕۆشتنە و فەرمووی: ئەی ئەبوو بەکر بۆچی وا دەکەیت؟

لەوەڵامدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بیر لەوە ئەکەمەوە کەسێک تیرێک یان ڕمێکت پێوە بنێت، بیر ئەکەمەوە لەم لاو ئەلاتەوە بتگرن و من نەتوانم هیچ شتێک بکەم، بۆیە بەم شێوەیە دەڕۆم.

لەزۆر جێگادا وا باس دەکرێت کە بە ١٢ ڕۆژ پێغەمبەری خوا ﷺ دەگاتە شاری مەدینەی منەوەرە، هەندێکی تر دەڵێن بە ٩ ڕۆژ.

لەو حاڵەتی دەرچوونەیان لە شەودا چەند کەسێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینن کە ڕۆیشتووە، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەبوو بەکری سدیق ڕێگا




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەبڕن کۆمەڵێک ماسیگر کە بەرەو شاری مەککە دەگەڕێنەوە قافڵەی (سوڕاقە کوڕی مالیک)ە، سوڕاقە دەنگۆی بڵاوبوونەوەی هەندێک خەڵکی تر دەبیستێ کە پێغەمبەری خوایان دیوە و دەبێتە مقۆمقۆ لە نێوان خەڵکیدا و خەڵکەکەش دەزانن کە سوڕاقە لە ڕێگای دەریای سوورەوە گەڕاوەتەوە لە ماسی گرتن، لەم کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵ دەدات ئەو قافڵەیەی سوڕاقەی کوڕی مالیک ببینێ و ئەزانێ کە هەر لەو ناوچەیەدایە و دوور نەکەوتونەتەوە، هەربۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- لەگەڵ ڕێنیشاندەرەکەیان کە (عەبدوڵڵا کوڕی ئورەیقید)ە نزیک دەبنەوە لێیان، لەوکاتدا ئەوان خەوتوون بەڵام بەخەبەر دێنەوە. کاتێک سوراقە ئەمان دەبینێت وردە وردە نزیک دەبنەوە گوێیان لێ دەبێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ قورئان دەخوێنێت، بەڵام سوراقە هیچی پێ نەکراو پێغەمبەری خوا ﷺ لێی نزیک دەبێتەوە کە بووخاری ڕیوایەتی کردووە دەفەرموێت: ئاشکرامان مەکە! قسەیەکی زۆر سەرسووڕمانی پێ دەڵێت و دەفەرمووێت: دەتبینم سوڕاقە تۆ بازنەکانی کیسرات لە دەستایە، واتە بازن و ملوانکەی شاهانەی فارس دەدەم بە تۆ کە وڵاتی فارس کەوتە بەردەستم.

ئەمەش مووعجزەیەکی خوای گەورەیە کە مژدەیەکە! وڵاتی کیسرا ئەخەیتە ژێر دەستەڵات و هەتا غەنیمەتێک و سەروەت و سامانی پاشا ئەگریت، پەیمان بێ بازنەکانیش بدەم بە تۆ! ئا ئەمەش بەڵگەی پێغەمبەرایەتی نەبێ چۆن ئەم هەواڵە ئەدا.

سوراقە داواکارییەکی هەبوو لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە نوسراوێک یاخوود یادداشتێک بنووسێت بۆی، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمری کرد بە (عامری کوڕی فەهیرە) کە بۆی بنووسێت و لە سەرپێستەیەک تۆمار کرا، پاشان خۆی و خەڵکەکەی دەورووبەری وازیان هێنا لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا کۆتایی شەو، ڕۆژ بووەوە خوای گەورە پاراستنی هەروەک خوای گەورە لە سوورەتی المدثر دا دەفەرمووێت:

﴿... وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ... ٣١﴾ [المدثر]

کەس ژمارەی سەربازانی پەروەردگارت نازانێت جگە لە زاتی خۆی.

ماکوان: ڕۆژگار هات و ڕۆیشت دوای فتحی مەککە و حونەین لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب -ڕەزامەندی خوای لێبێت- ئەو ناوچەیان گرت و تەخت و تاراجی کیسرایان تێک شکاند




WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەموو غەنیمەتێکیان دەستکەوت، بازنەکانی کیسرایان هێناو لەوکاتەدا سوڕاقە دەچێت یادداشتەکەی دەهێنێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی نووسیوە، بەو شێوەیە عومەری کوڕی خەتاب - ڕەزامەندی خوای لێبێت - ئەمری پەیمانەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیادە دەکات و بازنەکانی کیسرای دەداتێ، خوای گەورە لە سوورەتی النجم دا دەفەرمووێت:

﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ۝﴾ [النجم]

قسەو گوفتاریشی (ئەوەی کەقورئانە) لەئارەزوو بازی و هەواو هەوەسەوە نییە، ئەمەی کە ڕای دەگەیەنێت تەنها نیگاو وەحی خواییە.

نومەیر: بەڵێ بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو شاری مەدینەی منەورە دەکەوێتە ڕێو نزیک دەبێتەوە لە شاری مەدینە، لە ناکاودا و بە کتوپڕی پیاوێک بەناوی (بەریدەی کوڕی حەسیب) کە سەرۆکی قەبیلەی ئەسلەم بوو، خۆی و حەفتا کەس کە چەتەو دز بوون ڕێگایان بە پێغەمبەری خوا ﷺ گرت، لەم کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئیسلامی خستە بەردەمیان زۆر بەنەرمی و لەسەرخۆیی، وتوێژی لەگەڵ کردن پێی وتن بۆ نابنە موسڵمان؟ بەم شێوازی کردارەیی پێغەمبەری خوا ﷺ و زمان شیرینیەی کاریگەری لەسەر ئەوان درووست کرد، بەو شێوەیە بەریدە کوڕی حەسیب و حەفتا کەس بوونە موسڵمان، ئەمەش شێوازێکی دیکەی بانگەوازی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە مووعجیزەیەکی دی خوای گەورەیە بە درێژایی چوار ساڵ هیچ کەسێک لەشاری مەککە موسڵمان نەبووە تەنها چوار کەس نەبووبێ کە دووانیان مردوون و دووانیان لە ژیاندا ماون، تەمانیان ( ٢٢ ساڵە و ئەوی تریان ١٨ ساڵە).

ئەم حەفتا کەسە بوونە سووپا و هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای قیادی دەوڵەتی گەورەی ئیسلامییەوە بەو شێوەیە پۆل پۆل دێنە ناو ئەم ئیسلامەوە هەوەکوو خوای گەورە لە سوورەتی النصر دا دەفەرموێت: ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ۝ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ۝ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًا ۝﴾ [النصر]

کاتێ یارمەتی و کۆمەکی خوا دێت، شاری مەککە ڕزگار دەکرێت و دەرگای ئازادی واڵا دەکرێت، خەڵکیشت بینی پۆل پۆل دەچنە ڕیزی ئایینی خواوە، ئەوسا ئیتر تۆ سووپاس و



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ستایشی پەروەردگارت بکە و داوای لێخۆشبوونی لێ بکە، چوونکە بەڕاستی خوا زۆر چاوپۆشی دەکات و تۆبە وەرگرە ( ئومێدە لە ئایین دەیەکی نزیکدا، خوای باڵادەست سەرکەووتنێک ببەخشێت، ئەو کاتە ئیمانداران هەست دەکەن ئەم سوورەتە تازە دابەزیووە).

لەسەرەتاوە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەچنە شاری قوبا پێش شاری مەدینە، کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە قوبا دەمێنێتەوە بە خۆشی و شادییەوە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەگاتە شاری مەدینە لەوکاتەدا بە پێشوازی سەرکردەیی و سەرۆکی مەدینەی لێ کرا بەو شێوەیە دەوڵەتی دامەزراند.

لە کۆتایدا لە ڕۆژی ١٢ی ربیع الاولساڵی ١٤ی پێغەمبەرایەتی، کە ئەم ڕۆژە دائەنرێ بە هەنگاوێکی تازە و گرنگ لە بانگەوازی ئیسلامی لە مەدینەی منەوەرە دا.

ماکوان: ئالێرەدا چەند وانەو پەندێک فێر دەبین کە گرنگترینیان ئەم خاڵانەی خوارەوەیە:

- ئەوەی داوا ئەکرێت لە موسڵمانان هەر کەسێک بیەوێت کارێک ئەنجام بدات با پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بکاتە پێشەنگی هەموو کارێکی، هەروەک بینیمان چۆن بناغەیەکی پتەویان دامەزراند بۆ بەگەڕخستنی کاری سیاسییان و نەخشەو پلانیان بە شێوەیەک ڕێکخست کە سەرکەوتن بەدەستبهێنن، بینیمان چۆن پارەیان کۆکردەوە، وشتریان ئامادەکرد ڕێ نیشاندەریان ئامادەکرد و چوونە ئەشکەوتی سەور، ڕێگایان بڕی و توانیان خاڵی مەبەستیان وەدەستبخەن کە هەموو کارێکی ماددی و مرۆڤایەتی و موسڵمانان بە گشتی بەرچاو بگرێت، ئەم حاڵەتەش مەبەست لەوەیە کە مرۆڤ بە تەنها لایەنی ماددی نەخاتە ئەستۆی خۆی لایەنی خوایی فەرامۆش بکات کە بڵێت هەموو توانا و دەسەڵاتێک خۆم خاوەنی بووم، خوای گەورە لە سوورەتی الأنفال دا دەفەرمووێت:

﴿وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ ....﴾ [الأنفال]

(خوا فەرمان دەدات بەکار بەدەستانی دەوڵەتی ئیسلام): هەرچی لە تواناتاندا هەیە بۆ بەهێزکردنی سووپای ئیسلام بیخەنە گەڕ و ئامادەی بکەن هێزی ئاسمانی و دەریایی و وشکانی... هتد) و لە ئامادەکردنی هەموو جۆرە ئەسپ و (هۆکانی تری گواستنەوە) کەمتەرخەمی مەکەن تا دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن بکەن.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

- پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها پابەند نەبووە بە هۆکار، بەڵکوو پابەندبوو لەسەر بەرەکەتی خوای گەورە، تەوەکوولی بە خوای گەورە و دڵنیایی خۆی لە گەورەیی و ئیرادەی خوای گەورە بۆ سەرخستنی کارەکانی هەبوو ، هەربۆیە ئەم وشە جوانەی فەرموو بە ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- گومانت چۆنە دوو کەسین و سێیەمینمان خوای گەورەیە. [٩٦]

- پێغەمبەری خوا ﷺ لەهەموو ساتێک لەساتەکانی ژیانی هیوای ون نەکرد تەنانەت لە کاتی سەفەرکردنەکەیدا کە چەند ترسناک بوو ئەیوویست دەرچێت لە مەککەوە بەو ڕێگایەی کە لەسەرەتاوە باست لێوە کردووە، بەو شێوەیە هیوای بەژیان هەبووە ڕۆژێک تەخت و تاراجی کورسی پاشای کیسرا لە ژێر پێی موسڵمانان دەبێت. هەموو سەروەت و سامانی کیسرا دەبەن، کە دەفەرمووێت: "كَأَنِّي بِك يَا سُرَاقَةُ تَلْبَسُ سُوارَيْ كسْرَى".

- پێغەمبەری خوا ﷺ لەهەموو هەنگاوێک لە هەنگاوەکانی ژیانیدا هاوڕێیەکی لەگەڵدا بووەو بانگەوازی خۆی کردووە بە باسێکی گرنگ لەژیانیدا، لە مەککە هەر لەگەڵ هاوڕێکانیدا بووە لەکاتێکدا ویستی بچێتە تائیف هەر لەگەڵ هاوڕێکانی دا بووە، پەیمان بەستن و لەهەموو کار و چالاکییەکی سیاسی دا لەگەڵ هاوڕێکانیدا بووە، کاتێک جبریل -سەلامی خوای لێبێت- هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە هیجرەت بکات کە ئەبێت هیجرەتەکەی لەگەڵ هاوڕێیەکی دا بێت.

ئەمەش ئەوەمان فێر دەکات مەبەستی تێدایە کە زۆر ڕوون و ئاشکرایە، هەموو کارێک مرۆڤ ناتوانێت بەتەنها بەڕێوەی ببات. هەر بۆیە کاری کۆمەڵکاری ئەنجامێکی باش بەدەست دەهێنێت، هەموو کەس پێویستی بە هاوڕێ دەبێت بۆ سەرخستنی کارەکانی ژیانی، هەربۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ تا لەم دێرەدا کە یاسایەکی ئیسلامی بنەڕەتییە دەفەرمووێت: شەیتان لەگەڵ تەنهاکاندایە، کەبوون بەدوان دوورئەکەوێتەوە. [٩٧]

- بینیمان چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ کە سەرۆکێکی وا بەهێز تەنانەت لە گەشتەکەیدا لەگەڵ موعاناتی خەڵکەکەی دەژیا، لە هەموو هەلومەرجێکدا لەگەڵیانا بوو،

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٩٦] (مَا ظَنُّك بِاثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا)

[٩٧] (الشَّيْطَانُ مِعَ الْوَاحِدِ، وَهُوَ مِنَ الِاثْنَيْنِ أَبْعَد)





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هیجرەتیان کرد هیجرەتی کرد، دەربەدەرکران دەربەدەر بوو لەگەڵیان، خەفەتبار بوون خەفەتبار ئەبو، بە هەموو شێوەیەک لەگەڵیاندا ئەژیا و ژیانی خۆی پێشکەش ئەکردن لە پێناوی ڕزگاری گەلەکەی کۆچی کرد بۆ مەدینەو بۆ بیت المقدس، بەڵام لەم کاتەدا کوانێ سەرۆک و کوانی پێشەنگ؟ موسڵمانان لەڕێگای ئیشکردنیانەوە توانیان دەوڵەت دابمەزرێنن دوای ئەو هەموو نارەحەتی و دژوارییەی کە چۆن ڕووبەڕوی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەبووەوە.

- بینیمان چۆن پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بانگەوازی ئیسلامی ئەکرد وازی نەهێناوە لە بانگەواز کردن و وەختی فەرامۆش نەکردووە هەرگیز، چۆن بانگەوازی بووریدی کوڕی حصین و هاوڕێکانی کرد لە قەبیلەی ئەسلەم، هیچ شێوازێکی لێکۆڵینەوەی بەکار نەهێنا بەرامبەر ترسی ئەوەی ڕاکردنی بووريد و هاوەڵەکانی، بەڵکوو فەزڵ و نیعمەت و بەخشش و پاداشتێکی خوای گەورە بوو بۆ پێغەمبەرەکەی. پاداشت ناخەملێنرێت لەلایەن خوای گەورەوە، دەی کەواتە چۆن کات فەرامۆش بکەیت و ساتەکانت بە فیڕۆ دەدەی؟

- بینیمان لەم گەشتەدا کە چۆن ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- ئامادە بوو لە پێناوی خوای گەورە لەهەموو کاتێکدا، لەهەموو شوێن و زەمەنێکدا زۆر بە ئاشکراو ڕاشکاوانە ئامادەی ئەم کارە ئیسلامیە بوو، گرنگترین کار لەلای ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- ئەوەبوو کە خوا و پێغەمبەرەکەی لە خۆی ڕازی بکات، هەرگیز بیری نەکردوەتەوە کە بارو هەلومەرجەکەی بۆی ناگونجێ بەڵکوو هەمیشە لەهەمو زەمەنێکدا ئامادەیی هەبووە بۆ هەر کارێکی ئیسلامی بجەنگێ لە پێناوی خوای گەورە بە سەروەت و سامانی و بە گیانی جیهادی بۆ بکات بۆ سەرخستنی دینی خوا ببەخشێ.

لە ڕاستیدا زۆرینەمان واتەی (قیتال) و (جیهاد) تێکەڵ ئەکەین و ئەیشێوێنن، لەمانای ڕاستی و درووستییەکەی تێ ناگەین. بۆیە وا بە باش دەزانم بەکورتی ڕوون کردنەوەیەکی لەسەر بدەم:

پیش هەموو شتێک ئەبێ ئەوە بزانین کە (جیهاد) لە مەککەدا فەرز بووە، بەڵام (قیتال) لە مەدینە فەرز بووە.

(قیتال) بەشێکە لە جیهاد و لووتکەی جیهادیش قیتالە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئینسان ناتوانی هەموو کات قیتالەکە بهێنێتە پێشەوە، موقاتیل لە ڕێزی پێشەوەدان و خۆشەوویسترین کەسن لەلای خوای گەورە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

خوای گەورە لە سوورەتی الصف دەفەرموێت:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾ [الصف]

بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە دەجەنگن لە پێناویدا بە یەکڕیز و یەکپارچە و یەک دڵ، هەروەک دیوارێکی بەرزی قایمی تێهەڵکێش و ڕێکوپێک.

بەڵام (جیهاد) مەفهوم و واتەیەکی زۆر بەرفراوانی هەیە قسە کردن، نووسین، بانگەواز کردن و هەرشتێک لە پێناوی سەرخستنی ئەم ئیسلامەدا بێ جیهادە، لەبەر ئەوەی تێگەیشتنێکی فیقهی جیهادی نەبێ ناگاتە ئەو قۆناغە گرنگەی کە مرۆڤ تام و چێژی ئەم جیهادە ببینێ، هەر بۆیە زەرورەتێکی (پێویستە) ئینسانی موسڵمانە کە بزانێ جیهاد چییە و پاشان ئەتوانێ بگاتە قۆناغی قیتال.

- بینیمان کە خۆشەوویستیی ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن چاوەڕێی فرمانێک یاخوود داواکارییەکی نەئەکرد، بەڵکوو خۆشەوویستی لە ناخییەوە بۆ پێغەمبەری خوا کە ڕاستەوخۆ ئامادەبوو بۆ گەشتەکەی، لە خۆشیا گریا کە هاوەڵیەتی بۆ گەشتەکە لە ئەشکەوتی سەوردا چۆن پاراستنی گرتە ئەستۆی خۆی، لە ڕێگادا بەرەو مەدینە دەڕۆشتن چۆن لە ڕاست و چەپ و بەهەر چوار دەورییەوە پارێزگاری دەکرد.

خۆشەوویستی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پاک و ڕاستگۆ بوو، خۆشەوویستی لە هەڵسووڕاندنی ئیش و کاروبارەکانی ئیسلامیدا ڕەنگ ئەداتەوە، پێوویستە موسڵمانان لە دڵیاندا خۆشەوویستی بڕوێ بۆ خوای گەورە و بۆ پێغەمبەرەکەی و بۆ هاوڕێکەی.

بووخاری لە ڕیوایەتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێت: لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكمْ حَتَّى أَكونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ. لە ڕیوایەتێکی تردا نەسائی بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێت: مِنْ مَالِهِ وَأَهْلِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِين.

- بینیمان کە ڕاستگۆیی ئەبووبکر هەموو هاوکارییەکی وەکوو بەخشینی (٥٠) هەزار درهەم، پێشتریش (٣٥) هەزار درهەمی بەخشی لە پێناوی خوای گەورە توانی بگاتە مەدینە، بەهەشتی





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بۆ خۆی کڕی، خوا لێی ڕازی بێت، خوای گەورە لە وەسف و سەنای ئەو کەڵە پیاوەی ئیسلامدا لە سوورەتی اللیل دا دەفەرمووێت:

﴿وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلۡأَتۡقَى ۝١٧ ٱلَّذِي يُؤۡتِي مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ۝١٨ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعۡمَةٖ تُجۡزَىٰٓ ۝١٩ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ۝٢٠ وَلَسَوۡفَ يَرۡضَىٰ ۝٢١﴾ [اللیل]

جا خواناس و پارێزکاران لەو سزاو ئاگرو ناخۆشییە دوور دەخرێنەوە ،ئەو جۆرە کەسەی ماڵ و سامانی دەبەخشێت بەوە دڵ و دەروونی خۆی خاوێن ڕادەگرێت لە کاتێکدا کەکەس چاکەیەکی وای بەسەرییەوە نییە کە پاداشت بدرێتەوە، (چوونکە) تەنها مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی پەروەردگاری بەرزو بڵندە، سووێند بەخوا ڕازی و خۆشنوود دەبێت پێی.

- بینیمان و شایەتین چیرۆکی هیجرەتی پێغەمبەر ی خوا ﷺ ئەبوایە ئەو هیجرەتە بکرایە، لێرەدا هەڵوێستەیەک دەکەین ئایا زانیتان کە چۆن ئەبوو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لێبێت- هەموو خێزانەکەی لە پێناوی خوای گەورەدا کاریان دەکرد؟ ئایا زانیتان کە چۆن عەبدوڵڵای کوڕی بەکار هێنا بۆ گواستنەوەی هەواڵ و زانیاری؟ چۆن ئەسمای کچی بەکار هێنا بۆ گواستنەوەی خواردن و خواردنەوە؟ چۆن عامری کوڕی فەهیرەی مەولای بەکار هێنا بۆ شاردنەوەی شوێن پێکانیان؟

ئەمە خۆشەوویستی ئەبوو بەکری سدیق و خێزانەکەی بوو، بەداخەوە دوای بانگەواز نەخۆش بوو لەدووری خێزانەکەی، سەرەڕای ئەوەش چالاکییەکی بەرچاوی هەبووە لە دەرەوەی ماڵەکەی، ئەمە تێگەیشتنێکی گەورەو گرنگە و بەفیڕۆ نەدرێت کە پێشەنگێکە فێر بین لە ئەبوو بەکری ڕاستگۆ، بیرمان بکەوێتەوە کە پێغەمبەر ی خوا ﷺ دەفەرمووێت: (کُلُّكمْ رَاعٍ، وَكلُّكمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِه).[٩٨]

ئەمەش وانەیەک بوو لە وانەکانی هیجرەتی پیرۆز و دە خاڵی تەواو، لەڕاستیدا وانەی هیجرەت زۆرتری دەوێت، بەڵام لێرەدا ئەوەندە دەخەینە بەرچاوی خوێنەر تا بزانێت کە ئەم خاڵی کۆتاییە گەیشتینە بە دەست پێکی قۆناغی تازە، دامەزراندنی دەوڵەتی موسڵمانانە،

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٩٨] صحیح مسلم، رقم ٤٧٢٤



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هیجرەتیش بەگشتی بریتییە لەو پرۆژە عیملاقە لەبەرچاوتانا بێت هەمیشە، ئەویش دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامییە!

یا رسول الله وەک تۆ هیچ کات لەسەر زەوی دووبارە نابێتەوە..

بەڵام بە دووبارە کردنەوەی صلوات دان لەسەرت نووری حضورت لە دڵمان دا هەست پێ دەکەین.





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

# ناوەڕۆک



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM



یا رسول الله ﷺ، جەنابتمان وەک خۆت نەناسیووە تەنها دەزانین کە ناوی جوانت بەرزترە لە هەموو مەخلوقات، چۆن بتوانین بازنەی نوری چاکەکانت وێنا بکەین؟

مەدینە بەو گەورەییەوە هەرگیز ئیدیعای ئەوەی نەکرد کە جەنابتانی ناسیبێت.

لە وەصفی محمد ﷺ ئەوەندە بەسە بڵێم کە ئەو یەک کەس بوو، بوو بە چەند کەس، چەند سەد کەس، چەندین هەزار و ملیار کەس، بوو بە دنیایەک پڕ لە نوور و ڕەحمەت و میهرەبانی!






Design: Braw Al-Najjar

کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوار ڕیانی شێخ مەحمود بەرامبەر مزگەوتی محمود عەلاف

٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ /M.Ktebxana

نرخ: ٣٠٠٠٠


WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM